# تێرنەخۆرە

کۆمەڵێک ئەفسانەوو حیکایەتی جۆراو جۆری

فۆلکلۆری نێو کوردەوارییە

بەرگی یەکەم

بەشی سێ یەم


**مەولود ئیبراهیم حەسەن**

سەرپەرشتی کۆکردنەوەی کردووەو

پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە

به‌درخان
Bedirxan


**ناوی كتێب:** تێـر نــه‌خـــۆره

**بابه‌ت:** حــه‌كایــه‌ت و ئه‌فسـانـه

**دانه‌ر :** مه‌ولود ئیبراهیم حه‌سه‌ن

**تایپ:** هــاوتــا هیـــوا

**دیزاین و به‌رگ :** خه‌لیل هیدایه‌ت مام شێخ

**تیـــراژ :** ٧٥٠ دانـــــه

نرخی ( ٦٠٠٠ ) دیناره

له‌ به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی كتێبخانه‌ گشتییه‌كان ژماره‌ی سپاردن (١٨٦٢) ساڵی ٢٠٠٨ ی پێدراوه‌.

**شوێنی چاپ :** چاپخانه‌ی رۆژهه‌ڵات / هه‌ولێر

له‌ بلاوكراوه‌كانی ده‌زگای چاپ و بلاوكردنه‌وه‌ی به‌درخان Bedirxan

ئەم پرۆژەیە بریتییە لە :

١- هێلکەی نامێ، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم - ئەنستیۆتی کەلەپوور

٢- هێلکە نامێ، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم- هەولێر ٢٠٠٦

٣- تێرنەخۆرە، بەرگی یەکەم، بەشی سێ یەم — دەزگای بەدرخان

٤- زیاتر لە عەشقێك، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم هەولێر ٢٠٠٨

# وانەی بەکردەوە!

ساڵی ۲۰۰٦ (بەشی یەکەم و بەشی دووەم) ی (بەرگی یەکەم)ی (هێلکەی نامیّ) لە (ئینستیوتی کەلەپوری کوردستان. هەولێر) بە ژمارە(۷و۸) زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی ئەم نێوەندە کەوتنە بازاڕ، ئێستاش ئەوا (بەشی یەکەم)ی (بەرگی دووەم)ی (تێر نەخۆرە)یّ ئەوەتا لەبەر دەستی خوێنەدەوارانی خۆشەویست، ئەم سیّ بەشە بەرهەمی پرۆژەی کارکردنی دووساڵی خوێندنی (۲۰۰۱و۲۰۰۲)و (۲۰۰۲و۲۰۰۳) خوێندنی قۆناغی دووەم و سێیەمی قوتابیانی بەشی زمانی کوردی کۆلیژی ئادابی ئەوسایە کە ئێستا بووەتە کۆلیژی زمان، کە دەڵێن: (پرۆژە ! !) وا مەزانە ئەم پرۆژەیە، پرۆژەی بەشی زمان وکۆلیژو زانکۆ وحکومەتە !، واتە بەرنامە و پلانی بۆ دارنراوەو پسپۆڕ و لێژنەی بۆ ئامادەکراوەو پارەو خەرجی پێویستی خراوەتە بەردەست! نانەخێر. بەڵکە کارکردنی لە خۆوەی مامۆستا و قوتابیانی دوو قۆناغی باسکراوە، هیچ دەستگرتن و یارمەتی دانێکی فەرمی لەگەڵ دانیە: هەر چۆنێك کارکرابیّ و بەرهەمەکە لە چ ئاستێك دابیّ! ! ئەوا سیّ بەشی بەرگی یەکەم و دووەمی حەکایەتەکان کەوتنە نێو کتێبخانەی فۆلکلۆری کوردی و جێگای خۆیان کردۆتەوە، بەشی یەکەمی (بەرگی سێیەم) یش کە بریتیە لە بابەتی هەموو جۆر، ئەویش لەگەڵ ئەم بەشە هاوکات بڵاودەکرێتەوە. هەر چواربەش پێکەوە لەسەر یەك زۆر حەکایەت و بابەتی هەمەجۆر یان لە نێوچوون رزگارکردو زۆربابەتی نەوازەشیان بۆ یەکەم جار گەیاندە چاپ و بڵاوکردەوەو خستە بەردەستی خوێندەوارو لێکۆڵەرەوان. کە ئەگەر بە ووردی بخوێندرێنەوە، ئەوا نرخی ڕاستەقینەی خۆیان دەردەخەن.

وەك دەبینن ئەم (چواربەشە) بەرهەمی دووساڵی خوێندن و تەنیا دوو قۆناغی بەشی زمانی کوردییە: ئەویش بەبیّ بەرنامەو لەخۆوە ! !

باشــە ! ! ئەگــەر بــە شــێوەیەکی فــەرمی هــەموو بەشــە کوردییــەکانی زانکۆکــانی کوردســتان و پەیمانگــەکان ســاڵانە وەك ئــەرکی وانــەی بــە کــردەوە، هــەموو ســاڵی و هــەموو بەشــەکان و هــەموو قۆناغــەکان لەســەر بەرنامەیــەکی دارێــژراودا بەرهــەمی فۆلکلــۆری و کلتــووری کوردەواریــان کۆبکردایــەوە، ئێســتا هــەر خــوا دەیزانــێ چ بەرهــەمێکی زۆر و چ بابــەتێکی هەمەجۆر خۆیــان لــە نێــو بــەرگ و بەشــە جیاجیاکانــدا دەدۆزیــەوە کــە دەبــوون بــە کەرەســتەیەکی لــەبن نــەهاتووی خــاو بــۆ لێکۆڵینــەوەی زۆر لایــەنی ژیــانی کردەواریمــان. کــە لــە ڕاســتیدا ئەگــەر زۆریــش درەنگــە، کــە ئــەم بــە فــەرمی کردنــی کۆکردنــەوەی فۆلکلــۆرو کلتــوری کــوردەواری لــە نێــو بەشــە کوردییــەکان دەبوایــە هــەر لەگــەڵ دامــەزرانی بەشــی کــوردی لــە زانکــۆی بەغــداو دواجــار سلێمانی و زانکۆکــانی تــر ئــەم (وانــەی بــەکردەوە) بەشــێك بوایــە لــە ئــەرکی ســاڵانەی قوتابیــانی بەشــی زمــانی کــوردی، خــۆ ئەگــەر لــە دوای ڕاپــەڕینی ســاڵی ١٩٩١ یــش ئەمــە کرابوایــە. هــەر باشــتر بــوو، ســەیر کــە لــە ئــەم پــەنجا ساڵەی ڕابــردوو دەتــوانرا چ کارێــك بکرێــت ! ؟ بــەم کارنــەکردن و بــەم هــەموو گــۆڕان و وێرانیــەی بەســەر کوردســتاندا هــاتووە، تــۆ ســەیر دەکــەی چ دەریایــەك بەرهــەممان لێ فــەوتاوە، کــە قــەرەبوو کردنــەوەی کارێــك نیــە بکــرێ، ئــاخر هــەر ناوچــەیەك وێرانکرابــێ و هــەر گونــدێك تێکــدرابێ و هــەر پیرەمێــردوو پیرەژنێــك کۆچــی کردبــێ، لەگــەڵ ویرانکــردن و تێکــدان و مردنــی هەریــەك لەمانــە بەشــێك لــەو فۆلکلــۆرو زانیارییانــە لــە نێــو چــوون ! ! بــەڵام، گــرنگ ئەوەیــە کــە چیتر دەســتەو ئــەژنۆ بــەدیار ئــەو لــە نێــو چــوو - انــە دانەنیشــن و قــەرەبووی ڕابــردوو بــەکارکردنی داهــاتوو بکەینــەوە، هــەر ئێســتا درەنگــە و درەنگــیش نیــە ! ! لایەنــە پەیوەنــدی دارەکــان پێویســتە لــە ســەریان (وانــەی بــەکردەوە) لــە تــەك خوێنــدنی تیــۆری بخەنــە نێــو بەرنامــەی خوێنــدنی ســاڵانەی هــەموو قۆنــاغ و هــەموو بەشــە کوردییــەکانی زانکــۆو پەیمانگــەکانی کوردســتان کــە ســاڵانە بەبەرنامەیــەکی زانســتی و بەکەرەســتەی پێویســت مامۆســتاو قوتابیــان ئــەرکی فــەرمی ســاڵانەی خۆیــان جێبــەجێ بکــەن و لێژنــەی ڕێکخســتن و چــاپ و بلاوکردنــەوەی بــۆ دابنــدرێ و بکرێــت بەبەرنامــەی

سالأنەی داهاتوو. ئەگەر لەسەرەتاوە ئەمە کرابوایە ئێستا چ بەرهەمێکی زۆرو زەوەندو بەنرخمان لەبەر دەست دەبوو! کە ئەمە نەکراوە هیچ!! باشە ئەگەر هەر ئێستا دەستمان پێکرد، پاش دە ساڵی تر چ بەرهەمێك کۆدەبێتەوەو چ کارێك دەکرێ!؟.

بەو هیوایەی لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەم (وانەی بە کردەوە) لەبەشەکانی زمانی کوردی بچێتە نێو بەرنامەی سالأنەی خوێندن و ئەم کارانە بگرێتەوە:-

١- کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردەواری لە هەموو ناوچەکانی کوردستان و بە هەموو زاروبنزارەکان و هەموو بەشەکانی فۆلکلۆر بگرێتەوە.

٢- باسکردن و وێنە گرتنی هەموو کەرەستەو کلتووری کوردەواری لە هەموو ناوچەکان و بە هەموو شێوەکان.

٣- نووسین و کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی ناو و مێژووی هەموو گوندو چیاو دۆڵ و ئەشکەوت و کانی و مەزارو هەموو شوێنە جوگرافیەکانی کوردستان.

## با (خەڕەك)* مان لە كارنەكەویٚ !!

ئەفسانە بەقەد ئەوەی وەك ناوەڕۆك دەوڵەمەندە و پڕ لە گەوهەری یەكدانەیە، ئاواش وەك (زمان) پڕاو پڕە لە وشەو ناوو ئیدیۆم و ڕستەو وێنەی بێ وێنە، هەر لەبەر گرنگی زمانەكەشە وا پێویست دەكات فۆلكلۆر بە گشتی و ئەفسانەو حەكایەت بە تایبەت بە زمانی كوردی و بەشێوەزارەكەی خۆی كۆبكرێتەوەو دەسكاری نەكرێت، نەزاروبنزارەكەی بگۆڕیٚ و نە بە وەرگێڕاویش بۆ یەكەمجار بڵاوبكرێتەوە، چونكە ئەگەر یەكەمجار بە زمانی كوردی و ئەو زارو بنزارەی پێی دەگێڕدرێتەوە، كۆبكرێتەوە ئەوا سەرمایە زمانیەكە دەپارێزێو لە نێو ناچیٚ، بەڵام! ئەگەر هەر لە سەرەتاوە جاری یەكەمی بڵاوكردنەوەی دەقەكە وەرگێڕدرایە سەر زمانێكی تر! ئەوا بەشە گرینگە كەی زمان دەدۆڕێنیٚ و ناوەڕۆكەكەی دەمێنێتەوە ،كە هەندێجار ناوەڕۆكیش پەیوەستە بەزمانی دەربڕینەوە.تا ئێستا زۆر جار ڕویداوە ئەفسانەو حەكایەتی كوردی كۆكراونەتەوە و وەرگێڕدراونەتە سەرزمانێكی تر و دەقە ڕەسەنەكەیان - ئێستا- لەبەر دەست دانیە !

بۆ میللەتێكي وەكو ئێمە كە زیاتر لە هەزارساڵە لەچوار لاوە زمانەكەمان قەدەغەو ناشرین دەكریٚ و ڕێگەی گەشەكردنی لێگیراوە، كۆكردنەوەی فۆلكلۆر بە گشتی و حەكایەت و ئەفسانە بە تایبەتی كارێكە دەبێت بە شێوەیەكی ڕێك و ئەكادیمیانە بكریٚ چونكە ئەگەر دەقی نووسراوی كۆنمان كەمەو لە ئاستی نەبوون دایە، ئەوا فۆلكلۆر ریشەی كۆینییەكەی خۆی پاراستووەو زۆر وشەو

---

*خەڕەك: خڕەك، خڕیلە. بە پیٚ ئەم ئەفسانەیە، خەڕەك ئەو خڕیلەیە كە (داو، بەن، پەت)ی شەوو ڕۆژی لیٚ ئاڵاوەو بە بادان و هەڵكردنەوەی ئەم بەن و داوە لە سەر خەڕەك شەوو ڕۆژ دێن و دەچن و پیرەمێردیش میری (خەڕەك)ەو سوڕان و وەستانی بە دەست ئەوە. خەڕەك واتە زەمەن! كە هەندێجار بە فەلەك و جەرخ و فەلەكیش ناو دەبردریٚ، زانایانی فەلەكناسی دەتوانن سوود لەم بابەتە ئەفسانەییانە وەربگرن، چ وەك بابەت، چ وەك ناو.

نـــاوو ئیـــدیۆم و دەســــتەواژەو وێنـــەی کـــۆنی لەگـــەڵ خۆیـــدا هـــەڵگرتووەو گەیاندوویەتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ!.

لـــە گوڵبـــژێرێکی کـــورت و ســـەرپێی ئـــەم بەرگـــەی تێـــر نـــەخۆرە چـــەند نـــاوێکی ناوازەمـــان کەوتەبـــەر چـــاو کـــە دەکـــرێ بـــە هـــەموو زانســـتەکانی وشـــە ناســـی و زمانناســـی لێیـــان بکۆڵدرێتـــەوە، ئـــەوا جگـــە لـــە پێکهاتـــەو لیبکـــدان و دارژتنیـــان، نـــاوەڕۆك و ماناکانیشـــیان بابـــەتی گرنگـــی لێکۆڵینـــەوەو بـــەدوا داچـــوونن! بـــۆ نموونە:-

- داودانگ : ناوی کوڕێکە کە بە شێوەیەکی سروشتی لە دایك نەبووە.
- ڕست: ناوی – کوڕ– گەنجە.
- ڕەعبۆم : ناوی کوڕە.
- کـەڕۆ: نـاوی منداڵـە (مـن لـە بیرمـە کـە منـداڵ بـووم لـە گونـد سـەگێکمان هەبوو ناوی (کەڕۆ) بوو!
- لێرە کەڕۆ ناوی کوڕە.
- دوگنەچـارە: نـاوی کچـێکی ناشـیرینە، کچـی زڕدایکـی کچـە جوانەکەیـە، بەقەد ئەوەی ناشیرینە، کردەوەکانیشی نارێك و ناپەسندن.
- خوبیار: ناوی پیاوە.
- ڕۆزمار: ناوی کچە.
- خاکمار : ناوی کوڕە.
- قڕانی گاور: ناوی شارە.
- ئەحمەد وەی خڕ: ناوی کوڕە.

ئـەم ناوانـە جگـە لـەوەی لـە نێـو ئەفسـانە و حەکایەتـەکان نـاوی کەسـانێکن پێیـان دەناسـرێنەوە، لـە دروسـتکردن و لێکـدان و داڕشـتن و هـەڵگرتنی مانـاش. گونجـاو شـیاون بـۆ کەسـەکان، ناولێنـان لـە ئەفسـانە بـە تایبـەت و فۆلکلـۆر بـە گشـتی بـێ لایـەن نیـە! نـاویش ئـەرکی خـۆی هەیـە، ئەمانـە چـەند نـاوێکی بـە ژمـارە کـەمی

کەسەکانن، ئەگەر لە نێو ئەفسانەدا ناوی (دێو) و (پەری) و (باڵندە)و(ئاژەڵ)و (بەستەزمان)ەکان و ناوی (شوێن) و (گوند)و (شار) و (چیا) و (رووبار) و (باغ) و (ئەشکەوت) و (دارستان) و (بیابان)ەکان کۆبکەینەوە، ئەوا خەرمانەیەکی دەوڵەمەندی ناوی کۆنی زمانی کوردی تۆمار دەکەین، کە بۆ خۆی بەشێکە لە کەرەستەی کۆن و بێ وێنەو گرنگی زمانەکەمان، کە ئەگەر بە زانستی وشەناسی و (ناو) ناسی لێیان بکۆڵینەوە، ئەوا ئەو ناوانە هەریەکەو دەگەڕێتەوە سەردەمێکی مێژوویی و هەرێمێکی جوگرافی و باوەڕێکی ئایینی میللەتەکەمان، کە زۆر جار وشەو ناوو دەستەواژەکان مانای ئایینی، ئایینی جیاجیا لە نێو خۆیاندا هەڵدەگرن. بۆ نموونە: ئەگەر لە دوو جێگای جیا، یان بە دوو شێوەی جیا باسی (گیا) کراو گوترا (ئەم گیایە خۆڕسکە) ئەوا لە نێو ئەم ڕستەیەدا فەلسەفەیەك هەیە، کە هێز دەدات بەشتەکان خۆیان، واتە گیا کە هەر بۆ خۆی و لە خۆوە ڕسکاوە! و هێزی بوون و مانی لە خودی خۆی دایە. خۆ ئەگەر گوترا: ((ئەم گیایە خوا کردە)) ئەوا لێرە لەم ڕستەیەدا فەلسەفەکە دەگۆڕێ و هێز لە گیاکە دەسێنێتەوەو گیاکە دەکات بە نموونەو هێزی بە خودا– واتە ئەوە خودایە گیای دروستکردووەو کردوویەتی بە شت، گیاکەش نیشانەیەکی بچووکی بوون و هێزی خودایە لە نێو ئەم جیهانە پڕ (شت)ە، واتە گیاکە شتە بۆ سەلماندنی بوونی خودا. نەك بۆ بوونی خودی خۆی لێرە گیا (خود)ێکی بێ خودەو بە (خودا)یە! تۆ لە (گیای بێ خودا) و (خودای بە گیا) گەڕێ!! سەیری (خود)ی زمان بکەو ببینەو بزانە چ زمانێکی خاوەن (خود)ەو چ خودێکی بەهێزە لە دەربڕینی ڕستەی پشت لەیەك و پڕ (باوەڕ) و (بێ باوەڕ) و پڕاوپڕ لە (فەلسەفە)، فەلسەفەی (جوانی دەربڕین)و (تەواو دەربڕین). لە سەرەتادا (وشە) بوو! وشە لە نێو (ئەفسانە) دا بوو، ئەفسانە پڕاو پڕبوو لە (فەلسەفە) فەلسەفە باوەڕبوو، باوەڕ بەردەوام لە (گۆڕان) بوو، گۆڕان بە هێزی پڕ هێزی وشە بوو، وشە لە نێو (زمان) دابوو، زمان بەرهەمی یێکانەو تایبەتی ( مرۆڤ) بوو، لەسەرەتادا مرۆڤ بوو، (سەرەتا)

بیّ سەرەتاو (زەمان) بوو، لەو سەرەتای بیّ سەرەتاو زەمانە. با ئیّستا لە جوانیەکانی (ناو) لیّنانەوە بگویّزینەوە بۆ ماناکانی دەربڕین، ئەو دەربڕینانەی پڕاو پڕن لە جوانییەکانی فەلسەفەو زانست، فەلسەفەو زانستی نیّو زمان.
سەیری ئەم ویّنەیە بکە (کابرایەك دەمی بە رووبارێوە نابوو، رووبار هەمووی دەهاتە نیّو دەمی کابرا! کەچی کابرا هیّشتا هەر هاوار دەکات خنکام لە تیّنان) ئەریّ ئەو کابرایە کابرایەکی کابرایە!؟ رووبار بە هەموو رووباری خۆریەوە هەڵدەلوشیّ وهیّشتا هەر تیّنووە! یا ئەوەتا (کابرا) و (رووبار) و(تیّنویّتی) و (تیّر ئاو نەبوون) هیّمان بۆ شت و رووداوی تر!؟ ئەگەر لیّرە کابرا تیّر ئاو نابیّ! بابزانین ئەو لە برسان مردووە هیّمای چ شتیّکە؟ (گەیشتنە ئاشەکی، ئاش دەگەڕاو گەنمی دەکردە ئارد، تەمەشای کرد بە حەوت ژنان ئاردیان دەکردە هەویر، بەحەوتانیش هەویریان دەکردە نان، بە حەوتی تر دەیانبرژاند، حەوتیش دەیانکردە پاروو ئەیاندایە کابرای، کەچی کابرا هیّشتا هەر هاوار دەکات، لە برسان مردم!) ئەریّ ئەو کابرا تیّر نەخۆرەیە، ئەویش کابرایەکی کابرایە! یان ئەوەیە (کابرا) و (برسیەتی) و (تیّر نەخواردن) ئەوانیش هیّمان بۆ کەس و رووداوو حاڵەتی تر؟! ئەریّ ئیّستا تۆ دەتوانی چاو بە دەوروبەرو وڵات دنیای خۆت نموونە بۆ ئەم هیّما ئەفسانەییانە بدۆزینەوە؟.

ئەگەر (کابرای تیّنوو) بەرووبار بڕی ناشکیّ و (کابرای برسی) بە ئاشەکی تیّر نەخوات و دواجار ئەمانە لە نیّو دەقی ئەفسانە حاڵەتەکان دەگۆڕین وخزمەتی ئامانجەکانی پاڵەوان دەکەن! بابزانین پەری: ئەو پەرییە ناسك و جوانە، خاوەنی چ (باڵ)ێکە، باڵی فڕین! ئایا باڵی پەری باڵی خۆیەتی بەجەستەیەوە نووساوەو باڵی باڵندە ئاسایە؟ یان (باڵ)ێکە بەرگ ئاسا لەبەر دەکریّ و لەبەر دەکریّتەوە؟ (پەری خۆی رووتکردەوەو جل وبەرگ و باڵەکانی لەویّ دانا) ئەریّ ئەو باڵە زیهنی ئیّمە بۆ کویّ دەبات؟ ئەریّ ئەو باڵە باڵی جەستەییە؟ یان باڵیّکی دەستکردەو بەرهەمی زانستە؟ پەری ناسك و جوانیش، پەرییەیان!

کچە کچێکی جوان و ناسکەو خاوەنی (باڵی فڕین) یا ڕاستتر (ئامرازی فڕین)ە وەك ئەوەی ئێستا مرۆڤ، مرۆڤ تاك بە زۆر شێوە تەنیا و تاك لە ئاسمان دەفڕی و کەدێتەوە سەر زەویش (باڵی فڕین) ئامرازی فڕین لەبەر خۆیدا دەکەنێ! ئایا ئەو باڵی فرینەی پەری، هەر خەیاڵێکی لەمێژینەی پێشینەی مرۆڤە! یان ئەوەتە ئەو باڵی پەرییە! ئەو باڵی فڕین، ئامرازی فڕینە بەرهەمی زانستی ڕۆژانێکی زووی مرۆڤایەتییە؟ ئایا مرۆڤ لە ڕابردوو بێ زانست بووە؟ ئایا ڕابردوو مانای نەزانی و بێ بەرهەمی زانستی مرۆڤ دەدات؟ یان ڕابردووش زانست و بەرهەمی خۆی هەبووە؟ بەڵێ! ڕابردوو زانستی خۆی هەبووەو (باڵی فڕین)یش ئامرازێکی فڕین و بەرهەمێکی ئەو زانستەیە! ئەگەر ئێستا – باڵ– ەکە بۆ خۆی لەبەر دەست نیە! ئەوەتا دەنگ و باسی ئەو (باڵ)ە لە نێو ئەفسانەو لەوێنەو نەخشە کۆنەکاندا ماوەتەوە. ئەمەش ڕێگای ئەوەمان بۆ خۆش دەکات کە بڵێین: باڵی پەری بەرهەمێکی زانستییە ەو خودی باڵەکە نەماوە، بەلام، لە نێو ئەفسانەو بە شێوازی ئەفسانەیی باس دەکرێ.

ئەگەر پەری بە باڵ دەفڕێ و دەنیشێتەوە! ئەی ئەم دەنگ لە کودیلەکردنە چییە؟ (پیرەژنە سیحر بازەکە کودیلەی پڕ کرد لە دەنگی خۆی و کچەکان بانگیان دەکردو کودیلە وەلامی دەدایەوە) باشە ئەمەش هەر تەنیا خەیاڵە؟ یا ئەوەتە هونەرو زانستێکەو ئامێری دەنگ هەلگرتن و تۆمارکردن و قسەکردنی داهێناوە! ئایا ئەوە هەر کودیلەی کودیلەیەو پڕ دەنگ کراوە؟ یا ئەوەتە ئامێرێکی دەستکردەو وەك هەر ئامێرێکی تری زانستی توانای دەنگ تۆمارکردن و وەلامدانەوەو قسەکردنی هەبووە: ئایا پیرەژنی سیحرباز! ناکاتە مرۆڤێکی زانا، ئایا سیحر بە جۆرێك لە جۆرەکان – زانست– نیە؟ بازانستێکی ڕەشیش بێت، وەك دەڵێن. کە پیرە ژن مرۆڤەو سیحریش زانستە! ئەی کەواتە پیرەژنەکە زانا نیە! باشە کەزانا بێ، ئەستەمە بتوانی ئامێرێکی قسەکردن دروست بکات؟

باشـه ئـەوا کودیلـە، کودیلەیـەو پـڕ لـە دەنـگ کـراوە، کـێ پـڕ لـە دەنگـی کـردووە؟ پیرەژنـە سـیحربازەکە! واز لـەم پیرەژنـە سـیحربازە بێنـە، دەی ئـەو پـیرە مێـردە بـەو خـەرەك بادانـە چـی دەکـات؟! (پـیرە مـێرد دوو خـەرەکی ڕەش و سـپی لابـوو، بایـدەدان، بـەوەش شـەو و ڕۆژ دەگـەڕا. پاڵـەوان داوای لـە پیرەمێـرد کـرد خـەرەکی شـەوێ ڕابگـری و لێنەگـەڕی ببێتـە ڕۆژ هـەتا ئـەو دەچـی کارەکـانی خـۆی دەکـاو دەگەڕێتـەوە! لەسـەر خواسـتی پاڵـەوان خـەرەکی شـەوێی ڕاگـرت و لێنەگـەڕا ببێتـە ڕۆژ تـاوەکو پاڵـەوان کارەکـانی خـۆی تـەواو کـردوو گەڕایـەوە! کـە پاڵـەوان گەڕایـەوە، پیرەمێـرد گـووتی! بۆچـی هێنـدە دواکـەوتی؟ ئێسـتا نوێـژی نیوەڕۆیـە!) ئـەوەی لێـرە گرنگـە پیرەمێـرد خـەرەکی شـەو بانـاداو شـەو ڕادەگـرێ! بـەڵام وەك دواجـار لـە قسـەی پیرەمێـرد دەردەکـەوێ. کـە ڕوو لـە پاڵـەوان دەکـات و دەڵـێ: ((دواکـەوتی ئێسـتا نیـوە ڕۆیـە)) ئـەوە ئاشـکرا دەبـێ، کـە پیرەمێـرد ناوچـەیی و هـەر بـۆ پاڵـەوان شـەو لـەو جێگایـە ڕادەگـرێ، کـە پاڵـەوان پێویسـتی پێیـەتی! دەنـا لـە ڕاسـتیدا زەمـەن ڕاناوەسـتێ، ئـەوەتا کـە پاڵـەوان کارەکـەی تـەواو دەکـات و پیرەمێـرد خـەرەکی شـەوێ دەخاتـەوەکار، دەبینـێ ئـەوا لـە مێـژە شـەو کۆتـایی هاتووەو ڕۆژ بووەتە نیوەڕۆ.

ئـەرێ ئـەوە پیرەمێـرد خـاوەنی چ هێزێکـە، کـە دەتـوانی (شـەو) ڕابگـرێ!؟ ئـەرێ بـە ڕاسـتی شـەو ڕادەگـرێ، یـا ئـەوەتا ئیحساسـی شـەو ڕاگـرتن لای پاڵـەوان دروسـت دەکـات! ئـەرێ بـە ڕاسـت ئـەوە پیرەمێـردە خـەرەك بانـاداو شـەو ڕادەگـرێ، یـان ئـەوەتا زەمـەن ڕاوەسـتاوە؟ ئـەرێ ئـەم کـارە کـارێکی فەلـەکی و فیزیاوییـە؟ یـان ئیحساسـی پاڵـەوان وەك فەلـەك ڕاوەسـتاوە؟ یـان زەمـەن لـە نـاوەوەی پاڵـەوان ڕاوەستاوە؟.

باشـە! ئـەوە زانسـتەکانی فەلـەکی و پاراسـایکولۆژین لـە واقیعـدا کـار دەکـەن؟ یـان ئـەوەتا (زمـان)ی ئەفسـانەیە لـە (خـەیاڵ)دا (زانسـت) بەرهـەم دێنـێ!؟ ئـەرێ ئـەوە هـەر بـە تـەنیا خـەیاڵی ئەفسـانەیە شـەوی ڕاگرتـووە؟ یـان ئـەوەتا زانسـتی

دەستکردی مرۆڤەو وەك كەرەستە لە بێن چووەو دەنگ و باسەكەی لە نێو ئەفسانەدا ماوەتەوە؟ باشە ئەوە زمانە زانست لە نێو ئەفسانەدا (نەمر) دەكات؟ یان ئەوە ئەفسانەیە لە ڕێگای زمانەوە زانست دادەهێنیێ؟!.

دواجار ئەفسانە زەمینەیەكی پڕ لە بابەتەو هەر بابەتەی چاوەڕێی چەندین لێكۆڵەرە بۆ ئەوەی هەر لێكۆڵەرەو لە ڕووی پسپۆڕی خۆی لێی بكۆڵێتەوە، ئەفسانە ڕێك وەك ئەم (كەونە)ە وایە، بەشێكی بەردەستەو بەرچاوەو ناسراوەو زانراوە، بەشێكی لە مەودای خەیاڵ و وێناكردن دایە، بەشی گەورەش چاوەڕێی دوا ڕۆژە، دوا ڕۆژی زانست و زانین و گەڕان. گەڕانی مرۆڤ، مرۆڤی زانا بە دوای ئەو زانست و نهێنیانەی كەخۆی داهێنەریەتی، گەڕان بە دوای ئەفسانەداو گەڕان بۆ ئەوەی (خەڕەك) لە گەڕ نەكەوێ!؟ گەڕانی خەڕەك كاركرنە! لەهەر بوارێكدا كارمان نەكرد، خەڕەكی ئەو بوارەمان لە كار خستووە.كەواتە با كاربكەین تا خەڕەكمان لە كار نەكەوێ.

مەولود ئیبراهیم حەسەن
٢٠٠٨/٨/٢٢
هەولێر

# ئەفسانەی ((دویێت و خرس))

**کۆکردنەوەی: هەڤال محەمەد عەلی**

**گێڕانەوەی: کامەران لەتیف عزیز**

**(بەشێوەزای فەیلی)**

ڕۆژێـک لـە ڕۆژان چـەن دویێتیـک و چـن ئـەرا چـیلك هـاوردن وەخـتی چـیلك کـەن و تێنـەو یـەکێك لـەلیان میـنـدە جییـە و کەفـدە دەس خرسـیگ، خرسـە گـیش بـر دەی خـەدەی نـاو مغاریـك و کوچـگیگ گـەورا نـەدە قەییـەوە تـا دویێتەگـە نـەواد چـەند مـدەیگ وەپـی چـد دویێتەگـە بـوو دە خـاوەن سێ بەچـکە خـرس لـەلی. ڕۆژێـك تێـد شـوانێك لـەورە وریکـەد دویێتەکـە چـڕدەیی و هاوارکـەد مـن دویێـت فلانـە کەسـم لـەی ئاواییـە بچوو خـەوەر بییـە مـاڵ بـاوگم بیـوش دویێتەگـەدان مایـە و هانـا و ئـەی مغـارە و خـرس بردیـە سـەی بـان دەرم بکـەن و کـەل و پـەل ئـەوان بـارم چـونکە کـەل و پـەل نـی یـە وەرم، شـوانەگەش چـت خـەوەر دەدە مـاڵ بـاوگ دویێتەگـە، ئـەوانیش وە ئەسـپە و ئـەرای دەرچـن، تـێن ئـەرا دەر مغارەگـە و هەرچـی تەقـەلا کـەن نێتـوێنن کوچـکەگە لاوەن و دویێتەگـە دەربکـەن، ئیجـا هیـوچ ئـەرایان نـەکریا، ژنەگـە ووتـە بەچـکەگانی ئـەی کوچـگە لاوەن تابچـم خـوارن ئـەرا دان بـارم، ئـەوانیش پاڵنەنـە کەچـکەگە ولاوانـەی یـو دایگیـان شـێدە دەیشـت، کـەل و پـەل کەنـەوەری و سـوار ئەسـپی کـەن و تێرنـەی ئـەرا مـاڵ. نزیکـەی خـۆراوە خرسـەگە هـات ئـەرا نزیـك ئـاوایی و هـاوار کـرد بابـا دەو ژنەگـەم ئـەرا نـاو بەچـکەگان، ژنەگـەیش نەچـی ئـەرا لای، خرسـەگیش بـانگ ژنەکـەی کـرد و ووت بابـاد مناڵـەگان بـەش بکـەین ئـەویش چـی ئـەرا لای، خرسـەگە لـە سێ مناڵەگـە یـەکیگی بـرد و ئـەرا خـۆی یـەکیگی دا ژنەگـەی و یەکەگـەی تریـان کـردە جفـتی کوتـە و کـوتیگی ئـەرا خـۆی و مناڵەگـە چـی ژنەگـەیش ئـەو مناڵـەی کـە کـەفتیودە وەر بەشـی کوشـتەی ووت ئەیە بمیندەوەی بووتگمان بڕدەو.

– بیرۆکەی ئەم ئەفسانەیە لە نێو هەموو میللەتاندا هەیە.

((پیاو و شێرێك))

دارستانێك ئەبێ شێرێك ساحێبیەتی، هەرکەس بڕوا داری لێ ببڕێ، شێرەکە دەیخوات. ڕۆژێك کابرایەك سەرما زۆری پێ دەگەیەنێ و دەڕوات داری لێ دێنێ شێرەکە مۆڵەتی دەداتێ کە داری لێ ببڕێ، پێ ی دەڵێ ئەم نیوەڕۆیە میوانی منی. کاتێك کە نان دەخۆن کابرا لووت قرچ دەکات، شێرەکەش دەڵێ یان دەتخۆم یان ڕاستیم پێ بڵێ بۆ لووتت قرچ کرد؟ ئەویش ڕاستی خۆی پێ دەڵێ و دەڵێت بۆنی دەمت هات. شێرەکە سەری بۆ دادەنێ و دەڵێ بەو تەورەی دەستت بە هەموو قەوەتت تەورێك بدە بەسەرما، کابرا ناچار دەبێت تەورەکەی لێ دەدات و زامداری دەکات جێ ی دەهێڵێ و دەڕوات. پاش ساڵێك کابرا بۆ دار بڕین دەڕوات بۆ دارستانەکە، شێرەکە پێ ی دەڵێ بێ سەیری سەرم بکە بزان زەنگی پێوەیە، کابراش سەیری دەکات و دەڵێ نەخێر، شێرەکە دەڵێت جێگای تەورەکە نەماوە بەڵام جێگەی قسە ناخۆشەکەت هەر ماوە لە دڵم، بۆیە پەلاماری کابرا دەدات و دەیخوات.

- لەم حیکایەتەی گیاندارانەوە پەندی کوردی دروست بووە.
**کەدەڵێ: سارێژ دەبێ جێگای خەنجەران، چا نابێتەوە جێی کەسەران.**

((باوك و کچێك))

کابرایەك هەبوو هەر کاتێك کەسێك بهاتایەتە خوازبێنی کچەکەی، مەرجێکی بۆ ئەو کەسە دانابوو، مەرجەکەش ئەوە بوو دەیپرسی ((ئاو وەختێ دەکوڵێ دەڵێچی؟)) چەنەها کەس هاتن نەیانزانی وەلامی مەرجەکە بدەنەوە.ڕۆژێك کچەکەی دڵی لە کوڕێك دەچێ و دەڵێ بێرە خوازبێنیم کوڕەکەش دەڵێ مەرجی باوکت قورسە، کچەکە مەرجەکە نازانێ، بۆیە ڕۆژێك خۆی دەکات بە نەخۆش، دەڵێ بابە تا نەمردمە پێم بڵێ ئەوە چی یە با نەبێ بەداخ لە دڵمدا، بابەش

دەڵێ باشە کچم ئەوە دەڵێ ((ئەگەر ئاوی باران نەکەمە بنی دار ئەوا داریش ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆمی پێ نەدەکولاَن)). کچەکەش وەلاَم دەدا بە کوڕەو کوڕەکەش دێت بۆ خوازبێنی، بابەکەش مەرجەکەی پێ دەڵێ، کوڕەکەش دەڵێ زۆر ئاسانە ئەوەیە دەڵێت ئەگەر خۆم نەبوومایە بەباران و دارم سەوز نەکردایە ئەوا داریش خۆمی نەدەکولاَن، باوکەکەش دەڵێت ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان قسەی خۆمم لای کچەکەی خۆم نەکردایە ئاوهام بەسەر نەدەهات بڕۆ کچەکەمت پیرۆزت بێت.

– ئەگەر دزو خاوەن ماڵ یەك بن، گای لە کونێ دەبەنە دەرێ.

((چارەنوویس))

وەخت خۆی ڕوژێك بوود ماڵیگ لە دوویر ئاوای ماڵ خسنە. ڕوژێك کوڕ پاشا چد کولّ لە لیان گرت دوینەد ژنەگەیان منالّیان بییە و دوێتیگە، چارەنوویس تواد چارەی بنوویسند لەبان تویلّ دوێتەگە نووسیسند ئەی دوێتە بوودە ژن کوڕ پاشا، کوڕگەش ڕوژێگ فرسەت لەلی تێردو منالّەگە دزدو زگی دڕ دوو خەدەی بان سلّکوان، دالّگ منالّەگە دوینەد منالّەگەی لەبان سلّکوان کەفتیە چد تێردەی و بەدەی دختۆر و زگی دویرندە و تێردەوەی. لە دوای مدەیگ دوێتەگە گەورە بوود و چد دار بارد، ڕەفیقەگانی چنە و خۆی وەتەنیا مندە جییە و چیلگەگەی قورسە لە و وەختە کوڕ پاشا تێد ئەدا شکار بکوشد دوێتەگە دویندەی شەرمی تێد و چدەگژ داریك. کوڕ پاشا تێد لە سایکی دارەگە ئەسپەگەی بەستەدەو و هەلاَژییەد، دەم و چەوی ڕووی لە عاسمان بوود تکەیك لە عەسر دوێتەگە کەفدە بان دەم و چەو کوڕ پاشا کوڕ پاشایش هیوش بنیادەمی، بنیادەم زای بەوە خوار هیوچ وە پید نێکەم، دوێتەگەش هیوشد بیویش وە شێرمادەرم وەڕەنج دەرم هیوچ وە پید نێکەم، کوڕ پاشایش وەعد دە دەپێ، دوێتەگەیش تێدە خوار، کوڕگەیش سوار ئەسپەگەی کەدو بە دەوەی ئەرا ماڵ خۆیان،

کوڕگـەهیو شـدە دایگـی دوێـت خسـیگ هاوردمـە بـوەرەی حـەمام و بشـورەی و کـەل و پـەل جـوان بکـەوە وەری، دایگەگـەیش وەقسـەی کوڕەگـەی کـەد. دوێتەگـە لـە ماڵیـان کـار ئـەرایان کـەد، کوڕەگـە دڵـی چـدەلی و هیوشـدە دایگـی ئـەی دوێتـە خـوازم ئـەرا خـۆم و قسـمەتی خۆمـە،دایگەکـەش هیـو شـید کوڕەگـەم ئەیـە عەیبـە جۆجـا عالـەم قەشمـەری وەپیمانکـەن و هیـو شـن کوڕپاشـا دوێـت گاوانیـك هاوردییـە، گوڕگـەیش وەقسـەی دایگـی نێکـەدو دوێتەگـە ئـەرا خـۆی خـوازد، دەهـۆڵ و زوڕنـا ئـەرای تێـرد و زەماوەنـد ئـەرای کـەد: لـە ئـاخر وەخـت چنە غورفـە و کوڕەگـە دوینـد زگ دوێتەگەشـون تەقـەڵ هاپیـە و کوڕەگـە هیوشـد ئەیـە چـەس زگـت لـەواپی هاتییـە دوێتەگـەش هیوشـد وەخـت خـۆی وە منـاڵی دز بردییـە سـەم و لـەوا پـیم کردییـە و فـرەم دایـە سـەبان سـڵکوان، کوڕەگـەیش هیوشـدە پـێ ئـەوە مـن بیم لەوا پید کردم تا قسمەت تو ئەرا من نەود، ئاخری هەربی.

– ئەم جۆرە حیکایەتەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە قەدەر رەتنابێتەوە.

((پیاویگ))

روژیـگ پیـاویگ چـد ئـەرا یـان ئـاو کـز کـز دانیشـد فـرە قـەحر دار بییـە چـوینکە نـان نـەیرد بـووەد ئـەرا مناڵـەگانی. لـەو بـەر ئاوەگـەوە خریسـگ خـۆی کردییـە سـە ئایـەمیگ تێدئـەرا لای پیاوەگـە و هیوشـدە پـی ئەیـە براگـەم چـەنەی چـەن سـاڵە مینـەی تـو کـەم، لـە ژێـر زەوی ئـەرات گـەردم تـو هایـدە بـان زەیـو، بچـوو مناڵگانـت بـار لـەی مـاڵ منـە بکـەن و بخـۆن. پیاوەگـەیش چیـەو ئـەرا مـاڵ تـا مناڵگـانی بـارد، دایـگ مناڵگـان قـەبوڵ نـەکرد مناڵگـان وەل خۆیـە و بـوەد، وتـە پـی ئەیـە چـەنیگە ئـەرا خۆیشـگت نـەها نییـە سـە ئـیرە، ئیسـە هیوشـد خۆیشـگ دیـرم، خـۆت بچـوو ئیمـە وەل دەو نێتـێین. پیاوەگـەیش چـد ئـەرا لای خرسـەگە و، خرسـەگەیش دەسـتی گـرد و خـەدەی بـان شـان و بـەدەیی، وە ناوچـەن چـوەلێگە و بـەدەیی و بـەدەی نـاو مغـاریگ و بـەڕی نـەدا قـەی قاپیەگەیـە و تـا پیاوەکـە نـەواد و خۆیشـی دەرچـد و چـد مینـەی ئایـەم کـەد بـارد بخـۆ دەی، پیاوەگـە دوای ئـەوە خرسـەگە چـدوە نـاو خانیگـە گـەردت، کـەل و پـەل و سـەر ئایـەم دوینـد لـەو ناوەکەفتـە.

خرسـەگە تێـدە و قاپییەگـە دەدەلاوهیوشـد بـوون ئایـەم زادە تێـد لـە ماڵگـەم و هیوشـد چـاخد کـردم نـەخوردم یەسـە لـە داخـت مـردم، پیاوەگـەیش چدە نـاو کـە نـویگ و خـۆی شـاردەو، خرسـەگیش هـات بـان کەنوێگـە لاوردو خوڵمانـەوەی و قـەب گـردە لـی، پیاوەگـەیش وت نـەکردم وە قـەول ژنەگـەم سـەربکە قـوڕینی قنگەگەم.

((پیاو و ژنیگ))

پیـاویگ بیـە ڕوژی دوو بـار چـیلگ تێـردو فروشـدەی دوو قـران ئـەرای کـەد، جەمیـە و کـەد و وەدەس ژنەگـەی نێـدە دەی هیوشـد نـەك ژنەگـە خـەرجی بکـەد، پیاوەگـە قەرانـەگان جەمـەو کـەد و کـەدەی چـوار قـەران و خـەدەی نـاو جـل خـەری و خـەدەی نـاو خـانیی چـوڵیگ هیوشـد ئـەی خانیـە کۆن و پیسـە کـەس نـیّ تێـدە تـی و جلەگـە بـووەد. ڕوژیـك پیـاو دەلاڵـیگ تێـد و هیوشـدکی پـالاّن کۆنـەی جـل خـەردیرد بفرۆشـیدەی، ژن پیاوەگـەیش تێـد و هیوشـد خـاڵو مـن جـل توانـە دیـرم فروشمـەی دوو قـران بیـە پـیم دەمـەی پیـد، دەلاڵگـەیش دوو قـران دەدەپـی و پالاّنەگـە بـەد کـە خـۆی چـوار چـوار قـران هانـا و پالاّنەگـە پیاوەگـەی نایەسـە نـاوی لـە تـرس ژنەگـەی خـۆی. پیـاو ژنەگـە تێـدەو، ژنەگـەی چدە پیرییـە و هوشـیدە پـی پیاوەگـە جلـە توانەگـە فرۆشـتمەی و دامـەی دوو قـران، پیاوەگـەیش واد تێـدە دەیشـتە و هـەر دەدە مـل سـەرەو هـەر هیوشـدە نـەهات هـات نـەهات هـات، چـد ماڵـەگان گـەردد تـا دەلاڵەگـە بدوینـدەو، وێدوینـدەوەی و دەلاڵەگـە ئـەدا خـۆی چـی یە.

((بەبەدەرویش))

ڕوژی بەبەدەرویشی ڕی کەفدە ناو قەورستان و چد لە نزیک قەوریگ دانیشتد و خەفد، گوش تەکند هەردەنگ ئای ئای تێد، بەبەدەرویشەگەیش چدە بان قەورەگەو توولی کیشدە قەورەگەو هیوشد وە هوکم سلێمان پێغمبەر ئەی قەورە بکرێدە و بزانم ئەیە چەس هەر ئای ئایەسی، لە دوای لیدانی توولەگە قەورەگە کریدەو دویندیە کوڕ جوانیگە هانا و قەورەگە، بەبەدەرویشەگەش وە تورەگە هیوشدیە چەدە هەر هاوارکەیو تورەگەیش هیوشد تەماشای ئەی مارە بکە ڕوژی سێ وەختە خوینم خوّدو وە دوچك دەدەلیم، بەبەدەرویشەگەیش هیوشیدە پی ڕاستی دڵت بیوشە پیم تا ڕزگارت بکەم، کوڕەگەیش هیوشد بەلەوە بمرم ڕوژی دوو نەفەر هات ئەرا لام ووت مال ئەو دوێتە ها کام لا تابایِن بخوازینەیی منیش منال بیم باس دوێتەگە وەخراو کردم و ووتم ئەی دوێتە خراوە نەچنە دەورییە و، ئەی مارە نەفس ئەو دوێتەسە هەر عەزاوم دەت، ئیسە دوێتەگە پیر بیەو ها مال کەفتیە، بەبەدەرویشەگەش هیوشد مالیان ها کام لا تا بچم ئەدا لای تا عەفوت بکەد، کوڕەگەیش ڕەقەم مالەگەیان دەدەپی و هیوشد هەر خوّی و دایگیەسی هاناومال. بەبەدەرویشیش ئیوارە لە فەقیدی تێدە و چد ئەدا لای مالیان و دوێتەگەیش تێدە دەیشت هیوشد خالوّچەتواید، ئەییش هیوشد نێتوام بەس جی بییە نەپییم شەو لەی تارمەدانە بخەفم، دوێتەگەیش وە دایگی هیوشد، دایگی ڕازی بوود و لە تار مەگیان جی ئەدای خەنە و تا بخەفد، ئیجا نان ئەرای تێرن تا بخوّد ئەییش هیوشد نان نێخوّم من مەرام دیدم، دوێتەگەیش هیوشد نانەگەت بخوّ جوّ جا مەرامەگەت حاسل بوود بەس یەکی هاتی ئەوەنەود، بەبەدەرویشیش هیوشد منیش هەر ئەوا ئەوە هاتمە، دوێتەگە ڕازی نێود، بەبەدەرویش هیوشد عاق بکە، دوێتەگەیش هیوشد منیش مەرام دیرم، مەرامەگەمیش ئەوەسە بووە دوێتی چوارده سالان ئیجا عاق کەم، بەبەدەرویشیش ووت وەهوکم سلێمان پێغەمبەر ئەی دوێتە بوو دە دوێتی چواردە سالان، دوێتەگەیش جایەلەو بوودو هیوشد ئەوە من عاق کردم و ئەو زالمە لەلای لاچت کە عەزاوی دەد. بەبەدەرویشیش تێدە و چد ئەرای لای

قەورەگەو گوش تەکند دویند ئای ئای کورەگە نەمایە، ووتە پی ئیسە مارەگە عەزاوت دەد، کورەگەش ووت مارەگە هاتیە سێ جار سەلآم لە لیم کردو چی بچوو خودا عافت بکە و لەوای رزگارم کردیت لەی عەزاوە.

- ئەم حیکایەتانە تەنیا (دویت و خرس و بەبەدەرویش) رەگەزی ئەفسانەیان تێدایە، لە دویت و خرس کچە لە ورچەکە مندالی دەبێ و لە بەبەدەرویشیش، بەبەدەرویش دەچێتە ناو گۆڕ- واتا ئەو دونیا و قسە لەگەڵ مردوو دەکات، دەنا حیکایەتەکانی تر حیکایەتی گیاندارانن و پەند و حیکمەتن.

مەتەڵ

١. بەرخی سپییە و شەکی سوورە و مێ ی ڕەشە؟ ((تورك))
٢. کاڵەکێکم هەیە دوانزە لوزە، لوزێکی تاڵە هەرکەسێ بیخوا یان کەرە یان مناڵە؟ ((مانگی ڕەمەزان))
٣. تەڵە ئاوە زێتە چێوە نێچیر دەرچوو سەگ پێیوەبوە؟ ((فیرعەون))
٤. دنیا ها بە لووتیەوە؟((قەڵەم))
٥. دنیای پێ دەچێ؟ ((گوێ))

# ژن هەیە و ژنۆکەش هەیە!

**کۆکردنەوەی: نازم فازڵ محەمەد**

**گێڕانەوەی: مام عەلی**

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو سوارێکی ڕەش دەم و چاو پێچراو لە شار پەیدا بوو، هەر شەوێك دەهاتە شار لە دەرگای ماڵێکی دەدا هەرکەس دەهاتە دەرێ دەی کوشت وە کەس نەیدەزانی لەبەرچی ئەو کەسەی کوشتووە. ڕۆژێك سەرەی ماڵێك هات کەناوی حەسەن بوو، کاتێك پیاوی خاوەن ماڵ زانی نۆرەی ئەو هاتووە. ئەویش خۆی ئامادە کرد بۆ بەهەنگاربوونەوەی ئەو سوارە چونکە دەیزانی دەیکوژێ، کاتێك سوارەکە هات و لەدەرگای دا بینی خاوەن ماڵ پیاوێکی زۆر توندوتۆڵە زۆر دڵی خۆش بوو پێی گوت: وەرە پشتم سواربە ! کاتێك کە سوار بوو یەکسەر سوارەکە بەرەو دەشت بەڕێکەوت بەو شەوە کاتێك گەیشتە ئەشکەوتێك، بە کابرای گوت دابەزە. کاتێك دابەزی پێی گوت: سەری ئەم ولاغەم بۆ بگرە. ئەویش دابەزی سەری ولاغەکەی گرت. پێی گوت: لێرە ڕابووەستە ئێستا دێمەوە کاتێك ڕۆیی بەرەو ئەشکەوتەکە کە زۆر تاریك بوو پاش ماوەیەك بینی هاتەوە سەرێکی بەدەستەوەیە، کاتێك نزیك بەوە دەموچاوی کردەوە کابرا بینی ئافرەتێکی زۆر جوان و ناسکە. کابرا ((حەسەن)) پرسیاری لێ کرد پێی گوت: تۆ چی بۆچی هەموو شەوێك زەلامێك دەکوژی؟ ئەویش گوتی: من حەوت برام هەبوو هەموویان ئەم دێوە کوشتویانیەتی من بڕیارم دا کە تۆڵەی براکانم بکەمەوە و ئەو دێوە بکوژم. بەلاّم لەم شارە کەس نەبوو سەری ئەم ولاغەم بۆ بگرێ، هەر کات لە دەرگای ماڵێکم دەدا پیاوێك دەرگای دەکردەوە یان جلی خەوی لەبەردا بوو یان پێلاّوی لەپێ دا نەبوو، منیش لەداخان دەمکوشت. وەمن بڕیارم دا هەر کەسێك بتوانێت وەکو پیاوێکی ئازا و گورجوگۆڵ شەو بێتە دەرەوە لە دەرگا ئەوا سەری ئەم ولاغە بۆ من بگری ئەوا من شوی پێ دەکەم بەلاّم وادیارە بەقسمەتی تۆ بووم لەبەر ئازایی خۆت هەر لەوێ شوی پێ دەکات. پاش ماوەیەك کوڕێکیان دەبێت و کوڕشەکە گەورە دەبێت و دەبێت بەوەزیر. ڕۆژێك لەگەڵ پاشادا لە کۆشك دەردەچن کاتێك پاشا ئافرەتێك دەبینێت پیاوەکەی خۆی کوشتووە سەری لێ کردۆتەوە کردوویەتی بە پرد بۆ ئەوەی کابرایەکی قول بەسەریدا بپەڕێتەوە چونکە

پیاوه قوله‌كـه داوای لـیّ كـردووه ئـه‌م كـاره بكـات ئـه‌و ده‌یخـوازیّ كاتێـك پاشـا ئـه‌م ڕووداوه ده‌بـینیّ ده‌لّێـت وه‌زیـر مـن وا سـه‌فه‌ر ده‌كـه‌م تـاوه‌كو ده‌گه‌ڕێمـه‌وه هه‌رچـی ژنـی شـار هه‌یـه بیـان گـوژه ئه‌گـه‌ر ئـه‌م كـاره جێبـه‌جیّ نه‌كـه‌ی ئـه‌وا لـه ملـت ده‌ده‌م. دوای ڕۆیشـتنی پاشـا وه‌زیـر زۆر خـه‌مبار بـوو كـه چـۆن ئـه‌م بڕیـاره جێبـه‌جیّ بكـات چـونكه ده‌بێـت دایكـی خـۆی و ژنـی پاشـاش بكـوژێ بـاوكی و دایكـی لـه ته‌مـه‌نی پیریـدا بـوون بـاوكی هه‌سـتی بـه ناڕه‌حـه‌تی و خـه‌مباری كوڕه‌كـه‌ی كـرد لێـی پرسـی كـوڕم بۆچـی وا خـه‌مباری چـی بـووه بـه باوكـت بلّـێ: كوڕه‌كـه‌ش واتـا ((وه‌زیـر)) فرمـانی پاشـای بـۆ بـاوكی گـوت: كـوڕم خـه‌مبار مه‌بـه و هـیچ ئافره‌تێـك مـه‌كوژه تـاوه‌كو پاشـا دێتـه‌وه ئـه‌و كاتـه‌ی هاتـه‌وه مـن ببـه بـۆ لای پاشـا. كاتێـك هاتـه‌وه بینی وه‌زیـر فـه‌رمانی پاشـای بـه‌جیّ نـه‌هێناوه زۆر تـوڕه بـوو بـانگی وه‌زیـری كـرد فرمـانی دا له‌سـه‌ری بـده‌ن. بـه‌لاّم وه‌زیـر گـوتی پاشـا بـاوكم ده‌یـه‌ویّ لـه‌باره‌ی ئـه‌م كـاره قسـه‌ت له‌گـه‌لّ بكـات. پاشـا گـوتی: باوكـت بهێنـه كاتێـك ((باوكـه پیره‌كـه‌ی)) هێنـا كه‌وتـه گفتوگـۆ له‌گـه‌لّ پاشـا و چـۆنیه‌تی ڕووداوانـی هاوسـه‌رێتی خـۆی و دایكـی وه‌زیـری بـۆ گێڕایـه‌وه بـاوكی وه‌زیـر. پاشـای سـارد كـرده‌وه لـه‌م كـاره پێـی گـوت: جـه‌نابی پاشـا نابێـت ئـه‌م كـاره بكـه‌ی چـونكه ژن هه‌یـه و ژنۆچـكه‌ش هه‌یـه بـۆیێ پاشـا بڕیـاری دا لـه وه‌زیـر و سـه‌رجه‌م ژنـی ئه‌و شار خۆش بێت به‌هۆی ئازایه‌تی دایكی وه‌زیر وه‌كه چۆن كه‌لّه‌ژنێك بووه.

– كورد گوتوویه‌تی: شێر له‌لانیّ هاته‌ده‌ریّ چ نێر چ میّ.

## سێوێك

هـه‌بوو نـه‌بوو كـه‌س لـه‌خوا گـه‌وره‌تر نـه‌بوو كابرایـه‌ك هـه‌بوو زۆر لـه‌خوا تـرس و ده‌سـت پـاك و دیـن دار بـوو، ڕۆژێـك له‌سـه‌ر جۆگه‌یـه‌ك دانیشـتبوو لـه خـوار ڕه‌زێكه‌وه سێوێك به‌جۆگه‌كه‌دا هاته خواره‌وه وخواردی كاتێك سێوه‌كه‌ی خوارد

گـوتی بابچـم بـۆ لای باخه‌وانه‌كـه‌ی بـۆ ئـه‌وه‌ی گـه‌ردنم ئـازا كـات. باغـه‌وانیش لـه كابرایـه‌كی وا ده‌گـه‌ڕا كـه كچـه‌كه‌ی بـداتیّ كچـی باغـه‌وان زۆر جـوان و ناسـك و بـیّ خـه‌وش بـوو كاتێـك كـابرای لـه‌خوا تـرس بـه باغـه‌وانی گـوت مـن سـێوێكم لـه خـواری باغه‌كـه‌ی ئێـوه‌وه خـواردووه هـاتووم گـه‌ردنم ئـازا بكـه جـا چـۆن گـه‌ردنم ئـازا ده‌كـه‌ی؟ كـابرای باغـه‌وان لـه‌م هه‌لّـه باشـتری بـۆ ڕێـك نه‌كـه‌وتبوو پێـی گـوت: مـن به‌مـه‌رجێك گـه‌ردن ئـازا ده‌كـه‌م كـه حـه‌وت سـالّ باغـه‌وانیم بكـه‌ی لـه‌ماوه‌ی ئـه‌و

حەوت ساڵەدا تەنها یەك مێوەی نەخوارد بوو. ڕۆژێك پیاوێك لێی پرسی توو پێم بڵێ کام هەنار شیرنە گوتی: من نازانم چونکە من نەم خواردووە. حەوت ساڵ تەواو بوو باغەوان گوتی: بەمەرجێك گەردن ئازا دەکەم کچێکی کەڕ و لاڵ و بێ چاو و بێ پێم هەیە بیخوازی. ئەویش لەبەر ترسی خوا بەو بڕیارە ڕازی بوو کاتێك چووە ژوورەوە بۆ لای بووك بینی کە نە کوێرە و نە شەلە و نە کەڕ و لالە واتا ئافرەتێکی زۆر جوان بوو، بەلام باوکی لەبەر ئەوە دەی گوت کەڕ و لال چونکە نەقسەی لەگەڵ کەس نەکردبوو نەکەسی بینیبوو.

– چاك بکە ! چاك دێتە ڕێت.

## پیاوەتی!

هەبوو نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو کابرایەك بڕیار دەدات بگەڕێ تاکو یەکێك ببینێتەوە خەفەتی نەبێ پاش گەڕانێکی زۆر ڕۆژێك پیاوێك دەبینێت کە لە دووکانێکدا دانیشتووە زۆر پاك و خاوێنە و کەوا و چاکەتێکی لەبەردا بوو لەگەڵ جووتێك پێڵاوی باینجانی و جەمەدانییەکی لەندەنی لەسەردا بوو، کابرا گوتی هەبێت و نەبێت لەم پیاوە بێ خەفەت ترم دەست ناکەوێ با بڕۆم پرسیاری لێ دەکەم کاتێك پرسیار لە کابرای دووکاندار دەکات لەسەر کورسییەك دانیشتووە دەڵێت کەسی وەکو من خەفەتی نیە ئەم شەو میوانداریم بکە من بەسەرهاتی خۆم بۆتۆ باس دەکەم. کاتێك ئێوارە دەچنەوە ماڵێ کابرای دووکاندار، کابرای دووکاندار باس بەسەرهاتی خۆی دەکات دەڵێت من خێزانەکەم ئامۆزای خۆمە و زۆر یەکترمان خۆش دەویست و بڕیارمان دابوو بە یەکتری لە دوای یەکتری تەرکی دونیا بکەین. چوم بۆ بەجێ هێنانی فەریزەی حەج کاتێك حەجم کرد گەڕامەوە بەرەو ماڵ چەند قۆناغێکی کەمم مابوو بگەڕێمەوە ماڵ هەواڵیان پێدام کە خێزانەکەم مردووە، بەلام من زۆر خەفەتبار بووم چونکە بڕیارم دابوو بە خێزانەکەم لە دوای ئەو تەرکی دونیا بکەم بیرم کردەوە چی بکەم باشترین ڕێگەم هەڵبژارد ئەوەبوو کە خۆم لە پیاوەتی بخەم. کاتێك ئەم کارەم کرد و گەڕامەوە ماڵ بینیم خێزانەکەم نەمردووە ماوە ! ئیتر زۆر کاری تێکردم پاش ماوەیەك خێزانەکەم لێی پرسیم بۆچی وەك

جاران نیت لەگەڵم کاتێك پێم گوت من خۆم لە پێناوی ئەو چیم بەسەر خۆم هێناوە خێزانەکەم ئەم قسەی بیست گوتی چارەم دەکەی باشە دەنا بە جێت دەهێڵم. من بیری زۆرم کردەوە باشترین ڕێگای لەبەردەستم دابوو ئەوە بوو کە لە کارەکەری خۆمان مارەی بکەم بە هێنمنی ئەویش ڕازی بوو کە مارەی بکەم لەو کارەکەرە. کابرای میوان گوتی کەواتە تۆ گەورەترین خەفەتت هەیە و کەس وەکو تۆی بەسەر نەهاتووە. واتا من لەتۆ بە هەڵە تێگەیشتم.

## مامرە قوندە

هەبوو نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو مامرێکی قوەندە هەبوو لە گوندێك سالآنە جووجەڵەی هەڵدەهێنا، ڕێویەکی فێڵباز فێر بووبوو جووجەڵەکانی دەخوارد. ڕێوی پێش ئەوەی جووجەڵەکان بخوات دەیگوت گۆرانیت بۆ دەڵێم گۆرانیەکەی ئەوە بوو دەی گوت مامرە قوندەی قرمزی دەتخۆم بۆیە عێدزی؟ ڕۆژانە ڕێوی مامرە قوندەی دەبینی ئەم گۆرانیەی دووبارە دەکردەوە. مامرە قوندە زۆر بێزار بوو ڕۆژێك مام هۆمەری ڕاوچی بەلای مامرە قوندەدا تێپەڕی بینی مامرە قوندە زور بێزارە مام هۆمەر پرسی بۆچی بێزاری مامرە قوندە قسەکەی بۆ مام هۆمەر گێڕایەوە، مام هۆمەریش گوتی: من لەو کەندە خۆم دەشارمەوە کاتێك ڕێوی هات گۆرانی بۆ گوتی تۆش بڵێ سرەی منە گۆرانیت بۆ بڵێم. تۆش بڵێ مام هۆمەری لە کەندی بە خۆی و تولەی چەندی کەوڵە ڕێوی یان بەچەندی! کاتێك ڕێوی هات بۆ لای مامرە قوندە قسەکەی چەند ڕۆژەی دووبارە کردەوە مامرە قوندە گوتی ئینجا سرەی منە. ڕێوی ڕێوی ڕێگای پێ داو مامرە قوندە گوتی: مام هۆمەری لە کەندی بە خۆی و تولەی چەندی کەوڵە ڕێوی یان بەچەندی، ڕێوی گوێی لەم قسەی مامرە قوندە بوو پەلاماری مامرە قوندەی دا بەلآم مام هۆمەر زووتر خۆی ئامادە کرد بوو گەیشتە ڕێوی کەرتوپەرتیان کرد بەمجۆرە مامرە قوندە لە دەستی ڕێوی ڕزگاری بوو.

---

- حیکایەتی ژن هەیە و ژنۆکەش هەیە، بەزۆری شێوەی تر دەگێڕدرێتەوە و دەیخەنە پاڵ سوڵتان مەحمود و حەسەن مەمەندی. (سێوێك) و (پیاوەتی)یش حیکایەتی حیکمەت ئامێزن، بەلآم مامرە قوندە چیرۆکی گیاندارانە و تایبەتە بە منداڵآن.

# دنکە هەنارە

**کۆکردنەوەی: بەختیار رەئووف**

لە یەکێك لە لادێ یەکانی کوردستان، کە کەوتبووە ناوچەیەکی شاخاوی بەرز سروشتی ئەو دێ یە زۆر دلگیر و خەم رەوێن بوو، لە هەموو لایەکەوە سروشت دەوریدا بوو، کورێکی لاو ژیانی لەو دێ یەدا بەسەر دەبرد، و کچێکی هاوتەمەنی خۆی خۆش دەویێت، کە عاشقی کچێکی بالآ بەرزی جوان چاوانی رەش بالآی لە چنار دەچوو، لە دێ یەکەی خۆیان بوو، تەمەنی هەر لە تەمەنی کورەکە دەچوو.

هەولّ و ماندوبوونی ئەو کورە بۆ ئەوە بوو، کە بگاتە خۆشەویستەکەی و ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرن، دوای چەندین چاوەروانی مەینەتییەك تووشی هات، توانی خۆشەویستەکەی بهێنێ و ژیانێکی بەختەوەر دروست بکەن. ژیانیان لە ژیانی دوو پەپوولە دەچوو کە لەو دێ یە دا بەسەریان دەبرد، سروشتی و رازاوەیی دێ یەکە بەدەمیانەوە پێ دەکەنی. دوای دوو سالّ کجێکی جوانیان دەبێت لەسەر داوای دایکی ناوی دەنێن (هەنار) خۆشەویستی دایك و باوکی بۆ هەنار هێندە زۆرە کە شەوان لەسەر سینگی دایك و باوکی دەیان خەواند، هەرگیز نەیان دەهێشت لەسەر زەوی بخەوێ شەوان لە دیار ئازارەکانی تاکو بەیانی لایە لایە یان بۆ دەکرد، بەلآم رۆژگار چیتر رێگەی بەم خۆشەویستیە نادات دایکی هەنار توشی نەخۆشیەکی کوشندە دەبێت، دواجار مالّئاوای لە هەنار و باوکی هەنار دەکات بۆ یەکجاری چاوانی لێك دەنێت، ئای لەو رۆژگارە سەختەی کە بالّی رەشی کێشا بەسەریانا، فرمێسك لە چاوانی باوکی لە رێژنەی باران زیاتر ئەهاتە خوارەوە، بە سەر لاشەی خێزانەکەی دا، هەناریش کە باوەشی لە باوکی دابوو هاواری دەکرد...

ئاخۆ دایە گیان سەفەر بۆ کوێ؟

مردن بۆ کوێ؟

تەنیامان جێ مەهێلە.

ڕۆژگـار بـە بـێ بەزەیانـە لێکـی دابڕانـدن، بـاوکی هـەنار لـە پێنـاو بـەخێو کردنـی هـەنار بیری لـە ژیـانێکی تـر کـردەوە، بـۆ ئـەوەی هـەنار بـەخێو بکـات هەرچـەند، کـە ئـەم بڕیـارە بـۆ بـاوکی هـەنار سـەخت بـوو چـونکە نـەی دەتـوانی دایکـی هـەنار لـەبیر بکات بەڵام بەناچاری ئەم بڕیارەی دا لە پێناو هەنار.

ژنێکـی تـری هێنـا لـە زڕدایکـی هـەنار (منـاڵێکی تریـان دەبێـت دیکنـە چـاڵ) بـاوکی دنکـە هەنارەکـە، هـەناری زۆر خـۆش دەوێـت هـەر بۆیـەش پـێ ی دەڵـێ (دنکـە هـەنارە) بـەڵام ئـەو کچـەی کـە لـە زڕدایکـی هەنارەیـە کچـێکی زۆر ناشـرین و لـەخۆبایی دەبێـت. زڕدایکـی زۆر ڕقـی لـە دنکـە هـەنارە دەبـۆوە چـونکە دەنکـە هـەنارە زۆر جـوانتر بـوو لەکچـەکەی باوکیشـی دنکـەی هـەنارەی خۆشـتر دەویسـت لەبـەر ئـەوەی دایکـی نـەما بـوو، ڕۆژێکیان باوەژنەکـەی لەگـەڵ کچـەکەی و دنکـە هـەنارە چـوونە سـەر کـانی بـۆ خۆشوشـتن لـەناکاو کچـەکەی و دنکـە هـەنارە چـوونە سـەر کـانی و شـانەکەیان ئـاو بـردی تـا گەیشـتە بـەردەمی ئەشـکەوتێك، باوەژنەکـەی دڵـی نـەهات کچـەکەی خـۆی بنێـری بـۆ ئەشـکەوتەکە تـاکو شـانەکە بهێنێتـەوە، دنکـە هـەنارەی نـارد دنکـە هـەنارە چـووە نـاو ئەشـکەوتەکە و تەماشـای کـرد لـەناو ەشـکەوتەکەی دێـوێکی گـەورە هەیـە کـەوا پـای لەسـەر شـانی دانـاوە، دنکـە هـەنارە داوای لێکـرد کـەوا شـانەکەی بداتـەوە، بـەڵام دێوەکـە گـوتی: نـات دەمـەوە تـاکو چـەند پرسـیارێکت لێنەکـەم، ئینجـا دەت دەمـەوە، دەنکـە هـەنارە زۆر بەژیرانـە وەڵامـی پرسـیارەکانی داوە، دێوەکـە گـوتی: مـن جـوانترم یـاخود دایکـت؟ دەنکـە هـەنارە گـوتی: تـۆ جـوانتری. دێوەکـە گـوتی: تەماشـای سـەرم بکـە بزانـە سـەری مـن خـاوێنترە یـان ئـی دایکت؟ گوتی ئـی تـو پاشـان دێوەکـە زۆر دڵخـۆش بـوو باشـە ئێسـتا مـن دەنـووم، چـەند ئـاوێ دێ هەریەکـەی بـە ڕەنگـێ، ئەگـەر ئـاوی سـپی هـات بـانگم مەکـە، ئەگـەر شـین هـات بـانگم مەکـە، ئەگـەر سـوور هـات بـانگم مەکـە، ئەگـەر ڕەش هـات بـانگم مەکـە، ئەگـەر زەرد هـات ئینجـا بـانگم بکـە؟ پاشـان دێوەکـە نووسـت دەنکـە هـەنارە بـەدیار ئاوەکـان دانیشـت ئـاوی (سـپی، شـین، سـوور، ڕەش) هـات بـانگی نـەکرد پاشـان ئـاوی زەرد هـات (هـەنار) بەپەلـە بـانگی دێوەکـەی کـرد تـاکو زوو دەربـازی بێـت، دێوەکـەش هەسـتاو دەسـتی گـرت و کردیـە نێـو ئـاوە زەردەکـە و دەری هێنـا، تەماشـای کـرد هـەموو جلـەکانی بـووە بـەزێڕ پاشـان دێوەکـە بـەڕێی کـرد و دەنکـە هـەنارە بـە دڵخۆشـی بـەرەو مـاڵ بـەڕێ

کەوت دوای ئەوەی باوەژنەکەی دەنکە هەناری دی زۆری پێ ناخۆش بوو لە دەنکە هەناری پرسی گوتی ئەمانەت لەکوێ هێناوە؟ دەنکە هەنار بۆی گێڕانەوە کەوا کاتێ بۆ شانەکە چۆتە ئەشکەوتەکە دێوێکی لێ بووە ئەو شتانەی پێداوە ، باوەژنەکەی هەستا کچەکەی نارد بۆ ئەشکەوت، کچەکەی چووە ئەشکەوتەکەو چووە لای دێوەکە. دێوەکەش هەمان پرسیاری کە لە دەنکە هەنارەی کردبوو لە (دیکنە چاڵ)ی کچی باوەژنەکەی هەنار کرد، بەڵام ئەم بەشێوەیەکی تر وەڵامی دایەوە، بۆیە دێوەکە پێی گوت من دەنووم کاتێ ئاوەکان هاتن بە ئاگام بێنە و بەس ئەگەر ئاوی سپی هات بانگم مەکە ڕەش هات بانگم بکە؟ دیکنە چاڵ چاوەڕێ دەکات تاکو ئاوی سپی دەڕوات ئاوی سوور دەڕوات ئاوی زەرد دەڕوات دواتر ئاوی ڕەش دێت بەپەلە بانگی دێوەکە دەکات، دێوەکەش دەستی دەگرێت دەیخاتە ناو ئاوە ڕەشەکە و کاتێ دەری هێنا تەماشای کرد هەموو جەستەی ڕەش بوو پەڵێکی ناشرین لە ناوچەوانی دا بەدیار کەوتووە، کاتێ گەڕایەوە ماڵ دایکی بینی زیاتر ڕقی لە (هەنار) گرت و ڕکابەری دەکرد. پاش ماوەیەك ڕۆژێ بەڕێکەوت کوڕی پاشا لەسەر کانی دەنکە هەنارە دەبینێ دەچێتە دڵیەوە و عاشقی دەبێت کوڕی پاشا لەگەڵ باوکی دەچنە داوای دەنکە هەنار. باوکی هەنار ڕازی دەبێت کە شو بەکوڕی پاشا بکات، باوەژنەکەی زۆری پێناخۆش بوو کە شو بە کوڕەپاشا بکات، بۆیە بڕیاری دا پیلانێك دژی (هەنار) دابنێت. بڕیاری دا لە جێگەی دەنکە هەنار کچەکەی خۆی بداتە کوڕەپاشا، ڕۆژی ئاهەنگەکە هات باوەژنەکەی دەنکە هەنارەی شاردەوە و کچەکەی خۆی لە جێگەی کردە بووك و تارای سپی بەسەریا پۆشی، پاشان زاوا هات و بووکی برد کاتێ گەڕاوە ماڵ تارای لەسەر بووك لابردو تەماشای کرد ئەمە دەنکە هەنارە نی یە، بۆیە بەپەلە چووە ماڵی باوکی دەنکە هەنارە و گوتی: کوانێ دەنکە هەنارە؟ باوکیشی زۆری پێ سەیر بوو کوڕە چیت لە دەنکە هەنارە کردووە؟ کوڕی پاشاش دیکنە چاڵەی لەگەڵ بوو گوتی: ئەمەتان لە جێگەی هەنار داوەتە من، باوکی هەنار کاتێ دیکنە چاڵەی بینی زانی خێزانەکەی پلانی داناوە، داوای کرد ئێستا دەنکە هەنارە بگەڕێنێتەوە ئەگەر نا دەیکوژێت باوەژنەکەش لەترسا هەناری هێنا دەرەوە لەو جێگایەی کە شاردبوویەوە دەری کرد و هێنای بۆ لای باوکی. باوکی هەناری پێشکەش کرد بەکوڕی پاشا و کوڕە پاشاش لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ ماڵی

خۆیـان. باوکیشـی بڕیـاری دا ژنەکـەی و دیکنـە چاڵەی دەرکـرد لـە مـاڵ و بڕیاریـدا بـە تـەنیا بـژی نـەك لەگـەڵ ئـەو کەسـە خراپانـە بـەڵام دوای چـەند ماوەیـەك دەنکـە هـەنارە داوای لـە بـاوکی کـرد کـە لێیـان خۆشـبێ. باوکیشـی دڵـی هـەناری نەشـکاند و خێزانەکـەی و دیکنـە چـاڵەی گەڕانـدەوە بـۆ مـاڵ باوەژنەکـەش لـەگوڵ دیکنـە چـاڵە زۆر داوای لێبووردنیـان لـە دەنکـە هـەنار کـردو داوایـان کـرد کـە لێیـان ببەخشـێ، دنکە هەنارەش بەچاوی سۆزەوە لێیان خۆش بوو.

– بیری ئەم ئەفسانەیە زۆر کۆنە، گێڕانەوەکەی تازەیە.

**لاچەقنگە**

پاشـایەك هـەبوو لـە دێیـەك سـێ ژنـی هـەبوو، ئـەو سـێ ژنـە منـداڵیان نـەدەبوو، ڕۆژێـك شـێخێك هاتـەماڵیـان وتـی کـوا منداڵـەکانتان، ژنـەکان وتیـان منـداڵمان نیـە، شـێخەکە وتـی باشـە مـادام منـداڵتان نابێـت هـانێ ئـەو سـێ سـێوە بخـۆن، ئەگـەر بیخـۆن بەتـەواوی ئـەوە (خـوا) یـەکی منـداڵێکتان پـێ دەبەخشـێت ژنـی یەکـەم سـێوەکە دەخـوات، ژنـی دووەم بەهـەمان شـێوە بـەڵام ژنـی بچـووك خـەریکی کـار بـوو کـەرتێك سـێو ئـەخوات و کەرتەکـەی تـری مریشـکێك ئـەیبات ژنەکـە بـەدوای مریشـکەکە ئەکـەوێت بـەڵام ناتوانێـت بیگرێـت، پـاش ماوەیـەك هـەر سـێ ژن سـکیان دەبێـت، هـەر یەکـەیان کوڕێکیـان دەبێـت، بـەڵام ژنـی بچـووك منداڵەکـەی تـەواو نابێـت، لەبـەر ئـەوەی کـەرتێك سـێوی نـەخوارد، ژنـی یەکـەم کوڕەکـەی نـاوی (محمـەد) بـوو، ژنـی دووەم کوڕەکـەی نـاوی (ئەحمـەد) ژنـی بچـووك نـاو کوڕەکـەی دەنێـت (لاچـەقنگە)، پاشـان کوڕەکـان گـەورە دەبـن، محەمـەد و ئەحمـەد زۆر یـەکتریان خـۆش دەویسـت، بـەڵام زۆر ڕقیـان لـە لاچـەقنگە بـوو، لاچـەقنگە هیوایـەتی بـەخێوکردنی ئـاژەڵ بـوو، ڕۆژێـك باوکیـان بانگیـان دەکـات دەڵـێ کـوڕم دەمـەوێت وەسـیەتێکتان بـۆ بکـەم قـەت نەچـن بـۆ چـیای ڕەش چـونکە دوژمـنی لـێ یـە، کوڕەکـان وتیـان بـاش، پـاش ماوەیـەك ئەحمـەد و محەمـەد بـووە مـەرەق لێیـان وتیـان هـەر دەبـێ بچـین بـۆ ئـەم چـیایە بـزانین چـی لـێ یـە هـەردووکیان بـەڕێ کـەوتن چـوون بـۆ چـیاکە، سـەیریان کـرد دێـوێکی زۆر گـەورەی لـێ یـە لـەناو ئەشـکەوتێکە، دێوەکـە زانـی ئەوانـە کـوڕی پاشـان هـەردووکیانی بەسـتەوە ئەسـپەکایانی بەسـتەوە، ئـەم دوو کـوڕە زۆریـان برسـی بـوو خـەریك بـوو دەمـردن لاچـەقنگە زانـی براکـانی چوونەتە ئـەم چیایە، ئـەویش چـوو بەدوایانـدا کـە چـوو لەگـەڵ

خـۆی ئاژەڵـەکانی بـرد مریشـك و عەلەشـیش و قـاز و...هتـد، لـە دوورەوە دێوەکـە کـە سـەیری کـرد وای زانـی ئەمـە هـەموو لەشـکری پاشـایە، ئـەویش پشتاوپشـت ڕایکـرد بـۆ دواوە ڕاسـت لـە چـیاکە کەوتـە خـوارەوە ومـرد، لاچـەقنگە کـە چـوو براکـانی بـینی زۆر بـەزەیی پێیـان هاتـەوە هـەردووکیانی کـردەوە لەگـەڵ ئەسـپەکانیان کـە ڕۆیشـتەوە لـە ڕێگـا ئەحمـەد و محەمـەد چـونکە ڕقیـان لـە لاچـەقنگە دەبـووەوە، وتیـان بـا بیکـوژین بـۆ ئـەوەی لای باوکمـان نـەڵێت مـن ئازادیـانم کـرووە، ئـەوانیش هەڵسـان... بـە لێـدانی بیرێـك، لاچـەقنگەیان خسـتە نـاوی تـەنها سـەری نـەبێت، ئەحمـەد و محەمـەد ڕۆیشـتن لەپاشـان مریشـك و قازەکـان بـە دەنـوك لاچـەقنگەیان لـەناو بیرەکـە دەرهێنـا، بەبـەردەمی کانییـەك دەمـو چـاویان دەشوشـت، لاچـەقنگە گەیشـتە لایـان، ئـەوانیش سەرسـام بـوون وتیـان چـۆن لـەناو ئـەو بـیرە هاتـە دەرەوە، ئـەمجارە چـوون بـە پـەتێك لەسـەر دارێـك بەسـتیانەوە، ئەحمـەد و محەمـەد چـونەوە بۆمـاڵ، بەهـەمان شـێوە قـاز و مریشـکەکان بـە دەنـووك پەتەکـەیان پچـراند ئەحمـەد و محەمـەد کـە چـوونەوە پاشـای باوکیـان کـە زانـی بەسـەلامەتی... گەڕاونەتـەوە ئاهـەنگێکی گـەورەی بۆیـان سـازکرد، وتیـان بـاوە دێوەکـەی دوژمنـت ئێمـە کوشـتمان، باوکیـان زۆر خۆشـحاڵ بـوو لـە دواییـدا لاچـەقنگە گەڕایـەوە بـۆ لای بـاوکی سـەرو سـەربردەی همـوو بەتـەواوی بـۆ گێـڕاوە، پاشـای بـاوکی بـە کوڕەکـانی گـوت ئێـوە درۆتـان لەگـەڵ منـدا کـردووە، لاچـەقنگەی کـرد بە پاشا لە جێگای خۆی دانا کوڕەکانی تری کرد بەبەردەستی لاچەقنگە.

– لـەم دوو ئەفسـانەیە بـاس لـە (بـاوەژن) و (زڕ بـرا) دەکـات لـە یەکـەمیان زڕ دایـك – بـاوەژن – کچـە ناشـیرینە گێلەکـەی خـۆی دەپـارێزێ و دنکـە هـەنار دەخاتـە بـەردەم – دێـو – و لـە کـوڕی پاشـای دەشـارێتەوە، لـە ئەفسـانەی دووەم براکـان کـە ترسـنۆك و بـێ توانـان چـاکە و ئازایـەتی – لا کـەرتکی – برایـان دەشارنەوە و هەوڵی لەنێوبردنیشی دەدەن.

ڕەگەزی ئەفسـانە لـەم دوو دەقـە بـوونی دێـو و لـە ئـاو هـەڵێنانی کچەکان و جـوانتر بـوونی دنکـە هـەنار و ناشـیرینتر بـوونی – دیکنـە چـاڵ – ە و هـەروەها سـێو خـواردن و منـداڵ بـوون و لـەوەش ئەفسـانە تـر بـەخواردنی کەرتـە سـێوێك ژنـی سێیەم منداڵێکی نیوە و لا کەرتکی دەبێ، بەڵام لا کەرتکێکی ئازا و ژیر.

# ڕاسته و خواره

کۆکردنەوەی: ڕۆژان صدیق
پەریخان حسین
زەریفە شلك

ڕۆژێـك لـه ڕۆژان دوو بـرا هـەبوون یـەکیان نـاوی (ڕاسـت) بـوو یـەکیان نـاوی (خـوار) بـوو. خـواره و ڕاسـته ڕۆژێـك زۆر برسـیان بـوو بـەڵام هیچـیان نـەبوو بیخـۆن. هەسـتان یـەك دوو نانیـان پەیدا کـردو ڕۆیشـتن بـۆ ئـیش هـەتا بـووه پـێش نیـوڕان برسـیان بـوو ڕاسـته بـه خـوارەی گـوت: وەره بـا نـانی تـۆ بخـۆین خـوارەش نـا بـا نـانی تـۆ بخـۆین نانەکـەیان خـواردوو ڕۆیشـتن گەیشـتنه دەو زێ لـەوێ ڕاسـته گوتیـه خـواره بـا نـان بخـۆین خـواره گوتیـه ڕاسـته قـەت نانـت نـادەمێ ڕاسـته گـوتی: ئـاخر زۆرم برسـیه ئـەدی نـانی منـت نـەخوارد؟ خـوارەش گـوێی نـەدایێ و لـه ئاوەکەیـداو پەڕیـەوه ڕاسـتەی بـەجێ هێشـت و دەو زێ و دەو زێ ڕۆیشـت تـا گەیشـته شـوێنێك ئاشـێکی لـێ بـوو، خـواره چـووه نـاو ئاشـەکه لـەناو کەونـه ئاشـەکه خـۆی لـەژێر هەنـدێ نـوین مـات کـرد و دیـتی شـێرێك و ڕیویـەك و گورگـەك لـەوێ بـوون بـه ئـەمرێ خـودا بـه قسـه هـاتن. شـێرەکه و گورگەکـه لـه یـەکتر بـەجواب هـاتن، لـه شـێرەکەیان پرسـی بـۆ ئـەوها قەڵـەو بـووی ئـەویش گـوتی: لـه خۆشـی ئـەوه قەڵـەو بوومـه ئـەو گـردەت دیتیـه ڕۆژێ دەچـم لەسـەر پاردەدەمـەوه و سێ کوپه زێڕی لـه بنـه هـەر لەبـەر ئەمـه قەڵـەو بوومـه. لـه ڕیویـان پرسـی ئـەی تـۆ بـۆ وا قەڵـەو بـووی؟ گـوتی: بۆیـه مـن وا قەڵـەو بوومـه چـونکه کونـەکم دیتیتـەوه تـاکو نیـوڕانێ دەچـمه ژێـرەوه دەردەدەم و پاشـان دەچـم تێـی دەکەمـەوه ئـەدی گـورگ تـۆ بـۆ وا لاواز بـووی گـوتی: کـو لاواز نـەبم پیـاو خراپـەك (سـێ) سـەر حـەیوانی هەیـه ڕۆژێ هـەتا ئێـوارێ لێـی دەنـوێ و سـەگەکی ڕەشـی پێیـه قـەت نـاهێڵێ مـەڕەکان بخـۆم بۆیـه لـه داخـان لاواز بوومـه. بـەیانی ڕۆژ بـوو خـواره لـه دوو ڕیویەکـه ڕۆیشـت کـاتێ ڕیویەکـه گەیشـته شـوێنی مەبەسـت ڕیویەکـه چـووه نـاو کونەکـەو هـەر زێـڕی هەڵداو ئـەویش هـەر هـەڵی گرتـەوه کـه ڕیویەکـه هاتـه دەرێ و خـواره پارچـه کەرپوچـێکی بـۆ هاویشـتوو ڕیـوی دەرپـەڕی و ڕۆیشـت. ڕۆژێکیـان پاشـای شـار نەخۆشـیەك دەگـرێ و بـه هـیچ دەرمانێـك چـاك نابێتـەوه بۆیـه ڕاسـته دەچێته لای شـوانەکه داوای لـێ دەکـات کـه ئـەو سـەگه ڕەشـەی هەیـەتی پێـی بفرۆشـێ دەڵێـی ئەوەنـدەی ئـەو سـەگه زێـڕت دەدەمـێ بۆیـه شـوانەکەش سـەگەکەی بـه زێـڕ پـێ دەفرۆشـێ بـەڵام ڕاسـته بـه شـوانەکه دەڵـێ

سـەگەکەم بـۆ سـەربڕی و خوێنەکەشـم بـۆ بگـری شـوانەکەش سـەگەکەی سـەربڕی و خوێنەکەی بۆ گرت.

پاشـان ڕۆژێکیـان دیسـان چـووە لای شـوانەکە بـۆ ئـەوەی مـەڕەکی پـێ بفرۆشـێ بۆیـە مـەڕێکی ڕەشـی لـێ کـڕی و ئەویشـی بـۆ سـەربڕی و خوێنەکـەی لێگـرت. ڕاسـتەش خوێنـەکانی تێکـەڵ کـردوو چـووە لای پاشـای گوندەکـە کـە هـەموو لەشـی گـڕو بووبـوو لـەو گونـدە دەژیـا کـە سـێرەکەی لێبـوو گـوتی وەرن ئـەمن دکتـۆرم چـاکت دەکەمەوەڕاسـتە چـوو دەرمانەکـەی بـردوو دەسـتێکی لێـداو تفرێکـی فـڕێ دا ئـەو جـارە حـەوت دەسـتی تـری لێـداو بەتـەواوی تفـری لـێ فرێـدا و پێسـتێکی جـوان دروسـت بـووەوە و پاشـا گوتیـە ڕاسـتە چـت دەوێ بـۆت دەکـەم بەرامبـەر بـەوەی کـە منـت ڕزگـار کـرد و چـاکت کردمـەوە لـەو نەخۆشـیە. ئـەویش گـوتی: هیچـم نـاوێ تـەنها دەمـەوێ خانویـەکم بـۆ لەسـەر ئـەم گـردە دروسـت بکـەن پاشـاش خانوویـەکی بـۆ دروسـت کـرد و بەخۆشـحاڵیەوە داواکـەی قبـوڵ کـرد مـاڵێکی تـەواوی بـۆ دانـاو کچـەکەی خۆشـی لـێ مـارە کـرد، ئینجـا ڕاسـتە کەوتـە نـاو ژیـانێکی زۆر خـۆش ماوەیـەکی پێچـوو دیـتی ڕۆژێکیـان خـوارە دەهاتـەوە و بـە دیـار کـەوت کـە چـاوی بـە ڕاسـتەی بـرای کـەوت سـەری سوڕما وتـی هـا ڕاسـتە بەچـی دەوڵەمەنـد بـووی بـە دوو نانەکـەی سـەر زێ وتـی لـە کـوێ ئـەو دوو نانـەم بەدەسـت کـەوتووە خـوارە گـەڕاوە نـاو کونـە ئاشـەکە دیسـان شـێر و ڕێـوی و گـورگ هاتنـەوە بـۆ لای خـوارە شـێرەکە و ڕێویەکـە ئەوەنـدە لاواز بـوون هێزیـان لـێ برابـوو شـێرەکە لـە ڕێویەکـەی پرسـی ئـەوە بـۆ وا لاواز بـووی ڕێویەکـە هاتـە وەڵام و گـوتی: چـۆن لاواز نـەبم کـاتێ چـووم زێڕەکـە دەردەم پیـاو خراپێـك لـەوێ بـوو هـەموو زێڕەکـەی بـرد و کـە هاتمـە دەرێ کەرپوچـێکی تـێ گـرتم منـیش ڕام کـرد. ڕێویەکـە لـە شـێرەکەی پرسـی ئـەی تـۆ بـۆ وا لاواز بـووی؟ گـوتی: منـیش بەهـەمان شـێوە ئـەو گردەی کـە لەسـەری پـارم دەداوە زێـڕی لـەناو بـوو پیـاو خراپێـك خانویـەکی لەسـەر گردەکـە دروسـت کـرد و هەرسـێ کوپـە زێڕەکـەم کەوتوتـە ژووریێ،لـە گورگیـان پرسـی ئـەی تـۆ چـۆن وا قەڵـەو بـووی گورگەکـەش گـوتی بـۆ قەڵـەو نـەبم کـاتێ شـوانەکە خـەوی لـێ کـەوتبوو سـەگە ڕەشـەکەش سـەربڕا بـوو هـەموو مـەڕ و ماڵاتەکـەم خـوارد. گـوتی: دەبـا بـزانین کـەس لێـرە نییـە خـۆی شـاردبێتەوە و گـوێی لـە قسـەکانمان بـووبێ کـاتێ چـوون دەبیـنن کـە خـوارە لـەبن کۆمـەڵێ نـوین خـۆی مـات کـردووە بۆیـە هـەر سێکیان پەلاماریان داو خوارەیان شەق و پەق کرد.

– کێشە لە نێوان دوو هێزی خێرو شەڕە دواجار خێر سەردەکەوێ.

## خاڵ و خڕك

هەبوو نەبوو پیاوێكی فەقیر هەبوو ڕۆژانە دەگەڕا بەدوای ئیش و كار كاتێك كە دەغڵوودانی پەیدا دەكرد گەنمەكەی دەبرد بۆ ئاش لێی دەكرد بەڵام ئاردەكە نەدەبووە نان تەنها ژنەكەی دەیكردە پەپۆكە ڕۆژێكیان پیاوەكە بە ژنەكەی دەڵێ: ئەرێ ژنێ بۆ من ئەو گەنمە جوانە دەكەم بە ئارد كەچی نانی لێ نایێ و تەنها دەبێتە پەپۆكە؟ ژنەكەش گوتی: ئاخر كابرا چیت پێ بڵێم هەموو ڕۆژێ خوشكت دێ و ئاردەكەی دەبێژێ و بێژاریەكەی بۆخۆی دەبات و كەپەكەكەش بۆ ئێمە بەجێ دێڵێ كابراش گوتی: ئێ خوشكم دەردت لە گیانم پیاوە فەقیرەكە ڕۆژێك چوو دوو ماری ڕەشی گرت و لە ناو تورەگەیەكی دانا و بردیە كن خوشكەكەی سەلامی لێ كرد و ئەویش وەلامی دایەوەو خوشكەكەی كەرەكەی بۆ بەستایەوە تورەگەكەی لە كەرەكەی كردەوە تەماشای كرد مارەكە بە ئەمری خوا بوو بە هیزارەیەكی ڕەش ژنەكە گوتی برام بۆ ئەو هیزارەت بۆ من هێناوە؟ ئەویش گوتی: ئەو هیزارە نەبوو بەڵام با بێت بە هیزارە گوتی: ئەدی چ بوو؟ گوتی: دوو ماری ڕەش بوو بۆ ئەوەی پێت وەدات و یەكەو سەر بتكوژێ. گوتی: بۆ برام؟ گوتی: ئەی بۆ تۆ هەموو ڕۆژێك دێی ئاردەكە دەبێژی و كەپەكەكە بۆ ئێمە بەجێ دێڵی؟ ئەویش گوتی: بۆیە وادەكەم تاكو تۆ تێبگەی ئەویش گوتی لە چ بگەم لەوەی كە ژنەكەت دۆستی هەیە لەبەر هەندێ ئەو قسانە دەكات گوتی: ئەی خوشكم چی لێبكەم گوتی ئەتو خركی ببە بۆ ماڵی خۆتان ئەوكات چارەی دەكەین خرك ئێوارێ چوو دیتی خارۆژنی لەگەڵ دۆستی دەهات و دەچوو خرك گوتی: خارۆژن. گوتی: هۆ گوتی: دەڵێن چاكەك لە فرانە جێیە پێی دەڵێن چاكی (پۆشی) گوتی: ئەوەی مرازی حاسڵ ببێ دەنگێكی لێوە دێ ئەوەی مرازی حاسڵ نەبێ دەنگی لێوە نایێ. سبەینێ زوو ڕۆی چووە سەر چاكی خۆی لەبن پۆشی نایە ژنەكە گوتی: هۆ چاكی لەبن پۆشی مرازم حاسڵ بكە هەتا ئێوارێ هەردووكیان كۆرە بن دەست لە كلكی گا بگرن خارۆژن چۆوە ئەویش پێش خارۆژنی غاری داو چووە لای خاری گوتی: خارە زووبە. خاری خەریكی جۆتكردن بوو گوتی كلكی گا بگرە هەتاكو ژنەكەت وابزانێ دوعایەكەی قبوڵ بووەو وابزانێ تۆ كۆرە بووی كاتێ ژنەكە گەڕایەوە لە دەركەی خرك هاواری كرد ها خارۆژن چیمان لێدەكەی من و خارم كۆرە بووینە؟ ژنەكەش دەستی هەردووكیانی گرت و بردی لەناو ئاگردانی دانان گاسی دۆستەكەی كرد و گوتی: هەردووكیان كۆرە بوونە خارۆژن مریشكی بۆ دۆستەكەی سەربڕی و سۆری كردەوە و ئەوجا مەقریەك دۆشاوی بۆ كرد لەو كاتەش دۆستەكەی

نووسـتبوو خـرك گاسـی خـارۆژنی کـرد گـوتی: خـارۆژن بمبـە دەسـت بـە ئـاو دەگـەیێنم خـارۆژنی بـردی تـا خـارۆژنی هاتـەوە هـەموو جـەرەکانی بـەرداوە و ئاوەکـەی رژانـد گـوتی: خـارۆژن بمبـەوە ژووریّ ئـەوجارە گـوتی: خـارۆژن تێنیمـە ئـەیش دەسـتی دا جـەرەکان بـەلاّم هیچیـان ئـاوی تێـدا نـەبوو بۆیـە گـوتی: وا دەچـم ئـاو دێـنم تـاکو خـارۆژنی گەڕایـەوە مەقریـە دۆشـاوە گەرمەکـەی لەسـەر دەمـی دۆسـتەکەی کـرد و کوشـتی، خـارۆژنی هاتـەوە و چـووە لای خـرك و ئاوەکـەی دایـیّ چـوو بـۆ کـن دۆسـتەکەی وتـی: هەسـتە دۆشـاوی بخـۆ سـارد دەبێتـەوە کـە زانـی مردیـە کورسـیەکی هێنـا لـە ناوقـەدی دۆسـتەکەی خسـت لەگـەلّ خاکـەناس و پێمـەرەی هـەلّگرت و بـۆ ئـەوەی بچـیّ دۆسـتەکەی بشـارێتەوە مەیتەکـەی دانـا و گەیشـتیّ مەیتەکـەی ڕاکێشـا و هـەتا بـووە بـەیانی مەیتەکـەی هـەلّگرت و لەسـەر پوشـەکەی فـڕیّ داو بـەیانی خـەلّك خڕبوونـەوە کردیـە هـات و هـاوار کەسـێك کوژرایـە لەسـەر گوفـەك فڕێدرایـە گـوتی: خـارۆژن منـیش ببـە مـادام پیاوێـك کوژرایـە بـەلاّم خـرك گـورینگی لەسـەری خـارۆژنی قیـت کـردەوە ئـەوانیش دەلّـێن کـیّ کوشـتی ئـەویش دەلّـیّ ئـەو کەسـە کوشـتیتی کـە گـورینگی لەسـەر سـەری قیـت بویتـەوە ئـەوانیش تەماشـا دەکـەن دەبیـنن ژنەکـە گـورینگی قیـت بویتـەوە لەبـەر ئـەوە خارۆژنەکـەی دەکـوژن خـرك دەبێتـە بنـەوانی خـاری خـاری گـوتی: ئـەو پشـیلە نـەکوژی دوایـیّ ئاگرەکـە دەکوژێتـەوە بـەیانی خـرك هەسـتاو پشـیلەکەی کوشـت و ئاگرەکـەش کوژایـەوە چـووە دەریّ دیـتی لـە دوور دوور بریسـکەی ئـاگرەك دەسـووتا گـوتی کـاتیّ چـووم بینـیم (نـۆ) دێـو نووسـتوونە پیرەژنێکـی لێبـوو کـە ئـاگری دەکـردەوە و مەنجـەرێکی گـەورەی لەسـەر دانـابوو هـەموو بەشـەرێکی تیـابوو ئـەویش گـوتی هەنـدەك ئـاگرم بدەیـە ئـەویش گـوتی: ئەگـەر مەنجەلّەکـە دەینیـە خـواریّ و دایـەوە سـەریّ ئـەمجا کـەرتێك پۆلیـەت دەدەمـیّ ئەگـەر نـا دێوەکـان هەردەسـتنەوە و شـەق و پـەقت دەکـەن. ئـەویش هەسـتا و پیرەژنـی هاویشـتە نـاو مەنجەلّەکـە و مەنجەلّەکـەی هێنایـە خـواریّ کـەپو و لێـوی هـەر نـۆ دێـوی بـڕی و بـردی ئاگریشـی بـرد بـەیانی هەسـتا و خـاری گـوتی: کـا پشـیلەکە ئـەویش گـوتی لێمـدا و کوشـتم چـونکە ئاگرەکـەی کوژانـدەوە. ئـەو نـۆ دێـوەی کـە لەسـەر کـانی بـوون هـەموو ڕۆژیّ کچێکی دەخـوارد کـاتیّ خـەلّك چـوون بـۆ سـەر کانییەکـە وتیـان دەبـیّ کـیّ ئـەو نـۆ دێـوەی کوشـتبیّ گوتیـان هـەبیّ و نـەبیّ یـان خرکـە یـان خـارە لـە خارەیـان پرسـی وتـی: مـن نـەم کوشـتووە لـەخرکیان پرسـی گـوتی: ئـەمن بـووم. گوتیـان دەبـیّ ڕونـی بکەیـەوە ئـەویش چـوو توورەگەکـەی هێنـا و رووی کـرد و هـەر نـۆ کـەپو و لێـوی دێوەکـانی تێـدا بـوو خەلّکەکـە گوتیـان خـرك چـیت دەویّ دەتـدەینیّ ئـەویش گـوتی

تـەنها ژنەکـەی بـۆ خـارم بێـنن و خانوویـەکی بـۆ دروسـت بکـەن ئـەوجا خـرک چـۆوە و خاری بەجیٚ هێشت.

**داو دانگ**

ڕۆژێـك لــە ڕۆژان خوشــك و برایــەك هــەبوون بەتــەنها ئــەژیان برایەکــە هــەموو ڕۆژێ دەچـووە ڕاو بـۆ ئـەوەی خوشـکەکەی پـیٚ بژیـەنیٚ ڕۆژیٚ گەیشـتە ئەشـکەوتێکی چـۆل و هـۆل لـە دڵـی خۆیـدا گـوتی: وا باشـە خوشـکەکەم بێنمـە ئێـرە. کـە چـۆوە مـالٚ گـوتی: خوشـکم بـەیانی دەتبـەم بـۆ شـوێنێك کـە زۆر چـۆلٚ و خۆشـە بـۆ ئـەوەی کـەس زەفـەرت پـیٚ نـەبا خوشـکەکەی بـرد و ڕۆژێـك خوشـکەکەی گـوێی لـە ناڵـەناڵێك دەبێـت کـە لـەناو چـاڵێك دەنگەکـە دەهـات ئـەویش سـەری شـۆڕش کـردەوە و گـوتی: تـۆ کێـی گـوتی: منـیش مـرۆڤم ئەگـەر دەرم بـێنی ئـەویش گـوتی: باشـە کـاتیٚ دەری هێنـا دیـتی ئەمـە دێـوە دێوەکـە گوتیـە کچـەکە دەرمانـەك لـە فـلان شـوێنە بیهێنـە بمـدیٚ چـاك دەبمـەوە چـونکە مـن برینـدارم ئـەویش چـوو بـۆی هێنـا و دەرمانەکـەی دایـیٚ خوشـکەکەی لەگـەلٚ دێوەکــە دەســتی خۆیــان تێکــەلٚ کردبــوو بەشــەو خــۆی دەشــاردەوە و بــە ڕۆژیـش لەگـەلٚ کچـەکە ڕایـان دەبـوارد، ماوەیـەکی پێچـوو خوشـکەکەی زگـی بـوو کـوڕەکی بـوو، براکـەی نـەیزانی بـوو دێوەکـە فێلێکـی دامەزرانـد و بـە کچـەکەی گـوت: مەترسـە ئێسـتا مــن فێلێــك دەدۆزمــەوە دێوەکــە چــوو منالەکــەی لەســەر ڕێــی براکــەی دانــا و کوڕەکــە لــەکاتی گەڕانەویــدا دیــتی منــدالێك لەســەر ڕێگــا فــڕیٚ دراوە بۆیــە هــەلی گرتــەوە و بردیـەوە مـالیٚ بـە خوشـکەکەی گـوت: دەبـیٚ بـەخێوی بکـەی خوشکەکەشـی گـەورەی کـردو ناویـان نـا داودانـگ ئـیتر کچـەکە و دێوەکـە لەبـەر کوڕەکـە پێیـان نـەدەکرا قسـە بکـەن، ڕۆژێکیـان کچـەکە بـە کـوڕە بچـووکەکەی گـوت بـڕۆ بـەردێکمان بـۆ بێنـە چـوار ڕەنــگ چــوار پەنجــەش پــان بــیٚ منداڵــەش خــۆی شــاردەوە و هەســتی خــۆی لــە قســەکانی دایکــی و دێوەکــە ڕاگــرت دێوەکــە بــە کچــەکەی دەگــوت: کــاتیٚ براکــەت هاتــەوە ئــەو نــازانیٚ خــۆم دەکەمــە دووپشــك و دەچــمە نــاو پێلاوەکــەی پێیــوە دەدەم و لەوکاتــەدا منداڵەکــە گــەڕاوە و گــوتی: بەردەکــە نــەبوو ئــەوانیش گوتیــان نــەبوو نــەبوو! کــاتیٚ خــاری هاتــەوە و منداڵەکــە لــەکن پێلاوەکــەی دانیشــت خــالی هەســتا لــەپێی بکــا منداڵەکــە گــوتی: هــا خــارە دوپشــك خاریشــی دووپکەکــەی دەرهێنــا و بــە پێلاوەکــەی لێــی داو برینــداری کــرد دێوەکــەش بــەدەرمان خــۆی چــاك کــردەوە بــەیانی دووبــارە برلکـەی ڕۆیشـتەوە بـۆ ڕاویٚ ئـەوجارە تـەکبیری دیکـەیان دانـا و دێوەکـە گـوتی: خـۆم دەکەمــە مــارەك لەســەر دەرگــا بەســەری وەدەدەم و تــاکو بمــری کــاتیٚ براکــەی هاتــەوە

مالْ مندالّەكە گوتی: خالّە گیان دەبێ لەسەر شانتم دانێی دایكیشی دەیگوت: لێی گەڕێ ماندیە خاریشی دڵی نەشكاند هەمدیسان كارەكەیان سەری نەگرت: ئەوجارە دیسان دێوە هاتەوە گوتی: ئەوجارە تەكبیرێكی تر دەكەین دیسان گوتیانە مندالّەكە بڕۆ بەردێمان بۆ بێنە دوو ڕەنگ دوو پەنجە پان بێ هەم دیسان مندالّەكە خۆی مات كرد دێوەكە گوتی: بەیانی كە براكەت چووە ڕاو خۆم دەكەمە باشوكە سەری هەڵدەگرم و دەیكوژم. مندالّەكە گوێی لە قسەكانیان بوو دیسان هاتەوە گوتی: بەردەكە نەبوو گوتیان: نەبوو نەبوو! بۆ بەیانی مندالّەكە گوتی: خالّە لەگەڵت دێمە ڕاوێ سواری سەر ملت دەبم. خوشكەكەی گوتی: هەر تەیرێكتان كوشت پەڕ و باڵەكەم بۆ بێننەوە دەیكەمە بالیف گوتی: خارە خۆش بڕۆ باشوكە خۆی مات كردیە. خالّیشی باشوكەكەی كوشت و گوتی پەڕ و باڵەكەی بۆ خوشكم دەبەینەوە ئەویش گوتی: نا خالّە گیان ئەگەر ئەمە ببەینەوە وەكو خۆی لێ دەكاتەوە و دەبێتەوە دێو ئەویش نەیدەزانی چییە گوتی: وەختی خۆی دێوێك بە خوشكت فێر ببوو تاكو زگی لێ بوو منیش لەوم مندالّەكە هەموو سەر و سەربوردەكەی بۆ خالّی گێڕاوە خالّی گوتی: ئەی چی لێ بكەین گوتی: با بیكوژین كە گەڕانەوە خوشكەكەی كوشت و لەبن عەردیان ناو ژنێكی بۆ خالّی هێنا و مندالّێكیان بوو گوتی: من چیتر لەگەڵ تۆ ناگونجێم چونكە من لە دێوانم ئیتر بەجێی هێشت و چووە ناو قەومی خۆی.

- **باسی قۆناغی گۆڕانی مرۆڤ دەكات لە ڕووی جەستەیی و عەقڵەوە.**

## پاشایەك ژنی نەدەهێنا

پاشایەك هەبوو ژنی نەدەهێنا، ڕۆژێكیان گوتیان كچێك هەیە ناوی سۆرێ چاو شینە گەلەك جوانە. پاشاش لەگەڵیان چووە داخوازی كە دیتی زۆر جوانە مارەی كرد و كاتێ جل و شتی كرد چوو بووكی بینی دیتی كچەكە گۆڕا بوو زڕ داكی سۆرێ چاوشینی كچی خۆی دابوویێ، خەڵك قسەیان پێ دەگوت چونكە ناشیرن بوو بووك. كچەكە زۆر خەفەتی دەخوارد ڕۆژێك لەبەر خوا پاڕایەوە گوتی خوایە بمكەیە ماینەكی سۆر بۆ ئەوەی زاوا بێتە سەر پشتم بە ئەمری خودا كچەكە بووە ماینێكی سۆر زاوا گوتی دەبێ ئیلا و بیلا سواری ئەو ماینە سۆرەم بكەن ئەوەندە گوتیان نابێ دوایی سواریان كرد لەناو گۆمە قوراوێك بەری داوە ئەوجارەش لەناو گۆمەك فڕێی داو بووك گەیشتە جێ. ئەو جارە كچەكە گوتی: خوایە بمكەیە كۆترەك لەسەر سوانی مالّی زاوا بۆ ئەوەی ڕۆژێ دووجار زاوا ببینم بە ئەمری خودا

بوو بە کۆتر، بووك زگی بوو کاتێ ژانی هاتێ منداڵی ببێ گوتی ژانم ژانی کوڕانە گۆشتی کۆتر دەرمانە ئیلا دەبێ ئەو کۆترەم بۆ سەربڕن بەڵام لەکاتی سەر بڕین نابێ خوێن بڕژێ لەکاتی سەربڕینی دڵۆپە خوێنێك کەوتە سەر عەردی و بوو بە دار سێوێك کاتێ پاشا چووە بن دارەکە بەردەوام میوەی خۆش دەهاتە خوارێ، بەڵام کاتێ ژنەکە دەچووە بن دارەکە بەس شتی ناشیرین دەهاتە خوارێ ژنەکە گوتی: دەبێ ئەو دارە ببڕنەوە بۆم بکەن بە لانك ئەوانیش گوتیان: نابێ ژنەکەش گوتی ئەو دارە نەبێ هیچ لانکێکم ناوێ دارەکەیان بڕیەوە کردیانە لانك کاتێ پاشا دەچووە لای منداڵەکە منداڵەکە نەدەگریا بەڵام کاتێ ژنەکە دەچووە لای منداڵەکە دەگریا ژنەکە گوتی دەبێ ئەو لانکە بسووتێنن لانکەکەیان سووتان. بەڵام سەلکە ڕەژوویەك مایەوە و نەسووتا فڕێیاندا سەر گوفەك پیرێژنەك چوو دارەکەی هێناوە لەماڵێ داینا پیرێژن تەونی دەکرد بەیانی کە دەڕۆیی ئێوارێ کە دەهاتەوە ئیش و بستە تەونێکی بۆ دەکرا نەشی دەزانی کێیە ڕۆژێکیان پیرەژن خۆی مات کرد نەچووە دەرێ دەیبینی یەکێك لەبەر تەونی ئەو دانیشتووە ئەویش گوتی: تۆ کێی؟ کچەکەش سەربوردەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. ئەویش گوتی: ئێمە دەبینە دایك و کچ تاکو دەمرین ڕۆژێك کوڕی پاشا تۆپانێی دەکرد تۆپەکەی دەکەوێتە ماڵی پیرەژن. کچەکە غار دەدات تۆپەکە فڕێ بدات گلۆرە داوەکەش بە شمەکی دەنووسێ لە پەلەپەلیان لەبیری دەچێ گلۆرەکە هەڵدەدا کوڕە پاشا گلۆرەکەی فڕێ دەداتەوە دەبینی گلۆرە دەستی ئارموش نیە پیرەژن بهێنن ببینم لەو زیاتر کەسی ترم ناوێ پیرەژن دەڵێ کچم نیە زۆری لێ دەکەن ئەوانیش سەربوردەکەی بۆ دەگێڕنەوە. دەڵێ: من هیچ کچم نیە پاشا دەڵێ کچەکە بهێنن ئەویش دەڵێ ڕاستە من کچم نیە بەڵام ئەم کچەم هێناوەتەوە پاشاش دەڵێت بڕۆین کچەکە بێنن ئەوانیش بەفەرمانی پاشا کچەکە دێنن کچەکەش دەڵێ ڕاستە من کچی ئەو پیرەژنە نیم سەربوردەکەی بۆ پاشا دەگێڕێتەوە و دەڵێ ماینە سۆرەکە من بووم هەروەها کۆترەکەش من بووم و دار سێوەکەش هەر من بووم لانکەکەش من بووم کاتێك لانکەکەتان سووتاند پارچە خەڵوزێك مابوو ئەم پیرەژنە هەڵیگرتەوە پاش ئەوەی پاشا ڕاستیەکانی بۆ دەرکەوت ژنەکەی خۆی تەڵاق داو لەگەڵ سۆرێ چاوشین خێزانێکی بەختەوەریان پێك هێنا.

– بیرۆکەی کراسگۆڕین لەم ئەفسانەیەدا بەرچاوە.

## بەسەرهاتی کوڕێکی گاوان

لە گوندێك پاشایەك هەبوو کچێکی زۆر جوانی هەبوو. گاوانێکیش لە گوندەکە کوڕێکی هەبوو کوڕەکە بەباوکی گوت: دەبێت بچیتە خوازبێنی کچی پاشا. گاوانەکە بەکوڕەکەی گوت پاشا کچی خۆی نادات بەئێمە چەندین کەسی دیکە کە چویتە خوازبێنی. پیاوی گەورە و ماقوولیان ناردووە نەیدایتێ، پاشان گاوانەکە چووە ماڵی پاشا و پاشاش پێی گوت: چیت دەوێ گاوانەکە گوتی: هەندێکم ئیش پێتە نازانم چۆنت پێبڵێم پاشاش دەڵێ چیت پێیە و بڵێ، گاوانەکە گوتی باشە من بەقسەی کوڕەکەم هاتوومە کە زۆر ناچاری کردوومە گوتی: ئەگەر نەچی بۆ ماڵی پاشا من هیچ ئیشێك ناکەم بۆت. لەبەر ئەوەش هاتووم بۆ خوازبێنی کچەکەت، پاشا زۆر پێکەنی و گوتی: چەندکەسێکی ماقول هاتوو کچەکەم ڕازی نەبوو نەبوو، ئینجا پاشا بەکچەکەی گوت کوڕی گاوان هاتۆتە خوازبێنیت، کچەکەش دەڵێ مەرجێکم هەیە دەبێت دوو پەڕی بازم بۆ بهێنێ جا مێردی پێ دەکەم، گاوانیش چووە ماڵێ بەکوڕەکەی گوت: دەبێت بچیتە ئاقار دوو لاشەی مەڕیش لەگەڵ خۆت ببەی وە زۆر ئاگاداری خۆت بی نەوەك گورگ پەلامارت بدات، کوڕەکە چوو بۆ ئاقار، ئینجا لەناکاو بازەك هات بۆ سەر لاشەی مەڕەکان کوڕەکە دوو پەڕی بازەکەی لێ کردەوە و ئینجا چووە ماڵەوە بۆ بەیانی بردی بۆ ماڵی پاشا پەڕەکانی دا بە کچەکە، کچەکەش ڕازی بوو لە دواییدا ئاهەنگێکیان بۆ ساز کرا کە حەفت ڕۆژ و شەوی خایاند و هەروەها پاشاش ماڵ و سامانی خۆی دا بە کوڕەکە لە پاشاندا کردی بەوەزیر.

– ئەم حەکایەتە لە بنەڕەتدا زۆر درێژتر، لێرە تەواو نەکرایە.

## پاشایەکی بێ منداڵ

پاشایەك هەبوو هیچ منداڵی نەبوو کوڕی پیاوێکی هێنا کردی بەکوڕی خۆی ناوی نا ئەحمەد. پاشا خۆی بازرگانی دەکرد لە مۆسڵ شتی دەهێنا و دەیبرد. سەگێکی سۆریان هەبوو پاشا لەکاتی بازرگانی لەگەڵ خۆی دەیبرد هەندێك جار لە ماڵی بەجێی دەهێشت پاشا چیتر نەیتوانی بازرگانی بکات بە ئەحمەدی کوڕی سپارد ئەو لە جێگای پاشا بازرگانی دەکرد پاشا بە ئەحمەدی گوت ڕێگای موسڵ دوو ڕێگای هەیە یەکێکیان دوو ڕۆژی پێ دەچێ ئەوەی تریان پێنج ڕۆژی پێ دەچێ

پاشا بە ئەحمەدی گوت پاشایەك لەوێ هەیە كچێكی هەیە كچەكەی ناتوانێ قسە بكات هەر بازرگانێك یان هەر رێبوارێك بچێتە ئەو شوێنە پاشایەكە پێیان دەڵێ كچێكم هەیە ناتوانێت قسە بكات هەر كەسێك بتوانێ ئەو كچەی من بەقسە بێنێ ئەو هەموو ماڵ و سەروەت و سامانی خۆمی دەدەمێ، ئەحمەد كاتێك شتەكانی خۆی فرۆشت و ئەو شتی دەیویست كڕی و دوایی چووە ماڵی پاشا پێی وت من ئەمشەو دێم بۆ ماڵی ئێوە. كەچوو لەبەر دەرگای ئەو ژوورە كچێك راوەستاوە كە كچەكەش زۆر جوان نەبوو شەوێ بەردەرگاكەی قوڵ كرد بەدزی بینی حەزیایەك لەوێیە كە عاشقی كچەكە بوو ئەحمەد حەزیاكەی كوشتوو بەیانی كچەكە هەندێك بەقسە هاتبوو باوكی كچەكە، كچەكەی خۆی دا بە ئەحمەد و ماڵ و موڵكی پێدا لەكاتی چوونەوەیدا نەچووە رێگەی دوو شەوەكە بەو كەسانەی گوت كە لەكەڵی بازرگانییان دەكرد ئەمن دەچمە بن ئەم چیایە هەندێك ئیشم هەیە سەگەكەی لەگەڵ خۆی برد بن چیایەكە حەزیایێك هات و دوو چاوی دوڕی بریسكەداری هەبوو حەزیایەكە بە ئەحمەدی گوت سەگەكەی بكوژە و كەوری كە جەرگی لێ دەربهێنە و بیسووتێنە وەكو كل ووردیكە هەر كەسێك كوێر بێ پێی چاك دەبێتەوە ئەحمەد قسەكانی جێ بەجێ كرد. دەرمانەكانی لە گیرفای خۆی كرد هەندێك رۆیشت رووی چووە بن چیایەك كچەكەی لەگەڵ خۆی برد هەردوو دەستی بەستەوە سەراوژێری هەڵواسی بەشیرەكەی لەولاو لەولای تەنیشتی كچەكەی دەدا دڵی نەدەهات لە كچەكە بدات هەموو مارەكانی ناو مێشكی دەرهاتن و كچەكە زۆر باش بوو لەگەڵ خۆی بردی بۆ شاری خۆی.

- لەم حیكایەتە ئەفسانەییانەدا، زۆریەی كێشەكان لە نێوان برا و خوشك و برا و ژن و مێرد دایە، كە لەمانە ئەو روون دەبێتەوە، كە مەرج نیە خراپ هەر تەنیا لە كەسی نەناس و دوورەوە بێت، ئەوەتا برا فێڵ لە برای دەكات و خوشك خیانەت لە برای دەكات و ژن و مێردیش هەر هیچ، ئەم حیكایەت و ئەفسانانەش دەچنە خانەی حەكایەت و ئەفسانەی پەروەردە كردن.

# دیلاب زەنگلەك

هەبوو نەبوو كەس ل خودێ مەزنتر نەبوو. پیرەژنەك ل گوندەكێ بوو چەند بزنێ وێ هەبوون. هەموو رۆژان پیرەژنێ بزنێد خوە ددۆتن و شیرێ وان ل سەر كولەگا خانی ددانا و رێویەكژی دهات و شیرێ پیرێ دخوار.

پیرێ نەدزانی كێ شیرێ وێ دخۆت. رۆژەكێ پیرێ خوە ل ناو تەلیس و چوالێ ناری وەشارت. دیت كو رێویەك هات و شیرێ وێ ل سەر كولەگێ ئینا خوارێ و دەست بە خوارن شیری كرد. پیری دەستێ خوە هاوێتە دێلاّ رێوی و رێوی تەست هەلاتنی كر. ئێك ل رێوی و ئێك ل پیرێ. رێوی فركەك خوە داو هەلات، لێ دێلا وی قەتیا و ما ناو دەستێد پیری دا.

رێوی چوو ناو هەڤالێد خوە، هەڤالا بەردانێ و نەهێلان بچیتە ناو وان، گوتنێ كا دێلاتە، تو بوچی وسا لێ هاتیی. رێوی نەشیا ناووان بمینە و چو لایێ پیرەژنی گوتێ پیری تو سەرێ بابێ خوە دێلا من بدەڤە، وا ئەز دچمە ناو هەڤالێد خوە ناهێلن ئەز بچم ناو وان دب من دكەنن. پیرێ گوتی هەرە شیرێ من بینە، دا دێلاتە بدەم تە. رێوی چو بال بزنێ گوتی بز شیر بدە، بو پیر بدە، پیر دێلا مام رێوی بدە.

بزنێ ژی گوتێ هەرە بۆ من چلوی بینە. رێوی چو ئالیێ دارێ. گوتە دارێ، دار چلوی بدە، بۆ بز بدە، بز شیر بدە بۆ پیر بدە، پیر دێلا رێوی بدە. دارێ گوتێ هەرە ئاوێ بۆ من بینە. مام رێوی چو گوتە كانیێ، كانی ئاو بدە، بو دار بدە، دار چلوی بدە بۆ بز بدە، بز شیر بدە، بۆ پیر بدە، پیر دێلا مام رێوی بدە. كانی دبێژتێ هەرە كچێت پارچە بینە بلا سەربانێ من داوەتێ بكەن. رێوی دچە پال وان ژی ئەو دێژنە مام رێوی هەرە بومە سۆلێ كوندرمە بینە. رێوی دچە بۆ كچێن پاشایان كوندرما دكرە. كچ تێن سەربانێ كانیێ داوەتێ دكەن. كانیێ ئاودا، بو دارا. دارێ چلوی دا. بۆ بزدا. بز شیردا، بو پیردا. پیر دێلا مام رێوی دایێ و زەنگلەك ژی پێوەكر و بەردا. رێوی چو ناو هەڤالێد خوە هەمیا گوتێ رێوی ئەو دێلە كیوە ئینایە. چكی جوانە! مام رێوی گوت وان

هەرن دێلا خوە حەرتیدکی ل ناو ئاودا بەردەرێ پیری دانێن با وەژی دێ وس جوان بە. ئەو ژی چون و ساکرن. هەتا حەوتیەك گشتێ دێلا هەندەکا قەتیا دیا هندەکا قەرسی. مام رێوی یێ دێل زەنگل دەورا وان دزڤری و دگوت وان ئەوە ژی تولا من دا هوین چوجارا ب هەڤالێ خوە نەکەنن.

مودیدێ شێرالی، سێوەدەری

- **چیرۆکێکی فۆلکلۆریە و تایبەتە بۆ منداڵان و بە هەموو شێوازەکانی کوردی هەیە و دەچێتە ریزی چیرۆکی گیانداران.**

# تەعبیری خەونی پاشا

کۆکردنەوەی: هەردی ئەبوبەکر ئەحمەد
گێڕانەوەی: بەهرۆز محەمەد عەبدولکەریم

پاشـایەك هـەبوو شـەوێك خـەونێك دەبـینێ، بـۆ بـەیانی دەڵێـت هـەر كەسـێك تـەعبیری خەونەكـەم بـۆ لێكبداتـەوە خـەڵاتێكی گـەورەی دەدەمـێ، كـەس نازانێـت تـەعبیری خەونەكـەی پاشـا بكـات، كابرایـەك هـەبوو شـوان بـوو دەمـەدەمی نیـوەڕۆ قاپێـك شـیر لەبـەر خـۆر دادەنـێ لـەناكاو مـارێكی گـەورە پەیـدا دەبـێ و قاپـە شـیرەكەی شـوانەكە دەخـوات. شـوانەكە دێ بەسـەریا، مارەكـە دەڵێـت لـەبری شـیرەكەت كـە خواردوومـە چـیت دەوێ بـۆت بكـەم. شـوانەكە دەڵـێ پاشـایەكمان هەیـە خـەونی دیـوە، دەڵـێ ئـەوەی تـەعبیری خەونەكـەم بـۆ لێكبداتـەوە خـەڵاتێكی گەورەی دەدەمێ، تۆش ئەی مار تەعبیری خەونەكەی پاشام بۆ بكە.

مارەكە دەڵێ باشە بەمەرجێك پاشا چی پێشكەشت كرد نیوەی بۆ من بێت.

شـوانەكە دەڵـێ باشـە و خەونەكـە بـۆ مارەكـە دەگێڕێتـەوە. مارەكـە دەڵێـت تـەعبیری خـەونی پاشـا ئەوەیـە (ئەمانـەت لای هـیچ كەسـێك نـامێنێ لـە وڵاتەكـەتان كـەس سـیقە بەكـەس ناكـات) شـوانەكەش دەچـێتە خزمـەتی پاشـا و دەڵـێ پاشـام سـەلامەت بـێ تـەعبیری خەونەكـەت ئەوەیـە ئەمانـەت لای هـیچ كـەس نـامێنێ لـە وڵات، خـەونی پاشـا دێتـە دی و ئەمانـەت نـامێنێ لـە وڵات، پاشـا خـەڵاتێكی گـەورە پێشـكەش بەشـوانەكە دەكـات كـە (ڕبەیـەك زێـڕ)ە، شـوانەكەش هەڵدەسـتێ نیـوەی زێڕەكـە بـۆ خـۆی گـل دەداتـەوە. نیوەكـەی تـریش دەبـات بـۆ لای مارەكـە و دەیكـات بـە دوو بەشـەوە بەشـێكی بـۆ خـۆی هەڵـدەگرێ و بەشێكیشـیدەدات بـە مارەكە.

بۆماوەیـەكی تـر پاشـا خـەونێكی تـر دەبـینێ بەهـەمان شـێوە دەڵـێ هـەر كەسـێ تەعبیری خەونەكەم بكات خەڵاتێكی گەورەی دەكەم.

دووبـارە شـوانەكە دەچـێتەوە لای مارەكـە و دەڵـێ ئـەی مـار پاشـام خـەونی دیـوە وەرە تـۆ دەزانـی تـەعبیری خـەون بكـەی تـەعبیری ئـەو خـەوەم بـۆ بكـە مارەكـە

بەهـەمان شـێوە دەڵـێ باشـە خەلاتەکـەی بـە نیـوەی شـوانەکە دەڵـێ باشـە، خەونەکـە بـۆ مارەکـە دەگێڕێتـەوە مارەکـەش دەڵـێ بـڕۆ بـە پاشـات بڵـێ (لـە وولاتەکەتان خوێن دەڕژێ).

شـوانەکە دەکەڕێتـەوە بـۆ شـار و دەچـێتە خزمـەت پاشـا و دەڵـێ پاشـا گیـان تـەعبیری خەونەکـەت ئەوەیـە (لـە وولاتـدا خـوێن دەڕژێـت) دوای ماوەیـەك خـەونی پاشـادێتە دی و تـەعبیری شـوانەکەش ڕاسـت دەردەچـێت، پاشـاش (دوو ڕبـە) زێـڕ بەخەلات دەدات بە شوانەکە.

لـە کـاتی چـوونی شـوانەکە بـۆ لای مارەکـە شـواەکە تـەماح دەیگـرێ و دەڵـێ بۆچـی ئـەو هـەموو زێـڕە بـدەم بـەو مـارە مـار زێـڕی بۆچیە لـە دڵـی خۆیـدا دەڵـێ بیکـوژم باشە کە دەگاتە لای مارەکە سەیر دەکات لەبەر دەم کونەکەی نوستووە.

شـوانەکە دارێکـی بـۆ ڕادەەشـێنێ بـەر کلکـی مارەکـە دەکـەوێ خـوێنی لـێ دەڕژێ. کەچـی مارەکـە نـامرێ و دەچـێتە کونەکەیـەوە کـابرای شـوانیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ماڵ و هەردوو ڕبە زێڕەکەش لەگەڵ خۆی دەباتەوە.

پـاش ماوەیـەکی دیکـە پاشـا خـەونێکی تـر دەبـینێ، دار و دەسـتەی پاشـا دەچـنە لای شـوانەکە و دەڵـێن وەرە تـەعبیری خـەونی پاشـامان بـۆ بکـە تـۆ دەزانـی خـەون لێك بدەیتەوە.

شـوانەکەش دەڵـێ نـازانم تـەعبیری خـەونی پاشـا بکـەم. بـەلام زۆری لـێ دەکـەن و دەڵــێن چــۆن دووجــاری پێشــوو زانیوتــە و ئێســتا نــازانی ئەگــەر تــەعبیری خەونەکـەی پاشـا نەکـەی ئـەوە پاشـا لـە ملـت دەدا. هـەر بۆیـە شـوانەکە دەڵـێ باشــە دوای دوو ڕۆژی تــر تــەعبیری خــەونی پاشــاتان بــۆ دەکــەم. بــەلام لای دار و دەسـتەی پاشـا ناڵێـت مـار تـەعبیری خەونـەکان دەکـات ئەگـەر بیگوتایـە مـار باوەڕیـان پـێ نـەدەکرد. دواتـر بەناچـاری شـوانەکە دەڕوات بـۆ لای مارەکـە و هـەموو زێڕەکـەش لەگـەڵ خـۆی دەبـات دەڵێـت ئـەی مـار ئـەوە هـەموو زێڕەکـەم هێنـا پاشـام خـەونی دیـوە تـەعبیری خەونەکـەم بـۆ بکـە، ئەگـەر تـەعبری خەونەکەی پاشام بۆ نەکەی ئەوا لە ملم دەدەن.

مارەکـە دەڵـێ یەکـەم ڕۆژ هـاتی وتـت تـەعبیری خـەونی پاشـام بـۆ بکـە منـیش گـوتم

بەمەرجێك پاشا چی خەڵات كردی بە نیوەییمان تۆش گوتت باشە، منیش گوتم ئەمانەت نامێنێ فێڵ و فەرەج بڵاو دەبێتەوە لای هەموو كەس لای تۆش نەما و خیانەت و فێڵت لە من كرد نیوەی زێڕەكەت بۆ خۆت شاردەوە.

دواتر كە وتم خوێن دەڕژێ دەبوایە خوێن لە هەموو جێگەیەك بڕژێت تۆش لەبەر تەماعی خۆت بەدار لە كلكی منت داو خوێنی منت ڕژاند.ئێستاش تەعبیری خەونەكەی پاشات ئەوەیە (كە وولآت بەرە و ئامان و باشی و ئاشتی و خۆشی دەڕوات و متمانە بۆ هەموو كەس دەگەڕێتەوە و خوێن ڕشتن كۆتایی دێت و لە خۆشیدا دەژیت). تۆش ئێستا هاتووی بۆ لای من هەموو زێڕەكەت لەگەڵ خۆتا هێناوە خەڵك هەمووی باش بووە تۆش دەبێ باش بیت ئازایەتی خۆت نییە، پێشتر خەڵك لەگەڵ یەكتری خراپ بوون و خوێن دەڕژا، ئێستاش ئاستی ئاشتی و ئارامیە خەڵك هەمووی ڕاستگۆ و دەست پاكن تۆش دەبێ وابی. دەبڕۆ هەموو زێڕەكەش لەگەڵ خۆت بەرەوە هەمووی بۆ خۆت من مارم زێڕم ناوێت بۆچیمە بڕۆ لاچۆ لەبەر چاوم. شوانەكەش لەو كردەوانەی بەرامبەر مارەكە كردی پەشیمان بۆوە. پاشان دەڕوات بۆ خزمەتی پاشا و دەڵێت پاشام سەلامەت بێت تەعبیری خەونەكە ئەوەیە (كە وولآت بەرە و ئامان و باشی و ئاشتی و خۆشی دەڕوات متمانە بۆ هەموو كەس دەگەڕێتەوە خوێنڕشتن كۆتایی پێدێ ئیتر بە ئاسوودەی و كامەرانی دەژین وولآتەكەمان خۆشی و ئارام دەبێ).

– ئەم حەكایەتە كە حەكایەتی گیاندارانە، پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ، كە قەدەر ئەم جیهان وژیانە بەڕێوەدەبات.

# له تۆ ئازاتر هەیە

**گێڕانەوەی: بەهرۆز محەمەد عەبدولکەریم**

پاشایەك هەبوو پاشایەکی بەناوبانگ بوو کچێکی زۆر جوان و خانومانی هەبوو سەرنجی هەموو کوڕێکی بۆ لایخۆی ڕاکێشا بوو زۆر کەس دەهاتنە داوای پاشا کچەکەی نەدەدا پێیان.

بۆ دواجار کوڕە پاشایەك هاتە داوای کچەکە شوی پێ کرد. دوای ئاهەنگ گێڕان و گواستنەوەی بۆ ماوەی چەند مانگێك کچەکە نەهاتەوە بۆ مالی باوکی، جارێکیان کە هاتەوە ڕەنگی تێك چووبوو زۆر لاواز بوو، باوکی سەری سوڕما لە کچەکەی کە لەو ناز و نیعمەتە دایە ئەوهای بەسەر هاتووە.

پرسیاری لێ کرد و گوتی کچم بۆ بەو شێوەیە ڕەنگت تێك چووە و لاواز بووی، خۆ تۆ ژیانت زۆر خۆشە.

کچەکەش وەلامی دایەوە و گوتی: باوکە چیت لێ بشارمەوە مێردەکەم لەگەلم باش نییە، لە مالەوە باخچەیەکمان هەیە مێردەکەم هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو دەمباتە ناوی و لەوسەری باخچەکە دامدەنێ، سێویێکیش لەسەر سەرم دادەنێ لەوسەری باخچەکەوەش بەتیر لێی دەدات و لەتی دەکات، پاشان دێتە لام و دەلێت ئایا کەس لە من ئازاتر هەیە منیش لە ترسا دەلێم نا کەس لە تۆ ئازاتر نییە. منیش ئەترسم ڕۆژێك تیرێکم لێ بدات بمکوژێت. بۆیە وا لاواز و بێ تاقەتم ژیانم لێ تال بووە.

باوکی کچەکەش زۆر زیرەك بوو بە کچەکەی گوت بڕۆوە ئەمجارە ئەگر ئەوهای لێت کرد و گوتی کەس لە من ئازاتر هەیە تۆش بلێ بەلێ. ئەگەر گووتی کێیە؟ بلێ فلان کەسە و لە فلان شوێنە. کچەکە دەچێتەوە مالی مێردەکەی هەروەك و جارانی پێشوو سبەینێ زوو دیسان بردیە ناو باخچەکە و سێویێکی لەسەر سەری دانا و بەتیر لێی داو لەتی کرد، هاتە لایی و بە کچەکەی گووت: ئایا کەس لە من ئازاتر هەیە. کچەکەش گووتی: بەلێ لە تۆ ئازاتر هەیە، مێردەکەی

تـوڕە دەبـێ و دەڵـێ کـێ لـە مـن ئـازاتر هەیـە ئـەویش ناونیشـانی ئـەو پیـاوەی دەداتێ کە باوکی پێی دابوو.

مێردەکـەی هەسـتا و بـە توڕەییـەوە سـواری ئەسـپەکەی دەبـێ و بـەڕێ دەکـەوێت بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە پیـاوە ئازاکـەی لێیـە. بـۆ ماوەیـەکی زۆر دەڕوات تـا دەگاتـە ئەو شوێنە، لە دەرگا دەدات و پیاوەکە دێتە دەرەوە.

مێـردی کچـی پاشـا پرسـیاری نـاوی لـێ کـرد ئـەو پیـاوە بـوو کـە مەبەسـتی بـوو. یەکسەر بە توڕەییەوە پێی گوت ئایا تۆ لە من ئازاتری؟

پیـــاوە ئازاکـــە زۆر زیـــرەك بـــوو وەڵامـــی دایـــەوە و گـــوتی: جـــارێ وەرە ژوورەوە دانیشـــە ئیســـراحەتەك بکـــە نـــان بخـــۆ تـــا بەســـەرهات و ئازایـــەتی خۆمـــت بـــۆ بگێڕمەوە.

مێـردی کچـەکە چـووە ژوورەوە مانـدووبوونی حەسـایەوە و نـانی خـوارد. دوای نـان خـواردن سـاحێب مـاڵ واتـا ئازاکـە دەسـتی کـرد بـە گێڕانـەوەی ئازایـەتی خـۆی و گـووتی (مـن کـوڕی پاشـا بـووم بـاوکم پاشـای وڵات بـوو خـاوەن هێـز و دەسـەڵات و داراییـەکی زۆر بـوو، بـرادەرێکم هـەبوو هـەموو سـاڵێك دەهاتـە سـەردانیم هـەر کـاتێ بهاتایـە (١٢) ڕۆژ لـە لام دەمایـەوە، کـاتێکی زۆر خۆشمـان دەبـردە سـەر، بـە بەردەوامی تا چەند ساڵێك بەو شێوەیە ئەو برادەرەم دەهاتە سەردانیم.

سـاڵێك کـە هاتـە لام یەخـەی گـرتم و گـوتی تـۆ پیـاو نیـت یـا مـن بـە پیـاو نـازانی بۆچـی تـۆ نایەیتـە سـەردانیم لـە مـەودوا منـیش نایەمـە سـەردانیت. بـەڵام ئەگـەر ئیشـت بـەمن کـەوت یـا تووشـی موسیبەتێك بـووی ئـەوا نـاوی مـن بهێنـە خـەڵکی زۆر مـــن دەناســـن، منـــیش قســـەکانیم زۆر بەئاســـایی وەرگـــرت چـــونکە لام وابـــوو پێویســـتیم بـــەهیچ کەســـێ نـــابێ و لەبـــەر ئـــەوەی مـــن بـــاوکم پاشـــا بـــوو خـــاوەن دەســـەڵات و داراییـــەکی زۆر بـــوو، دواتـــر برادەرەکـــەم ڕۆیشـــت و ســـاڵێکی پێچـــوو، هێـــزی دوژمـــن دای بەســـەرماندا و وڵاتەکـــەمانی داگـــیر کـــرد، هەرچـــی هێـــز و دەســـەڵاتمان هـــەبوو لـــەناو چـــوو، بـــە تـــەنها مـــن و کچـــە ئامۆزاکـــەم توانیمـــان دەربازبین لەو شەڕە گەورەیە. ئەو کچە ئامۆزایەم مارەبڕم بوو.

لـە ترسـی سـوپای دوژمـن بـە تـەواوی لـە وڵاتـی خۆمـان دوور کەوتینـەوە، ڕۆژێـك لـە کـاتی ڕۆیشـتن لـە ڕێگـادا قەسـرێکی گـەورە بـەدیار کـەوت، منـیش بـە ئامۆزاکـەم گـووت: تـۆ لێرەبـە تـا بچـم بـزانم ئـەو قەسـرە چـی لێیـە، چـوومە نزیـك قەسـرەکە

تەماشـام کـرد قەسـرێکی زۆر گەورەیـە، (مەحکەمـە) دەرگایـەکی پـۆڵاینی گـەورەی پێوەیە، کەس نەیدەتوانی بیکاتەوە و بچێتە قەسرەکە.

گەڕامـەوە لای ئامۆزاکـەم لـە پـاڵ کۆمـەڵێك قەسـەڵ شـاردمەوە دواتـر بـە ئامۆزاکـەم گـووت: مـن لـەوێ ئـەبم تـا خـاوەنی ئـەو قەسـرە دێـت. بـەڵکو مۆڵـەتی لـێ وەردەگـرم کـە جێگامـان بکاتـەوە لـەوێ بحەسـێینەوە، لـە ترسـی ئـەوە ئامۆزاکـەم شـاردەوە چـونکە نەمـدەزانی خـاوەنی قەسـرەکە کێیـە پیـاو چـاکە یـا خراپـە، دواتـر چـاوەڕوان بـووم تـا ئێـواریّ درەنـگ، هـەر کـاتێکم زانـی (چـل سـوار) بـە ئەسـپ و ئەسـبابی جەنگـەوە هـاتن بـۆ لای قەسـرەکە بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەوان خـاوەنی قەسرەکەن.

چـووم بـۆ لای سـەرۆکەکەیان کـە کابرایـەکی بـە قیافـە و سـەر گـەورە بـوو وا دیـار بوو بە توانا و لێهاتوو بوو، لە ڕووی شەڕەوە پیاو سامی لێ دەکرد.

گـوتم گـەورەم ئەگـەر بکرێـت ئەمشـەو جێم بکەنـەوە لێـرە بحەسـێمەوە، ئـەویش بـە پێکەنینـەوە گـووتی فـەقیر تـۆ چـیت پـێ دەکـرێ ئەگـەر (ناڵـدار) هاتبێـت ناڵیمـان ڕزانـدووە – ئەگـەر باڵـدار هـاتبێ باڵیمـان شـکاندووە). لێرەبـە منـیش گـوتم بـەس شـەو دەرگـە پێـوە مـەدەن مـن شـەوان دەچـمە دەرەوە بـۆ حاڵـەتی پێویسـت. مەبەسـتم ئـەوە بـوو تـاکو ئامۆزاکـەم بێنمـە ژوورەوە ئـەو شـەوە لـەوێ بمێنینـەوە و تـا بـەیانی لـەوێ بـەڕێ بکـەوین بـەو شـێوەیە ژوورێکیـان دا پـێم شـەو چـومە دەرەوە (فـەرەنجی)یـەکی گـەورەم لەبـەر بـوو واتـا قـاپوت، ئامۆزاکـەم نایـە بنیـەوە و لەگـەڵ خۆمـدا هێنامـە ژوورەوە و خـەوتین. درەنگـانی شـەو گـوێم لـە دەنگـی گـۆرانی و شـایی بـوو، هەسـتام دیـتم ئافرەتێـك لـەناو چـل سـوارەکە سـەما دەکـات، منـیش لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم ئەمانـە ئێـوارە ئافرەتیـان پـێ نـەبوو، ئـەم ئافرەتـە لـە کوێـوە هـات دواتـر تەماشـام کـرد ئامۆزاکـەم نـەماوە چـۆتە نـاو ئـەوان، ئـەوە لـە ناویان سەرخۆشە و ڕەقس و سەما دەکات.

منــیش تــوڕە بــووم و چــوومە لای ســەرۆکەکەیان، گــوتم ئامۆزاکــەم بدەنــەوە، مەبەستم ئەوە بوو کە بمدەنەوە بیکوژم. چونکە ئەو خیانەتی لێم کرد.

ســەرۆکەکەیان پێکــەنی و گــوتی بــڕۆ فــەقیر دێــو نــاتوانێ لــە ئێمــەدا تــۆ چــیت ناتدەینەوە.

منــیش یەکســەر برادەرەکــەم بــەبیر هاتــەوە کــە باســی قارەمانیــەتی و ئازایــەتی

خـۆی دەکـرد، پێمـی گوتبـوو ئەگـەر ڕۆژێـك لێـت قـەوما ناوبـانگی مـن بـدە. منـیش ناوبـانگی ئـەوم دا یەکسـەر سـەرۆکەکەیان لـە جێـی خـۆی هەسـتاو بەسـەر سـامییەوە گـوتی ئـەو کابرایـە لـە کـوێ دەناسـی. ئێمـە بـە بـەردەوام بـە چـل سـوارەوە ڕۆژانـە لەگـەڵ ئـەو کابرایـە دەجـەنگین تـەنها لـە سـاڵێك دوانـزە ڕۆژ نـەبێت، بـە تـەنیا بـەرەنگاری هـەمووومان دەکـات، منـیش زانـیم ئـەو برادەرەمـە و ئەو دوانزە ڕۆژەی کە شەڕیان نەدەکرد، دەهات بۆ لامن.

منـیش لـە دڵـی خۆمـدا گـوتم مـادام برادەرەکـەم ئـەوها کابرایـەکی ئـازا و چـاو نەترسـە، ئـەی بـۆ مـن نەجـەنگم لەگـەڵیان خـۆ تـازە هـەموو شـتێکم لـە دەسـت داوە (وولاَت، بـاوك، سـامان، هێـز، تەنانـەت ئامۆزاکەشـم کـە خۆشەویسـترین کـەس بـوو لـەلام). یەکسـەر بڕیـاری جـەنگم دا لەگـەڵیان، گـوتم گـەورەم یـان ئامۆزاکـەم بدەنەوە یان وەرنە مەیدان بۆم.

سـەرۆکەکەیان بـە پێکەنینـەو گـوتی فـەقیر ئـەتوانی، منـیش گـوتم بـەڵێ وەرنـە مەیـدان بـۆم، ئـەویش (دە) نەفـەری نـاردە مەیـدان بـۆم لەگـەڵیان جـەنگام نزیکـەی سـەعات و نیوێـك تـوانیم ئـەو دە نەفـەرە بکـوژم، چـوومە پـێش سـەرۆکەکەیان دیسـان گـوتم یـان ئامۆزاکـەم یـان وەرنـە مەیـدان بـۆم، دیسـان پێکـەنی و گـوتی فـەقیر دەتـوانی گـوتم بـەڵێ (دە نەفـەر)ی تـر هـاتن، ئـەو دەنەفـەرم کوشـت بـەلاَم زۆر بـە زەحمـەت، چـونکە لـەو دە نەفـەرەی پێشـوو لێهـاتوو تـر بـوون ئامۆزاکەشـم بەردەوام بوو لە ڕەقس کردن، ئەوانیش ئاهەنگی خۆیان دەگێڕا.

دیسـان داوام کـرد، یـان ئامۆزاکـەم یـان وەرنـە مەیـدان دە نەفـەری تـر هـاتن لەگـەڵیان جـەنگام، ئـەو دە نەفەرشـم کوشـت، بەقـەدەر بیسـت نەفەرەکـەی تـر مانـدویان کـردم، لـە هـەموو لایەکـەوە برینـدار ببـووم. دیسـان چـومەوە پـێش سـەرۆکەکەیان داوام لێکـرد ئامۆزاکـەم بدەنـەوە یـان وەرنـە مەیـدان، وەك جـاران پێکـەنی و گـوتی فـەقیر لـەبارت هەیـە گـوتم بـەڵێ، نـۆ نەفـەری تـر هـاتن بەتـەنها خـۆی مایـەوە ماوەیـەکی زۆر لەگـەڵیان جـەنگام، زۆر مانوویـان کـردم لـە کۆتاییـدا تـوانیم سـەرکەوم بەسـەریانداو بیـانکوژم. بـەلاَم بەقـەدەر سـێ نەفەرەکـەی تـر مانـدوویان کـردم، دیسـان چـوومە پـێش سـەرۆکەکەیان داوام لێکـرد ئامۆزاکـەم بداتـەوە یـان لەگـەڵم بجـەنگێ، پێکـەنی و گـوتی فـەقیر توانـات مـاوە، گـوتم بـەڵێ وەرە پێشەوە.

هاتـە مەیـدان بـۆم، کابرایـەکی زۆر زەبـەلاح بـوو قـەدێکی دەشـکایەوە بەسـەرمدا،

یەکسەر ملمی گرت و ویستی بەشیر لەسەر پشتم بدات، منیش بە شمشێرەوە دەستێکم بۆی ڕاوەشاند. ئیتر ئاگام لەخۆم نەما. کاتێک بەئاگا هاتمەوە ئەو دەستەی کە ڕام وەشاند بوو، بەر ملی کەوتبوو ملی لەلاشەی جیا کردبۆوە، جەستەی منیش جێی نەما بوو بەر تیغ نەکەوتبێ، هەموو برینداربوو، ئامۆزاکەشم بەسەرخۆشییەوە هەر خەریکی ڕەقس کردنی خۆی بوو، هەستام چووم ئەویشم کوشت، زۆر ماندوو بووم بەهەر شێوەیەك بوو برینەکانی خۆم پێچا و سواری ئەسپێك بووم، بە ڕێ و شوێن پێی ئەو سوارانەی ئەوان بەڕێ کەوتم، ماوەیەك ڕۆیشتم، دیتم سوارێك بە پرتاو هات لە دوورەوە بە جوێن دان، دیار بوو ئەی گوت (ئێوارە زۆر ماندووم کردی بۆیە ئێستا وا زوو هاتوویتەوە).

کە نزیکم کەوتەوە دیتی هەموو گیانم خوێن بوو یەکسەر وەستا چاوم پێی کەوت ئەو برادەرەم بوو کە لەگەڵ چل سوارەکە دەجەنگا و، پێشتر دەهات بۆ لام، یەکسەر دەستمان کردە ملی یەکتری و یەکترمان ماچ کرد، زۆر خۆشحاڵ بووین کە جارێکی تر یەکترمان بینیەوە. بردمیە ماڵی خۆیان برینەکانمی تیمار کردم، دوای ئیسراحەت باسەکەم بۆ گێڕایەوە، برادەرەکەم بڕوای پێم نەکرد تا چوینە سەر لاشەی سوارەکان.

ئینجا لای برادەرەکەم مامەوە، تا بە تەواوی چاك بوومەوە، خوشکێکی هەبوو، مارەی لێم بڕی و دای پێم، دواتر توانیمان لەگەڵ برادەرەکەم، بێینەوە وولاتی خۆمان و ڕزگاری بکەین ئەوە بەسەرهاتی من بوو).

یەکسەر مێردی کچەکەی پاشا هەستا و گوتی بەڵێ کەسی ئازا و قارەمان زۆرە ئیتر دوای گەڕایەوە بۆ ماڵ چیتر سێوی لەسەر سەری ژنەکەی دا نەنا، خۆی بە ئازا نەدەزانی، داوای لێبووردنیشی لە هاوسەرەکەی کرد.

هەر بۆیە نابێ ئێمەش خۆمان لە هەموو کەسی پێ ئازاتر و زیرەکتر و چاکتر بێت، چونکە لە ئێمە ئازاتر و بە تواناتر و زیرەکتر هەیە.

**– حیکایەتێکی پەند ئامێزە و مرۆڤ فێری دوور بینی و لەخۆ بایی نەبوون دەکات.**

## تەكبیری پیاوە زیرەكەكە

ڕۆژێك كابرایەكی زیرەك بە ڕێگایەكدا دەڕوات لە ڕێگادا تووشی كابرایەك دەبێت بارە سێوێكی پێیە وا دیار بوو سێو فرۆش بوو، سڵاوی لێ دەكات لە ڕێگادا بەیەكەوە دەڕۆن ماوەیەك ڕێ دەبڕن.

پیاوە زیرەكەكە بە كابرای سێو فرۆش دەڵێ سێوێكم بدەیە چیرۆكێكت بۆ دەڵێم.
سێو فرۆش سێوێكی دەداتێ.

پیاوە زیرەكەكە لێی وەردەگرێ و سێوەكە سپی دەكات و دەیخوات چیرۆكەكەی بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ(( كە یەكەمجار تووشی یەكێك بووی یەكەمجار پرسیاری ناوی لێ بكە زۆر بەباشی ناونیشانی وەرگرە و خۆتی پێ بناسێنە)).

كابرای سێو فرۆش ئەمە چیرۆكەكەت بوو؟ ئەمە كەی چیرۆكە وەڵا هیچ نەبوو. پیاوە زیرەكەكە دەنگی نەكرد ماوەیەكی تر ڕۆیشتن دیسان بە كابرای سێو فرۆشی ووت سێوێكی ترم بدەیە چیرۆكێكی ترت بۆ دەگێڕمەوە.

كابرای سێو فرۆش وتی باشە بەس وەك چیرۆكەكەی یەكەم نەبێت. سێوێكی تری دەداتێ سپی دەكات و دەیخوات چیرۆكەكەی بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ ((قسەی دڵت لای كەس مەكە)). كابرای سێو فرۆش زۆر تووڕە دەبێ دەڵێ ئەمە كەی چیرۆكە هەر بڵێ حەزم لە سێوە پارەم پێ نیە بكرم باشترە سێوم ئەدا پێت. پیاوە زیرەكەكە هیچ دەنگ نەكرد بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن ماوەیەكی برد دیسان پیاوە زیرەكەكە بە كابرای سێو فرۆشی ووت: سێوێكی ترم بدەیە چیرۆكێكی تری خۆشت بۆ دەڵێم.
كابرای سێو فرۆش ئەڵێ ئاخر وەك چیرۆكەكانی تر نەبێت.

پیاوە زیرەكەكە نەخێر وەك ئەوانی تر نییە جیاوازە لەوانی تر. سێوێكی تر وەردەگرێ و سپی دەكات و دەیخوات و چیرۆكەكەی بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ ((لە جێگایەك دابنیشە كەس هەڵت نەستێنێ)).

كابرای سێو فرۆش تووڕە دەبێ كۆمەڵێ قسەی ناخۆش و جوێنی پێ دەدات دەڵێ: تۆ حەزت لە سێوە بۆیە وا دەكەی، بەردەوام دەبن لە ڕۆیشتن تاكو دەگەنە دوو ڕیانێك. كابرای سێو فرۆش بە ڕێگایەكیان دا دەڕوات و كابرا زیرەكەكەش بە ڕێگاكەی تردا دەڕوات، دوور دەكەونەوە لەیەك مەسافەیەكی زۆر. كابرای سێو فرۆش بارە سێوەكەی لێ دەكەوێتە خوارەوە لەسەر گوێ درێژەكەی بەتەنیا ناتوانێت بیكاتەوە سەر گوێ درێژەكەی كەسیش لەو ڕێگایەدا نەبوو تا یارمەتی بدات جگە لە

پیـاوە زیرەکەکـە نـەبێت ئـەویش زۆر دوور کـەوتبووەوە ناچـار بـوو بـەدوای بکـەوێ و بـانگی بکـات تـاکو یارمـەتی بـدات بـۆ بارکردنـەوەی بـارە سـێوەکەی، بـانگی دەکـرد بـەڵام نەیـدەزانی نـاوی چـییە. دەیگـوت کـوڕە کاکـە... کـوڕە کـابرا... کـوڕە خاڵـە... کـوڕە مامـە. پیـاوە زیرەکەکـە گـوێی لێبـوو بـەڵام وڵامـی نەدەدایـەوە چـونکە یـەکێك لـە چیرۆکەکانی ئـەوەبوو ئەگـەر ((یەکـەمجار تووشـی یـەکێك بـوو پرسـیاری نـاوی لـێ بکـە و خـۆتی پـێ بناسـێنە)). کـابرای سـێو فـرۆش هـەر بـەدواوەی بـوو بـانگی دەکـرد. کـوڕە خاڵە... کوڕە مامـە هـۆ کـابرای سێوخۆر بـەڵام پیـاوە زیرەکەکـە بـە هـیچ جۆرێـك وەڵامـی نـەداوە تـاکو بـەغاردان گەیشـت پێـی کـردی بـە شـانیا وتـی بـێ قـەزا بـی بـۆ وەڵام نادەیتەوە.

کـابرا زیرەکەکـە گـوتی لەگـەڵ منـت بـوو خـۆ تـۆ نـاوی منـت نـەهێناوە مـن چـوزانم بـانگی مـن دەکـەی. هـەر بـەحاڵ گەڕایـەوە لەگـەڵی بـارە سـێوەکەی لەگـەڵی بـار کـرد خـوا حـافیز... خـوا حـافیز... دیسـان لـە یـەکتر جیـا بوونـەوە هـەر یـەك بـە ڕێگـەی خۆیـدا ڕۆیشتن.

کـابرای سـێو فـرۆش چـووە شـاری خـۆی، کـابرای زیـرەکیش چـووە شـاری خـۆی ماوەیـەکی پێچـوو کـابرای سـێو فـرۆش لەگـەڵ ژنەکـەی دەردەچـێت بـۆ دەشـت بـۆ سـەیران لـە قـەراغ چـەم و ڕووبارێـك ئـەبینێ برگـە شـووتیەك دوو شـووتی پێوەیـە زۆر سەرسـام بـوو پێـی چـونکە مـانگی سـێ بـوو کـاتی شـووتی نـەبوو، بـانی شـووتیەکانی بـە گیـا گـرت و هاتـە لای ژنەکـەی باسـی کـرد لەبـەر ئـەوەی ژنەکـەی شـووتیەکانی نـەبینی بـوو، زۆر دڵخـۆش بـوو بـە ژنەکـەی ووت لای کـەس دەنـگ مەکـە سـبەی دەچـم لـە دیوەخـانی پاشـا گـرەو دەکـەم لەسـەری چـونکە شـتی وا زۆر سـەیرە. ژنەکـەش وتـی باشـە چـوونەوە مـاڵ ژنەکـەی دۆسـتی هـەبوو خـۆی گەیانـدە دۆسـتەکەی وتـی: کـوڕە پیاوەکـەم شـتێکی وا دۆزیوەتـەوە بـە نیـازە گـرەو بکـات لەسـەری لـە دیوەخـانی پاشـا... تـۆش بـڕۆ گـرەو بکـە لەسـەر مـن، شـووتیەکانی لـە قـەراغ ڕووبارێکـە لـە فـلان جێگـا لـە ناویـان دەو برگەکەشـی لـەناو ببـە تـاکو قسـەی مێردەکـەم بـە درۆ دەرچـێ تـۆش گرەوەکە دەبەیتەوە.

دۆسـتی ژنەکـە یەکسـەر ڕۆیشـت شـووتیەکانی بینیـەوە بـە گـوێرەی ناونیشـانی ژنەکـە کـە پێـی وت بـوو. بـۆ ڕۆژی دواتـر مێـردی ژنەکـە واتـا کـابرای سـێو فـرۆش ئەچـێ بـۆ دیوەخـانی پاشـا تـاکو گـرەو بکـات لەسـەر شـوتیەکان. بـە دەنگێکـی بـەرز دەڵـێ مـن شووتیم بینیوە.

دۆستی ژنەکە دەڵێ درۆیە لەم کاتەیا شووتی نییە شووتی چی درۆیە. مێردی ژنەکە (سێو فرۆش) با گرەو بکەین لەسەر چی دەڵێی گرەو دەکەم.

دۆستی ژنەکە دەڵێ باشە یەکەمجار دەست لەسەر هەر شتێك دابنێین لە ماڵەکەمان ئەوا دەبێتە موڵکی ئەو کەسە جا هەر شتێك بێت دوو شاهێد لە یەکتری دەگرن.

دۆستی ژنەکە بە مێردی ژنەکە دەڵێ برۆ شووتیەکان بێنە ئەگەر راست دەکەی. مێردی ژنەکە دەڕوات... تاکو شووتیەکان بێنێ کە دەچێت تەماشا ئەکات نە شووتی ماوە نە برکەکەشی ماوە یەکسەر لە چۆکی خۆی ئەدا و پیاوە زیرەکەکەی وە بیر دێتەوە ئەڵێ بە خوا مەگەر ئەو پیاوە من ڕزگار بکات بەڵام ناوی نازانێت بەس ئەو ڕێگایە دەزانێ کە پیاوە زیرەکەکە پێیدا ڕۆیشت بۆ شاریی خۆی، یەکسەر بەڕێ کەوت بۆ ئەو شارە تا گەیشتە شارەکە... بەڵام ناونیشانی پیاوەکەی پێ نەبوو ناونیشانی نەدەزانی تا پرسیاری بکات بۆیە ناچار بوو لە پێش دەرگای مزگەوت بووەستێ بەڵکو کابرا بێت بۆ نوێژ بەڵکو بەو جۆرە بیناسێتەوە وا ڕێکەوت ((پیاوە زیرەکەکە)) هات بۆ مزکەوت لەوێ یەکتریان ناسییەوە دیار بوو کاتی ئێوارە بوو. سێو فرۆشەکەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان نانی ئێوارەیان خوارد چون بۆ دیوەخانی پاشا بێ ئەوەی هیچ پرسیاری لێ بکات بۆچی هاتوی، ئەویش هیچ پرسیاری نەکرد. وا باو بوو پیاوەکان لە دیوەخان کۆ دەبوونەوە، کە چوونە دیوەخانی پاشا یەکسەر کابرای ((سێو فرۆش)) چوو لە تەنیشت پاشا دانیشت واش باو بوو لە دیوەخانی پاشا هەر کەس جێی خۆی هەبوو ڕێزی پاشا جێگای وەزیر و پیاوەکانی پاشا بوون بۆیە هەر کەسێك کە ئەهات کەمی کابرای سێو فرۆشی ئەهێنایە خوارەوە، چونکە جێی خۆی نەبوو چونکە دەبوایە لەمبەری دیوەخان دانیشتبایە. دیوەخان پڕ بوو. کابرای سێو فرۆش گەیشتە سەر پێڵاوەکان. ((پیاوە زیرەکەکە زۆری پێ ناخۆش بوو کە لەسەر پێڵاوەکان دانیشتبوو چونکە میوانی ئەو بوو، بەڵام چاری ناچار بوو لەبەر ئەوەی تا دیوەخان کۆتایی پێ نەهاتایە نە ئەبووایە هەڵسن.

لەناکاو چرای دیوەخان کوژایەوە فتیلەی چراکە تێکچوو بوو، پیاوێك لە پیاوەکانی پاشا وتی کێ تیغێکی پێیە بۆ ئەوەی فتیلەکەی پێ چاك بکەم کابرای سێو فرۆش، خەنجەرێکی پێ بوو یەکسەر دای بە پیاوەکەی پاشا تا فتیلەکەی پێ چاك بکات، پاشان چراکە چاك بووەوە دیوەخانەکە ڕووناك بووەوە وا دیارە بوو خەنجەرێکی نایاب بوو.

پیاوەکەی پاشا تەماعی چووە خەنجەرەکە ویستی لێی بسەنێ بە پاشای ووت

گەورەم- ئەمە خەنجەرەکەی جەنابت نییە، پاشا لە وەلامدا ووتی بەلێ هەوە ئەمە ەکوێ بوو.

پیاوەکەی پاشا ووتی ئەو کابرایە دزیویەتی،

پاشا: بیگرن و بیخەنە بەندیخانە.

بەلام پیاوە زیرەکەکە هەستایەوە و وتی گەورەم ئەوە میوانی منە با ئەمشەو لای من بێت بەیانی چی لێ دەکەن بکەن، پاشاش شارەزای پیاوە زیرەکەکە بوو دەیزانی تەکبیری بۆ دەکات، بۆیە پاشا وتی بە مەرجێك لات ئەبێت سوێند و تەلاقم بۆ بخۆ نە خۆت و ماڵ و منداڵت نەکەسی تری قسەی لەگەڵ نەکەن.

پیاوە زیرەکەکەش وتی باشە دواتر لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆ ماڵ بە خێزان و منداڵەکانی وت کەس قسەی لەگەڵ نەکات، بە ژنەکەشی ووت دارێکم بۆ بێنە، ژنەکەشی دارێکی هێنا و دایە دەستی، ئەویش کلاوەکەی لەسەر خۆی کردەوە و داینا و دایە بەر دار و ووتی ((کلاو سەگباب... کلاو گەواد... کلاو قەحبەباب)) کلاو رۆژەکەت بەبیر دێت کە پێکەوە بە رێگادا دەرۆشتین سێوێکم لێت وەرگرت ووتم کە تووشی یەکێك بووی یەکەمجار ناونیشانی لێ وەرگرە و بیناسە. ئاخر تا ئێستا ناوی من نازانی کلاو...، کلاوی دایە بەر داران کلاو من سێوێکی ترم لێت وەرگرت ووتم ((قسەی دڵی خۆت لای کەس مەکە)) ئاخر تۆ بۆ لە خۆتەوە خەنجەر ئەدەیتە دەست پیاوی پاشا. دیسان کلاوی دایە بەر دار و کلاو من سێوێکی ترم لێت وەرگرت ووتم ((لە جێگایەك دابنیشە کەس هەڵت نەستێنێ)) ئاخر کلاو بۆ لە تەنیشت پاشا دادەنیشی تا بێیتە سەر پێلاوەکان. کلاو وات دەزانی من حەزم لە سێو بوە، دیسان بە دار لە کلاوی دا ووتی گوێم بۆ راگرە کلاو سبەی ئەچیت خۆت لە قوورە رەشە وەر ئەدەی... دەچیتە پێش قازی شکایەت لە پاشا دەکەی و دەڵێی گەورەم جەنابی قازی من خەنجەرەکم پێ بووە خاوەنەکەی بەدیار کەوتەوە ئەویش جەنابی پاشایە. راستە خەنجەرەکەی ئەوە بەلام من ئەو خەنجەرەم لە بەریی باوکما بینیوەتەوە کاتی خۆی باوکم بەو خەنجەرە کوژراوە. ئێستاش من خوێنی باوکم ئەوێت.

پیاوە زیرەکەکە دیسان کلاوی دایە بەر دار ژنەکەی پێی ووت کورە پیاوەکە ئەگەر کلاو ئەقڵی هەبێت بەسیەتی.

کابرای سێو فرۆش لەو قانە تێگەیشت کە لەگەڵ ئەویانە. سبەی لەگەڵ کردنەوەی

دەوام خـۆی لـە قـوڕە ڕەش وەردا و چـووە پـێش قـازی گـووتی مـن خەنجـەرێکم پـێ بـوو دەرکـەوت کـە هـی جـەنابی پاشـایە، پـێم دەڵێت گوایـە تـۆ دزیوتـە، بـەڵام مـن نـەم دزیـوە، خـۆی ڕاسـتە هـی جـەابی پاشـایە، بـەس مـن ئـەو خەنجـەرەم لـە بـرینی باوکمـا بینیوەتـەوە بـاوکم بـەو خەنجـەرە کـوژراوە ئێسـتاش خـوێنی بـاوکم ئـەوێ لـە پاشـا. قـازیش پاشـا دەهێنێتـە دادگـا پاشـاش دەنێرێتـە دوای پیـاوە زیرەکەکـە تـاکو کێشـەکەی بۆ چارەسەر بکات چونکە پاشا تاوانبار دەرچوو ئەیزانی تەکبیری ئەوە.

پیـاوە زیرەکەکـە کێشـەکەیان بـۆ چارەسـەر دەکـات مەبلـەغێك پـارە و خەنجەرەکـەش لـە پاشا وەردەگرێتەوە.

پاشـاش بـە پیـاوە زیرەکەکـە دەڵـێ ئێسـتا ئـازادی پیاوەکـە بـەرەوە ماڵەکـەت قسەشـی لەگـەڵ بکـە چـونکە تەکبیرکـەری باشـی، ئـەوانیش دەچـنەوە بـۆ مـاڵی پیـاوە زیرەکەکە...

ئینجـا پیـاوە زیرەکەکـە پێـی دەڵێـت بۆچـی هـاتووی پـێم بڵـێ. کـابرای سـێو فـرۆش باسـی گرەوەکە و شووتیەکەی بۆ دەکات.

یەکسـەر پیـاوە زیرەکەکـە دەزانـێ کـە ژنەکـەی دۆسـتی هەیـە. بـە کـابرای سـێو فـرۆش دەڵێـت ژنەکـەت دۆسـتیی هەیـە، ئـەی پـێم نـەووتی قسـەی دڵـی خـۆت لای هـەوو کـەس نەکـەی. لای ژنەکـەت باسـی شـووتیەکانت کـرد، ئـەویش بـە دۆسـتەکەی ووتـوە شـووتیەکان ببـات و لـەناوی ببـات ئـەو پیـاوەی کـە گـرەوی لەگـەڵت کـردووە دۆسـتی ژنەکەتە، کابرای سێو فرۆش ئەی تەکبیری چییە من دۆڕاوم.

پیـاوە زیرەکەکـە: مـن تـەکبیرێکت بـۆ دەکـەم هـەر ئێسـتا بـەم شـەوە بچـووە هەرچـی ماڵ و سـامانت هەیـە ببـە سـەریان قادرمـەی خانووەکەشـت هـەمووی تێـك بدەپاشـان قادرمەیـەك دروسـت بکـە بەسـێ پایـە بیگەیەنـە سـەریان هـەر پایـەی بـەژنێك بێـت کـە بتـەوێ لـە یەکـەم پایـە سـەرکەوی بـۆ دووەم پایـە دەسـت لەسـەر پایـەی دووەم دابنێیـت ئینجـا سـەربکەوی، دوای پارچـە بەرەیـەکی بێکـەڵك لەسـەر دووەم پایـە دابـنێ بـۆ ئـەوەی چـونکە ئێـوە گرەوەکـەتان وابـووە بـۆ یەکـەمجار لـە مـاڵ و سـامانی هـەردووکتان هـەر کەسـێ کـە گرەوەکـەی بـردەوە دەسـت لەسـەر هـەر شـتێك دا بنێـت ئـەوا دەبێتـە مـاڵی ئـەو، تـۆش کـابرا بێنـە لەگـەڵ دوو شـاهێدەکە، شـتەکانیش هـەمووی لەسـەر بانـە کـابراش دەیـەوێ بەسـەریان بکـەوێ تـاکو دەسـت لەسـەر ژنەکـەت دابـنێ، ئـەو کاتـەی کـە سـەردەکەوێ دەسـتی دەکەوێتـە سـەر پارچـە بـەرە شـڕەکە، تـۆش دەسـتیی بگـرە

بیهێنە خوارەوە پێی بڵێ ئەو پارچە بەرە ڕەشەیە مالی تۆیە.

کابرای سێو فرۆش بەو شەوە دەگەڕێتەوە یەکسەر بە ژنەکەی هەموو ماڵەکە دەباتە سەریان ژنەکەشی لە سەریان دادەنێ، قادرمەکەشی تێکدا، پاشان قادرمەیەك دروست دەکات سێ پایەی بۆ دەکا لە پایەی دووەمیان بەرە شڕەیەك دادەنێ.

بۆ بەیانی کابرای سێو فرۆش دەچێتە دیوەخان، دۆستی ژنەکە چاوەڕوانی دەبێت. پێی دەڵێ گرەوەکەم دۆڕاند فەرموو با بڕۆین لەگەڵ شاهێدەکان یەکەمجار دەست لە هەر شتێك دابنێی ئەوە ماڵی تۆیە، شاهێدەکانیش ووتیان وایە. باشە...باشە

دۆستی ژنەکە لە خۆشیان وەخت بوو شێت بێت کە چووە ماڵەوە تەماشای کرد ژنەکە لە سەریانە یەکسەر ڕۆیشت بۆ سەریان ویستی بەو قادرمەیە سەرکەوێ کە پیاوی ژنەکە دروستی کرد بوو، چووە سەر پایەی یەکەم دەستی نایە سەر پایەی دووەم کە پارچە بەرە شڕەکەی لێ بوو دەستی کەوتە سەر پارچە بەرە شڕەکە. یەکسەر کابرای سێو فرۆش دەستی گرت و بە بەرەکەوە هێنایە خوارەوە. ووتی ئەوە ماڵی تۆیە چونکە ئێمە گرەومان وابوو، تۆش دەستت لەسەر ئەو پارچە بەرەیە داناوە هی تۆیە دۆستی ژنەکە بەرەکەی فڕێداو ووتی ئەمەم بۆ چییە.

شاهێدەکانیش ووتیان تۆ خۆت دەستت لە سەری داناوە. دۆستی ژنەکە بە توڕەییەوە چووە دەرەوە،ژنی کابرای سێو فرۆشیش عیبرەت وەردەگرێت و لەگەڵ پیاوەکەی باش دەبێ هەرچی بڵێ بە گوێی دەکات.

سێو فرۆشیش دەوڵەمەند بوو بەو خوێنەی باوکی کە لە پاشای وەرگرت.

- حیکایەتێکی پڕ حیکمەتە و هەمووی دەرز و پەند و ڕۆژی ئەمڕۆش ئەم پەندانە بە کەڵك سود بەخشن. هەر پەندێکی پیاوە زیرەکەکە وەك نەخشەی ڕێگای ژیانی داهاتووە.

# زۆرزان ترین درۆزن

**کۆکردنەوەی: دیلمان عەلی عەبدوڵڵا**

**ژاکاو صباح ئیبراهیم**

هەبوو نەبوو لە سەردەمێکدا پاشایەك هەبوو، ئەو پاشایە فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیەی دەکرد کە تێیدا دەژیا. ئەم پاشایە سروشتێکی سەیری هەبوو هەندێ جار خولیای وای دەکەوتە بەر چاو نموونەی وا نەبوو، جارێکیان قاسیدی ڕەوانەی هەموو ناوچەکانی فەرمانڕەوایی خۆی کرد بۆ ئەوەی ئە ڕاگەیاندنە بڵاو بکەنەوە:

هەر کەسێ بتوانێ بسەلمێنێ کە درۆزنترین کەسە، ئەوە جەنابی خاوەن شکۆ خۆی یەك سێوی زێڕی خەڵات دەکات.

خەڵك لە شار و گوندەکانەوە هاتن و لە تەك کۆشکی پاشادا خڕبوونەوە. ئەوانە هەموو جۆرە کەسێکیان تێدا بوو بۆ نموونە: شازادە، بازرگان، وەزیر، قەشە، هەژار، دەوڵەمەند، لاواز، قەڵەو، کەڵەگەتو قوتە. واتە لێرەدا دەرکەوت کە وڵات درۆزنی کەم نەبوو. هەریەك لەو کەسانە هەقایەتی خۆیان بۆ پاشا گێڕایەوە و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە شێوە زێڕەکەیان بەر بکەوێت بەڵام ئەم پاشایە زۆر درۆی بیستبوو هیچ درۆیەکی لەو درۆیانە بە دڵ نەبووکە ئێستا بۆیان دەکرد. پاشا خەریك بوو لەو بەزمانە ماندوو دەبوو دەیویست ڕایبگەیەنێ کە کەس لەو پێشبڕکێیە نەی بردۆتەوە، لەناکاو کابرایەکی هەژار لە بەردەمی پەیدا بوو. کابرا جلێکی پڕی پڕی لەبەر بوو گۆزەیەکی گەورەی پێبوو. پاشا پرسی: فەرموو چیت دەوێ بۆت بکەم؟

کابرا بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە گوتی: باوکی بەڕێز هەڵبەت لەبیرتانە یەك گۆزەی پڕ زێڕ قەرزاری منن، هاتووم زێڕەکەم وەربگرمەوە.

پاشا گوتی: من تەنانەت یەك پولیش قەرزاری تۆ نیم. تا ئێستاش درۆزنی وەکو تۆم نەدیوە!

کـبرا گـوتی: ئێستا خـۆت گوتـت تـا ئێستا هـیچ درۆزنـی وەك منـت نـەدیوە، کەواتـە سێوە زێڕەکە بۆ من دەبێ.

پـشا کە زانی فریو دراوە قسەی خۆی کێشایەوە: نا نا تۆ درۆزن نی!

کـبرا گوتی: بێنە گۆزە زێڕەکەم بدەوە.

پـشا هیچ ڕێگای درباز بوونی نەبوو، تەسلیم بوو سێوە زێڕەکەی دایێ.

## گورگ و ڕێوی و هەڵۆ

هـەبوو نـەبوو، لـە ڕۆژگارێکـدا کابرایـەکی فـەقیر هـەبوو، ئـەم کابرایـە لـەو دنیایـەدا لـە پـیرە دایکێـك زیـاتر هـیچ کەسـی نـەبوو. ڕۆژێـك ئـەو کابرایـە بـە خـۆی و پـیرە دایکی چـوونە نێـو دارسـتانێکی دوور. کـابرا کـوخێکی لـەناو ئـەو دارسـتانە دروسـت کـرد و لەگـەڵ دایکـی دا تێـدا دەحەسـانەوە. کـابرا ڕاوکـەرێکی زیـرەك بـوو، هـەموو ڕۆژێـك لـە مـاڵ دەردەچـوو لـە نـاو دارسـتانەکە داوی دادەنایـەوە، چـەند حـەیوانێکی ڕاو دەکرد و دەگەڕایەوە ماڵەوە.

ڕۆژگـار هـات و چـوو ئـەو دایـك و کـوڕەش بـەمجۆرە لـە ژیـانی خۆیانـدا بـەردەوام بـوون. ڕۆژێـك ڕاوکەرەکـە هەڵۆیـەکی زۆر جـوانی گـرت، بردیـە ماڵـەوە داوای لـە دایکـی کـرد ئـەم هەڵۆیـە نەکوژێتـەوە بـەڵکو ڕایبگـرێ و بـەخێوی بکـات. ڕۆژی دواتـر ڕاوکەرەکـە ڕێویـەکی گـرت ئەویشـی بـردەوە مـاڵێ و داوای لـە دایکـی کـرد ئـەویش ڕابگـرێ و بـەخێوی بکـات. چـەند ڕۆژ بەسـەردا تێپـەڕی گورگێکیشـی گـرت ڕاوکەرەکـە ئەویشـی بـردەوە ماڵـەوە دیسـان بەهـەمان شـێوە دایـە دەسـتی دایکـی و داوای لێکـرد ئـەو گورگـەش بـەخێو بکـات. ڕۆژگـار بـەمجۆرە ڕۆیشـت ڕاوکەرەکـەش هـەر خـەریکی ئیشـی خـۆی بـوو. ڕۆژێـك کـاتی ڕۆژئـاوا کـە گەڕایـەوە مـاڵێ دیـتی هـەڵۆ و ڕێـوی و گـورگ کـپ و بـێ جووڵـە لـەوێ کـەوتوون خـەمێکی قووڵیـان پێـوە دیـارە. کـابرا چـووە لای دایکـی و بـە گازنـدەوە گـوتی: ئـەوە چ ئیشە تۆ دەیکەی بۆچی شتێ نادەیتە ئەم حەیوانانە بیخۆن؟

دایکـە گـوتی: ئـەوە تـۆ چـی دەڵێـی مـن هـەموو ڕۆژێـك خواردنیـان دەدەمـێ. کـابرا هاتـە لای حەیوانـەکان و گـوتی: هـۆ هـەڵۆ و ڕێـوی و گـورگ ئـەوە بۆچـی

کەوتوونەتە بن باری خەمان؟ ئێوە تا ئەمڕۆ حاڵتان باش بوو بەوە دڵخۆش بوون کە لەماڵی منن.

ڕێوی گوتی: خوا ئاگای لێیە تۆش بزانە کە ناڕەحەتی ئێمە سەبارەت بە خۆمان نییە. ئێمە سەبارەت بە تۆ ناڕەحەتین. ماوەیەکە نان و نمەکی تۆمان خواردووە، هەر چۆن بێ ئێمەش لەو شتانە دەگەین دەمانەوێت بچین دەستگیرانی پاشا بە دیل بگرین و بیهێنینە ئێرە بۆ ئەوەی خزمەتمان بکات. چونکە ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە کە هەر چۆنێك بێ ڕۆژێك دادێ تۆ دایکت دەمرێ، ئەوسا کێ چاومان لێ دەکات.

ڕاوکەرەکە گوتی: زۆر باشە، چیتان پێ خۆشە وا بکەن. ئینجا هەر سێ گیانداری لە قەفەس هێنایە دەرێ و ئازادی کردن و گوتی: ئێوە ئازادن دەچنە هەر کوێ بڕۆن. هەر سێ گیاندارەکە کەوتنە ڕێ. ڕێوی زۆر شەیتان بوو، پیلانێکی دانا و بۆ دوو گیاندارەکەی تری ڕوون کردەوە گوتی: پاشا ئمڕۆ ژن دێنێ و ئاهەنگێکی گەورەی سازداوە. ئێمەش لە ئاهەنگەکەی ئامادە دەبین. من ڕێنمایی سەماکەرەکان دەگرمە ئەستۆ. گورگی برادەر تۆ لە پشت سەماکەرەکان ڕادەوەستی و هەڵۆ تۆش دەچی لەسەر لێوی پەنجەرەی سەر بووك دادەنشی. کە من گەیشتمە بەر دەرگای هۆڵ، هەڵۆ باڵەکانی توند لێك دەدا چراکان دەکوژێنەوە و هۆڵەکە تاریك دەبێتەوسا هەڵۆ چرنووکی لە بووك گیر دەکا و دەفڕێ. من و گورگیش یەکسەر لەناو هۆڵەکە دەچینە دەرەوە. بەمجۆرە ئەوانە چوونە ناو ئەو کۆشکەی ئاهەنگی زەماوەندی تێدا دکرا.

هەڵۆ لەسەر لێوی پەنجەرەی سەر سەری بووك نیشت. ڕێوی چووە بەردەم سەماکەران و گورگیش لە پشتیانەوە. پاش ئەوەی ماوەیەك سەمایان کرد، ڕێوی چاوی لە هەڵۆ قوچاند و هەڵۆ باڵەکانی توند لێکدا. هەموو چراکان کوژانەوە و هۆڵەکە تاریك داهات میوانەکان زۆر سەریان سوڕما و بە هەراوهۆریا پەرتەیان کرد.

هەڵۆ بە خێرایی هاتە خوارێ چرنووکی بەهێزی لە بووك گیر کرد و لە پەنجەرەکەوە دەر پەڕیە دەرێ و فڕی و لەناو ئاسمان بزر بوو. ڕێوی لە دەرگاوە چووە دەرێ و خێرا ڕای کرد، بەلام گورگ گیری خوارد و لەناو

حەشـیمەتەکە دەسـتگیر کـرا. یەکـەمجار لێـدانێکی باشـیان بـۆ کـرد پاشـان بڕیاریانـدا لـە سێدارەی بـدەن، بـەڵام ئـەو بەهـەر چۆنێك بێـت ڕای کـرد گـورگ زۆر زۆر تـووڕە بـوو خـوا لـە بـەلای گـەورەتری بپـارێزێ. هـەڵۆ بووکەکـەی بـردە سـەر چـیایەکی بڵنـد و ڕێـویش چـووە سـەر چـیایەکە. هـەڵۆ و ڕێـوی لـەوێ دانیشـتن چـاوەڕێی گورگیـان کـرد. گـورگ بـە لەشـی بـە خوێنـەوە تـوانی خـۆی بگەیەنێتـە ئـەوێ. ڕێـوی یەکسـەر زانـی گـورگ زۆر تووڕەیـە بۆیـە خێـرا چـووە پێشـوازی و گـوتی: مـاڵ ئـاوەدان گـورگی ئـازیز ئـەوە بـۆ هەنـدە نارەحـەتی تـۆ خـەزووری ئـەو کچـەی. نـابێ هـیچ نارەحـەت بـی. هـەقی ئـەو زەحمەتـەی کـە کێشـاوتە وەری دەگریـەوە. بووکەکـەت دەسـتەکانت دەشـوا و قاچـەکانت دەشـێلێ تەنانـەت ئـەو ئیشـانەی کـە بـۆ تـۆی دەکـا بۆمـە نایکـا. گـورگ کـاتێ ئـەو قسـانەی بیسـت هەسـتی بـە خۆشـی کـرد. هـەموویان هەسـتان و بووکیـان سـواری پشـتی گـورگ کـرد و کەوتنـە ڕێ. ڕێـوی لـە ناکـاو سـەیری دواوەی کـرد بـینی کـە لەشـکرێکی گـەورەیان بـە دواوەیـە. بۆیـە ڕێـوی بـە لەرزینـەوە گـوتی: وەرن بـا خۆمـان لـە پـەنای ئـەم تاشـە بـەردە بشـارینەوە. کـە سـەربازەکان گەیشـتنە ئێـرە، لـە ناکـاو پـەلاماریان دەدەیـن بەمـەش ئەسـپەکان دەڕەونـەوە و سـوارەکان بەردەبنـەوە هـەڵۆ تـۆ بـە دەنـووکی خـۆت چـاویان دەربێنـە، گـورگ تـۆش ورگیـان بدڕێنـە منـیش گۆشـتی دەم و چـاویان پچـڕ پچـڕ دەکـەم و دەخـۆم. ئەگـەر بـەم کـارە ڕازی نـەبن ئـەوە بووکمـان لـە دەسـت دەچـێت. بۆیـە هـەڵۆ و گـورگ ناچـار بـوون کـە ڕازی بـن. بـەم جۆرە کـە لەشکرەکە هاتـە پێشـەوە هـەر یەکـە لـە گـورگ و ڕێـوی و هـەڵۆ دەسـتیان کـرد بـە کارەکـەیان کـە ڕێـوی بـۆی دانـا بـوون. لـە کۆتاییـدا توانیـان لەشـکرەکە بشـکێنن و ڕزگـار بـن. بـەڵام گـورگ زۆر شـەکەت بـوو نەیـدەتوانی بـەڕێ بـڕوات بۆیـە ماوەیـەك دانیشـتن بـۆ ئـەوەی بحەسـێنەوە کـە حەسـانەوە ڕێـوی گـوتی: باشـە بـا هەڵبسـتین بکەوینـە ڕێ بـا کچـی پاشـا سـواری پشـتی گـورگ بکـەین. بـەڵام گـورگ ڕازی نـەبوو گـوتی ئێوەکـە دەزانـن کـە مـن لاقـم لـەدوو نایـە جـا چـۆن بتـوانم ئـەم کچـە هـەبلگرم. دوای ڕێـوی چـاوی لـە هـەڵۆ داگـرت و گـوتی: سـەیرکە، ئێمـە هیچـمان لەدەسـت نایـەت گـورگ تـۆ بـاوکی زاوای و خـەزووری بـووکی دەبـێ خـۆت بووکەکـەت هـەڵگری ئـەگینا بـا بووکەکـە جـێ بـێڵین. لەبـەر ئـەوە گـورگ لـە چـاو ڕێـوی و هـەڵۆ هەنـدێ گێلۆکـە بـوو هـەر زوو ڕازی بـوو بـووکی سـواری پشـتی خـۆی کـرد گەڕانـەوە مـاڵی گەورەکـەیان. کـە ڕۆژ ئـاوا بـوو ڕاوکەرەکـە هاتـەوە مـاڵێ دیـتی

کچێکی جوان وەکو ڕەونەق کوخەکەی ڕووناك کردۆتەوە. ماوەیەك بەسەر ئەم ڕووداوە تێپەڕی ڕۆژێك پاشا لە دوو پیرەژنێکی جادوگەری نارد پێی گوت دەتوانی دەستگیرانەکەم بدۆزیتەوە و بیهێنیەوە ؟

جادوگەرەکە گوتی: بەڵێ.

پاشا پرسی بەرامبەر بەمە چیت دەوێ؟

جادوگەورەکە گوتی: چارێکی زێڕ.

پاشا قبوڵی کرد گفتی دا ئەگەر کچەکەی بۆ بێنێتەوە زێڕەکەی دەداتێ. پیرەژن سواری ئەسپە باڵدارەکەی بوو فڕی تا گەیشتە کوخی ڕاوکەرەکە، بە کچی پاشای گوت: من لێرە غەریبەم نازانم چی بکەم بە دوای شوێنێك دەگەڕێم. ڕووخسەت دەدەی ئەمشەو لە ماڵی تۆ بم؟

کچی پاشا دڵی پێ سووتا و ڕای گرت. چەند ڕۆژ تێپەڕین ئاخیری پیرەژن بە کچەکەی گوت: حەزدەکەی ئەسپەکەی من ببینی؟ وەرە با بچین ئەسپەکەی خۆمت نیشان بدەم. کچەکە و پیرەژنەکە چوونە دەرەوە کاتێك کچەکە ئەسپەکەی دیت، گوتی: دایکە ئەوە ئەسپی تۆیە ؟

پیرەژنەکە پێی گوت بەڵێ، بو کەکە لە ئەسپەکە نزیك بووەوە، پیرەژنەکە فێڵی لێ کرد و سواری سەر پشتی کرد و دوایی ئەسپە باڵدارەکە فڕی. دوای ماوەیەك گەیشتەوە کۆشکی پاشا. پاشاش زێڕەکەی دا بە پیرەژنەکە ئینجا دەستیان کرد بە ئاهەنگ گێڕان، دووبارە پاشا کەیف خۆش بوو ڕێوی گورگ و هەڵۆ کە زانیان کچەکە دزراوە هەرسێکیان هەستیان بە شەرمەزاری کرد بۆیە بڕیاریان دا کە بەدوای کچەکەدا بچنەوە. بەم شێوەیە، هەرسێکیان چوونە شاری پاشا لە شوێنێك خۆیان شاردەوە تا دەرفەتێکیان بۆ ڕێك بکەوێت. ڕۆژێك هاوسەری پاشا بۆ گەڕان لە کۆشك هاتە دەرەوە کە بینیان بڕیاریان دا پەلاماری بدەن. هەڵۆ لە ئاسمان هاتە خوارەوە چڕنووکی لێداو گرتی و فڕاندی. ڕێوی لەکاتی خۆیدا لە شەڕ هەڵات، گورگ دیسان گیری خواردوو لێدانێکی باشیان لێدا بەڵام بەهەر حاڵ هەبێت خۆی ڕزگار کرد. دیسان گورگ تووڕە بوو کە گەیشتە ڕێوی ویستی پەل پەلی بکا. بەڵام هەر کە ڕێوی گورگی بینی بە زمانی لووسی چووە پێشوازی و پێی گوت: چیە گورگی ئازیز دیسان دەڵێی نارەحەتی. گورگ هاواری کرد خۆ برادەرایەتی بەو شێوەیە نییە کە

ئێوە دەیکەن و ئێوە رادەکەن و من بەجێ دێڵن. رێوی بە گورگی گوت برا ماڵ ئاوەدان، بۆ ما تۆ ئاگادار نی کە هەڵۆ بە تاقی تەنێ بوو گەر وام نەکردایە لەوانە بوو کچەکەمان لە دەست بچوایە بۆیە چووم هاوکاری هەڵۆ بکەم، چونکە من دڵنیا بووم کە تۆ دەتوانی دەرەقەتی دوژمنەکانت بێیت و دەمزانی ئەوان باری تۆ نابەن. رێوی بەم قسانە توانی گورگ هێور بکاتەوە قەناعەتی پێ بێنێ.

رێوی و هەڵۆ کچەکەیان سواری پشتی گورگ کردو هەموو بەیەکەوە بەرەو ماڵی گەورەگەیان بەڕێ کەوتن. کاتێك کە گەیشتنە جێ دیتیان گەنجەکە ئارەزووی راوکردنی نەماوە لە ماڵەوە دانیشتووە و زۆر غەمبارە. بەڵام کابرا کە دیتی رێوی و هەڵۆ و گورگ هاتوونەتەوە و کچەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوەتەوە، لە خەنی خۆشیان خۆی کرد بە باوەشی کچەکەدا. بەم چەشنە ئاهەنگی زەماوەند جارێکی تر ساز درا. گورگ و رێوی و هەڵۆ چوونە سەر زەماوەند و پیرۆزباییان لە گەورەی خۆیان کردوو وە هەروەها راوکەرەکە کە گەورەی رێوی و هەڵۆ و گورگ بوو زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە سێ گیانداری وەکو گورگ و رێوی و هەڵۆ ئەو پیاوەتیە گەورەیان لەگەڵ کردووە.

دواجار راوکەرەکە سوپاسی کردن بۆ ئەو کارەی کە ئەنجامیاندا، دواتر هەریەکە لە سێ گیاندارەکە واتە هەڵۆ و گورگ و رێوی ماڵ ئاواییان لە راوکەرەکە کرد و هەریەکەیان بە رێگای خۆیدا رۆیشتن.

- لە حیکایەتی زۆرزان ترین درۆزن دا، جگە لەوەی باس لە خوێکی سەیری پاشا دەکات، ئەوە دەسەلمێنی کە درۆش پێویستی بە زانین هەیە لە شوێن و وەختی خۆیدا. لە گورگ و رێوی و هەڵۆ- شدا ئەو پەیوەندیە دەردەخات کە لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵاندا هەیە و جگە لەوەی بە مرۆڤ کردنی ئاژەڵەکانە بەوەی کە رەوشتی مرۆڤ دەدات بە هەریەك لەو هەڵو و رێوی وگورگەکە.

# چەند بەهێز بی لە تۆ بەهێزتر هەیە

**کۆکردنەوەی: مەسعود عەبدوڵلا مستەفا**

**بێخاڵ حەسەن مەحمود**

لە سالآنی رابردوو لە گوندەکان مرۆڤی دەست و بازو بەهێز هەبوو. دەڵێن رۆژێکیان پیاوێکی بە تەمەن گۆپاڵێکی بە دەستەوە بوو، بانگی کۆمەڵێك گەنج دەکات بۆ یارمەتی دانی کە چوار پێنج جوارە گەنم لەسەر یەکتری دابنێن، گەنجەکان ئامادەن بۆ یارمەتی دانی. جواری گەنمەکان لەسەر یەکتری دادەنێن، بەلآم جوارێکیان بەسەر ناکەوێت، پیاوە بە تەمەنەکە دەڵێت تخوا ئێوەش پیاون، جواری گەنمەکە لایەکی دەخاتە ژێر دەستی لایەکیشی دەخاتە سەر گۆپاڵەکەی دەیخاتە سەر جوارەکانی تر، دوای تەواو بوونی کارەکە پیاوەکە دەڵێت فەرموون چای بخۆن ئەمانیش رازی دەبن، بەلآم یەك لە گەنجەکان زۆر سەرسام دەبێت بەهێزی ئەو پیاوە بە تەمەنە بۆیە دەڵێت من چای ناخۆم تا بۆم باس نەکەی کە تۆ لەو تەمەنە ئاوا بەهێز بی دەبێت لەکاتی گەنجی چەند بەهێز بوویت.

پیاوەکە دەڵێت چاکەت بخۆ، ئێستا بۆت باس دەکەم من لە کاتی گەنجی هەمیشە دەچووم بۆ راوکردنی گیانداران بۆ ماوەیەك دەمامەوە شەوان دەچووم بۆ ئەشکەوت، رۆژێکیان کە چووم بۆ راو گشت پێداویستییەکانم لەگەڵ خۆم بردبوو لەگەڵ یەك لە حەسیر لە قەسپ، پاش ئەوەی ئەمانم لە ئەشکەوتەکە دانا، باران نم نم دەباری، چووم بۆ خوارەوە بۆ راو کردن، بینیم پیاوێك و ئافرەتێك سەرکەوتن بۆ ناو ئەشکەوتەکە، منیش کە لە راوەکە گەرامەوە، کەروێشك و سیخورێکم راوکردبوو، چووم بۆ ناو ئەشکەوتەکە، سەلامم لە پیاو و ئافرەتەکە کرد وەلآمیان داوە هیچیان نەووت، دوای ئەوەی گۆشتی کەروێشکم پاك کردەوە، سوورم کردەوە و خواردم. ئافرەتەکە زۆر سەرنجی راکێشام منیش بیرم کردەوە گەر ئێستا ئەو ئافرەتە ماچ بکەم ئەم پیاوە چی پێ دەکرێت بەرامبەر من، من چەند بەهێزم، ئەو پیاوە بالآ کورتە چۆن چۆن هێزی منی هەیە، بۆیە هەوڵمدا ئافرەتەکە ماچ بکەم، ئافرەتەکە نەیهێشت. تفێکی خستە

ناو چاوی پیاوەکە و ووتی: من خێزانی تۆ نیم بۆ پارێزگاری ناکەی لە شەرەفی خۆت.

پیاوەکە ووتی: ئافرەت جا ئەوە کەی پیاوە تاکو دەستی خۆمی پێ پیس کەم، من هەر کە گوێم لەو قسەیە بوو یەکسەر هێرشم کردە سەر پیاوەکە، نەمزانی ئەو پیاوە کورتە بالأیە یەکجار وا بەهێزە. بە پارچە گوریسێك هەردوو دەست و پێیەکانمی بەستاوە، فرێی دامە بەر دەرگای ئەشکەوت، تا بەیانی کات ناکات دەنگێك قەسپی دەخوارد ناوکەکەی لەمن دەگرت هەمووی بە دەم و چاوم دەکەوت.

دوای ئەوەی بەیانی رۆژ هەلأت پیاوەکە لەگەڵ خێزانەکەی رۆیشتن زانیم کە ئەوان رێبوارن، من ویستم بە هێزی خۆم بنازم و زوڵم بکەم.بۆم دەرکەوت کە چەند بەهێز بی لە تۆ بەهێزتر هەیە.

((گەر خوا ناردی پاردەوە))

پیاوێك لە سەرەتای تەمەنی هێندە کار دەکات تاوەکو تەمەنێکی زۆر، بەلأم زۆر بێزار دەبێت لە کارکردن بۆیە رۆژێکیان بریار دەدات کە چیتر نەچێت بۆ کارکردن، دەڵێتە خێزانەکەی کە چیتر ناچێ بۆ کار، خێزانەکەی دەڵێ پیاوەکە مەگەر نازانی هەر رۆژێك نەچی بۆ کار هیچمان نییە بیخۆین، ئەوەتا دار نەماوە بیسوتێنینو پیاوەکە دەڵێ ئەم سۆبەیە هەڵکرە دەبێت خوای گەورە لە کونی ئەو سۆبەیە بۆم بنێرێ. خێزانەکەی شەو خەو دەبینێ پێی دەڵێن بە پیاوەکەت بڵێ بچێتە ژێر ئەو دارەی کە لە گوندەکە هەیە کوپەیەك لیرەی تێدایە، خێزانەکەی کە بەیانی لە خەو هەڵدەستێ زۆر دڵخۆش دەبێ بۆ پیاوەکەی دەگێرێتەوە پێی دەڵێ بەڵکو خوای گەورە دەرگای خێری لێ کردینەوە، بەلأم پیاوەکەی دەڵێت ئافرەت هەر دەبێت لە کونی سۆبەکە بۆم بێتە خوارەوە، خێزانەکەی زۆر تکای لێ دەکات بەلأم پیاوەکە هەرگیز رازی نابێت، بۆیە خێزانەکەی بریار دەدات بچێ بە دراوسێکەیان بڵێ بە نیوەییان بێت، دراوسێکەیان دەچێتە ژێر دارەکە هەڵدەکۆڵێ دەبینی راستە ئەمە کوپەیەك لیرەیە، بۆیە بریار دەدات هەمووی بۆ خۆی بێت، ئەگەر پرسی دەڵێم چی لێ نەبوو، کە دەچێتە ماڵەوە سەیری کوپەکە هەڵدەداتەوە یەکسەر دەبێت بە

شـانەیەکی مـێش هـەنگین، زۆری بـەلاوە سـەیر دەبێـت بۆیـە دەڵێـت دەبێـت هـەمووی لـە کوونەکـەوە بـۆ شـۆڕ بکەمـە خـوارەوە بـەڵکو لـە ژوورەوە دەچـێتە دەرەوە، کـە سـەری کوپەکـە دادەخـات هـەموو مێشـەکان دەچـنەوە نـاو کوپەکـە، لەسـەر کـونی سـۆبەکە بـۆی شـۆڕ دەکاتـە خـوارەوە لەسـەرەوە مـێش هـەنگین لـە خـوارەوە هـەمووی دەبیـت بـە لـیرەو دەکەوێتـە سـەر دەم و چـاوی، خێزانەکـەی زۆر دڵخـۆش دەبێـت، پیـاوە کـەی دەڵـێ ئـافرەت ئـەم ووت دەبێـت هـەر لـەم کونـە خوای گەورە بۆم بنێرێ، ئەمەش ئەگەر خوا ناردی پاردەوە.

- حەکایـەتی هێـز یەکێکـە لـەو حەکایەتانـەی کـە ڕووداوی ژیـانن و زۆر ڕوو دەدەن، ئەوەش دەسـەلمێنی کـە تـۆ هـەر چۆنێك بیت، بـە چـاك بـە خـراپ لـە تۆ هەورازتر هەیە.

لـەوەش لـە کـە حەکایـەتی (کـە خـودا نـاردی پـاردەوە) پشـت بـە فەلسـەفەی قـەدەری و بـەختِ و نسـیب دەبەسـتێ. لـە ژیانـدا ئـەم جـۆر ڕێکـەوت و پێشهاتانەش هەن.

# ئەبو زێد بن هەلالیان

**کۆکردنەوەی: تابان ئازاد عومەر**

سـولّتان حەسـەن دوو ژنـی هـەبوو، ڕۆژێـك تاقمێـك میـوانی هـات چـووەلای ژنـە گەورەکـەی گـوتی ئـافرەت زێڕەکـانتم بـدێ بیفرۆشـم بـۆ ئـەوەی میوانـەکانی پـێ بـەڕێ بکـەم پـاش (١٠) ڕۆژێـك جەلەبـە سـوارێکی تـر هـات چـووە لای ژنـە بچـووکەکەی گـوتی ئـافرەت زێڕەکـانتم دەرێ بـۆ ئـەوەی میوانـەکانی پـێ بـەڕێ کـەم دوای ئـەم دوو جەلەبـە سـوارە سـولّتان حەسـەن دیوەخانەکـەی ((قـوڕدا)) چـونکە هیچـی نـەما گـوتی: شـورەتی بکـەن کـەوا بـۆ غـەزا دەچـم کـە ئـەو ڕۆیـی برازایـەکی مـابوو نـاوی ((ڕسـت)) بـرازای سـولّتان حەسـەن ڕۆژێـك ((ڕسـت)) هاتـە دەرەوە ((پیریـژنێك)) دەگریـا ئـەویش چـووە لای ژنـە پیرەکـە گـوتی ئـەوە بـۆ دەگریـەی؟ پـیرەژن گـوتی: لەوەتـەی سـولتان حەسـەن نـەماوە کـەرە مامزێـك هـەموو بەیانییـەك خێوەتەکـەم دەڕمـێنێ، گـوتی پـیرەژن سـبەی جاسـوس ئەگاتـە خێمەکـەت لـە هەلهەلـە بـدە ئمـن سـوارەبم دەیکـوژم ((واتـا مامزەکـە)) پـیرەژن کاتێك بـە ئاگـا هـات خێمەکـە ڕووخـا بـوو ئـەویش سـوار بـوو ((ڕسـت)) کەوتـە دوای ئاسـکەکە هـەتا نوێـژی عەسـر تـاوەکو ئاسـکەکەی کوشـت، کـە ئاسـکەکەی کوشـت سـەری بـڕی و سـوپایەکی زۆر لـەو شـوێنە کـۆ ببونـەوە کـە ئاسـکەکەی لـێ کوشـت بوو.

تـەنها سـوارێك لەسـەر چـیادا بـوو ئـاگری کردبـووەوە ئـەویش پێـی وابـوو (ڕسـت)) چـوو بـۆ لای سـوارەکە مێـوانی ئـەو سـوارە بـوو کـە چـوو ئـەویش.نێچـیری پـێ بـوو گۆشـتی مـامزی دەبرژانـد دانیشـت و گۆشـتیان برژانـد و نانیـان خـوارد. لێـی پرسـی ((ڕسـت)) لـە سـوارەکەی پرسـی ئـەتۆ کێـی، بـۆ کـوێ دەچـی گـوتی: ئـەوە مـن دەچـم بـۆ لای سـولّتان حەسـەن. گـوتی: وەخـتی خـۆی سـولّتان حەسـەن حـەوت عەجیـدمی کوشـتووە لەگـەڵ حـەوت ڕەعبـۆمی بـردووە دەڵـێن سـولّتان حەسـەن نـەماوە ئـەمنیش دەچـم لێـی دەدەم تـالآنی دەکـەم ((ڕسـت)) پێـی گـوت ڕاسـتە سولّتان حەسەن نەماوە.

ئـەمن ((ڕسـت)) بـرازای سـوڵتان حەسـەنم سـبەینێ دەچـینە مەیـدان پـاش ئـەوەی شـەوێ پشـتیان دا یـەك و لـەپاڵ گردەكـە نوسـتن. سـبەینێ كـە نانیـان خـوارد نـاوی خوایـان هێنـا چـوونە مەیدانـەوە. لـە مەیـدانی یەكـەم ((ڕسـت)) نوكـە ڕمێكـی پێیـا هەڵـدا گــوتی: هەســتە ســواربە ئــەوە لــە بــانی حــەو عەجیدەكــە و حــەوت ((ڕەعبۆم))ەكە.

ئـەمجارە سـوار بوونـەوە كەوتـەوە مەیـدان ئـەمجارەش پانـە ڕمێكـی هەڵـداو فرێـی دایــە زەوی ئــەوە بــەو ســوپایەم بەخشــی و نــاتكوژم ئــەمن بــرازای ســوڵتان حەسـەنم. ئـەمجارەیان سـوار بوونـەوە بەتـەما بـوو بیكوژێـت بـەڵام سـوارەكە گـوتی مـەمكوژە گـوڵێكم لـە بـاغ هەیـە پێشكەشـت دەكـەم وا ((كچـێكی هـەبوو پێشكەشـی كـرد)) دەبـێ بچـینەوە میـوانم بـی. پاشـان كەچـوونەوە ((ڕسـت)) سـێ شـەو لـەماڵیـان مـاوە. بـەیانی سـوارەكە وەلەكـە عـارەبێكی نسـحەت كـرد پێـی گـوت: وە لـە كـە عارەبەكـەی ئـەو پێـی لـە ئـاوزەنگی یـارەبی پـیرۆزت بـێ وولاغێكـی جوانـە ((ڕسـت)) دەڵـێ ئەگـەر عەجیـد یٚ وولاغەكـەی بـەجێ دەهێڵـێ بـەڵام ئەگـەر عەجیـد نـەبێ وولاغەكـەی بـەجێ ناهێڵێـت. ڕسـت گـوتی ئـەم وولاغـە بـە كـەڵكی مـن نایـەت وولاغێكـی تـرم بـۆ بێنـە. سـواری باجیـدێك بـوو ((ڕسـت)) ڕۆیشـتەوە كـە چـۆوە لـەبۆ ماڵــەوە مــامی هاتۆتــەوە ســوڵتان حەســەن هاتۆتــەوە. مامــەی گــوتی كــوا جوانــە ماینەكـەت لـە ((ڕسـت))ی پرسـی ئـەویش ئـەو بەسـەرهاتەی كـە بەسـەری هـاتبوو بـۆ مـامی گـوت و شـەوێ پـێش ڕسـت كـە سـوڵتان حەمیـد هاتـەوە لـە دەرگـای داو گــوتی دەرگــام لــێ بكەنــەوە بــەڵام حەرەســەكە دەرگاكــەی نــەكردەوە گــوتی دەرگـام لـێ كـەوە سـوڵتان حەسـەنم، بـەڵام حەرەسـەكە گـوتی سـوڵتان حەسـەن نـەماوە ئـەو لـە غـەزا شـەهید بـووە.گـوتی بـانگی ژنـە گەورەكـەم بكـە كـە چـەلەبە سـواری عەشـیرەت بـوو هـاتووە بـۆ میـوانی زێڕەكـەی تـۆم نەفرۆشـت میوانـەكانم پـێ بـەڕێ كـرد بـانگی ژنـە بچـووكەكەم بكـەن بـانگی ژنـە بچـووكەكەیان كـرد بـە ژنەكـەی گـوت ئـافرەت كـە جەلەبـە سـوارە عەشـیرەت بـوو هـات بـۆ میوانمـان زێڕەكانی تۆم نەفرۆشت میوانەكانم پێ بەڕێ كرد.

ژنـە گەورەكـە گـوتی دەرگـا بكەنـەوە پاشـان سـوڵتان حەسـەن هاتـەوە بـە مـاڵێ خـۆی شـاد بـوو. سـوڵتان حەسـەن دوو كـوڕی هـەبوو. هـەر كـوڕەی لـە ژنێكـە چـووە ژووریێ گـوتی لای ژنـە گەورەكـە دەخـەوم بـەڵام ژنـە گەرەكـە گـوتی بـڕۆ لای ژنـە

بچووکەکە. کوڕەکـان ئاگایـان لـێ نییـە کـە باوکیـان هاتۆتـەوە کـە دەچێت بـۆ لای ـ یەکـی پیاوێـك لەسـەر جێگـای دایکـی نوسـتووە کوڕەکـە چـوو خەبـەری دا بـرا گەورەکـەی گـوتی بـرا پیاوێك لەسـەر جێـای دایکـم نوسـتووە. بـرا گەورەکـەی گـوتی بـا دایکـم ئاگادارکەینـەوە ئینجـا دەچـین پیاوەکـە دەکـوژین دایکـی گـوتی ئـەوە کـوڕم بـۆ وا مشەوەشـن. ئـەویش مەسـەلەکەیان بـە دایکیـان گـوت و دایکـی گـوتی نـای نەکـەن ئـەوە باوکتانـە لێـی گـەڕێن بـا بخـەون ((دیـاب)) خـەزوری سـوڵتان حەسـەن بـرای ژنـە گەورەکـەی سـوڵتان حەسـەن. بـەیانی لەسـەر نـان خـواردن بـوو ((دیـاب)) گـوتی دەبـێ بچـین بـووك بهێـنین بـۆ ((ڕسـت))م گـوتی: کـە ڕۆیشـتین لـە ڕیوایـەتێك دەڵـێن حـەوت ڕۆژ کـەس ئاگایـان لـە کـەس نـەمابوو بـەڵام لـە ڕیوایـەتێکی تـر دەڵێـت هـەر ووڵاغێـك لەفـەردە جۆیـەك بەسـترا بـوو. سـوارەکە سـێ ژنـی هەبووچـووە لای ژنـە گەورەکـەی گـوتی کچێکم هەیـە ئەگـەر هـەر عـەیبێکی هەیـە پـێم بڵـێ ژنەکـە گـوتی کچـەکەم هـیچ عـەیبی نییـە بـەڵام ڕۆژێـك کچـەکەم لسـەر تەنـدور وە لەکـە عارەبێـك تیکـە نـانێکی لـەناو دەمـی بینیـوە. چـووە لای ژنـی ناوەنـدی گـوتی ئـافرەت کچـەکەتم داوەتـە سـوڵتان حەسـەن کچـەکەتم چ عـەیبێکی هەیە پـێم بڵـێن. گـوتی کچـەکەم هـیچ عـەیبی نییـە بـەڵام ڕۆژێـك لەسـەر تەنـدور دوو سـەگ بەشـەڕ هـاتن هەرچـەند غاریـدا ئاوێنەکـە و کلدانەکـەی کـەوت گـوتی ئـەوە بـە کـەڵك نایـە چـووە لای ژنـە بچووکەکەی گـوتی: ئـافرەت کچـەکەت چ عـەیبێکی هەیـە پـێم بڵـێ ژنەکـەش گـوتی: کچـەکەم هـیچ عـەیبێکی نییـە بـەڵام ئێمـە نێرینـەمان بـبێ هـەتا سـێ مـانگ ناشـرینە. دەڵـێ قەیناکـە ئـەوە خـۆم بـە سـوڵتان حەسـەن دەڵـێم کـە زاوا هـات و ژنێـك لـە دەوری بـووك بـوو سـوڵتان حەسـەن گـوتی ئـەو ژنـە کێیـە سـوارەکەش گـوتی ئـەوەش پێشکەشـت بێـت. دایـان بـە سـوڵتان حەسـەن ئـەویش ژنەکـەی سـوارەکە بـوو ئینجـا سـوارەکە گـوتی لـە بـیرم چـوو بـە سـوڵتان حەسـەن بڵـێم نێرینـەمان ناشـرینە سـوارەکە ڕۆیـی بـە دوای لەشـکرەکە سـوارەکە گـوتی: سـوڵتان حەسـەن ڕاوەبسـتێ ئیشـم پێیـەتی ئـەویش بـانگی کـرد و لەشـکرەکە ڕاوەسـتا ((دیـاب)) گـوتی سـوڵتان حەسـەن تـۆ مەچـۆ مـن دەچـم بـزانم ئیشـی چـی پێمانـە. کـە گەیشـت پێـی دەیزانـی سـوڵتان حەسـەنە گـوتی سـوڵتان ئێمـە نێرینـەمان بـبێ سـێ مـانگ زۆر ناشـرینە. ((دیـاب)) گەڕایـەوە گـوتی ئـەوە هـەر مشـکیلە نییـە بۆچـی هـاتی کاتێـك ((دیـاب)) گەڕایـەوە دەسـتی کـرد بـە تەقـە کـردن کاتێـك ((دیـاب)) گەیشـتەوە لەشـکرەکە گـوتی مـن دەڵـێم: ((دوژمـن هـەر

دوژمنــه)). ئینجـا ژنەکـەی سـوارەکە کـە شـوی بـە سـولّتان کـرد کەژاوەکـەی سـەری لادا گـوتی زۆر عەیبــە ســەگێك بـۆ ((دیـاب)) قسـەی سەربەسـت ناکەیتــەوە مــن ژنــی سـوارەکەم کۆرپــەی لانکـم بەجێهێشـتووە سـولّتان حەسـەن نـەیزانی بـوو کـە ژنــی سـوارەکە بـوو ژنەکـەی ناردەوە بـۆ سـوارەکە هـەوەل جـار ژنیـان بـرد و یەکـەم سـالّ ژنەکـەی (ڕسـت)) کچـێکی بـوو ناویـان نـا ((هەلاّلــە)) بـەلاّم سـالّی دوایـی کـوڕێکی بـوو. عادەتیـان وابـوو کـە کـوڕ بـبێ دەبـێ سـولّتان حەسـەن نـاوی بـنێ بێتـە دیوەخـان ئینجـا کـە سـولّتان حەسـەن نـاوی نـا هـە لـە مەجلیسـدا بـوو هـەر کـەس شـتیان پێشـکەش کـرد. مالّیـان بـۆ دەکـەن بـۆ منداڵەکـە. ژنەکـەی ((ڕسـت)) گـوتی مەبیـە دیوەخـان بـا مامـەم بێـت لـە مالّـەوە نـاوی دەنـێین بـەلاّم ((دیـاب)) نـەیێت. ئـەویش گـوتی مامـە حـەز دەکـەم بچینە مالّـەوە هەنـدێك پیـاو دەبـەین لـە مالّـەوە نـاوی دەنـێین. مـامی گـوتی باشـە مـن ڕازیـم بـەلاّم ((دیـاب)) لـەو قسـەیە بـە ئاگـا هـات ئـەویش کـە چـۆوە بـە خێزانەکـەی گـوت جـێ چـاکە مامـەم دێ لێـرە نـاوی دەنـێین. کاتێـك ژنەکـە جـێ و شـتی داخسـت ((دیـاب)) گـوتی بـە پیرەژنێکـی گـوت بـڕۆ ئـەو منداڵـەم بـۆ بـدزە ژنەکـە خـەریکی جـێ داخسـتن بـوو. پیرەژنەکـە چـووە ژووری گـوتی تـۆ لێـی گـەڕێ مـن جـێ دادەخـەم سـەرێکی مافورەکـەی بـرد بـۆ لایـەك و سـەرێکی تـری بـرد بـۆ لایـەکی تـر. کـە دیـتی جێگاکـەی بـە خـواری داخسـتووە ژنەکە گوتی تۆ ئەو منداڵە بگرە من ڕایدەخەم.

با مـامم نـەڵێ ئـەو کچـە ناسـکە. هـەر کـە منداڵەکـەی دایـە پـیرەژن منداڵەکـەی فڕانـد و بـردی بـۆ لای ((دیـاب)) کاتێـك ((دیـاب)) لـە دیوەخـان بـوو منداڵەکـەی دا بـە سـولّتان حەسـەن، سـولّتان حەسـەن گـوتی سـەری هەڵدایـەوە و گـوتی : ((اللــهم مصـلی علـی سـیدنا محمـد)) ((ئـەبوو زێـدی بـن هەلالیـە)) پیاوێـك لـەولاوە گـوتی حوشـترێك نـەزری بێـت پیـاوێکی تـر وەری گـرت و گـوتی جوانـە مـاینی خـدێری نـەزری بێـت پیـاوێکی تـر وەری گـرت گـوتی ڕەشمـالّ نـەزری بێـت. گەیشـتە دەسـت ((دیـاب)) گـوتی ((تـف)) تفێکـی لـێ کـردوو گـوتی ئـەو منداڵـە لـەو ژنـە نییـە ئـەو منداڵـە ناشـرینە. منداڵەکـەیان فرێدایـە دەرێ ((ڕسـت)) منداڵەکـەی دایـە دەسـت ژنەکـەی و گـوتی: خـۆت حازرکـە و جوانـە ماینەکـە و ڕەشماڵەکـە لـە حوشـترەکە پێچـرا بـانگی دوو عـارەبی کـردوو گـوتی: بـڕۆ ئـەو منـداڵ و ژنـە بـەرن لەسـەر حـدود ببیـەن لــە خــوێنی وەردەن و بیکــوژن و کراســەکانیانم بــۆ بێننـــەوە، بــەلاّم دوو

عارەبەکە گوتیان مادام تۆ جاحێری ناتکوژین کاوڕێکیان کڕی و سەریان بڕی و لە خوێنیان وەردا هێنایانەوە دایانە دەست ((ڕست)) حوشترەکە شەو و ڕۆژی نەبرد هەر ڕۆیشت هەڵی کردە باو و باران و بەفر کاتێك حوشترەکە هەر ڕۆیشت کاتێك سەری کردە عوبانێك نووست. ئەو عوبانە دوو ژنی هەبوو شێخی کوێر مەشهورە شەو بەفرە. کاتێك بانگی ژنەکە گەورەکەی کرد گوتی هەستە بڕۆ دەرێ. عوربان نەماوە تالآن کراوە ژنەکە گوتی: هیچ شتێك لە گۆڕێ نییە پاشان بە ژنە بچووکەکەی گوت هەستە بڕۆ دەرێ تالآن هیچ نەماوە هەتا سەگ و مانگاش نەماوە ئینجا ژنە بچووکەکەی گوتی: هیچ شتێك لە گۆڕێ نییە. پاشان قەدەرێکی تر چووە دەرێ و گەڕاوە بینی حوشترێك دوور نوستووە چوو سەری کاتێك سەیری کرد ژنێك بە منداڵێکەوە لەسەر حوشترەکە نوستووە ئەویش بە ئەسپایی گەڕایەوە. بانگی دوو ژنەکەی کرد گوتی: هەستن مەنجەڵێك ئاوم بۆ گەرم بکەن گوتی بڕۆن ئافرەتە منداڵێکی پێیەو بانگی کەن. خۆشی چوو جوانە ماینێکی هێناو لە تەوێڵی حوشترەکەی بەستاوە پاشان دوو ژنەکە مەنجەڵە ئاوەکەیان گەرم کرد ژنەکەیان جوان شووشت لە بەینی هەردوو ژنەکەدا نوست. پاشان ئافرەتەکە گەرم بۆوە منداڵەکە دەستی بە واسکە واسك کرد شێخ کوێر چاوی بە ئافرەتەکە کەوت گوتی: بەیانی دەچم قاوەیەك دەخۆم و ڕاست لە خۆمی مارە دەکەم. بەیانی شێخ کوێر کە دوو قاوە سێ قاوەی خوارد هاتە پرسیار لە ژنەکەی بکات و بزانێت تەلآق دراوە. لە باتی هەموو ئەو قسانەدا دەستەسڕەکەی هێنا ناو چاوی و گوتی: من باوك و تۆ کچ بە مانایەکی تر خۆی بە باوکی دانا. ئینجا لێی پرسی کوڕەکەت ناو لێناوە یان نا ژنەکەش گوتی بەڵێ، ناومان لێناوە (کەرۆ) شێخی کوێر دوو کوڕی هەیە. بە کەرۆش دەبێتە سێ برا کەرۆش بە شێخی کوێر دەڵێ ((باوە)).

هەر سێ براکە گەورە بوون دەچوونە ڕاو ژنەکە بە (کەرۆ)ی دەگوت: کوڕم دەبێ ڕاوت لە ڕاوی ئەوان جودا بێ. ڕۆژێك کەرۆ هاتەوە گورگێکی پێبوو خەڵك تێی بەربوون و کوشتیان. ئەمجا کەرۆ ڕۆژی دوایی دێتەوە لە ڕاو باوکی زۆر مشەوەش دەبێت گوتی دایە باوکم بۆ وا مشەوەشە ئینجا گوتی ئەی کوڕم نازانی سوڵتان حەسەن بەیانی جوابی ناردووە دەبێ خەرجی حەوت ساڵم بۆ

بنێرێ ئینجا دایه پیاو هەیه خەرجی لە باوکم بسێنێ. هەڵدەستێت دەچێت بۆ دیوەخان.

دایکی دەیگرێت دەڵێ ڕاوەستە کوڕم دایکی کەرۆ گوتی با لە شار دەرچێ ئینجا ڕێی لێ بگرە با خەرجەکە نەڕوات پاشان هەندێك ڕۆیشت گوێی هەر حەوت خەرجەکەی لێ کردەوە و پارەکەی هێنایەوە.

کاتێك هاتەوە بۆ ماڵێ هەموو خەرجییەکەی و پارەکەی هێنایەوە کردیە بەردەمی باوکی گوتی: ها ئەمەش بۆ تۆ پاشان ((١٤)) حوشتری نارد بۆ جەزا حەوتی کون مەرزدارە. کە چوونە ڕاو گوتی کەرۆ ڕاوت لە ڕاوی براکان جودا بێت. کاتێك هاتەوە گوتی دایە باوکم دیسان مشەوەشە. دایکی گوتی ئەی نازانی باوکت ١٤٠) حوشتر و جەزایان لێی دەوێ. (کەرۆ)ش گوتی پیاو هەیە جەزا لە باوکم بسەنێت. ئینجا (کەرۆ)ش ڕۆیی گوێی هەر چواردە پیادەکەی بڕی و پارەکەیان هێناوە و گوتی ها باوە ئەمەش بۆ تۆ.

ئەمجارەیان گوتی کەرۆ ڕاوت لە ڕاوی ئەوان جودابێت ئەمجارەیان چووە ڕاو سێ ڕۆژ لە ڕاو چوو بوو هیچی دەست نەکەوت سەری چوار ڕۆژ سەیری کردو گوتی دایە هەرچی تەیر و توارد هەیە ڕەوی کردووە وا دێن. بەیانی کەرۆ گوتی دایکی گوتی کەرۆ دایکت بە قوربانت بێ باری حەوت حوشتر گۆچانی شوانم لێت دەوێ. ئێواری هاتەوە باری حەوت حوشتر گۆچان هێنایەوە گوتی دایە ئەوەش بۆ تۆ. ئینجا دایکی گوتی کەرۆ بڕۆ ڕەشماڵەکەمان لە خوار ئاوایی هەڵدە گوتی کەرۆ تاقم قاوەکەت لە باوکت بسێنە من خۆم قاوەت بۆ دەکەم تاقم قاوەکەی برد و دایکی قاوەی بۆ لێناو قاوەی عەجیدی. گوتی وەرە یەك نسحەتت دەکەم بە گوێم بکە. دەی دایە فەرموو دوو سوار دێنە مەیدان ئەوهایە و ئەوهایە کەمەند پێچی بکە و بیهێنە بۆ لام بەڵام ئەو سوارێکی تر ئەوهایە و ئەوهایە لە ناو چاوی بدەن.

چوونە مەیدان لەشکری سوڵتان سێ ڕۆژ خۆی ڕانەدەگرت هەموو شەوان دایکی پێی دەگوت سوارێکی ئەوها و ئەوهایە ئەو سوارەی کە دایکی پێی گوتبوو کە ئەوهایە هێنای بۆ دایکی. دایکی گوتی: (ئۆف) دایکی ئەوجا چوو دۆشەگێکی هێنا و لە بان دۆشەکەکەی دانا خوبزەکی بۆ گرت لە قەنەچییەکەی بۆ تێ

بکـات. کاتێـك ((دیـاب)) شـەوێ چۆوە بـە سـوڵتانی گـوت ئـەو کـوڕە گەنجـەی کـە شـەڕەکەی دەکـرد. دیـاب گـوتی مامـە ئـەم کـوڕە گەنجـە دوو کـچ دەبـەین یـەکێکیان ((هەلالـــە)) و کچـــی ســـوڵتان حەســـەن دەڕازێننـــەوە لەســـەر مەیـــدانی شـــەڕی دادەنــێن. کاتێــك کــەرۆ تەماشــای دوو کچــەکەی دەکــرد لــە پشــتەوە دیــاب بــە تەمابوو لـە کـەرۆ بدات هەلالـە هـەل هەلـەی لێدا کـەرۆ لەبـەر دەسـتی دیـاب ڕای کـرد لـە پاشـان گـوتی دایـە ئـەو سـوارەی کـە تـەعریفت کـرد لەبـەر دەسـتی ڕام کـرد بـەڵام دایکـی گـوتی بـە قوربانـت بم دەسـت لەسـەر چـاوی هەڵنـەگری. دیـاب گـوتی مامـە ئـەو بەدڕەوشـتە عەشـقی ئـەو گەنجـە بـوو دەنـا دەمکوشـت. وا دەیکـوژم ئـەوە دیـاب گـوتی بـەڵام هەلالـە چـووە لای سـوڵتان حەسـەن گـوتی مـەم کـوژن هـەتا بـەیانی. بـەیانی نـەدابوو هەلالـە چـووە لای سـوڵتان حەسـەن گـوتی بـاوکم مایـە گوتی ئـەو سـوارەی کـە لـە مەیدانـە ئـەبو زێدی برامـە باوکیشـم مـاوە دایکیشـم خـۆی قــاوە دەگێڕێــت. ســوڵتان حەســەن گــوتی ئــەمڕۆ ناچــین بــۆ لای شــەڕ. ســوڵتان حەســەن خــۆی و عــەزیزە خــان چــوونە پارێزیــان لــە ڕەشماڵەکــەیان کــە لچــکێکی ڕەشماڵەکـەیان هەڵدایـەوە کچـەکە چـۆن خەونەکـەی گێڕایـەوە کـە بـاوکی لـە ژێـر ڕەشماڵەکـە دانیشـتبوو خەونەکـەی هەلالـە ڕاسـت بـوو. سـوڕانەوە لای ڕەشماڵەکـە گوتیـان سـەلام و عـەلێك بـە منـداڵی خۆیـان شـاد بوونـەوە. ئینجـا بـانگی شـێخی کـوێرە دەکـەن تـۆ خـەرجیت لەسـەر نـەماوە ئـەبو زێـد و ژنەکـەیان هێنـاوە. ئێوارانێـك ((دیـاب)) قاوەیـەکی لێنـاو گـوتی هەرکەسـێك ئـەم قاوەیـە وەربگـرێ دەبێـت بچـێ مـاینێکی ڕەشـی فـران شـێخ بهـێنێ. بـەڵام نەیـدزی. سـێجار قاوەکـەی لـەناو مەجلیسـەکەی گێـڕاو کـەس وەری نـەگرت لـە ئـاخیری ئـەبو زێـد وەریگـرت وە قاوەکـەی خـوارد چـووە مـاڵی فـلان ((شـێخ))ەکـە شـەو ئـەبوو زێـد خـۆی هاوێشـتە نـاو حەوشـەی مـەڕەکان. مـاینی ڕەش بـە حـەوت مـێخ پێچـرا بـوو جێـی ئـەو کچـە عازەبـەش لەسـەر حـەوت مێخـەش بـووە پاشـان ئـەبو زێـد لـەناو مـەڕەکان خـۆی مـات کردبـوو کچـەکەش چـوو دەسـت بـە ئـاو بگەیـەنێ. شـوانەکەیان خـەریك بـوو فەسـادی بکـات کچـەکەش گـوتی مـادام هـەر وایـە بـە شـیری ئـەبو زێدی بـن هـەلالیان ئـەبو زێـدیش لـەپاڵ مـەڕەکان بـوو شـیرێکی لـە ملـی شـوانەکە داو سـەری چـووە لایـەك و لەشـی چـووە لایـەکی تـر. کچـەکەش گـوتی ئـەوە کێیـە ئـەو پیاوەتییـەی لەگـەڵ مـن کـرد ئـەویش گـوتی: ئـەبو زێـدم. گـوتی تـۆ بـۆ لێـرەی حـازر بـووی گـوتی بـۆ مـاینی ڕەش هـاتووم. گـوتی مـاینی ڕەشـت دەدەمـێ بـەڵام نـابێ لێـرە بمێنی

دەبی بڕۆی ماینەکەی بۆ زین کرد و دایە دەستی و بەیانی ڕۆیشت لە بان گردێك دانیشت.

بەیانی کە شێخی عەرەب هەستا شوانەکە سەربڕاوە و ماینی ڕەش بە حەوت مێخ بەستراوەتەوە. بانگی کچەکەی کرد گوتی کچم عەجەب تۆ لەسەر ئەو حەوت مێخە خەوتبووی ئاگات لێ نەبووە ماینی ڕەش بردراوە. گوتی باوە من داومە پێی کچەکە مەسەلەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە و. بەشەڕ هات لە نێوان ئەبو زێد و باوکی کچەکە. ئینجا ماینەکەی هێنایەوە و سێ مانگ شاردیەوە شێخە عەرەبەکە هاتە لای سوڵتان حەسەن گوتی ئەبو زێد ماینی منی هێنایە و هیچ قەبوول ناکەم ناموسمی کریوەتەوە. ئەمجا گرانی هات ئەبو زێد گوتی مامە سێ حوشترم بدێ هەرسێکیانی کردە سێ کوچکە و هەر حوشترێك بو ولاتێك بچێت ئەوا هەرزانی دەبینمەوە. بەیانی کە ئەبو زێد کە چووە لای حوشترەکان دوانیان هیچیان نەکردبوو بەلام یەکیان جولوی کردبوو هاتەوە لایەوە و گوتی لە لای جوی غەیبەوە گوتی مامە دوو زەلامم بدێ بچین غەیبەر بشکێنین. هاتنە دەم زێ ئەوبەر هەرزانی بوو بەلام لاکەی تری گرانی بوو بەلام ئەبو زێد نەخەوت بوو دوانەکەی تر خەوت بوون گورگێك لەلای هەرزانی دەیلوراند گورگێکی تریش لە لای گرانیەکە دەیلوراند. لە لای گرانیەکە دەیگوت هیچ نییە نە گۆشت و نە خواردن بەلام ئەوی لای هەرزانییەکەی دەیگوت گۆشت زۆرە و خواردن زۆرە. گورگەکەی هەرزانی دەیگوت وەرە ئەم بەرەوە بەلام گورگەکەی گرانی دەیگوت ناتوانم لەو ئاوە بدەم گورگەکەی هەرزانی دەیگوت وەرە خواریێ ئەم ڕاستە ببڕە. ئەبو زێدیش گوتی بە هەردوو کەسەکەی گوت و وەرن بە دوای ئەو کورگە وەرن. پەڕینەوە ئەوبەر و ڕوویان کردە ماڵێك و شەو بوو بە ئیرادەی خوا ئەو ماڵە ئیسلام بوون. کابرای ئیسلام گوتی ئەو بەرخە حوشترە سەر ببڕە بۆ ئەم میوانانە. بەلام لە ملی فلان جولەکە بکولێننەوە بۆ میوانی بهێننەوە ئەبو زێد گوتی بۆ ئاگر هەڵناکەن ماڵەکە گوتی ئاگری ئیسلام کوژاوەتەوە ئاگری جو هەیە. ئەبو زێد گوتی هەستە بە دوو کەسەکەی گوت و هەستا ئاگرێکی گەورەی کردەوە.

گۆشتەکە لە ماڵی خۆتان لێبنێن. جو هات گوتی مانای نییە ئاگرت کردیتەوە ئەوە قەشە بانگت دەکات ئەویش گوتی ئەوە بڕۆ قەشە بڵێ ئەوە ئەبو زێدی

بن هەلالیان میوانمە. کە هەستان لەگەڵ خانەخوێیەکەی بوونی میوانی قەشە ئەبو زێد چووە لای قەشە دانیشت دەستی وەك مستە کۆڵە لێ کردو دەستی خستە سەر ڕانی قەشە و ڕانی قەشەی شکاند قەشەکە گوتی تۆ ئەبو زێدی بن هەلالیان نیت ئەویش ووتی هەوم قەشە گوتی بەچی بزانم تۆ ئەبو زێدی بن هەلالیانی ئەویش ووتی بە هەر شتێك قەشەکە گوتی من کچێکم هەیە بۆت ئەرازێنمەوە وە بۆت ئەکەم بە پەردە ئەگەر لێی بە زاوا بووی ئەوا ئەبو زێدی بن هەلالیانی کچەکەیان ڕازاندەوە و کردیان بە بووك شەو ئەبو زید بە تەما بوو بچێت بۆ لای بووك. عەزیزەخان بە ئەبو زێدی گوت مەچوو بۆ لای بووك ئەبو زێد گوتی بۆ؟ گوتی ئەمانە جون جێی سیقە نین ئەگەر تۆ بکوژرێیت ئێمە هەموومان لەناو دەچین. عەزیزەخان وتی من دەچم و کچەکەش شیشێکیان دابوویێ لە ژەهری مار ئاودار بوو کە عەزیزەخان چوو بۆ لای بووك. بووك سێ شیشی کرد بە زگی عەزیزەخانداو عەزیزەخان لە ژووری زاوادا مرد. بەیانی زاوا هاتە دەرەوە تاکو چێشت تەنگاوەکانیش ئەبو زێد چوو بۆ ژووری زاوای سەیری کرد عەزیزەخان مردووە و چەنماوە. ئەبو زێد قۆڵی خۆی لێ هەڵماڵی و جووی خەیبەری پاك کردەوە تەنها مەقەری سەرەکی نەبێ.

ئەبو زێد گوتی گرانیە لە مەنتیقەی خۆمان با بچین قەومەکەی خۆمان بێنین لە گرانی دەرچن و نەمرن. ئینجا مەقەری سەرەکی دەگرین. کە قەومەکەیان هێنا ئەبو زێد بە دیابی گوت دەبێت بچی ئەم مەقەرە بشکێنی دیابی سوار کردبە زۆرداری ناردی بۆ مەقەرەکە کە مەقەرەکە یەك قاپی هەبوو لەوێ هەر پاڵەوانێك لە جووی خەیبەر دەچووە پێش بە دیابی دەگوت ناوت چییە کە لێی پرسی ناوت چییە گوتی ناوم ((دیبە)) پاڵەوانی جوی خەیبەر ڕایکرد لە ترسا ((دیاب)) پاڵەوانەکەی کوشت دیاب گەڕایەوە مەتحی خۆی دەکرد و بە خۆیا هەڵدەدا ئەبو زێدی بن هەلالیان گوتی بە حەقی قورعان دەبێ حەوت ساڵ پشکۆ بنێیتە سەر (قەنە) واتا سبیلی دار جگارە (دارە) دوای چەند ساڵێك ڕۆژێکیان ((دیاب)) لە لای ئاسنگەرێك بوو پێی دەگوت ماشەیەکم بۆ بکە تاکو ئاگری پێ بنێینە سەر (قەنە)کەوە لە کاتێکدا کە ئەبوو زێد بەوێ تێپەڕ دەبوو ئاسنگەرەکە بۆی دروست نەدەکرد. دیاب بانگی ئەبو زێدی کرد ووتی بۆم دروست ناکات ئەبو زێد گوتی بۆی دروست بکە ئەبو زێد نەیدەزانی داوای ماشە

دەکات ئەو تۆپێکی تیژی دەویست کە ددانی تیژی پێوە بوو. ڕۆژێك باوکی ئەبو زێد مرد "عەمری خوای کرد" کە باوکی مرد چوون بۆ سەر قەبران قەبریان لێدەدا. دیاب گوتی ئەم قەبرە کورتە ئەبو زێد چووە ناو قەبرەکە گوتی: باوکم هەر هەندەی من درێژە لە کاتێکدا کە ڕاست بۆوە ((دیاب)) تۆپە ئاسنەکەی بەسەری ئەبو زێد دادا ئەبو زێدی کوشت. دیاب خۆی کرد بە سەرۆکی ئەو عەشیرەتە ئەبو زێد کوڕێکی هەبوو سوڵتان حەسەنیش کوڕێکی هەبوو هەریەك لە ژنێك بوو. دیاب کە بوو بە سەرۆکی عەشیرەتەکە تەدریبی بەم پیاوانە دەکرد واتا سێ کوڕەکە کوڕی ڕست و کوڕی سوڵتان حەسەن و کوڕی ئەبو زێد. خەندەقێکی گەورەی لێدابوو کە دەبوایە بە قوشمە بەسەری بڕۆن قوشمە واتا سوار سوارانێ. ژنەکەی سوڵتان حەسەن ساڵی ئەسپەکیان خزمەت دەکرد. یەکەم ساڵ وولاغی کوڕی خۆی خزمەت دەکرد بۆ ئەوەی کوڕەکەی لەو خەندەقە بپەڕێتەوە. دیاب بکوژێ. ساڵی دوایی خزمەتی ئەسپی کوڕی ژنی بچووکی سوڵتان حەسەنس دەکرد، بەلام دیسان ((دیاب))یان نەکوشت لەو سێ ساڵەدا گوتی بەخوای بەچکە شێر هەر شێرە خزمەتی وولاغی کوڕی ئەبو زێدی کرد، کە پەڕیەوە کوڕەکەی ئەبو زێد لە دیابی دا دیابی کوشت بە شیر لێیدا. ژنەکەی سوڵتان حەسەن بە کوڕەکەی ئەبو زێدی گوت: هەر بۆخۆت شێری و کوڕەکەی ئەبو زێد بووە سەرۆکی عەشیرەتی ئەو هۆزە.

- ئەم حیکایەتە باسی سەردەمی بڵاوبونەوەی ئیسلام دەکات لە سەرەتادا و تێکەڵیشە لە چەند ڕوودا و حەکایەتێك. کە شوێن و زەمەینان جیایە، جگە لەوەی باسی چوو مەسیحی و ئیسلام دەکات، باسی کورد و عەرەبیش دەکات.

# قالۆچه و مشك

**کۆکردنەوەی: سازان قاسم**

**گێڕانەوە: حاجی مستەفا**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو قالۆچە و مشکێك هەبوو، جارێکیان مشك لە ڕێگای دەڕۆیشت قالۆچەی دیت مشك سلاوی لە قالۆچەی کرد ووتی: بۆ کوێ دەچی؟ قالۆچە ووتی: دەچم مێردی دەکەم. مشك بە قالۆچەی گوت: مێرد بەمن ناکەی قالۆچە ڕازی بوو شوو بە مشك بکات. قالۆچە بە مشکی گوت. بەچم بەخێو دەکەی؟ مشك ووتی بە نانی ماری ئاغا قالۆچە ووتی: ئەدی بە چم لێ دەدەی؟ مشك ووتی: بە کلکی خۆم. مشك و قالۆچە لە ڕێگادا دەڕۆیشتن ڕۆیشتن تا گەیشتنە دیوەخانی ئاغا. قالۆچە و مشك چەند حەفتەیەك لە دیوەخانی ماری ئاغا مانەوە ڕۆژەکیان قالۆچە بە مشکی ووت: دەچمە کوڕێ مشك پێستەکەی لەبەر خۆی داکەند قالۆچەکەش پێستەکەی لە دوو خۆی ڕاکێشاچووە دەو زێ پێی قالۆچە کەوتە جیگای سمی کەرێ. قالۆچە، چەند خۆی هێنا و برد نەیتوانی خۆی دەرباز بکات.سوارێك بەوێ داهات قالۆچەکە چاوی بە سوارەکەی کەوت سێجار بانگی کرد. ووتی: هۆ سوارۆ، هۆ سوارۆ.... ئەگەر چوویە گوندی بڕۆ دیوەخانی ئاغا بڕێ سیچاناغەی خاتوونەزین لە قوڕێ حاسێ بووە، بێ بمگاتێ.

کە سوارە چووە دیوەخانی ئاغا سوار گوتی بە دەو زێدا چووم کەسێك هاواری دەکرد ئاوریشم داوە کەسیش دیار نەبوو، هەر دەیوت ئەگەر چوویە گوندی بڕۆ دیوەخانی ماری ئاغا بڕێ سیچاناغا خاتوونە زین لە قوڕێ حاسێ بووە بێ بمگاتێ کاتێك مشك لە کونی گوێی لێبوو ڕۆیی گەیشتە قالۆچەی. وەکی دیتی قالۆچە کەوتۆتە جیگای سمێ کەرێ مشك بە قالۆچەی ووت: چت لێ هاتووە؟ قالۆچەکە ووتی پێم شکاوە، مشك وتی: وەرە سەر پشتم قورتارت کەم. قالۆچە گوتی: پشتیشم شکاوە ناتوانم مشك ووتی دەستت بێنە ڕاتکێشم. ووتی: دەستیشم شکاوە ناتوانم. مشك ووتی: کەلکت نەماوە چۆن بتبەمەوە مشکیش لە داخان پێیەکی پێ دادا قالۆچەی کوشت.

## کەر بووە قازی

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو. ژنەك و پیاوێك هەبوون هیچ منداڵیان نەبوو ڕۆژەکیان پیاوەکە بە ژنەکەی ووت باراشم بۆ حازرکە دەچمە ئاشی پیاوەکە، کەرێکی هەبوو کەرەکەی هێنا و باراشەکەی بارکردە پشتی کەرێ چوونە ئاشی، ئاشەکەش لە گوندێکی تر بوو. دوو ڕۆژ لە ئاش مانەوە ئەوجا سرەیان بەرکەوت ئینجا ئاردەکەیان بارکرد و گەڕانەوە بۆ ماڕێ لە نیوەی ڕێگا پیاوەکە گرەوی لەگەڵ کەرەکەی کرد گۆتی کەرەکە ئەگەر پێش من گەیشتیەوە ماڕێ نانی من بخۆ، بەلأم ئەگەر من پێش تۆ گەیشتمەوە ماڕێ جۆی تۆ دەخۆم. لە ڕێگا پیاوەکە غاریدا پێش کەرەکە گیشتەوە ماڕێ غاریدا ئاخورەکەی جۆی کەرەکەی تێدا بوو جۆیەکەی دەخوارد ژنەکە غاریدا. گوتی: پیاوەکە ئەوە چ دەخۆی پیاوەکە بە ژنەکەی گۆت لەگەڵ کەرەکە گرەوم کردیە کامەمان زووتر گەیشتینەوە ماڕێ نانی یەکتر دەخۆین ژنەکە گوتی: گرەو لەگەڵ کەرێ چۆن دەکرێ. تا بەیانی کەرەکە نەگەڕاوە ماڕێ پیاوەکە بە دوای کەرەکەدا گەڕاوە کەرەکەی نەدیتەوە لە ڕێگادا پیاوەکە گەیشتە ڕێبوارێك پیاوەکە لە ڕێبوارەکەی پرسی کەرەکەی منت نەدیوە؟ ڕێبوارەکە ووتی: کەرەکەت بۆ بزر کردووە پیاوەکە بەسەرهاتی خۆی و کەرەکەی بۆ گێڕاوە ڕێبوارەکە ووتی: کەرەکەت لە بەغدایێ بوویتە قازی. پیاوەکە دەسکە گیایەکی کردوو چووە بەغدایێ پیاوەکە هەر بە پرسیار شوێنی قازی دیتەوە چووە بەر دەرگای قازی بە حەرەسەکەی ووت ئیزنم بدە دەچمە کن قازی حەرەسەکە ئیزنیدا چووە بەرامبەر قازی دەسکە گیایەکەی لۆ ڕاگرت گۆتی: کورش کورش با بچینەوە قازی هەستاوە گوتی: لۆ وا دەکەی کابرا پیاوەکەش گۆتی کەرەکەم بۆتە قازی دەیبەمەوە. دوای ئەوە پیاوەکەیان گرت و ماوەیەك لە بەندیخانە ماوە کاتێك بەربوو چۆوە گوندی بەسەرهاتەکەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. دوای ئەوە پیاوەکە دەستی بە ئیش کرد و ڕۆژێ دەچووە جۆتی یەك خەتی جۆت دەکرد و دەهاتەوە ژنەکەشی دەیگۆت لۆ یەك خەتی دەکەی زوو دێیەوە وە پیاوەکەش دەیگۆت ئەگەر خودا بدات لە خەتەکی دەدات. ڕۆژەکی پیاوەکە هاتەوە خشتەکی زێڕی هێناوە ژنەکە لێی وەرگرت و گۆتی لە کوێت هێناوە؟ پیاوەکەی گۆتی: لەگەر جۆتی لە عەردی هەرقەنا لۆ دەرکەی کۆریتی باشە تا

ریـوی مریشـکەکان نـەخوات ژنەکـە ووتـی زێـڕە نـابی پیاوەکـە ووتـی: باشـە هـەڵیگرە بـەیانی دەیبـەم لـۆ ئاغـای گونـدی ژنەکـەش زۆرزانـتر بـوو پیاوەکـە فـەقیر حـار بـوو شـەو داهـات و نووسـتن شـەویٚ ژنەکـە هەسـتا سـەبەتێك هێلکـەی هێنـا و دنـك دنـك داینـا لـە سـەربان و دیـوار و حەوشـە داینـا نووسـتەوە تـا بـەیانی پیاوەکـەش پـێش ژنەکـەی هەسـتا و چـووە حەوشـە چـاوی بـە هێلکـە کـەوت و ژنەکـەی هەسـتاند و، ووتـی هێلکـە بـاریوە ژنەکـە هەسـتا لەگـەڵ پیاوەکـە هێلکەکانی کۆکردەوە.

ڕۆژەکیـان پیاوەکـە دەڵـیٚ خشـتە زێڕەکـەی بینـە لـۆ ئاغـای دەبـەم ژنەکـە حاشـای لـە زێڕەکـەی دەکـات و زێڕەکـەی نـاداتیٚ پیاوەکـە دەچـێتە کـن قـازی دەریٚ خشـتە زێـڕەکم دیتـەوە ژنەکـەم شـاردیتیەوە نامداتـەوە قـازی بـانگی ژنەکـە دەکـات و داوای زێڕەکـەی لـیٚ دەکـات و ژنەکـەش دەریٚ مـن زێڕەکـەم نـەدیتووە. پیاوەکـە گـوتی ئـەو شـەوەی کـە هێلکـە بـاریبوو ئـەو ڕۆژەی خشـتە زێڕەکـەم دۆزیـەوە ژنەکـەش ووتـی قـازی هێلکـە دەبـاری قـازیش ووتیـە پیاوەکـە ئـەتۆ شـێتی کـەی هێلکە دەباری.

## فەقیٚ حەق مەخۆ

هـەبوو نـەبوو کـەس لـە خـوای گـەورەتر نـەبوو. جارێکیـان پیاوێـك کـاوڕێکی لـیٚ دزرابـوو پیاوەکـە چـووە کـن مـەلا شـکایەتی کـرد گـۆتی مامۆسـتا کـاوڕم دزراوە. فـەقێکانی مامۆسـتا کاوڕەکـەیان چـاکردو ووردیـان کردبـوو خسـتیانە سـەر ئـاگر کاتێـك فـەقێکان دیتیـان پیاوەکـە هـاتووە کـن مـەلای شـکایەتی بکـات و کاتـك جـەرگ و ناوەکـە لەسـەر ئـاگری بـوو، لـە کوراندن و بڵقـی جـەرگ و ناوەکـە بەسـەر دەکـەت و بـەدیار دەکـەت یـەکێك لـە فـەقێکان چـووە لای مـەلا و پیاوەکـە پیاوەکـە بـە مـەلای گـوت کـاوڕم لـیٚ دزراوە فەقێکـە گـوتی مـەلا جـەرگ و نـاو سـەلاوە مامۆسـتاش خـۆی لـە فەقێکـە تـووڕە کـرد گـۆتی فەقێحـەق مـەخۆ بـە داری بیخەنەخۆ.

## نۆ نـان نۆ نـان

**گێڕانەوەی: حاجی خەجیج**
**کۆکردنەوەی: سازان قاسم**

هـەبوو نـەبوو ژنـەك و پیـاوەك هـەبوون هـەموو ڕۆژێ ژنەكـە و پیاوەكـە دەچـوونە دروونـەی هـەموو ڕۆژێ ژنەكـە تـا بچێتەوە مـاڕێ دەیگـوت هـۆ پلكـە عەیشـێ چـت دەوێ؟ پیاوەكـەش دەیگـوت: ژنەكـە ئـەوە چ بـووە، ژنەكـەش دەیگـوت: ئـەوە مـاڕێ پلـە عەیشـێ شـتیان دەوێ بـەو فێـرە ژنەكـە دەچـووە مـاڕێ وەكـی چـووە مـاڕێ نـۆ نـوردی نـۆ نـان نـۆ نـانی دەیخـوارد و تەشـتەك هـەویر كـرد و كردیـە خـەرمانی بـن ئـاگری ئەویشـی خـوارد مەنجـەرەكی لۆلكـەی بـە پێچـكە گـایێ لێنـاو ئەویشـی خـوارد. پیاوەكـەش بـەدوای ژنەكـە هاتـەوە بـە دزی تەماشـای دەكـرد، پیاوەكە ووتی نۆ نووردی نۆ نان نۆ نان رەبی ژنـێ شـفابێ لۆلكـەی پێچـكە گـا بـن رەبـی ژنـێ پـێ بمـری، خـەرمانێ بـن ئـاگری رەبـی ژنـێ پـێ بمـری پیاوەكـە بـە كوتەكان تێر و پڕی لە ژنەكەدا.

- لـە حەكایـەتی قالۆچـە و مشـك بەشـێوەی تـەنز ئـامێز حەكایەتەكـە داڕێـژراوە و دوو كارەكتـەری لێـك جیـا لەگـەڵ یـەك كۆكراونەتـەوە و سـیفەتی مرۆڤیـان دراوەتێ و دواجار پێكەوە سەركەوتوو نەبوون.
- حیكایـەتی كـەر و قـازی بـاس لـە پیـاوێكی گێـل و سـاویلكە دەكـات و ژنێكـی زڵزان، هـەر ئەوەنـدە لـەم دەقـە حیكایـەت قـازی تـا سـەر دەرنەخسـتووە، لـە دەقەكانی تر دەردەكەوێ قازی بە ساختە خۆی كردووەتە قازی.

**کۆکردنەوەی: رووناك سلاح عەلی**
**گێڕانەوەی: سەلاح فەیلی**
**تەمەنی: ٤٩ ساڵ**
**خوێندن: دەرچووی ئامادەیی**
**شوێن: بەغدا**
**وەختی خۆی لە باوکی بیستووە**
**(شێوەزاری فەیلی)**

## ١- للافە:

روژێك لە روژگارێك لە یە ئاوایك پیاگیگ لە ژنەگەی زەلیگی ئەچووی و ژنەگەی ناوی گلاخە بووی. یەکیك لەی روژە لە گلاخە وتە شیوەگەی مە ئەچمە شار تونیش چاودە مر خە لەم بوو. گلاخەش نزیکەل بیس مرخ داشت وتە شیوەگەی ئەگەر یە مرخ گۆم بێ پوست ئەکەنم، شیوی گلاخەیش فرە زیەلیگێ چووی هەوە ناو فکر بووی چووی ئیوەتیان بکاد چونکە ئەگەر گلاخە بچگە شار چوار، پەنج رووژ وە پێ ئەچێد ئێ رووژەگەش گلاخە شدوەکی زووی چوو هەرەی شار، شیویەگیش تەپەلێ شیوویا چووین چاویە ئی مرخە لە بوود فکر کرد گشتیان وە یەکەوە بوەسید، وە هەئی کارە کرد.

نزیکی شاو گشتیان لە پایان وەسیان وە بە کەنان و خەوکەفتە لێ، شەوەکی لە خەو ئەڵسا وەختی دی یە مرخ نەمەنیە. تومەسە رووی هاتیەو گشتی مرخەکان لە ئەنافەکە کیشاس و برد گەسیان.

شیویەگدی وت: هەی دادو بێ داد چە خەریگیگ بگرمە سەر سەر وە دەس گلاخە ئەگەر وەدەس گلاخە بیەتەو پوسم کەنیدە کەفتە فکر! بوایدەودەس گلاخە وە پێ نەرەسد. جفتێ کلاش داشت نانەی ژیر باڵی و کەمی نان هشك وەل خۆی برد و ئاوای و ئاوای وای دوای چەند روژیك دەروەدەری رەسیە نزیك شاریك.

ئمجا کلاخە هاتە ماڵ وەختی دی میرکانەکدی کاوڵ بوویە. نەشیوها ماڵ نە مرخ مەنیە. ئەویش کوتەکیك گرتە دەس کەفتە شوون شیوەکەی ئاوای وە ئاوای. فیر شیوەگەی نەکرد رەسیە پەری شار لەی وەختە قسەیەك بەلاوبووی

کە ئەژدیهایك هاناو تیوونی ناوی شارەگە. پادشاهی ئەو شارە وت: هەرکە ئەو ئەژدها بکوژی خەلاتی ئەکەم، شیوەگەی گلاخە فکر کرد بچیٚ ئەو ئەژدها بکوژی تا بیتە خاونی خەلاتێکی خاس و پویلٚ دار بوود وە لەدەس گلاخە دوویر بکە فێد.

شیوەگەی گلاخە چوویە لای پاشا وت: من کۆشمە. پادشاه وت: ئەگەر بکو شیدە خەلات و پویلٚی خاسی دەمەپیر.

شیوەگەی گلاخە چوویە لای تینەگە فکر کرد یاد چووین بچووە ناو ئی تیوونە کە بنی دوویرە، لەی وەختە گلاخە حازر بووی و بووق ملٚی گرت و وت

وت: ها ! ئەرەی کو دەرچوید.شیوەکەی وت: مە کەی دەرچوومە ! مامر دزەگە ها ناو تیوونەگە. یەنی چەن رووژە کە فتمەسە، سەری خۆی لێرە شاردگە سەوە.

گلاخەوت: وە تەناف کلم بکە خوار تا بزان یە چووین مرخی من دزییەز

شویش وە تەناف وەسیەو کلی کردە خوار. چاوەری کردیار بزانن چەبوود. قەیلیك وسا خەوەرێك نەبو. وە یە جار تەماشا کرد ئەژدها هاتە و بان و تەپیٚ:

یە چە بووی کل کردیدەرام وەرەو خوار.

شیو وت: کۆرە یە گلاخەس، گلاخە.

ئەژدەها وت: ئەو قەرە وە کۆتکە داسە نۆك لوویتم نەتوەنستم قەپەلس بگرم.

شیر وت: منیش وەدەس گلاخە وایە.

ئەژدەها لە شار وای و دوویر کەفت. شیر گلاخەیش تەنافەکە بری تا گلافە نەیەتە بان و خۆی چوویە لای پادشا و خەلاٚت و پولگەی خۆی برد. مالٚی خاسێگ لەناو شار دروست کرد، ژیانیٚ خاسیگ داشت. دوای قەبلیگ ژنەفت ئەژدەها لە شاری تر هاتگەسە دەیشت. پادشای ئەو شارە پەیام ناردەریٚ ئی پادشاه کە ئەو کابرا ئەژدەهاگەی ئیوە کۆشت، ئەرەی ئیمە کلی بکەن لە ئەژدەها زگارمان بکاد. دە وەراوەر خەلاٚتەی ئیوە دیمەنەپیٚ.

سەربازلەی پاشا هاتنە شوون، شیو گلاخە وتنە پێ ئیجوور کارێك هەس شیو گلاخە فرە زەلیکی چووی وت: ئەمجارە ئەژدەها خوەدەم.

سەربازەکان وتن: ئەمری پادشاه باید بچێت. چووین پادشاه قەولی داس.

شیوی گلاخە وە هەر جورێك باید بچیاتاد. جفتە کلاشەگەی نانە ژێر باڵی و چووی، چووی تا رەسیە ئەو شارە. چوویە لای پادشاه وت:

گەورام من بووم ئەو ئەژدها کوشتم.

پادشا وت: ئی ئەژدها فرە گەوراس و سەر رێ مەردم گرتیە و نیە توە نیمنە بەنی، خلاسمان بکە وەلی خەلاتیکی فرە دەنیمە پید.

شیو گلاخە وت: ئەوە بان جێمەڵم

شیو گلاخە کەفتەری جفتە کلاشگە لە ژێر هەنلی بووی وەرە و ئەژدەها چووی. ئەژدەها وە دیوورە وە دییە و تەپێ:

نەوتمە پید نزیکم نەکەف خوەوە مەد؟

شیو گلاخە وت: کورە مەکەی نزیکت کەفتم دیرم وام.

ئەژدەها وت: لە چەواید؟

وت: کورە نیەزانی؟ گلاخە هاتیە سەشار وە دەس گلاخە وام. وتمە ترنیش فکری خوت بکەی.

ئەژدەها وت: نەیشوید راستە؟

شیو گلاخە وت: کورە ها ئەلان رەسیدە پیمان. ئەم جارە دوو کوتەکی ها دەسی وجی یەکیك.

ئەژدەها وت: تو وە رێگ بچوو منیش وە رێگ تا گلاخە بکە فیدە شوێن تو وە شوون مەناد. ئەژدەها وای. شیو گلاخەیش بیچ کردو جاری تر هاتە ناو شار و خەلاتی خوەی لە پادشا برد و چویەرەی شارەگەی خوی و لە ژیانی خوەشی ژیا.

## ٢- جوجه

**کۆکردنەوەی: رووناك سلاح عەلی**

**گێڕانەوەی: ئەزهار عەبدولکەریم**

**تەمەنی: ٤٦ ساڵ**

**خوێندن: دەرچووی ئامادەیی**

**شوێن: بەغدا**

وەختی خۆی لە میمکی کەناوی (مەهدیە عەلی خان)بوو بیستووە.

یەکیك بووی یەکیك نەبووی. جگە لە خودا کەسی نەبووی. یەپیاگگ بووی سێ دوەت و ژنگ داشت فەقیر بوین. پیاگەگە چال کەن بووی و ناوی جوجە بووی. یە رۆژ لە روژان داشت چاك ئەکەنی موی لە ژێر زەوی دێ، مویەگە ئیقرە فریە بدوی جەمی کرد و کردەی کلافیك. وەل خوەی وت ئی مویە بکدینە چادرگ و مەن و ژن و منالم بنیشینە ژێری. یەك جاری لەو چالە دیرگ هاتەدەر کە نەو موویە هن دیوەگ بووی.

دیوەگە وت: ئی موید ئەرەی چە جەمید کدید. ئی موید هن منە.

جوجە وت: ئیمە فقیرم و جی نیریم ئەخوازم بکەمە چادرگ و خۆم و ژن و منالیم بنیشمنەی. دیوەگە وەل خۆی فکر کردو وت ئەیرمان و چاخیان بکەم و بخوەمەیان.

دیوەگە وت: تۆ مە ناناسید؟ مە میمگەم و مال و پویل فرە دیرم بیەن و وەل مە بژین (وەدروو)

جوجە خوەشی کرد و دەوی چویدەری ماڵ خەوەردا ژن و منالی. وتە ژنەگە: حازر بوو بچیمنە ماڵ میمگم.

ژنگە وت: جوجە تو نەکو میمگ داشتت؟

جوجە وت: تو چوزاند مە میمگ دیرم.

ژن و منالی حازر بوون و چووینەوەی ماڵ دێوەگە. دیوەگە هاتە نوایان و ماچیان کردودەس خستە ملیان و وت:

بیەن یەماڵمیمگدانە. ئەری خودان بخوەن و بژییەن.

هەر روژ دیوەگە نان و گوشت و ئاو ئەدا پیان تا بخوەن و قەیوون بوون و ئەمجا بخواگەیان. هەر شەو وەختی وانە دیوەگە ئەهات و دەس ئەنانە قەی لەشیان تا بزانی قەیوون بووینە.

یە شەوی یەکیك لە دوە تەگی دیوەگە کە شەو دەس ئەنانە قەیان. بویە شەوەکی دوەتەگە ئی چشتە کردێ ئەرەی داگ و باوگ وت:

بزانن داسە ملّدان تا زۆقۆم نەخوەن.

یە روژتر یەکیك لە دوەتەگەی دی میمگیان لەناو متوەقەگە دەس ئایمت ئەخوا. دیوەگە وەختی دوەتەگە دی دەسەگە نانە ناو خەزانگ و دەری نان و وتە دیوەگە بیە لای میمگد تاماچد بکەم. دوەتەگە هاتە لای میمگ و دیوەگە قەپی لە گوپی گرت دوەتەگە گیرست و چیوە لای داگ و وت میمگم قەپیگم لم گرت. وەختی باوگیان هات بە باوگی وت ئیفەنە باوەر نەکردو وت:

تۆ خوەد لە گویچە بازی کردە و کەفتدە.

روژیك دیوەگە لە ماڵ چویە دەر. ژنەگەو هەر سێ دوەتەگە وتن بیەن بواسین تا ئی میمگە کاریك وەسەرمان نەکردگە (جوجە وت من نایەم و ئەوانیش جوجە لیشتنەجی) وەلی خۆیان یە گوونی ئاو و تیخ و خوا و پویلّ بردن و ی بان عەرەبانەیەك و خویانیش سوار بوون و چووین.

وەختی دیوەگە هات ئەینۆی کەس لەماڵ نیە و وەل خۆی ئەیژو (مەسدان کردم وە هەردوو دەس بوینە داخ دلّم) لە دیوور هەر چواریان دێ و جوجە وەلیان نەبو وت بیلە جوجە فیر بکەم چووین ئەوە ولیان نییە. فیری کردو دواتی جوجە لەناو تەنیورەگە خۆی شاردگە سەو و تەپێ ها جوجە (مەسدم کردم وە هەر دوو دەس بوویدە داخی دلّم) جوجە کردە یە لۆقمە و دەوی چوویە شوون ژن و منالّەگەی جوجە تا بخواگەیان.

ئەدەوید شوونیان و هەر ئەوت (مەسدان کردم وە هەردوو دەس بووینە داخ دلّم.) وەختی نزیکیان بووی و قەپیان بیەن مەمیگدانم کەمی چیشت بەمە پدان بەرژە بچن. منالّە لەوتن هیوچ چشتگ ناخوازیم کل چتشگ بردیمنە و لی

وەختــە یــە گونیــە تیــغ لــە عەرەبانەگــە خســتنە خــوار و وتــن دونیــا کــل بدگــە تــیخ دیوەگــە کــە ئەدەویــە شــونیان لــە بــان تیخــە ئەجســمت و پــای شــلپە شــلپی خــوین لــی هــات. ئــەمجا منالّــە لــە گــوونی خــوا خســت و وتــن دونیــا کــل بیگــە خــوا. پــای دیوەگــە چــووین زەخمــی وەخــتی لــە بــان خواگــە ئەجســمت پــای ئەلرچــانەی و ئەسوزانەی ئەجا منالە لە جاری تر گونیە ئاو لە عەرەبانەگە خستە خوارو وتن دونیایکی بدگە ئاو دیوەگە سەینی و لەناو ئاوەگە ناتوانست بجمی.

دیوەگــە وتــە پیــان: مەمیگــدانم بویژنــەپم لــەناو ئــی ئــاوە چــووین بییەمــە دەر. وتنــە پیّ: میمگــە یــە کۆچك ســەینی نبــەئی شــان و یــەکیك بنــە ئــەو شــاند تــا لــەناو ئاوەگــە بیــدەدەر (وەدروو). دیوەگــەش قســەیان گرتــە گــووش و ئــی کارەکــە ئــەوان وتــن کــرد. دیوەگــە ســەینی و ئــی کوچگە لــیش کــد نانویــە ســەر شــانی ســەینی و ئــەرەی موودیــە نــاو ئاوەگــە و خــنگ بــووی و مــرد. ئــەو ژن و ســیّ دوەتەســیش چــووین و ئەرەی خوەیان ژیان.

- لافــە دەقێکــە بــاس لــە ژنێــك دەکــات کــە مێردەکــەی لــە زەواق نــاوە و هــەتا ئــەژدیهاش لێــی دەرســیّ. ئــەم ئەفســانەیە بــەزۆر شــێوازی کــوردی دووبــارە بووەتەوە.
- جوج باس لە ڕۆژانیّ دەکات کە ژیان نزیك ئەشکەوت و سادە بووە، کێشەکە لەگەلّ دێوە. دەکریّ لێرە دێو بۆ قۆناغێکی دواکەوتوو تر بیّ لە مرۆڤەکان.

# سەر بە زێڕ و سەر بە زیو

**کۆکردنەوەی: پەرژین رەئووف عەلی**

**گێڕانەوەی: محەمەد حەسەن یونس**

**تەمەن: ٥٠ساڵ – نەخوێندەوارە**

**خەڵکی گوندی دارەبەن**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو لە ناوچەیەکی ئەم کوردستانە دەستە خوشکێك دەبن سێ کچ دەبن رۆژێکیان بۆ ئاو دەچنە سەر کانی، کوڕی پاشاش چاوی پێیان دەکەوێت و دەڵێت با لە دوویان بڕۆم بزانم چ دەڵێن کاتێك کە لێیان نزیك دەکەوێتەوە هەر یەکەو قسەی خۆی دەکات یەکێکیان دەڵێت ئەگەر مێردم کرد دەبێت دوگوردێکی بێنم جێی هەموو خەڵکی گوندی لەسەر ببێتەوە ئەوی تر دەڵێت: من لەکاتی مێرد کردنم مەنجەڵێکی گچکەی شیو لێدەنێم و هەموو ئاوایی تێری لێ بخوات، ئەوی تریان دەڵێت: منیش دەبێت دوو منداڵم ببێت سەر بە زێڕ و سەر بە زیو. کوڕی پاشاش دەڵێیت شەرت بێ هەرسێکیان بخوازم هەردەستێ هەرسێکیان دەخوازێ ئەوەی یەکەم دووگوردەکەی دەینی پڕی ناوی دەرزی دەکات هەرکەسێ دادەنیشێ و لەسەری هەڵدەستێ ئەو شەرتەکەی دەباتەوە ژنی دووەم مەنجەڵێکی گچکە شیوی لێ دەنێت بەڵام زۆر سوری دەکات هەرکەسێ پارویکی لێبدات تفی دەکاتەوە و فرێی دەدات ئەویش شەرتی خۆی دەباتەوە. ژنی سێیەم دوای ئەوەی ساڵێك بەسەری دادەچێت زگی دەبێت دوو منداڵی دەبێت بەڵام پێش بوونی دوو ژنەکەی تر دەڵێن بەخوای گەر وا بڕوات ئێمە ئیهمال دەبین لەلای پاشا پێش ئەوەی ژنەکە منداڵی ببێت دەچنە کن دارتاشێك سندووقێك دروست دەکەن و دوو (دوو گوجیلە سەی) پەیدا دەکەن لەکاتی منداڵ بوونی ژنی سێیەم منداڵەکان دەخەنە ناو سندووقەکە و دوو گوجیلە سەیەکەی دادەنێن دەڵێن پاشا ئەوە دوو گوجیلە سەی بووە شەرتەکەی دۆڕاند و منداڵەکەش دەخەنە ناو سندووق و فرێی دەدەنە ناو زێ.

پاشـاش بڕیـار دەدات چـونکە ژنەکـە شـەرتی دۆڕانـد لـە دیوەخـانی خـۆی دادەنـێ و هــەر میـوانێکی هـات تـف و نەحلـەتی لـێ بکـەن ئـەو دوو منداڵـە لـەناو زێ پیـاوێکی ڕەشـی ڕاوچـی چـاوی بـەو سـندووقە دەکـەوێت دەڵێـت بـەخوا ئـەم سـندووقە شـتێکی تیادایـە سـندووقەکە دەگرتـەوە کـە تەماشـا دەکـات دوو منـداڵی جوانکیلـەی تێـدا دەبێـت ئـەویش خـۆی منـداڵی نابێـت دەڵێـت بـا بـەخێویان بکـەم. ئـەو دوو منداڵـە دێنێتـەوە دەیانشـوا و لـە کـاتی شووشـتنەکەی چـرکی یـەکێکیان دەبێـت بـە زێـڕ و هی یەکێکیان دەبێت بە زیو.

بـەم شـێوەیە ئـەو پیـاوە ڕەشـە دەوڵەمەنـد دەبێـت دەڵێتـە ژنەکـەی ئاوێنـەیان پـێ پیشـان مـەدە چـونکە ئەگـەر بـزانن ئـەوان وا جـوان و ئێمـەش وا ڕەشـین و ئـەوە دەزانـن کـە کـوڕی ئێمـە نیینـە ڕۆژێکیـان بـۆ گـەڕان دەچـنە بـازاڕێ چـاویان بـەخۆیان دەکـەوێ لـە ئاوێنـە کـە چـەندە جـوانن. دەگەڕێنـەوە دەڵێنـە دایکیـان بـۆ ئێمـە هەنـدە جــوانین ئێــوەش هەنــدە ڕەشــن دوایــی دەزانــن کــە کــوڕی ئــەوان نینــە زۆری لــە دایکیـان دەکـەن کـە بـزانن دایکـی ڕاسـتەقینەیان کێیـە بـەڵام دایکیـان پێیـان دەڵێـت کـە نـازانێ دایکـی ڕاسـتەقینەیان کێیـە بـەڵام کـوڕی ئـەو نینـە بۆیـە ئـەوانیش دەڵـێن چـونکە ئێـوە چـاکەتان لەگـەڵ کـردین هەریەکـەو کـەمێك پرچـیان دەبـڕن و دەڵـێن بەرامبـەر ئـەو چـاکەی لەگـەڵتان کـردین ئێسـتاش ئێمـە دەڕۆیـن تـا دایـك و بـاوکی ڕاستەقینەمان بدۆزینەوە.

بـەرێ دەکـەون و دەڕۆن دەکەونـە گونـدێك لـە دوایـی هـەر ڕاناوەسـتن لـە ڕێگـا شـەویان بەسـەر دادێ لـە پـڕ (خـدری زنـدە)یـان دەگـاتێ پێیـان دەڵێـت سـڵاوتان لـێ بێـت چـۆنن ئێـوە وا جـوان بـۆ بـە تـەنیا لـەم شـوێنەن؟ ئـەوانیش شـتەکەی بـۆ دەگێڕنـەوە ئـەویش دەڵێـت مـن دەزانم دایـك و باوکتـان کێیـە ئـەوانیش داوای لـێ دەکـەن یارمـەتیان بـدات دەڵێـت. باشـە دایـك و باوکتـان پاشـان لـە شـوێنێك دایکتـان لەسـەرەنگۆ لـە دیوەخـانی باوکـت دانـراوە هـەر تـف و نەحلـەتی لـێ دەکرێـت. دوو زڕداکیشـتان هەیـە کـە ئـەوان لـە دایکـت کردیـە ئەگـەر پاشـا دەعـوەتی کـردن تـف و نەحلـەت نەکەنـە ژنەکـەی لـە دیوەخـانێ چـونکە ئـەوە دایکتانـە. ئـەوانیش دەڵـێن چـۆن بگەینـە ئـەوێ دەڵێـت مـن فرێتـان دەدەم دەکەونـە ئـەوێ. ئـەویش فرێیـان دەدات دەکەونـە سـەر خانوویـەکی نزیـك کۆشـکی باوکیـان چـونکە سـەر زێـڕ و سـەر زیـو بووینـە زوو خانوویـان بـۆ گرتـووە پاشـاش دەڵێـت مـاڵی نـوێ هاتوونـە ئێـوە پێیـان بڵـێن بـا بێنـە ئێـرە و دەعوەتیـان دەکـەم بـۆ ئـەوەی تـف و نەحلـەی ئـەو ژنـەی بکـەن کاتێـك دێنـە ئـەوێ دەبیـنن ژنەکـە لـەوێ بەسـتاوەتەوە خورامـەکان دەڵـێن ئـەو

ژنە تف و نەعلەت بکەن پاشان برۆنە کن پاشا ئەوانیش دەزانن کە دایکیانە تف و نەعلەتی ناکەن خەبەر دەگاتە کن پاشای پاشاش دەڵێت دەبێت لەسەریان دەن چۆن قسەی من دەشکێنن. بەلام کوڕەکان دەڵێن با پاشای ببینین قسەیەکمان پێیە ئەویش دەڕێنە پاشای پاشاش دێت دەڵێت ئێوە کێن بۆ قسەی من دەشکێنن ئەوانیش یەکسەر دەڵێن ئەم ژنە دایکی مەیە پاشا ئەمەی زۆر پێ سەیر دەبیت دەڵێت باشە ئەگەر ئێوە لەکاتی سەر شووشتن سەر زێڕ و سەر زیو بن ئەوە هەون ئەوانیش سەریان لە پێش چاوی پاشا دەشۆن چرکەکەیان دەبێتە زێڕ و زیو. پاشاش دەڵێت کەوایە ژنەکانی تر ئەم خیانەتەیان کردووە و راستییەکە ئاشکرا دەبێت پاشاش بڕیاری دەدات دوو ئەسپی زۆر باش بێنن. هەردوو ژنەکەی لە ئەسپەکان دەبەستێت و تاکو دەمرن ئەسپەکان دەڕۆن، دایك و کوڕەکانیش بەیەك شاد دەبن (ئەمنیش گەڕامەوە کراسیشم دڕا هیچم پێ نەبڕا)

– ئەم ئەفسانەیەش زۆر شێوەی هەیە، لێرە کەمێك لەوانی تر جیایە، ڕەگەزی ئەفسانەیی چرکی لەشیان دەبێتە زێڕ و زیو.

# چیرۆکی خالید ئاغا

**کۆکردنەوەی: زانا محەمەد عەولا**

**گێڕانەوەی:(مام عەولا). کە تەمەنی (٥٨) ساڵە نەخوێندەوارە**

**دانیشتووی گوندی (کونەقیرە)، (باسرمە)**

ئاغایەك هەبوو بە ناوی خالید ئاغا وو وەزیری هەبوون وەزیری دەستە ڕاست و دەستە چەپ، وەزیری دەستە ڕاست ناوی ((حەمێ زەرێ)) بوو وەزیری دەستە چەپ بە ناوی ((حەمێ)) وەزیری دەستە چەپ خوشکەکی هەبوو بە ناوی ((گورێ)) مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبوو، لە دەرەوەی گوندی بوو، خالید ئاغا پیاوێکی بەناوبانگ و لێهاتو و جوان بوو سێ ژنی هەبوون، ڕۆژێکیان دوو فەقێ لە ڕێگا بوون بۆ گوندەکە دەهاتن لە ڕێگا لە ماڵی ((حەمێ)) میوان بوون لەوکاتە ((حەمێ)) لەکن خالید ئاغا بوو. خوشکی حەمێ کە ناوی گورێ بوو زۆر بەخێرهاتنی ئەو دوو فەقێیانەی کرد. خواردنی دانێ پاشان لە دوای نان خواردنیان هاتنە گوندەکەو چونە دیوەخانی ئاغای گوندی کە دیوەخانی خالید ئاغا بوو لەکاتی نان خواردنیان سەیری ئاغایان کرد و لەنێوان خۆیان گۆتیان ئەو کیژەی کە دەمێدی نانی دامە. قابیل بەو ئاغایە خالید ئاغا هەستی بەوە کرد.کە ئەو دوو فەقێیە لە نێوان خۆیاندا قسە دەکەن، بۆیە داوای لێ کردن کە بزانی ئەوان چارێن. فەقێکان نەیانویست قسێ نەخۆ ئاشکرا بکەن لۆ ئاغای قسەکان بگێڕنەوە، بەلام ئاغا زۆری داوای لێ کردن کە قسەکەی خۆیان لۆ بکەن. لۆیە ناچار بوون لۆ ئاغا قسێ بکەن لەوکاتەشدا ئاغا دەپرسیت ژنی ((چارەم)) بینی، فەقێکان بە ئاغایان گۆت ئەمە لە خوارەوە میوانی ماڵە ڕەوەندێك بووین. کیژێکی لێبوو زۆر جوان بوو قابیل بە تۆ بوو، ئاغا گۆتی کیژەکە ناوی چییە؟ ئەوانیش گۆتیان کیژەکە ناوی ((گەورێیە)) زۆر بەڕێز و چاو برینە و خانەدانە. ((ئاغا)) داوای کرد و گوتی هەڕوون بزانن ئەوە ماری کێیە دوو سواری ناردن بەرەو ماری ((گەورێ)) بەڕێ کەوتن لەوکاتەدا ((حەمێ)) زۆری پێ ناخۆش بوو بۆیە بە عادزی گەڕاوە مارێ دوو سوارەکە زانیان کە ئەوە مارێ حەمەیە وەیان گۆتە خالید ئاغای، لۆیە خالید ئاغا گاسی حەمەی کرد کە وەزیری دەستە چەپی خۆی بوو، حەمەش وەیگۆتە ئاغای،

ئاغـام خوشـكی مـن شـوو ناكـات و نەقووسـتانە قابيـل بـە تـۆ نييـە، خاليـد ئاغـای گـۆتی هـەردەمويّت حـەمیّ نـەيتوانی واز بـە بڕيـاری خاليـد ئاغـای بهـێنی سـەبارەت بـە هێنـانی خوشـكی وی، لۆيـە وەيگۆتـە خاليـد ئاغـا مـن خوشـكی خـۆم نادەمـە تـوو. خاليـد ئاغـاش كورسـيەكی لەسـەری حەمـەيّی داو سـەری شـكاند، حـەمیّ گەڕايـەوە مـاریّ بەسـەر شـكايی گـەوریّ پێـی گـۆت بـۆ وات لێهاتيـە و سـەرت شـكاوە ئـەويش وای گـۆت كـە خاليـد ئاغـا داوا دەكـات ئـەتوو بدەمـە وی. منـيش بـەوە ڕازی نيـيم و لۆيـە ئـەو تـورە بـوو كورسـييەكی لێدام وە پێويسـت مـاریّ خۆمـان لێـرە بـار بكـەين و بچـينە جێيـەكی زۆر دوور لـە گونـدی خۆمـان، لـۆ ئـەوەی خاليـد ئاغـا و پياوەكـانی مـاری مـە پـێ نەزاننـەوە، لۆيـە مـاریّ خۆيـان لـەناو يـەك نـاو سـواری ئەسـپەكانيان كـرد، حـەفت شـەو و حـەفت ڕۆژ بەشـواری ئەسـپەكانيانەوە ڕۆيشـتن لـە گونـدەكانيان دوور كەوتنـەوە لـە وەرزی زسـتاندا بـوو لۆيـە خاليـد ئاغـا ڕاوەسـتا تـاكو وەرزی بـەهار داهـات ئـەوجا دوو سـواری نـارد لـۆ مـاریّ حـەمیّ سـوارەكان چـوونە وێنـدەر تەماشـايان كـرد يـەك بيسـت گيـا لەسـەر هەوارەكـەی حـەمیّ شـين بـووە زانيـان كـە حـەمیّ هەوارەكـەی بەجێهێشـتيە لۆيـە گەڕانـەوە كـن خاليـد ئاغـا و وەيـان گـۆت كـە حـەمیّ هەوارەكـەی خـۆی بەجێهێشـتيە لۆيـە خاليـد ئاغـا گاسـی حـەمیّ زەدی كـرد وەی گـۆتیّ حـەمیّ زەدە تـەكبير كـەرە تەكبيرامـە چـييە لـۆ حـەمیّ و گـەوریّ و مـەڕو ماراتەكـەی. حـەمیّ زەدی گـۆ مـا تـەكبير چـييە ئاغـام سـەری حـەمیّ بپـبڕێنين گـەوریّ لـۆ خاليـد ئاغـای بيـنين تارانـا وانـيش (مـەڕ و مـارات) لـۆ زيلـدن و حەيـدەری (سـوپا) هەسـپیّ حـەمێلۆ حـەمیّ زەدی لۆيـە حـەمی زەر هەسـتا بـە خڕكردنـەوەی سـوپايەكەی لـەناو گونـد بـراو بـووەوە كـە خاليـد ئاغـا ئەيـەويّت حـەمیّ لـەناو ببـات تـەكبيرا ئاغـا و خورامـان وايـە كـە سـەریّ حـەمیّ بپـەڕێنن گـەوریّ لـۆ خاليـد ئاغـای بيـنن ماينـا حـەمیّ لـۆ حـەمیّ زەری بـی تـاراوانيش لۆ زيلان و حەيدەری بن.

مێرەم كـە مـامۆژنی حـەمیّ بـوو ژنـا كـالۆی بـوو. كـە كـالۆ مـامی حـەمیّ بـوو. مێـرەم لەسـەر كـانيیّ گونـدی گـوێی لـەوە ببـوو كـە تـەكبيرا ئاغـا و خورامـان وەهايـە بۆيـە گەڕايـەوە مـاریّ لـە پشـت سـەریّ كـالۆی گريـا فرمێسـكەكانی كەوتنـە سـەر ڕوومـەتی كـە كـالۆ نووسـتبوو لەگـەر ئـەو فرمێسـكانەی مێرەمـیّ لـە خـەو هەسـتا و گـۆتی هـا مێـرەم خێـرە ئەگرێيـەی گـۆتی كـالۆ بـرێم چـی تـەكبيرا ئاغـا و خورامـان ئەوهايـە كـە سـەریّ حـەمیّ برازايـیّ تـوو بپـەڕێنن گـەوریّ خوشـكا وی لـۆ خاليـد ئاغـای بيـنن ماينـا وی لـۆ حـەمیّ زەری بـی، مـەڕ و مـاراتی وی لـۆ زيـلان و حەيـدەری بـی،

کـالۆش کـە ئـەوەی زانـی گـۆتی هەسـتا شـێر و مـەتارێ مـن لـەبن سـواندەی خـانی دەربینـە زیـنێ مـن دەربینـە بـە ئـاوی گـەرم و سـابونێ بشـورینە کـە کـالۆ قـەدیم سوارچـاکێکی لێهـاتوو بـوو زۆر ئـازاو چـاونەترس بـوو بـەلأم پـیر ببـوو نـەخۆش کـەوتبوو بـە مێرەمـی گـۆت هەسـتە سـرێ منـیش بشـۆ سـەرو ریـش و نینـۆکێ مـن بقرتێنـە مـەیرە مـێش هـەموو ئیشـی لـۆ کـردن، هەسـپێ خـۆ زیـن کـرد و شـێر و مـەتارو تیروکـەوان و قـەڵغانی خـۆی هـەرگرن و سـواری پشـتا ئەسـپێ خـۆ بـوو خالیـد ئاغـاو حـەمێ زەریـش سـوپا و جەیشـی خـۆی کـۆکردەوە لۆیـە کـالۆ چـووە فرەیـەکی بـە دەوری جەیشـەکەی خالیـد ئاغـا لێـداو تیرەکـەی خـۆی لـەناو تیرەکانیـدا خالیـد ئاغـا و حـەمێ زەری گۆتیـان کـالۆ ئـەتو پـیری ئـەو بـرازای تـووە ئەمـە ئەچـین ئـەیکوژین تـەکبیرا مـەش ئەوەیـە کـەورێ لـۆ مـن بـی ئەسـپەکەش لـۆ حـەمێ زەری بـی تـارانیش لـۆ زیـلان و حەیـدەری بـێ ئـەتوو لـۆ دێـی لـە گەرەمـە ئـەوی بکـوژی ئاغـام ئـەو لـۆ کوشـتنێ باشـە چـونکە هەنـدە سـالە ئـەو دەورەمەنـدە و ئـەمنیش فـەقیرم کـە مـامێ وی مـە گیسـکە گرەوەکـی نەدایتـە مـن لۆیـە ئـەمنیش دێـم شـەڕی لەگـەر دەکـەم و بـەرکو هەنـدەك لـە تارانـاوی وەبـەر منـیش دەکـەوێت.
بـەرام حـەمێ زەرێ گـۆت ئاغـا بـا ئـەوی لەگـەرە خـۆ نەبـەین ئـەوە لەمـە بـە فێـرە لۆیـە ئاغـا بـە حـەمێ زەری گـۆت ئـەو پـیرە مـا چـی پـێ ئـەکرێ بـا دەگەرەمـە بـێ کـالۆش سـێ گوللـەی زێـڕی پـێ بـوو سـووپاکەیان کەتـە ڕێ کـالۆش دەگـەر خالیـد ئاغـا و حـەمێ زەری بـوو شـەوی بەسـەرداهات و سـەربازەکانیان هـەموویان نووستن کـاتی سـبەینێ داهـات کـالۆ لـە خـەو هەسـتا گـۆتێ غالیـد ئاغـا لاوکـەکی بـرێ بـا سـەربازەکان لەخـەو هەسـتن چـونکە ڕێـی مـارا وان زۆر دوورە خالیـد ئاغـای گـۆت ئـەمن نـارێم دوایـە کـالۆی بـە حـەمێ زەری گـۆت ئـەتوو بـرێ حـەمێ زەریـش گـۆت ئـەمن نـارێم پاشـان خالیـد ئاغـای گـۆت دەی کـالۆ ئـەتو بـرێ، کـالۆی گـۆ ئـاخر خالیـد ئاغـا سـبەینەیە ئـیش بـاش دێـن و خـراپ دێـن قسـەی خـراپ بکـەن لـێم تـووڕە بـبن ئـەویش گـۆت ئـەتو عـەفووی کـالۆ بـرێ ئـەویش گـۆ سـبەینەیە، سـبەینەکا ساردە سێ گوللەی ئاوزێرم وێنە. خالید ئاغا ڕوحا توو پێی ئەکەمە تارە.

کـالۆی گـۆت ئاغـا نـەمگوت ئـیش خراپـە سـبینەیە خالیـد ئاغـای گـۆت کـالۆ ئـەتو عـافوی دوایـێ سـوپا کـە تـۆ ڕێـی گەیشـتە گـەرێی زینـا شـەوی بەسـەر داهـات و سـوپاکە نوسـتن و سـبینەدا هاتـەوە دیسـانەوە کـالۆ هەسـتا لـە خـەوێ خالیـد ئاغـا لاوکـوکی بـرێ بـا سـوپاکە لـە خـەوێ هەسـتی ئـەویش گـۆتی ئـەمن نـارێم ئـەتۆ برێـوە گـۆتی ئاغـا سـبینەیە ئـیش خـراپ دێـن و باشـیش دێـن بـاوەکی جـارێ دی لـێ نێـت

خراپ بکەم گۆتی نا کالۆ ئەتوو عافوی کالۆی گۆت گەریٚ زێرا داکەتم گەرییەکی بە داروبارە خالید ئاغا ئەگەر نەمرم هەرسیٚ ژنی توو ئەکەم مارە لۆیە حەمیٚ زەری گۆت ئاغا با کالۆی بکوژین بەرام ئاغی گۆت نا کالۆ عافووە سوپاکە لەخەو هەستان بەرەو ماریٚ حەمی بەرێ کەتن شەو بوو گەیشتنە ئەویٚ حەمیٚ لەگەر گەوریٚ خوشکی خۆ بەتۆبەن حەرەسیان ئەگرت و لەو وەختە سوپاکە گەیشتە ئەویٚ دەوریٚ مارا وانی گری گەوریٚ حەرەس بوو گوێی لێبوو خالید ئاغای گۆت حەمیٚ زەرۆ تەکبیر کەرۆ تەکبیرا مە چ بی ئەویش گۆت ئاغا ما تەکبیرا مە چییە ئەوەیە گەوریٚ لۆ توو ماینیٚ حەمیٚ لۆ من تارانیش لۆ زیلان و حەیدەریٚ لۆیێ گەوریٚ چوو خواریٚ لە سەربانیٚ لەسەر سەریٚ حەمیٚ گریا فرمێسکەکانی چاوی گەوریٚ کەتنە سەر روومەتی حەمیٚ، حەمیٚ لەخەو هەستا گۆتی چییە گەوریٚ. گەوریٚ گۆت هەستا سوپا خالید ئاغای دەوریٚ مارا مە گرتیە تەکبیریشیان ئەوەیە کە ئەتوو بکوژن ئەمن لۆ خالید ئاغای ببەن ماینا تو لۆ حەمیٚ زەریٚ تارانیش لۆ زیلان و حەیدەری بی، حەمی هەستا چووە سەر خانی کالۆش گاسی حەمیٚ برازاێت من ئەوە پیرە مامیٚ تو دەگەریا دایە کالۆ هەستایە لە جێی خۆ گوللەی زێری لە سینگی خالید ئاغای دان و کوشتی وە حەمیٚ زەری پەڕاند، پاشان گوەریٚ حەمیٚ کەوتنە ناو زیلان و حەیدەری ئەوی کوشتیان ئەوی گیران و ئەوی خۆیان بەدەستەوە دا سەرکەوتن کالۆ هەستا هەرسیٚ ژنی خالید ئاغای مارە کردو بووە وەزیر لە جێی حەمیٚ زەریٚ حەمێش هەردەوو ژنیٚ حەمی زەری مارە کردوو بووە ئاغای گوندی لە جێی خالید ئاغا.

– ئەم حیکایەتە، بەسەرهاتی زیلان و حەیدەرە = ان =ە کە شوانکارە بووین و دواتر نەوەیان لیٚ کەوتووەتەوە و بوینە بنەماڵە و عەشیرەت، ئێستا لە باکوری کوردستان بنەماڵەیەکی ناودارن.

# سـێ برا

**کۆکردنەوەی: هاوکار بەکر خدر**

**گێڕانەوەی: عەبدالستار ٥٥ ساڵ. بنەسراوە**

هەبوو نەبوو سێ برا هەبوون هەرسێ برا یەکیان ناوی ئەحمەد بوو یەکیان ناوی محمەد بوو ئەویتریان ناوی مەحموود بوو مەحموود برا گچکەکەیان بوو ئەحمەدیشیان برا گەورە بوو محەمەدیشیان برا ناوەنجی بوو. برا بچووکەکەیان کەناوی مەحموودە حەزی لە ژن دەبێت داوای کچی پاشا دەکات مەحموود بە دوو براکەی دەڵێ من حەزم لەوەیە کە کچی پاشام بۆ بهێنن براکانی زۆر بەم داواکاریە سەرسام بوون و ووتیان برام ئێمە دەستمان کورتە و ماڵی پاشا وەك ئێمە نین ئەوان دەوڵەمەندن بەڵام هەر لەسەر داواکارییەکەی بەردەوام بوو وتی من کچی پاشا نەبێت کەسی ترم ناوێت بەهەر شێوەیەك بێت براکانی ڕازی دەبن و دەچن بۆ داواکاری کچی پاشا کاتێك دەچن بۆ ماڵی پاشا دەبینن پاشا میوانی زۆرە ئەوانیش بێدەنگ دەبن تاکو هەموو مێوانەکان دەڕۆن پاشا بە سێ براکە دەڵێ بۆچی هاتوون چیتان دەوێ برا گەورەکەیان بە پاشا دەڵێ چی بڵێم گەورەم من بۆ خزمەتی هاتووم هاتووم بۆ داواکاری کچەکەت بۆ مەحموودی برام پاشا زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێ کچی من بۆ ئێوە نابێت چونکە کچی من چل مێردی کردیە هەر کاتێك کچەکەم بە مێرد دەدەم لە شەوی بوکێنیدا زاوا دەمرێت پاشان پاشا دەڵێت من هۆی مردنی ئەم چل پیاوە نازانم چییە؟ بەڵام مەحموود هەر ڕازی دەبێت گەر ببێتە قوربانیش پاشاش کچەکەی خۆی دەداتە مەحموود یەکێك لە براکانی کە کەناوی محەمەد بوو زۆر زیرەك بوو کە برا گەورەکەی بوو دەڵێ من مەحموود ئەگەر ڕازی بێت لە شەوی زاوایەتیدا من لە پێش تۆ دەچمە ژوورەوە مەحموودی براشی زۆر بەم شتە دڵگران دەبێت بەڵام ژن بۆ منە چۆن دەبێ تۆ لە پێش من بچیتە ژوورەوە بەهەر شێوەیەك بێت برا گچکەکەیان ڕازی دەکەن کە ناوی ئەحمەدە کە پیاوە زاوایەکەیە سەرەتا ئەحمەد دەچێتە ژوورەوە خۆی هەڵدەداتەوە سەر جێگە لە دواییدا خۆی لە پشت دەرگا دەشارێتەوە سەیری سەر جێگاکە دەکات دەبینی

وا مارێکی زۆر ئەستور و درێژی نزیکەی سێ مەتری دەبێت ئەحمەدیش کە خۆی لە پشت دەرگاکە خۆی شاردۆتەوە برێکی پێیە لە سەری مارەکە دەدات و مارەکە دەکوژێت لە دواییدا بە براکانی دەڵێت وەرنە ژوورەوە بزانە چی قەوماوە کاتێك براکانی دەچنە ژوورەوە زۆر سەرسام دەبن بەم دیمەنە ناخۆشە کە دەبینن مارێکی زۆر گەورە لە ژوورەکەدایە هەرسێ براکە بە کچە دەڵێن بۆچی تاکە ئیستا ئەم شتەت لای کەس باس نەکردووە ئەویش وتی من لە ترسان نەم توانیوە چونکە مارەکە پێی وتم من تۆم خۆش دەوێت هەر کەسێك تۆ بهێنی من دەیکوژم هەروەها تۆش ئەم شتە کەشف بکەی ئەوا دەتکوم بۆیە تاکو ئیستا ئەم کێشەیەم لای کەس باس نەکردووە. لە ڕۆژی دواییدا هەرسێ براکە لەگەڵ کچی پاشا دەچن بۆ لای ماڵی پاشا کاتێك دەچن لە دەرگای ماڵی پاشا دەدەن خزمەتکاری پاشا بە پەلە بۆ لای دەرگاکە دەڕوات و پاشاش دەڵێت کابرا ئەوە چی بووە ئەوان کێن لە دەرگا دەدەن؟ کابرای خزمەتکار دەڵێ: گەورەم ئەوە ئەو پیاوانەن کە کچەکەی خۆتت پێشکەش کردوە پاشاش بەم هەواڵە زۆر دەترسێ دەڵێ بەخوا ئەم زاوایەش مردووە پاشاش دەڵێ فەرموو هیچ بووە ئەوانیش دەڵێن پاشا شایی بکە پاشاش بەم قسەیە زۆر دڵخۆش دەبێت و دەڵێ فەرموو وەرنە ژوورەوە ئەوانیش کێشەکەی هەموو بە تێر و تەسەلی بۆ پاشا باس دەکەن پاشاش زۆر دڵی خۆش دەبێت سێ براکەش مارە گەورەکە دەهێنن و پاشاش لە پێش چاوی هەموو خەڵکەکە دەیسووتێنی.

# بەسەرهاتی ژن و پیاوێك

**گێڕانەوی: رسول سلێمان بنەسراوە ٥٢ سالّ.**

هەبوو نەبوو ژن و پیاوێك هەبوون منداڵیان نەدەبوو زۆریان حەز لە منداڵ بوو ڕۆژێکیان شێخێك ڕێی دەکەوێتە ماڵیان و دەڵێت کابرا ئەوە کوا منداڵەکانتان؟ ئەوانیش دەڵێن منداڵمان نییە شێخەکەش دەڵێ ئێوە هەندێك نۆك لە پشت سەری خۆتان دابنێن ئەوکاتە منداڵتان دوبێت لە دواییدا خوای گەورە منداڵیان پێ دەبەخشێت ناوی لێ دەنێن خوبیار باوەکی هەر لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە فێری ئیشی دەکات و لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ ئیش ڕۆژێکیان دەچێتە سەر ڕووبارێك دەبینێت کۆمەڵێك خەڵك بەدیار ئەم ڕووبارە وەستاون کە دەچێت دەڵێت چی بووە ئەوانیش دەڵێن ئەوا ئەسپێکی ئاڵتوونی لەناو ئەم ڕووبارەدایە ئەویش لەگەڵ ووتنی ئەم هەواڵە یەکسەر خۆی فڕێ دەداتە ناو ئاوەکە یەکسەر ئەسپەکە دەردەهێنی خەڵکی هەموو ەرسام دەبن ماوەیەك پاش ئەم ڕووداوە باوکی کۆچی دوایی دەکات و دەمرێ دوای ماوەیەك خوبیار لەگەڵ دایکی گەشتێك ئەنجام دەدات دەچن بۆ شوێنێك کە ئەم شوێنە زۆر زۆر چۆڵە تەنها خانوویەکی کۆن و کوڕیتێکی بچووکی لە کنە لەناو کوریتەکە دێوێکی زۆر گەورەی لێ دەژی ئەم دێوە بریندار دەبێ دایکی خوبیار بەخێوی دەکات و چاکی دەکاتەوە لە دواییدا دێوەکە دایکی خوبیار هەردەخەرەتێنێ ڕێکدەکەون پلان دادەنێن بۆ لەناوبردنی خوبیار خوبیار بۆ ڕاو دەنێرن تاکو کەروێشکێکیان بۆ بگرێت خوبیار بۆ ڕاو دەچێت کەروێشکێك دەگرێت دەیهێنێتە ماڵەوە دوو سێ جاری تر ڕەوانی دەکەن کە بچێت سێویان بۆ بهێنێت لە ڕێگادا تووشی جبرائیل دەبێت جرائیل دەڵێ گەر بتەوێ سێو بەدەست بهێنی دەبێ دوو ڕکات نوێژ بکەیت ئەوکاتە بە دەستی دەهێنی لە دواییدا سێوەکانی بەدەست کەوت هێنای بۆ ماڵەوە وە دوو تا سێ جاری تر خوبیاریان ڕەوان کرد هەر سەرکەوتوو دەبوو بۆ جاری چوارەم کەچوو بۆ سێو هێنان لە ڕێگادا خەوی لێکەوت کاتێك هەڵدەستێتەوە دەبینی کۆمەڵێك دێو

بەدیار سەری کۆبوونەتەوە لە دواییدا دێوەکان خوویار دەگرن دایکی خوویار کە لەگەڵ دێوەکان دەژیت دەڵێ خوویار مەکوژن فرێی بدەنە بیرێکی قولی گەورە هەردوو چاویشی دەردەهێنن خوویار دوو سەگی دەبێت ئەم دوو سەگە ڕۆژانە نان بۆ خوویار فڕێ دەدەنە ناو بیرەکە خوویاریش دەیخوات ڕێبوارێکی دەبینی هەموو ڕۆژێ ئەم دوو سەگە بە دیار ئەم بیرە وەستاون دەبێت چی بێت ڕێبوارەکە دەچێت دەبینی پیاوێك وا لەناو بیرەکە کەوتووە بە خوویار دەڵێ ئەو چیت بەسەر هاتوە؟ خوویاریش کێشەکەی خۆی بە دوور و درێژی بۆ ڕێبوارەکە باس دەکات ئەویش دەچێت حەبلێك دەهێنێ و رزگاری دەکاتن دەیباتەماڵەوە، لە دواییدا دەیباتە لای شێخێك تاکو چاکی بکاتەوە شێخەکەش دوو کۆتر دەهێنێ دوو جیقنە دەکەنە ناو چاوی خوویار خوویار چاك دەبێتەوە، لە دواییدا شێخەکە پێی دەڵێت: دایکت وای لێ کردوویت لە دواییدا خوویار بە دوای دایکی دەگەڕێ دەچێتە شارێکیتر دەچێت بۆ ماڵێك دەبینی وا دایکی نان دەکات. دەڵێ: برسیمە. ئەویش دەڵێ: وا نان بۆ دێوەکان نییە بۆ تۆ هەر نییە. لە دواییدا خوویار شیرێکی پێیە دەهێنێتە دەرەوە بە دایکی دەڵێ تۆ بکوژم یان دێوەکان بکوژم ئەویش دەڵێ دێوەکان بکوژە ئەویش دێوەکان دەکوژی لە دواییدا دایکی لەگەڵ خۆیدا دەباتە شارەکەی خۆی خەڵکی شار هەموو خڕ دەکاتەوە دایکی دەهێنێتە پێش خەڵکەکە سەری دایکی دەتراشی و بەڕەڵای دونیای دەکات.

- لە ئەفسانەی سێ برا حەزیا ئاشقی کچی پاشا دەبێ و کچەش ناوێرێ ئەم عەشقە ئاشکرا بکات و لەم نێوە چل زاوا سەریان تێ دەچێ. ئەمەش دیسان بە حەزیا کردنی پیاوی خراپ و زاڵمە. ڕەگەزی ئەفسانەیی عاشق بوونی حەزیایە بە کچی پاشا.
- لە ئەفسانەی بەسەرهاتی ژن و پیاوێك دیسان پیاو خراپ کراوە بە دێو، هەر ئەم دێوەش ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم حەکایەتەیە.

# پیاوێك هەبوو ژنەكەی زۆر خراپ بوو بۆی

كۆكردنەوەی: ژوان عەبدولكەریم وەجید

گێڕانەوە: مەلا عەبدوللا

ئەم پیاوە لە تاوان چارەی نەبوو، چووە لای پیاوێكی ئاقڵ ووتی من چارەم چییە لە دەست ئەو ژنە، زۆر بێزاری كردووم كە خراپە، نازانم چارەم چییە ئەبێ تەڵاقی بدەم؟

پیاوە ئاقڵەكە گوتی تەڵاقی مەدە بەجێی بهێڵە، پیاوەكەش هەڵسا ڕۆیی لە دەست ژنەكەی چوو بۆ شارێك چووە ناو بازاڕی ئەو شارەی كە بۆی چوو بوو لەناو بازاڕی ئەو شارەدا بەرگێكی بازرگانی كڕی و كردیە بەر خۆی.

ئەچووە هەر چایەخانە و چێشتخانەیەكی ئەو شارە بە خەڵكی چایەخانەكە و چێشتخانەكەی ئەوت: بە خاوەنی چایەخانە و چێشتخانەیەكە بڵێن پارەی هەموو نەفەرەكان لەسەر حسابی من بنووسێت هەتا بازرگانییەتیەكەم دیتەوە حسابی خۆتان ڕاگرن.

ئیتر مانگێك، دوو مانگ، سێ مانگ بەم سوورەتە ڕایبوارد.

خەڵك هەموویان تەعەجووبیان كرد ئەم بازرگانە چییە؟

پاشا بە وەزیرەكانی ووت، ئەم مەسەلەیە چییە كە لەناو شاردا بڵاوبۆتەوە و بۆتە دەنگ و باس لەناو خەڵكی شاردا.

وەزیرەكان ووتیان ئەی پاشای گەورەی شار بازرگانێك هاتووە بەوجۆرە پارەی چایەخانە و چێشتخانە لەسەر حسابی خۆی دەنووسێ.

بە قەرز ووتی مادام وابێ ئەوهایە من دەعوەتێكی دەكەم بۆ تەجروبەكردن.

پاشا هەڵسا بازرگانەكەی دەعوەت كرد كە هات گەوهەرێكی وەكە ئاوێنە دایان لەسەر لێواری مێزێك وەختێ بازرگان هات بووبە میوانی پاشا و دارو دەستەكەی

فەرموویان لێ كردوو بازرگانەكە تێپەڕی بۆ جێگەی خۆی و خۆیدا لە گەوهەرەكە.

بازرگان ووتی ئەی پادشا خەجالەتم، بەڵام پاشا خەم مەخۆ ئەمن بەخێر بازرگانییەتەكەم هاتەوە (١٠٠) گەوهەری ئاوات بۆ دێنم.

ئەوجا بازرگان ڕۆیشت بۆ ناو شار و خوا حافیزییان كرد لە پاشا.

- پاشا چووەوە ماڵی خۆیان و کەوتە بیرکردنەوە لەم بازرگانە و باسی کرد بۆ خێزانەکەی و کچەکەی و بە کچەکەی ووت کچم ئەتدەم بەم بازرگانە چی دەڵێی.
کچەکە ووتی باشە، رازیم باوکە مێردی پێ دەکەم.
- ئەوجا ناردی بەدوای بازرگان، بازرگان هات و بانگی مەلای کردوو کچەکەی لێ مارە کردوو هەموویان پیرۆزباییەکی گەرمیان لێ کرد.
- پاش ماوەیەك بازرگانییەتی، بازرگان نەهات لێی کەوتنە گومانەوە و ووتیان ئەی پاشا ئەم بازرگانییەتییە بوو بەچی هەر نەهات، ئەگەر درۆ نییە پادشا ووتی باشە من بیرێکی لێ دەکەمەوە.
- پاش بیرکردنەوەی پاشا، پاشا ووتی من بە کچەکەم دەڵێم، کچم بزانە ئەوە چییە ئەم بازرگانییەتیەی، پیاوەکەت بۆ نەهات.
- ژنەکە لە پیاوەکەی پرسی پیاوەکە ئەم بازرگانییەتەی تۆ چی بوو هەر نەهات؟
- پیاوەکە ووتی هەمووی درۆ بوو ئافرەت، ئەوجا کچی پاشا چوو لە ماڵی باوکی ماینێکی بۆی رازاندەوە رۆیی بۆ سنووری ئێران وەرزی بەهار بوو جووتیار جووتیان دەکرد کاتی کاتی نیوەڕۆ بوو جووتیار نانیان دەخوارد.
- بازرگان چوو بۆ لای جووتیارێك سەلامی لە جووتیارەکە کرد و جووتیار ووتی بەخێربێی بازرگان
- بازرگان ووتی برسیمە جووتیار
- جووتیار ووتی ئەی بازرگان لای وولاغەکان بە ئەچم خواردنت لە ماڵ بۆ دێنم.
- ئینجا بازرگان لەوێ مایەوە وتی ئەمن با جووتەکەی بۆ بکەم تا جووتیار دەگەڕێتەوە لە ماڵ خێرم دەگات.
- وەختێ جووتی کرد بۆ جووتیارەکە بازرگان گاسنەکەی چەقی لە بەردێکی گەورە گاسنەکەی کێشایەوە جووتەکەی راگرت ئەوجا سەیری کرد بەردێکی ڕەشی گەورەیە وەختێ بەردەکەی لادا خوارەوە ژێر زەمینێکی بینی.
- لەناو ژێر زەمینەکەدا گەوهەر و دوڕ و یاقووتە باوڵێك لەوێیە و ئەنگوستیلەیەك لەسەریەتی ئەنگوستیلەکەی کردە دەستی خۆی.
- ئەنگوستیلەکەی بادا دوو عفریت هاتنە دەرەوە و ووتیان ئەمرکە بازرگان ووتی ئەمری من ئەوەیە،
- دەبار بە ولاغەوە ئامادە بکەن و لەبان ئەوەوە لەم گەوهەرە و لەم دوڕەش ئامادە کەن ووتیان بەسەر چاو.

- ووتی ده باری دیکەش ئامادە بکەن سەریان خستە سەرەوە، ئەوجا جووتیارەکە هاتەوە فەردەیەکی لەو گەوهەرە دانابوو بۆ جووتیارەکە.
- ووتی جووتیار ئەم گەوهەرەت پێشکەش بێت.
- بەلاّم ئەم کاغەزە بەرە بۆ پاشا و پێی بڵێ بازرگان هاتەوە جێگەی بۆ دیاری بکەن لە شار.
- ئەوجا قافڵەی بازرگان بەرەو شار ڕۆیی ووتیان پادشا پیرۆز بێ ئەم خەزێنەیە.
- ئەوجا بازرگان بە پاشاش ووت ئەو ڕۆژەی من خۆم دا لە گەوهەرەکە ئەوا ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە لە باتی یەك دانە ئەوە سەدان دانە گەوهەر لەم بابەتە پێشکەشت بێت.
- ئەوجا بازرگان ووتی ئەی پاشا مەولوودێك ساز دەکەین.
- لەم مەولوودەدا با هەموو ساحێب (خاوەنی) قەرزەکان دەفتەری خۆیان بێنن و ئامادە بن و حەقی خۆیان پێ دەدەم بە زیادەوە.
- مەولوودیان کرد حەقی هەموو قەرزەکانی دایەوە و ووتیان خودا لێت قبووڵ بکات ئەم خێر و ئەم هەقانەت جێبەجێ کرد بۆ خودا ئەوجا پیرۆزت بێ ئەی بازرگان.
- بەهەر حاڵ پاشاش هەموو کارەکانی بە ڕێك و پێکی جێبەجێ کردوو هەموویان بەیەك شاد بوون.

(وە سەلام و ختمی کەلام)

— لەم حیکایەتانە ژنە خراپەکان، ئەگەر سەرەتا ژیان لە مێردەکانیان تاڵ دەکەن، ئەو دواجار مێردەکان دەبن بە پاشا و دەوڵەمەند، ئەمەش هیوای ئەو کەسانەیە کە ژیانیان ناخۆشە و هەژارن و خەون بە دنیایەکی خۆشترەوە دەبینن، دۆزینەوەی زێری ژێر زەوی ڕاستی تێدایە، لە زۆر شوێنی پاشماوە زێڕ دۆزراوەتەوە، ڕەگەزی ئەفسانەیی ئەم ئەفسانەیە بادانی ئەنگوستیلە و دەرکەوتنی عفریتە.

# چیرۆکی ئەحمەد گاوان

**کۆکردنەوەی: حەکیم سەیدا حەسەن**

**هونەر مستەفا علی**

سەرچاوەی ئەم چیرۆکە: ئەم چیرۆکەم لەسەر زاری ((أحمد حسن محمود)) وەرگرتووە کە تەمەنی (٧٠) ساڵە. نەخوێندەوارە – خەڵکی وەرتێ (دۆڵی خانەقا)یێ بەبێ هیچ گۆڕانکارییەکی زمانەوانی نوسیوومە، چیرۆکەکەش بە ناوی (ئەحمد گاوان)ە.

ئەحمەد گاوان کابرایەکی هەژارە لە گوندی ژیانی خۆی بەسەر دەبات، دەبێت بە گاوانی گوند بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە قسەکردن، زۆربەی ڕۆژەکانی ژیانی خۆی لە دەشت و چیا بەسەر دەبات، ڕۆژێکیان لە چیا خەریکی چێر لەوەڕاندن دەبێت، هەر لەم ڕۆژەدا دەکەوێتە خەیاڵاتەوە، پاش ماوەیەك کە شەوی بەسەردا دێت ((ئەحمەد)) خەونێکی دیت لە خەونەکەدا وای دیت کە ڕۆژ لەسەر ملی چەپەی هەڵات و لەسەر ملی ڕاستەی ئاوا بوو. و مانگی بینی لەسەر ملی ڕاستەی هەڵات و لەسەر ملی چۆپەی ئاوا بوو. وە هەر لە خەونەکەیدا گەلاوێژی لەسەر تۆقی سەری ڕاوەستا.

سبەینێ داهات ((ئەحمەد)) چۆ مزگەوتێ خەونەکەی بۆ مەلا گێڕایەوە کە شەو لە خەوەکەیدا دی بووی.

لە وەڵامدا مەلا گۆتیە ئەحمەدی ئەو خەونەی بفرۆشە من نیوەی مارت دەدەمێ ئەحمەد گۆتی نایفرۆشم. جارێکی تر مەلا گۆتیە ئەحمەدی هەموو ماری خۆمت ئەدەمێ بەڵام ئەحمەد رازی نابێت.

مەلاش تەعبیری خەونەکەی نازانێت و لەبەر هەندێ ئەحمەد بە ناچاری هەستا و ڕۆیی بۆ گەڕان بەدوای تەعبیری خەونەکەیدا ڕوو دەکاتە شوێنێکی تر.

بە خۆی و ئەسپەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر دەڕوات تا گەیشتە گوندێکی تر کە گەیشتە گوندەکە زۆری نەمابوو ڕۆژ بێتەوە بۆیە ئەحمەد جڵەوی ولاغی شل کرد و گوتی سەری بەکام دەرگان لەو ماڵە میوان دەبم زۆری پێنەچوو سەری بە دەرگای ماڵێك نا کە تەماشای سعاتی کرد هێشتا ڕەنگە کەس بەئاگا

نـەهاتبێت. بڕیـاری دا تـاكو ڕۆژ دەبێتـەوە جگەرەیـەك بكێشـێت كاتێـك ئاگرەكـەی داگیرسـاند قەپـەنگی سـەرەوە كـراوە. لەگـەڵ كردنـەوەی جۆركێك فـڕێ درایـە سـەر زینی ولاغـی ئەحمـەد كـە پڕبـوو لـە زێـڕ و زیـو پـاش كـەمێك ژنێك دێتـە خـوارەوە دەرێـت ئەحمـەد هـاتی؟ ئەحمـەد گـوتی بـەرێ. ژنەكـە پێـی گـوت: لاركێفـێكم بـۆ بەتاڵكـە ئەحمـەدیش لاركێفەكـەی بـۆ بـەتاڵ كـرد و ژنەكـە سـوار بـوو گـوتی: ئەحمەد بازۆ كە ڕۆژ داهات نەكە تەماشای كرد ئەوە ئەحمەدی دۆستی نییە.

پێی گـوت ئـەتو كێـی؟ ئەحمـەد گـوتی: ئـەمن ئـەمنم، بـەلام ئـەتوو كێـی؟ تـۆ گـوتـت ئەحمـەد هـاتی گـوتم هـاتم وتـت لاركێفـێكم بـۆ بەتاڵكـە كـە بـۆم بـەتاڵ كـردی ئێسـتاش ئەگـەر قایـل نیـت ئـەت گەیەنمـەوە مـارێ بـابی ژنەكـە قەیـدی ناكـات نـاوت چـییە؟ گـوتی ئەحمـەد. ئەحمـەدیش بـە ژنەكـەی گـوت ئـەتۆ نـاوت چـییە؟ گـوتی گەلاوێژ. ئەحمەد گوتی ئەوە لە مەخسوودان یەك.

پـاش ماوەیـەك زۆر ڕۆیشـتن گەلاوێـژ لـە تێنییەتیـە لـە ئەسـپەكە هاتـە خـوارێ ئەحمـەد زۆر گـەڕا هـیچ ئـاوی دەسـت نەكـەوت. بـەلام، چـووە سـەر گردێـك لـە شـوێنێكی دوور سـەوزاییەكی دیـت ئەحمـەد سـواری ئەسـپەكەی بـوو بـە شـوێنی سـەوزاییەكەدا ڕۆیشـت كـە گەیشـتە ئـەوێ دیـتی كانییـەك لـەبن چـیایەككە كـە ئەشـكەوتێك لـە شـاخەكەدا بەسـەر كانییەكەوایـە دڵۆپـە خـوێن لـە ئەشـكەوتەكە دێتـە خـوار لـۆ نـاو كانییەكـە دەكەوێتـە نـاو دەمـی ماسـی و ماسـیەكە فڕێـی دەدات و دەبێتـە دوو، ئەحمـەد مەتارەیـەك ئـاوی پـڕ كـردوو هەنـدێك دووری لەگـەڵ خـۆی هێنـا گـەڕاوە لای گەلاوێـژ ئاوەكـەی پێـداو گەلاوێـژ هەسـتاوە سـواری ئەسـپەكە بـوون و ڕۆیشـتن گەیشـتنە گونـدێك دیتیـان پـیرەژن و پـیرە مێردێـك خـەریكی ئـیش كـردنن لـەناو ڕەزەكـەیان پاشـان سـەلامیان كـرد و لـە لایـان دانیشـتن و پێیـان گـوتن ئێـوە كەسـی ترتـان نیـە؟ ئـەوانیش گوتیـان: ئەمـە بـە تەنێینـە كـەسمان نییـە ئەحمـەد گـوتی ئەگـەر ئێمـە بـە كـوڕ و كچـی خـۆت دابنێـی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە دەژیـن. ئـەوانیش ڕازی بـوون. بـەلام گوتیـان: ئێمـە تـاكو پـاییزدا دێـت ناچـینەوە شـاری پـاییز تـەواو بـوو دەڕۆنـەوە شـاری شـەوێك پـێ چـوو. گەلاوێـژ بـە ئەحمـەدی گـوت: هەسـتە بـڕۆ لای پاشـای. پێـی بڵـێ ئێمـە غەریبـەین تـازە هاتینـە ئێـرە حـەز دەكـەین چـاوت لێـبین. دووڕەكـانیش لەگـەڵ خـۆت بـەرەو بـەلام زۆر تـاخیر مەبـە پاشـان ئەحمـەد چـووە لای پاشـاو خـۆی پـێ ناسـاند و دووڕەكانیشـی پێـدا ناونیشـانی مـاری خـۆی پاشـا ئیشـارەتی بـۆ جووەكـەی خـۆی كـرد تـا تەماشـای مارەكـەیان بكـات تـاكو بزانێـت چـیان هەیـە. پـاش سـعاتێك ئەحمـەد گەڕایـەوە

ماریێ و جووەکەش گەڕایەوەو ماڵی پاشاو پێی گوت تەخت لێ موبارەك نەبێ ژنێکی هەیە هەموو سەرو ماری تو دەبینی. پاشاش پرسیاری لێکردن ئەی چی بکەم وەزیرەکانیش گوتیان بانگی بکەو لەسەری بدە.

بەلاّم پاشا گوتی نابێ ڕاست لەسەری بدەم. گوتیان: ئەمجارە پێی بڵێ هەندێکی تر لەم دوورانەم لۆ بین ئەمانە زۆر کەمن من کابرایەکی خانەوادەم ئەگەر لە دیوەخان بن ئەوا لەماڵ نییە دایان بنێم ئەگەر لە ماڕێش بن بەشی دیوەخایێ ناکەن.

پاشا لە دوو ئەحمەدی نارد شتەکانی پێگوت کە هەندێك دووری کەی بۆ بێنێت ئەحمەد گۆتی: ناچم. ئەویش گۆتی: ئەگەر نەچی لەسەرت دەدەم. ئەحمەد گۆتی: لەسەرم دەن بەلاّم بەلاّم پاشا گوتی من بە عەدالەت دەکەم هەفتەیەکت مەجاله دەبێت لۆم پەیدا بکەیت.

ئەحمەد بە عادزی گەڕایەوە ماریێ گۆتیە گەلاوێژێ خوا بتگریت ئەگەر نەت ناردباوە لای پاشا نێستێ پاشا پێی نەدەگوتم هەندێکی ترم لەم دوورانە بۆ بێنە ئەگەر نا لەسەرت دەدەم. گەلاوێژ گوتی: ئەم کانییەی جاران پێ نازانیەوە کە جاری یەکەم ئەم دوورانەت لێ هێنا ئەحمەد گوتی: با. پاشان ئەحمەد خۆی حازر کردو سواری ئەسپەکەی بوو بۆ ئەو شوێنەی کە کانییەکەی لێ بوو. کە گەیشتە ئەوێ سەیر کردن وەك جاران خوێن لە شاخەکە دێتە خوارەوە ماسییەکە دەبێتە دوور.

ئەحمەدی گۆت: ئەوجارە سەرێك لەم بەسەرهاتە دەدەم دەبێت بزانم چییە سواری ئەسپەکەی بوو بە ڕێگادا چووە ناو خارەکەی خار واتا ئەشکەوت. دیتی ژنێك بە سەر کوژرابۆوە لاشەی لەلایەك دانرا بوو سەرەکەشی بەلایەکی ئەشکەوتەکە وەکرابوو خوێنی لێ دەچۆڕا دەچووە ناو کانییەکەو دەکەوتە دەمی ماسییەکە، لە ئەشکەوتەکەدا دەلاقەیەك هەبوو کە شووشەیەك دەرمان لەگەڵ پەڕی خەرتەڵ داندرابوو. ئەحمەدیش سەری ژنەکەی بە لاشەکەیەوە ناو شووشە دەرمان و پەڕی خەرتەلی بەکار هێناو ژنەکە چاك بووەوە، ژنە گوتی کابرا ئەتوو لۆ هاتییە ئێرە نزانی ئەمن دێوم دێوی ڕەش ئەمنی هاناوم لۆ ئێرە ژنەکە گوتی: دێوی ڕەش ڕەوحی وە خۆی نییە بەکەس ناکوژرێت ئەحمەدیش لە وەلاّمدا بە ژنەکەی گۆت ئەگەر هیچواریێ دێوەکە هاتەوە پێی بڵێ ئەمن تازە هەر لۆ توومە، هیچی کە مەکوژەوە حەز دەکەم ڕەوحی خۆتم پێ بڵێ لە

کێنـدەرت دانـاوە؟ بـۆ ئـەوەی لەگـەڵی گـەمان بکـەم. پاشـان ئەحمـەد ژنەکـەی وەك خـۆی لـێ کـردەوە، کـە ئێـوارە دێوەکـە هاتـەوە ئەحمـەد خـۆی شـاردەوە دێوەکـە ژنەکـەی چـاك کـردەوە ژنەکـە بـە ژێوەکـەی گـۆت حـەز دەکـەم شـوێنی ڕۆحـی خـۆتم پـێ بڵێـی دێوەکـە گـۆتی: ڕەوحـی مـن وا لەبـەردی قـون ئاگرەکەدایـە. سـبەینێ دێوەکە ڕۆیی ئەحمەد هاتەوە لای ژنەکەو گۆتی: چیت کرد.؟

ژنەکـە گـۆتی: رووحـی دێوەکـە لەبـەردی قـون ئاگرەکەدایـە. ئەحمـەدیش گـۆتی: درۆ دەکـات بـەلآم بەردەکـە بێنـە جـوانی بشـۆ هەنـدێك تیلتیلـەو بیلبیلـەی پێـوە بخـەو لەسـەر ئەسـتەرکی دابـنێ تـاکو دێتـەوە بـەدیار بـەوە دانیشـەو کـە دێوەکـە هاتـەوە گـوێ گـۆتی: ئـەو بـەردە چـیيە؟ ژنەکـە گـۆتی ئـەوە ڕووحـی تۆیـە. دێـوی ڕەش گـۆتی رووحـی منـت زۆر خۆشـدەوێت ژنەکـەش گـوتی ئـەدی نـابینی چـەندم ڕازاندۆتەوە. دێوەکە گۆتی: روحی من وا لەم گەسکە پێش دەرگەیە.

شـەو نووسـتن کـە سـبەینەداهات دێوەکـە وەك هـەموو ڕۆژان زوو ڕۆیـی ئەحمـەد هاتـەوە لای ژنەکـەو گـۆتی ئـەمڕۆ چـی گـۆت ژنەکـە گـۆتی رووحـی دێـو لـەناو گەسـکەدایە. منـیش گەسـکەکەم جـوان ڕازاندۆتـەوە و هـەڵم گرتـووە. کـە ئێـوارە دێوەکـە هاتـەوە بـینی گەسـکەکە ڕازاوەتـەوە. بـە ژنەکـەی گـۆت رووحـی مـن لـەناو ئـەو گەسـکە نییـە بـەڵکو رووحـی مـن لـەناو زگـی ماسـییە. ماسـیەکەش لـەناو کانیەکەدایـە تـۆ نایگـەیتێ چـونکە ئەگـەر دەری بـینی ئـەوا مـن دەمـرم ژنەکـە گـۆتی نـا بـەقوربانـت بـە قوربانـت بم دەری مەینـە ئەگـەر ئـەتو بمـری ئـەمن چـی بکـەم سبەینێ دێوەکـە ڕۆیـی ئەحمـەد هاتـەوە لای ژنەکـە پێـی گـوت ئـەمڕۆ دێوەکـە چـی گۆت؟

ژنەکـەش پێـی گـۆت روحـی دێوەکـە لـەناو زگـی ماسـیە ماسـیەکەش لـەناو کانیەکدایـە. ئەحمـەد دەسـتی ژنـەی گـرت و پێـی گـۆت وەرە مـن پێـی دەزانم ئـەوجا چـوونە سـەر کانییەکـە ئەحمـەد ماسـییەکەی دەرهێنـاو هەنـدەکی ئەزیـەت دا، دێوەکـە لەبـەر ئـازاری رووحـی خـۆی هاتـەوە دێوەکـە گـۆتی: ئـەمن کـرد ئـەتۆ نەیکـەی. پـێش ئـەوەی دێوەکـە بگاتـە لای وان ژنەکـە پێیـەکی لێخشـاند ماسییەکەی کوشت، دێوەکەش بەلایەکدا کەوت.

ئەحمـەد چـووە سـەر کانییەکـە هەنـدێك دووری خـڕ کـردەوە. ژنەکـە پێـی گـۆت: ئـەوە چـی دەکـەی؟ ئەحمـەدیش گـۆتی: هاتیمـە هـەنێك لـەو دوورانـە لەگـەڵ خـۆم بـەرم ژنەکـە پێـی گـوت: مـن خـۆم دووڕ بایمـە لەگـەڵ قاقـای پێکـەنین دووڕ لـە

دەمی دەهاتە دەر پاشان ئەحمەد لەگەڵ دووڕیای هاتەوە ماڵێ کە شەو داهات پەشتەماڵ ڕێکخست و پڕی دووڕیان کرد. ئەحمەد و باوکی بە یەکەوە چوون بۆ ماڵی پاشا دووڕەکانیان بە پاشا داو پاشا ئیشارەتێکی بۆ جووەکەی کرد بۆ ئەوەی بزانێ چی هەیە. پاش سعاتێك ئەحمەد و باوکی هەستان، جووەکەش لەگەڵ دیتنی هەردوو ژنەکەی ئەحمەد لە قادرمە بەربووەوە و لاقێکی شکا بە شەلەی خۆی گەیاندە ماڵی پاشا پێی گوت: پاشا تەختت لێ موبارەك نەبێت تا ئێستا یەك بوو ئیستا بووینە دووان هەموو شاری تۆ دێنن. پاشا گۆتی: وەیرینە چی بکەم خەریکە شێت دەبم لۆ ئەو ژنانە. دیسان وەزیرەکان پێیان گۆت: لەسەری بدە بەلام پاشا گوتی: من بە قانون دەکەم وەزیرێکی پیری هەبوو پێی گوت: سبەینێ لەدووی بنێرە پێی بڵێ ئەو دوو پەشتەماڵە دووڕانە زۆر جوانن بەلام ئەگەر هەندێك لە گوڵی گوڵ بارینم لۆ بینی لە کنیان دانێم ئەوا زۆر جوانتر دەبێت.

ئەحمەد سبەی هات و پاشا پێی گوت هەندێك لە گوڵی گوڵبارینم لۆ بینە ئەحمەد گۆتی: پێمنایەت پاشا پێی گۆت: لەسەرت دەدەم.

ئەحمەد گۆتی لەسەرم بدە. بەلام پاشا پێی گۆت ماوەی یەك مانگت پێ دەدەم. ئەحمەد چووە ماڵێ بە ژنەکانی گۆت پاشا داوای لێکردم کە دەسکێك لە گوڵی گوڵ بارینی بۆ بێنم ئەگەرنا لەسەرت دەدەم. دووڕبارین گۆتی من خۆم دێوم هەستم ئەم شارەی لێ کاول دەکەم، بەلام ئەگەر ئەو بە قانوون بکات ئێمەش بە قانوون دەکەین دووڕبارین گۆتی: ئەحمەد نامەکت لۆ دەنووسم بە زمانی دێوان لۆ پیرە داکی داکم گردە لەسەر گردەکی دانیشتیە، خۆی داپۆشییە مەمکی ڕاستیە هەڵداوەتە سەر ملی چەپەی، مەمکی چۆپەشی هەڵداوەتە سەر ملی ڕاستەی هەروو خۆ بگەیینە بن کەزیانی مەمکی ڕاستەی بمژە هەتا سێ جار نەڵێ بەکوڕی خۆم قبوولێ کردی دەمی لێ نەکەیەوە، کە تەواوبوو ئەم کاغەزەیەی وێدە کە سبەینەداهات ئەحمەد ڕۆیی چەند ڕۆژێکی پێ چوو تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە دووڕبارین وەسفی کردبوو.

دیتی دێوێك لەسەر گردێك دانیشتووە ئەحمەد زۆر ترسا گوتی: بگەڕێمەوە هەر لەسەرم دەدرێت نەوەلا باشترە بچمو ناوی خوای هێناو چووە پێش خۆی گەیاندە بن کەزیان دەمی بەسەر مەمکی ڕاستەوەنا هەتا سێ جار دێوەکە گۆتی بە کوڕی خۆم قبوڵم کردی دەمی لێ نەکردەوە. ئەحمەد نامەکەی پێدا

دێوەکـە گۆتیـە ئەحمـەدی خـوات بـە قوربـانی ئەوکەسـە کـات کـە پێـی گـۆتی ئـەم کارە بکە.

پاشــان دێوەکــە نامەکــەی خوێنــدەوە گــۆتی: ئــەوە خــەتی کچـمە پاشــان پــیرە دێوەکـە ئەحمـەدی لـەژێر قاچـی خـۆی دانـا پـیرە دێـو چـل کـوڕی هـەبوو کـاتی گەڕانــەوەیان داهــات لــە ڕاویّ ئەحمــەدی شــاردبۆوە کــە ئەحمــەد لەچــاو ئــەوان فروجەك بوو.

کوڕەکــان گەیشــتنەوە جــیّ پــیرە دێــو پێــی گــوتن: هــەمووتان بــەڕێز دانیشــن کاغەزەکــەی دایــە دەســتی بــرا گەورەکــە گــۆتی تــەنیا بۆخــۆت بیخونــەوە پاشــان هــەمووتان بــەریزە بیخوننــەوە تــا دەگاتــە دەســتی مــن هــەموویان نامەکــەیان خوێنـدەوە دایانـە دەسـتی. پـیرە دێوەکـە گـۆتی: کوڕینـە ئەگـەر ئـەو کەسـە ببیـنن کە ئەم ئیشەی کرد چی لێدەکەن.

هەریەکــەو قســەیەکیان دەکــرد پاشــان پــیرە دێــو لــەبن ڕانــی خــۆی دەری هینــا گۆتی ئەو کەسە هەوە.

کوڕەکانیش گۆتیان بریا بەس ناوبانگمان زانیبا قەت نەمان نەدیبا.

ئەحمـەدیش گـۆتی: بـەس شـیرەکم وێـدەن یـەك یـەك لـۆم وەرنـە مەیـدانی ئـەوانیش گۆتیان ئەتوو سونی هەموو شتێکت پیّ دەکرێت.

دوو سـیّ ڕۆژی پێچـوون پـیرە دێـو هـەر چـل کـوڕ و ئەحمـەدی لەسـەر بـاڵی خـۆی دانـان و چـوونە پـاش چـیایەکی بـەرز کـە بـرای پـیرە دێوەکـە کـە بـە دێـوی سـۆر ناسـراوبوو قەسـرێکی بـەرزی هـەبوو چـوونە ئـەویّ بـەس دێـوی سـۆر لـەویّ نـەبوو. کاتێك ئێـوارە داهـات دێـوی سـۆر گەڕایـەوە کـە نزیـك بـۆوە لـە مـاریّ خـۆی گـوێی لـە خربـە خربێـك زۆر بـوو. (خربـە خـرب =دەنگـەدەنگ) دێـوی سـۆر زۆر ترسـا گـۆتی: هـەبیّ و نـەبیّ ئـەوە دێـوی ڕەشـە هاتیـە بەسـەرمان دادات، دێـوی سـۆر گەڕایـەوە چـوو لـە شـوێنێکی دوور بـەردێکی زۆر گـەورەی کـە بەسـەر قەسـرەکەی دابـدات لـۆ ئەوەی دێوی ڕەش بکوژێت.

پاشـان خوشـکی دێـوی سـۆر دیـتی کـە دیـتی دێـوی سـۆر بـەردێکی گـەورەی وێیـە بـانگی کـرد. پێـی گـوت ئـەو بـەردەی فـڕەدە خۆمـانین لێـرە پاشـان دێـوی سـور بەردەکەی لە شوێنێك فڕەدا، گورزی حەفت ساڵی لەو شوێنەدا.

دێـوی سـۆر گەیشـتەوە مـاریّ پـاش بـەخێرهاتنی پـیرە دێـوی خوشـکی و لەگـەڵ کوڕەکـانی پـیرە دێـو نامەکـەی دایـە دەسـت دێـوی سۆر گۆتی لۆ خۆت بخوێنـەوە.

پاش ئەوەی کە دێوی سۆر نامەکەی خوێندەوە خوشکی پێی گوت: ئەگەر ئەلعان ئەو کەسەت لەکن بایە چیت لێدەکرد.

دێوی سۆریش گۆتی ئەبمە ئەڵقە بە گوێی خزمەتی دەکەم تاکو ئەو ڕۆژەی ئەو کەسە ئەمێنێت پاشان خوشکی دێوی سۆر ئەحمەدی لە ژێر قاچی خۆی دەرهێنا لە پێشی دانا گۆتی: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئەو کارەی کردیە.

دێوی سۆر گۆتی: بریا قەت نەمدیبا بەس ناوبانگم زانیبا، ئەحمەدیش گۆتی: شیرێکم وێدەن لۆم وەرە مەیدانێ دێوی سۆر گۆتی: ئەتو سونی هەموو شتێکت پی دەکرێت. پیرە دێو خوشکی دێوی سۆر گۆتی برام دەزانی دووپیارین ئەحمەدی لۆچ ناردیە دێتە ئێرە دەبی لەگەڵی بچیت دوو دەسك لە گوڵی گوڵبارینی لۆ پەیدا بکەی، دێوی سۆریش گۆتی ئەمن منال بووم لەسەر باری باوکم بووم گەیشتینەتە شوێنێك زۆر تیژ تێپەڕی ئەمنیش گۆتم باوە ئەوە لۆ هەندە تیژ. ئەویش گۆتی کورم ئێرە مەنتیقە پەریانە گەر تیژ نەڕۆین دەمان سووتێنن گەر ئەوانیش لە شوێنی ئێمە تیژ نەڕۆن دەیان سووتێنین، دێوی سۆر گۆتی باڵەگەڵم بێت دەینێرمە ناوچەکەی ئەوان ئەگەر توانی بیهێنێت ئەوا سەردەکەوێت ئەگەر نەشی توانی ئەوا لەناوی دەبەین. دێوی سۆر گۆتی ئەحمەد: دەستدە ئەو جۆرکە خامەو ئەو تەوشووەی بێنە با لەگەڵ خۆمانی ببەین. ئەحمەدیش هێنای و وەرێکەتن تا سەر ئەو ڕووبارەی کە ناوچەکانی لەیەك جیا دەکردنەوە لەسەر ڕووبارەکە دانیشتن، دێوی سۆر بە ئەحمەدی گوت ئەو کانییەێ دەبینی کە دوور تەختی لێیە تەختێکی سۆر تەختێکی زەردی لێیە هەرو لەبن تەختەی زەرد چاڵێك هەڵکەنەو هەڕۆ ناوێ و هەندێ گیای بەسەرەخۆت دادە تا نەتبینن.

یەکەمجار چل پەری دێن مەلەی خۆیان دەکەن و دەڕۆن پاشان دە پەری دێن یەکیان لەسەر تەختی سور یەکیان لەسەر تەختی زەرد خۆ دەگۆڕن و مەلەی دەکەن کە خۆیان هەڵدا ناو گۆمەکەو بزر بوون پاڵەکانی تەختی زەرد بە هەموو شتەوە بێنە لای من.

پاشان دێوی سۆر گۆتیە ئەحمەدی چۆرکە خامەکان ڕاگرە بە تەوشووەکە قاچم داماڵەو قرێژی لێ بکەوە تا هەموو چۆرکە خامەکان بوون ئەحمەد لەگەڵ خۆی دەستی دانێ و بردنیە ئەوبەری ڕووبارەکە ئەوجا ئەحمەد بەڕێ کەوت لۆ سەر کانییەکە و خۆی گەیاندە لای تەختی زەرد چاڵێکی هەڵکەند و خۆی تیا شاردەوە هەندێك گیاو پەلکی بەسەر خۆی دادا بۆ ئەوەی نەیبینن، ئەوجا چل

پـەری هـات و دەسـتیان کـرد بەمەلـەکردن پاشـان لـە کانییەکـە هاتنـە دەرەوە ڕۆیشـتن. پـاش کـەمێکی تـر دوو پـەری دیکـە هاتنـە ئـەوێ کـە دێـوی سـۆر گۆتبـووی بە ئەحمەد.

پەریـەکان خۆیـان گـۆڕی چـوونە نـاو ئاوەکـەو بـزر بـوون ئەحمـەد هاتـە دەرەوە هـەموو شـتەکانی سـەر تـەختی زەردی بـرد و هـەڵات کاتێـك هـەردوو پەریەکـە لـەناو ئاوەکـە هاتنـە دەرەوە گوڵبـاین دیـتی جـل و بـەرگی نەمایـە ئەحمـەدیش هـەر هەڵدەهات دیتیـان کابرایـەك لـە دەشـتی هەڵدێ گوڵبـارینیش بـە خوشـکی گـۆت بـڕۆ ئـەو جلکانـەم لـۆ بینـەوە ئـەویش گـۆتی: نـە ئەچـم نـە باڵەکانیشـت ویئـەدەم، ئەگـەر حـەزت لێبـوو بـە ئاشـکرا مێـردت پـێ کردبـا. گوڵبـارین کەوتـە دوای ئەحمـەد کاتێـك لێی نزیك بۆوە گۆتی کابرا دەرپێم لۆ فڕەدە.

دێـوی سـۆر بـانگی کـرد ئەحمـەد لـۆی فـڕەدە تـا لەبـەری کـردەوە ئەحمـەد بـڕەك دوور کەوتەوە پاشان گوڵبارین گۆتی ئەحمەد کراسم لۆ فڕەدە.

دێـوی سـۆر گـۆتی کراسـی لـۆ فـڕەدە، ئەحمـەدیش کراسـەکەی لـۆ فـڕدا تـا کراسـەکەی لەبـەر کـردەوە ئەحمـەد گەیشـتە سـەر ڕووبارەکـە دەسـتی دایـە جۆرکـە خامەکـە خـەریك بـوو پێـداکات دێـوی سـۆر گـۆتی ڕاوەسـتە تـا گوڵبـارین نزیـك دەبێتـەوە کاتێـك گوڵبـارین نزیـك بـۆوە گـوتی ئەحمـەد پێداکـە ئەحمـەدیش پێیـدا کـردو ڕووبارەکـە پێـی دێـویش ئـامێزی لـە هـەردووکیان داو پەڕاندنیـەوە ئـەو بـەری ڕووبارەکـە ئـەوجا دێـوی سـۆر بـە ئەحمـەدی گـۆت: ئەگـەر دەتـەوێ هـەتا دەمـری گوڵبـارین لای تـۆ بـێ ئـەوا نابێـت گوڵبـارین چـاوی بـە باڵـەکانی خـۆی بکەوێتـەوە هەر کاتێك چاوی پێ بکەوێتەوە و باڵەکان دەباو دەڕواتەوە.

ئـەوجا ئەحمـەد بـە دێـوی سـۆری گـۆت چیت پـێ چاکە وا بکـە دێـوی سـۆر باڵـەکانی گوڵبـارینی لـەناو دەسـتی خـۆی کوشـی و ووردی کـرد و بـوو بـە تۆزوبـا گـۆتی ئەحمـەد هـەتا هەتایـە ئـەو گوڵبارینـە لۆتـووە پاشـان هـەردووکی لەسـەر باڵـەکانی خـۆی دانـاو چـوونەوە پـاڵ ئـەو چاییەی کـە مـاڵی دێـوی سـۆری لـێ بـوو دێـوی سـۆر گۆتی: هەمووتان هەروونە ناو قەسرەکە.

دێـوی سـۆر بـە کنـدڕی حەلـەبی بـێ قەسـرەکەی لـەخۆ هـەردا، بردیـە شـوێنی مـاڵی خوشـکی دوو ڕۆژ لـەوێ مانـەوە پاشـان گۆتیـە ئەحمـەد گوڵبـارینی هەڕونـە نـاو قەسـرەکە، قەسـرەکەی لـەخۆ هەڵـداو بـەڕێ کـەوتن چـوونە نزیـك خـانی ئەحمـەد خانوەکـەی لـەوێ دانـاو گـۆتی ئەحمـەد دووڕبـارین ئـەمن، دەناسـی بـەلام بـە دایکـت

و باوکـت و گلاوێـژ بڵـێ وەرنـە دەرێ و نەترسـێن ئـەوانیش لـەناو خانووەکـە هاتنـە دەرێ و دێوی سۆر هات خانووی ئەحمەد بەرداوە بەلای دواوە.

هاویشـتیە نـاو رووبارەکـە قەسـرەکەی خۆشـی لـە جێـی دانـا وەختـەکی مـەلای شارەکەی تا بۆ ڕۆژ سێجار بانگی بەیانی دا.

پاشـانیش هـەموو جارێـك لەخـەو هەڵدەسـتا پاشـاش گـۆتی: شـەرت بـێ لەسـەرت بدەم کـە بەیانیـداهات. کـە ڕۆژ بـۆوە لـە دوو مـەلایان نـارد گـۆتی: مـەلا لـۆ شـەوێ دی سـێجار بانگـت دا؟ مـەلاش گـۆتی: شـەوێ دی سـێجار ڕۆژهـەلات. پاشـاش گۆتی: لە کام لا مەلاش گۆتی لەلای ڕۆژئاوا.

شـەری پاشـتر گوڵبـارین پەشـتەماڵێکی پـڕ لـە گـوڵ کـردو گۆتیـە پـیرە بـاوت هـەڵبگری و هـەر نیوسـعات نـا خێربـێ کاتێـك چـوون دانیشـتن گوڵـەکانیان دا بـە پاشـایە جووەکـە گـۆت: بـڕۆ بزانـە چـی هەیـە کـە جووەکـە لـە پەنجـەرە تەماشـای کـرد هەرسـێکیان بەیەکـەوە ئاوریـان داوە جووەکـە بـەربووەو تـۆپی، پاشـان ئەحمـەد پـیرە بـاەی هەسـتاند پاشـا بـە پیاوەکـانی گـۆت هـەرۆن بـزانن جـوو لـۆ نەهاتیتەوە کە چوون جووەکە لەوێ تۆپی بوو.

کە پیاوەکانی پاشا تەماشایان کرد، دیتیان سێ ژن لەناو قەسرەکەینە.

هـەر ژنـەو مەملەکـەتێك دێنێت، گەڕانـەوە لای پاشـاو مەیتەکـەیان بـۆ بـردەوە ئـەجا پاشا گۆتی: وەزیرینە چی لێبکەم هەموو شتێکی جێبەجێ کرد.

وەزیرێـك گـۆتی بڵـێ ئەحمـەد سـبەی ڕاوەدەبێـت پردێـك لەوبـەری رووبارەکـە دروست بکـەی لـۆ ئەوبـەری رووبارەکـە هەرکەسێك لـە مـاڵی خـۆی سوار بـوو ڕاست بپەڕێتـەوە هـەر شـاقاوێك گـوڵ بێـت هـەر شـەقاوێکیش دوور بێـت. پاشـا لـە دوای ئەحمـەدی نـارد و شـتەکانی پـێ گـۆت ئەحمـەد گـۆتی: پـێم ناکرێـت. پاشـا گـۆتی: لەسەرت دەدەم. ئەحمەد گۆتی: لەسەرمدە پاشا گۆتی: بە قانون دەکەم.

ئەحمـەد گەڕایـەوە مـارێ هـەموو شـتێکی پـێ گـوتن کـە شـەوداهات دێـوی سـۆر گـۆتی: ئەحمـەد بـڕۆ ئـەتو لەگـەڵ گەلاوێـژ بنـوو. دێـوی سـۆر لەگـەڵ گوڵبـارین و دووربـارین بـڕۆن هـەر شـەقاوێکی دادەنـا گوڵبـارینی دەکـەنی دەسـتە گـوڵێکی دادەنـا سـەر شـەقاوێکی تـر دوور بـارین پێدەکـەنی دەسـتە دوورێکـی دادەنـا هـەتا بـەیانی داهـات بـەیانی گۆتیـە ئەحمـەد ئـەو دارە لـۆ تـووە هـەتاکو ئـەتو لـەناو ببـەن بـەلام ئـەتو سـواری وولاغـی خـۆت بـەو بـڕۆ ئـەو بـەری رووبارەکـە کـە هـاتن بڵـێ مـن زۆر مانـدووم مـن نایـەم پاشـان بگـەڕێوە مـاڵێ. بـەیانی گـەڕاوە دەسـتی پێکـرد

پاشـاو وەزیـر ڕۆیشـتن دیتیـان ئەحمـەد لەوبـەری ڕووبارەکـە راوەسـتایە گۆتیـان ئەحمەد برۆ ئەحمەد گۆتی زۆر ماندیمە ئەحمەد گەڕایەوە ماڵەوە.

ئـەوانیش تـا ئەوبـەری پردەکـە چـوون راوەکـەیان بـەتاڵ کـردەوە. پاشـا گـۆتی: ئـەوجارەیان چـی بکـەم وەزیرەکـان گۆتیـان دەعـوەتی بکـەو یـا لەکنـە تـو دانیشـێ لای ئـەو خواردنەکـە ژەهـراوی دەکـەین. سـبەی بـانگی کـرد و گـوتی: ئەحمـەد ئـەمڕۆ ئێـوارە دەعـوەتی مـنی ئەحمـەدیش چـۆوە بەخۆیـەوە پـیرە بـابی هەسـتاند دێـوی سـۆر گـۆتی: منـیش دێـم. ئەحمـەدیش گـۆتی: ئـەتو ببیـنن هـەموو دەپسـێن. دێـوی سـۆر گـۆتی مەترسـێ ئـەمن لـەبن دیوارەکـە خـۆم مـات دەکـەم کـەس نامبینێ.

ئەحمـەد و بـاوکی چـوونە ژوورەوە دانیشـتن دێوەکـەش لـەبن دیـواری دیوەخانەکـە دانیشت دەستی کرد بە سەبیلە تێکردن.

سـێبەری دێوەکـە وەکـو هـەور سـێبەری لـە زەویەکـە کردبـوو خـەڵکی دەیـان گـۆت ئـەو پەڵـە هـەورە چـەند جوانـە کاتێـك نانیـان دانـا پاشـا گـۆتی: بـا دەسـت پـێ بکـەین. دێـوی سـۆر دەسـتی بـردە ژووری لـە ئاوگـانی نـا لەسـەر سـەبیلەی رووکـرد پاشـاو هـەموو وەزیرەکـان لـەخۆ چـوون تـەنها ئەحمـەد و پـیرە بـاو مانـەوە ئەحمـەد گۆتی: دێوە لۆ وات کرد.

دێـوەش گـۆتی: لـەقاپی پێشـەخۆت هەنـدەك خـواردن بێنـە بـدە ئـەم توڵەیـە، خواردنی هێنا و لەپێش تولەکەی روو کردو توولەکە کەمێکی خوارد مرد.

دێـوی سـۆر گـۆتی: ئەحمـەد ئـەو خواردنـەی ژەهـری تێکرابـوو بۆتـۆ بـوو. ئـەوجا دێـوی سـۆر دەسـتی کـرد بـە خـواردنی پاشـاو وەزیرەکـان و ئەوانـەی لای پاشـا بوون کە سبەینە داهات.

دێـوی سـۆر داری لـە ڕەگـەوە دەردەهێنـا بـەوانی لـە عـاردی دەنـا. ئـەوجا ئـەوەی لایـەنگری پاشـا بـوو هـەمووی خـواردن گـۆتی: سـەردەم سـەردەمی ئەحمـەد پاشـایە هەر کەسێك قسەیەك بکات دەیخۆم. ئەحمەد بوو بە پاشای شارەکە.

- ئەفسـانەیەکی تـەواوە و دێـو و پـەری دوو کچـی گوڵبـارین و دووڕابـرین هـەروەها وڵاتـی دێـو و پـەریانی هەیـە و دێـو باسـی زمـانی تایبـەتی خۆیـان دەکـات و باسـی نووسـین دەکـات. لـە نێـو ئـەم ئەفسـانەیە فیکـرە و وێنـە و کاری یەکجار کۆنی ئەفسانەیی تێدایە.

# باوکێك و سێ کچەکەی

**کۆکردنەوەی: شریهان ڕەفعەت عبدالرحمن**

**گێڕانەوەی: حاجی خەجیج**

ڕۆژێك پیاوێك ژنەکەی دەمرێ ئەو سێ کچەی جاحێڵن، پیاوەکە ژنێکی تر دەبێنی ئەو ژنە زڕدایکی کچەکانە زڕدایکیان کەیفی بەو کچانە نایەت لەگەر زڕدایکیان ناحەوێنەوە. زڕداکەکە بە باوکی کچەکان دەڵێ: دەبێ ئەو کچانە دەرکەی لە ماڵێ بەڕەڵلایان بکەی باوکیا هەرسێ کچەکەی دەباتە دارستان لەوێ بە کچەکانی دەڵێ بڕۆن داری خڕ بکەنەوە، کچەکانیش دەڵێنە بابیان بابە ئێمە ئەگەر بڕۆین کو بزانین تۆ ماوی یان نەماوی لێرە، بابی کچەکان دەڵێ: ئەمن کراوەکەی خۆم بە دارێکی وەدەکەم ئەگەر کراوەکە بە دارەکەی وەنەمابوو مانای وایە ئەمن دەڕۆمەوە ئەنگۆ وەرنەوە. کچەکانیش هەر دار خڕ دەکەنەوە تەماشای کراوەکە دەکەن کراوەکە هەر مایە کە مانگەشەو دادێت هەرسێ کچەکە دەچنە کن کراوەکە دەبینن بابیان لەوێ نەمایە هەرسێ کچەکە هەر دەڕۆن تووشی مارەکی دەبن، سێ خوشکەکە دەچنە ئەو مارەی، ئەو مارە سێ کوڕیان دەبێ، ئەو سێ خوشکە مێرد بەو سێ برایە دەکەن. پاشی چەند سارەکی دەڕوات کچەکان دەبنە ساحێبی مار و منداری خۆیان ڕۆژێك بابی کچەکان دەچێتە ئەو گوندە بەقاری هەیە کە کچەکان بابیان دەبینن دەڵێنە مندارەکانیان ئەو زەلامەی بەرد باران بکەن، مندارەکان لە دایکیان دەپرسن لەبەر چی؟ کچەکان دەڵێنە مندارەکانیان ئەوە بابمانە وەختی خۆی ئەمەی بەرەڵلا کرد لەبەر زڕدایکی منداڕەکان بەرد بارانی دەکەن، پیرە مێردەکە هاوار دەکا دەڵێ لۆ لێم دەدەن، منداڕەکان دەڵێن داکی ئێمەت بەرەڵلا کردیە کە دەکاتە کچی خۆت، باوکەکە کە چاوی بە کچەکانی دەکەوێت دەگریێ پەشیمان دەبێتەوە ئەمن لەبەر ژنەکەم ئەنگۆم بەرەڵلا کرد بریا ئەنگۆم هەبوایە ژنەکەم نەبوایە.

## ژنێکی سەید

ڕۆژێك ژنەك دەچێتە سەر سراوێ (سەر ئاوێ) بۆ ئەوەی ئاو بینی لەبۆ ماری، بەخۆی و کەرەکەی بەڕێ دەکەون گە دەگەنە سەر سراوێ گۆزەکان پڕ دەکات و شەوی بەسەر دادێت بەڕێ دەکەوێ بۆ مارێ، کەرەکەی بەردەبێتەوە ژنەکە سڵ لەو سەحرایە کەسی لێ نییە نازانی کو ئەو کەرەی ڕاست بکاتەوە، چونکە ئیمانی زۆر بەقوەتە هەر لە خودا دەپاڕێتەوە کە کو بچیتەوە ناو مارو منداری خۆی لەو دەمەدا خدری زندەیەکی لێ پەیدا دەبێت و کە دەستێك بە کەرەکە دادێنێت یەکسەر ڕاست دەبێتەوە ئەو پیاوە گەنجە کراسێکی سپی لەبەردایە کە ژنەکە سەیدەکە ئاوڕ دەداتەوە خدری زندەکە نەمایە پێی دەرێ چت لۆ بکەم؟ خدری زندە دەرێ (یەك شیوی نیسك) ژنە سەیدەکە دەچیتەوە گوندی ئەوەی کە بەسەری هاتووە لۆ مندارەکانی دەگێڕێتەوە و هەتا ئیستاش ماوەتەوە و (کە خودا پشت و پەنای هەموانە).

**- ئەوەی کەرەشە خەڵکەکە بڕوایان پێی هەبێ، زۆر چیرۆکی لەسەر دروست دەکەن، خدری زیندەش یەکێکە لەم باوەڕانە.**

## ژنی بێ ئەقڵ

دەگێڕنەوە دەڵێن ژن و مێردێك هەبوو، ئەو ژن و مێردە زۆر فەقیر بوون هەتا بڵێن هیچیان نەبوو ژیانیان پێی ببەنە سەر تەنها چەند مریشك و کەڵەبابێك نەبێ کە لە ماڵەکەی خۆیان بەخێویان دەکرد. ژنی ئەو پیاوەش کەم ئەقڵ بوو ڕۆژێك پیاوەکە لەماڵ دەچێتە دەرەوە. بەقار هاتە گوندی بانگی ڕاهێشت گوتی مریشکی دەکرم هێلکەی دەکرم ژنەکەش گووتی هۆ کاکی بەقال وەرە مریشك و کەڵەبابمان هەیە پێتی بدەم بە پارە. بەقار هات بۆ لای ژنەکە، گۆتی مریشك و کەڵەبابم هەیە لێم بکڕە بەقار گۆتی لیت دەکرم بەلأم پارەم پێ نییە هەتا جارێکی تر دێمەوە ئەوجا دەت دەمێ، ژنەکەش گۆتی: نات دەمێ، هەتا کەڵەباب رەهن دانەنێی کەڵەبابەکەش هەرهی خۆی بوو کابرای بەقالیش هەر لە خوای دەویست لەبن دەستی ژنەکەی دەربینی گوتی: باشە. بەقالەکە ڕۆیی، ژنەکە هاتەوە مارێ و کاتێك پیاوەکە گەڕاوە مارێ ژنەکە گوتی: پیاوەکە

پـارەم پـەیا کـردووە شـتمان لـۆ پـێ بکـڕە، کـابراش ووتـی کـوت پەیـدا کـردووە؟ ژنەکـەش ووتـی مریشـك و کەڵەبابـەکانم داوەتـە بـەقار بەقـەرد کەڵـەبابی ڕەهـەنی بـەجێ هێشـتووە، پیاوەکـەش گـوتی هـەی بـێ ئـەقر ئـەدی کەڵـەبابیش هـەر هـی خـۆت نییـە کـابرا گـوتی دەڕۆم سـەری خـۆم هەڵـدەگرم هـەتا یـەکێکی لـەتۆ بـێ ئـەقرتر نەبینمـەوە نایەمـەوە. زۆر ڕۆیشـت هـەر ڕۆیـی هـەر ڕۆیـی. هـەتا گەیشـتە ئاقارێـك دیـتی ژنێـك لـە ئاقـاری دەگریـێ لەبەرخۆیـەوە هـەر گـۆرانی دەڵـێ و دەگریـێ، بـە گریانـەوە داری خـڕ دەکـردەوە پیاوەکـە لـە ژنەکـە نزیـك بـۆوە سـەلامی لـێ کـرد ژنەکـە سـەلامی لـێ وەرگرتـەوە گـوتی: ئـەرێ بـرا ئـەتوو لـە کـێ ڕا دێـی کـابراش گـوتی وا لـەو دونیایـە دێمـەوە، ژنەکـەش بـرای مردبـوو دەگریـا براشـی حەمـەد بـوو بـە کـابرای گـوت: بـە قوربانـت بم حەمـەدی برامـت لـەو دونیـا نـەدیتوە، کـابراش لـە دڵـی خۆیـدا گـوتی وەڵـلا لـەوەی بـێ ئـەقرتر نابینمـەوە، کـابرا بـە ژنەکـەی گـۆت: حەمـەدی بـرات وا لـەو دنیـا لەسـەر (١٠٠) لـیرە لەوسـەر دەیبەنـە ئـەو سـەر خـەر لێـی دەدەن، ژنەکـەش گـۆتی: بـە قوربانـت بم هـانی ئـەو گـوارە خەزێمـەت بـدەمێ لێرەبـە وا دەچـمەوە پـارەت لـۆ دەیـنم لـەبۆ حەمـەدی ببـە، کـابراش دەرێ بـاش. ژنەکـە دەچێتەوە مـارێ بـە غـاردان مێردەکـەی دیـتی ژنەکـە وا بـەغاردان دەچـیتەوە مـارێ پێـی گـوت ئـەوە چ بـووە؟ بـۆ ئـەوها بـە غـار دەچـیەوە مـارێ ژنەکـەش وتـی ئـەتۆ وا لـە مـارێ دانیشـتی چ ئاگـات لـە حەمـەدی برامـە، گـوتی کابرایـەك وا لـەو دونیایـە هاتۆتـەوە دەرێ حەمـەدی بـرات وا لەسـەر (١٠٠) لـیرە ئەوسـەر ئەوسـەری پـێ دەکـەن ئـەمنیش دەچـم ئـەو پارانـەی لـەبۆ دەبـەم لـۆ ئـەوەی ڕزگـاری بکـەن، ژنەکـە پارەکـەی لەگـەر خـۆی دەبـا لـەبۆ کـابرای هـەتا دەچـیتەوە کـابرا لەوێنـدەر نەمایـە ڕۆیشـتەوە کـابرا لـە بـۆی دەرکـەوت کـە لـە ژنـی خـۆی بـێ ئـەقر تـر هەیـە، لۆیـە گەڕایـەوە گوندەکـەی خـۆی و کۆنـە هـەواری خـۆی لای ژنەکـەی خـۆی ژیـانێکی خـۆش و تـا هـەتا هـەتاییان بـردە سـەر، کراشـم دڕا هیچم پێ نەبرا.

– چیرۆکی بێ عـەقل تـرە بێ بـەخت تـرو ئـازاترو جوانترو ئـەم جۆرە چیرۆکانە زۆرن.

## عەباسە لە دیوانان چ باسە

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو پیرەژنێك هەبوو ئەو پیرەژنە کوڕێکی هەبوو، ناوی عەباس بوو. عەباس لەگەڵ دایکی بە تەنها دەژیان عەباس هەموو شەوێك دەچوو لۆ دیوەخانی گوندی تا درەنگانی شەو نەدەهاتەوە هەموو ڕۆژێك کە دەهاتەوە ماریێ دایکی لە عەباسی دەپرسی عەباسە لە دیوانان چ باسە؟ عەباس هەموو ڕۆژێك باس و خاسی دیوانی بۆ دایکی دەگێڕاوە، تا وای لێهات عەباس بێزار ببو لە گێڕانەوەی قسەی دیوەخانێ بێزار ببوو لە باس کردنی ئەو شتانەی کە لە دیوەخان باس دەکرا، ڕۆژێکیان عەباس بە برادەرەکەی خۆی گوت بێزار بوم لەوەی هەموو ڕۆژێك باس و خواسی دیوەخانێ لۆ دایکم باس بکەم.

برادەرەکەش پێی گوت ئەگەر ئەوجارە داکت لێی پرسی لە دیوانان چ باسە بڕێ (سەرگرتن و قەراسە) بڕێ لە دیوەخان باس دەکەن، دەڕێن هەر پیرەژنێك شەو تا سبەینێ لەناو ئاو بێت دەبێتە کچی (١٤) ساڵە، عەباسەش لە بۆ ڕۆژی پاشتر دیسان دەچێتە دیوەخان کە دەگەڕێتەوە ماریێ داکی دەرێ کوڕم عەباسە لە دیوانان چ باسە؟ عەباسەش دەرێ دایە گوێم لێ بگرە با بۆت باس کەم.دەرێ (سەبر گرتن و قەراسە)دەرێ کوڕم کو؟ عەباسەش دەرێ دایە لە دیوەخان دەیان گوت هەر پیرەژنەك شەوێ هەتا سبەینێ لەناو ئاو بێت دەبێتەوە بە کیژی چاردە ساڵی پیرەژنەکەش دەرێ: کوڕم ئەوجا ئەوە زۆر ئاسانە ئەمن ئەوها دەکەم لەبۆ سبەینێ خۆی ئامادە دەکات. ئەو شەوە پیرەژن دەچێتە ناو ئاوەکە و هەر دەلەرزێو پیرەژنەکە بەو شەوە گوێی لە دەنگی حەپەحەپی سەگی دەبی و دەرێ

سەگێ چ حەپەحەپە

سبەی شایی و

ئێسکەك دەدەم لەدەمە

گوێی لە دەنگی بۆق دەبێ و دەرێ:

بۆقێ چ قیژە قیژە

سبەی شایی و لە کیژە

پیرەژن دەبنەوە کیژە

پیرەژن هەر بەدەم گۆرانی گۆتنەوە لەناو ئاو دەمێنێتەوە بەیانی کاتێ خەرکەکە دەچن لۆ ئەوەی بزانن پیرەژن چی لێهاتیەدەبینن پیرەژن ڕەق و تەق بۆتەوە و مردووە.

- باوکێك و سێ کچ باس لە دڵ ڕەقی باوەژن و بێ بەزەیی باوك دەکات، کاتێ ژنەکەی دەمرێ و کچەکانی ل ماڵ دەردەکات، ئەمەش لە ژیان زۆر ڕویداوە و بەردەوام ڕوودەدات.

ژنێکی سەید، ڕووداوی ژیانە ئەویش، هێندە هەیە (خدری زیندە) لەم حیکایەتەدا هەیە، خدری زیندەش بە پی ٚی بیروباوەڕی خەڵك ئەم کەساتییە، بەردەوام یارمەتی خەڵکی لێقەوماو دەدات، ئێستاش لە ژیان زۆر کەس هەن، دەڵێن بە چاوی خۆمان خدری زیندەمان دیوە

ژنی بێ ئەقڵ نموونەی کەسانی ساویلکەی بە بەزەییە کە لای وایە چۆن لە ژیان دەکرێ یارمەتی برای خۆی بدات، ئاوا لەو دنیاش هەر دەکرێ کە یارمەتی بدات. بۆیە زۆر بە دڵسۆزییەوە گوارە و پارەی خۆی دەداتە کابرای نەناس. کابراش بۆی ڕوون دەبێتەوە لەم دنیایە لە ژنەکەی ئەویش بێ عەقڵ تر هەیە.

# حەکایەتی دەنکە هەنارو دایکی

**کۆکردنەوەی: دیار دەهام فەتحی**

**گێڕانەوەی: عەبدوڵلا عەبدولرەحمان**

هەبوو نەبوو ژنێك هەبوو هیچ منداڵی نەبوو، ڕۆژێك لە سەرەتای نوێژ کردن ڕاوەستا بوو دەنکە هەنارێك لەسەر تاتەکە کەوت بوو دەستی دایێ و خواردی دوعای لە خودا کرد گوتی: منداڵێکم ببێت وەك ئەم دەنکە هەنارە بێت، شەرت بێ بەناوی دەنکە هەناری کەم. ژنەکە منداڵێکی بوو ناوی نا دەنکە هەنارە کە بەرەگەز کچ بوو، منداڵەکە گەورە بوو دایکی مرد، دایکەکە گوتیە باوکی ئەگەر مردم دەستێکم ببرە لە پارچە پەڕۆیەکی بدرو ئەگەر ژنت هێنا با بەو دەستە لە منداڵەکە بدات. پیاوەکە ژنەکەی مردوو لەپاشان ژنی هێناو، دەستەکەی کە بڕی بوو لە پێشتر تەسلیم بەژنەکەی کردو گوتی: بەم دەستە برایە لێیدە هەر ئەوەندەی ژنەکەی لێی دەدا منداڵەکە جوان دەبوو یان قەڵەو دەبوو چونکە دەستی دایکی بوو، ژنەکەش کچێکی پەیدا بوو کە جاحێر بوو هەردووکیان جاحێر بوون (کچە حەقیقیەکە و کچە غەیری حەقیقیەکە) واتە (زڕەکە) بە کوردەواری خۆمان پاشان کوری پاشای دی دڵی کەوتە کچە جوانەکەی واتە (دەنکە هەنار) خواستی و دایان بەکوری پاشاکەی گوند کە هاتن بۆ بردنی زردایکی دەنکە هەنار لەجیاتی دەنکە هەنار کچی خۆی واتە حقیقیەکەی جلی بووکی لەبەر کردوو لەجیاتی دەنکە هەنارە بۆ کوری پاشای ڕەوانە کرد، کوری پاشا پاش زەماوەندەکە چوو بۆلای بووکەکە کە سەیری کرد بوکی یەکەم جارە نەبوو واتە دەنکە هەنارە نەبوو واتە فێڵیان لەکوری پاشاکرد و غەدریان لە کچەکە واتە دەنکە هەنار کرد. کچەکەی ناردەوە کچەکە بوە (مەیمون) دەنکە هەناریش چووە بۆ لای کوری پاشا گوتی: منیان لە زوور کرد بوو واتە بەندیان کردبووم کە ئاگام لە هیچ شتێك نەبوو وەختێ کە کچەکە هاتەوە دایکە دووبارە پەشیمان بووەوە و منی ئازاد کرد و هاتم بۆلای تۆ. کەواتە لەم حەکایەتە کوردیە کۆنە یاخود لەم ئەفسانەیە کۆنەی کە لەسەر زاری هاولاتی گوندەکە وەرمان گرت ڕەنگدانەوەی زولم و زۆرداری پێوە دیار بوو لە کچی یەکەم خواوەندیش ئەمەی قەبوول نەکرد و شتەکەی ئاشکرا کردوو هەر کچی یەکەم سەرکەوت و ئازاد کرا وەچوو بۆ لای کوری پاشا، ئەمەش پەند و

عیبرەتێکە بۆ ئێستا و بۆ داهاتووش کەشایەنی باسکردنە وە ئەوەی بە ووردی لێی ووردبێیتەوە مانایەکی دوو لایەنی و ڕەوانبێژی تێدایە و مانای حەقیقی ئێستا و پڕ بە پێت دەبەخشێت وەك لەکوردەواری خۆمان پێی دەڵێن.

**- دەنکە هەنارە زۆر دەقی تری هەیە و بڵاو کراونەتەوە، زۆر حەکایەت و ئەفسانەی کوردەواری باسی کچی سێوی - هەتیو - و بێ دایك دەكات، كە زڕدایك - باوەژن - لەگەڵی خراپ دەبێ و کچە ناشیرین بێ ئەقڵەکەی خۆی، پێش ئەو کچەی سێوی و جوانە دێنی، بەڵام، حەکایەت و ئەفسانەکان، وەك هەمیشە کۆتایی حەکایەت بەوە دێنن کە دواجار کچە بە مرازی خۆی دەگات و زڕدایکیش بە سزای خۆی.**

**ئەم حیکایەتە باسی گەورەی خوای دەکات کە چۆن لە چارەی مرۆڤی نووسیوە دەبێ هەر وابێ کەس ناتوانێ دەستکاری بکات.**

گێرانەوەی: ئەمەم لەسەر زاری باپیرم وەرگرتووە. لە چۆمان ١-٥-٢٠٠٧ سێ شەممە دەڵێ جارێکیان سێ پیاو بەناوی سوڵتان مەحموود و ئەیاس و حەسەن مەمەند دەچنە سەفەر لە ڕێگا دەگەنە پیرە پیاوێك سێ کۆمەڵە خۆڵی کۆکردبووەوە، سوڵتان مەحموود بەپیاوە پیرەکەی وت: پیرە مام ئەم کۆمەڵە خۆڵانە چین؟

پیرە پیاو وتی: دەیان فرۆشم.

سوڵتان مەحموود وتی: جاخۆڵ کەڵکی چییە دەیفرۆشی؟ وازی لێ هێناو نەیکڕی دوای سوڵتان مەحموود ئەیاس چووە پێش و وتی بەچەند دەیانفرۆشی؟

پیرە پیاو وتی: بە بیست دینار خولاسە لێی کڕی و پارەکەی پێداو وتی جا مانایان چییە ئەم کۆمەڵە خۆڵانە پێم بڵێ؟

پیره پیاو وتی: یەکێکیان مانای ئەوەیە زاڵم ببێتە پرد بەسەریدا نەپەڕیەوە، یەکێکیان ئەوە خزم بەناخزم نەدەن، ئەوی تریان بۆ هەموو شتێك بڕوا بەژنت نەکەی.

دوایی هەرسێکیان پیرە پیاویان بەجێ هێشت و ڕۆیشتن بۆ مەملەکەتێکی تر لەوێ چوون بۆ ڕاو ڕەشماڵێکیان دیت بەتەنیا لە دەشت ئێوارە چوون بۆ ئەوێ بەمیوانی شەو لەو ماڵەی ناو ڕەشماڵەکە مانەوە، لەو شەوەدا ژنی ئەو ماڵە منداڵی دەبوو کەسیشیان لێ نزیك نەبوو بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات،ژنەکە کوڕێکی بوو (جارانیش وەکو داب و نەریت چاودێری منداڵەکەیان دەکرد لە ترسی شەوە تا بەیانی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ)، کابرای خاوەن ماڵ زۆر خزمەتی ئەوانی کرد لەبەر ئەوە نەیانتوانی بەجێیان بێڵن و بڕیاریان دا لایان بمێننەوە و یارمەتیان دان وەتا سێ شەو تەواو بوو بەنۆبە چاودێری منداڵەکەیان دەکرد تا بەیانی، ئەو شەوەی نۆبەی ئەیاس بوو لە نیوە شەو باڵندەیەکی سپی هات ئەیاسیش لە دووری منداڵەکە خۆی مەڵاس دا باڵندەکە لەسەر چیفی ڕەشماڵەکە هەڵنیشت پاشان چووە سەر سەری منداڵە لەو کات ئەیاس پەلاماری قاچی باڵندەکەی داو گرتی، باڵندەکە کەوتە قسەکردن و وتی: بەرەڵام بکە من چارەنووسم بەئەمری خودا هاتووم شەوی ڕابردووش ژنی سوڵتان مەحموود کچێکی بووە هاتووم چارەنووسی ئەم دوو منداڵە لە یەك بنووسم ئەیاسیش وازی لە باڵندەکە هێناو لێی دووکەوتەوە تاکو باڵندەکە خۆی ڕۆیشت.

کەسێ شەو تەواو بوو لە ماڵەکە ڕۆیشتن، لە ڕێگا ئەیاس پێکەنی (هەر کاتێکیش ئەیاس پێکەنیبا قسەیەکی پێ بوو) بۆیە سوڵتان مەحموود وازی لێ نەهێنا وتی: قسە بکە بەچی پێدەکەنی؟

ئەیاس وتی: بەهیچ پێناکەنم سوڵتانم خۆشبێ، سوڵتان هەر وازی لێ نەهێنا ناچاری کرد قسە بکات و ئەویش بەتەواوی بۆی گێڕایەوە کە ئەو شەوەی ئەیاس نۆبەی لە منداڵەکە گرتووە باڵندەیەك هاتووە و چارەی کوڕی ماڵەکە و کچی تۆی لەیەك نووسیوە، سوڵتان بەمە ڕازی نەبوو وتی: دەچم منداڵەکە دێنم و دەیکوژم پیاوەکەش بێ دەسەڵات بوو نەیتوانی منداڵەکە نەداتە دەست

سـولّتان، ئـەیاس بەسـولّتانی وت: ئـەم منداڵـە مـەكوژە لـەناو سـندوقێكی داری دابـنێ فرێیبـدە نـاو ڕووبـار، سولـان بەقسـەی ئـەیاس ڕازی بـوو (چـونكە قـەت لـە قسـەی ئـەیاس دەرنەچـووە) منداڵـەی لـەناو سـندوق نـاو فرێیدایـە نـاو ئـاو. منداڵەكـە بەئاوەكـەدا ڕۆیشـت تـا لـە گونـدێك كـو ئاشـێكی ئـاوی لـێ بـوو منداڵەكـە چـووە نـاو ئـاوی ئاشـەكەو مایـەوە لـەوكات ئاشـەكە ئـاوی بەسـەرگەڕاو پـڕ ئـاو بـوو ئاشـەوانەكە چـووە سـەربانی ئاشـەكە دیـتی سـندوقێكی دار بەئاوەكـەدا هـاتووە و وتـی: ئـەم دارە بـۆ ئـاگر باشـە و بردیـەوە ماڵـەوە كاتێـك سندوقەكەی لـە ئـاگر نزیـك كـردەوە قـیڕی دەرەوەی سـندوقەكە توایـەوە و ئاشـەوان وتـی: لەوانەیـە شـتێكی تێـدابێ سـندوقەكەی شـكاندووە كردیـەوە دیـتی منـداڵێكی تێدایـە جـا منداڵەكـەی بردە لای ژنەكەی و بۆی گێڕایەوە پێی وت: ئەم منداڵە بەخێو بكە.

ژنەكەش منداڵەكەی بەخێوكرد تا گەورە بوو!

جـارێكی تـر سـولّتان مـەحموود و ئـەیاس و حەسـەن مەمەنـد چـوون بـۆ باخچـەیەك كـە لـە ئاشـەكە نزیـك بـوو لـەو كـات كوڕەكـە هاتـە دەرەوە ئـەیاس كوڕەكـەی ناسیەوە و پێكەنی، سولّتان وتی ئەیاس بەچی پێدەكەنی؟

ئـەیاس وتـی: بـەوە پێدەكـەنم كـە چارەنووسـی خـودا بـەتۆ تێـك نـادرێ، ئـەوە ئـەو كوڕەیە كە تۆ لە سندوقەكەدا فرێتدایە ناو ئاو گەورە بووە.

سـولّتان بەمـە زۆر تێكچـوو هەسـتا دووكەسـی بـانگ كـرد و وتـی: ئـەو كـوڕە ببـەن بكـوژن دوایـی جلـەكانی بـەخوێنی بـۆم بێننـەوە، دوو كەسـەكەش كوڕەكـەیان بـردە دەشـت و یـەكێكیان بـەوەی تـری وت: بـۆ ئـەم كـوڕە بـێ تاوانـە بكـوژین بـا بزنێـك لـە شـوانێك بكـڕین و بیكوژینـەوە پاشـان جلـەكانی بـەخوێن دەكـەین و بـە خەنجـەران لـە جلـەكان دەدەیـن و كـەمێك دەیـان دڕێنین بـۆ ئـەوەی سـولّتان شـك نـەكات و ئـەو كـوڕە ئـازاد دەكـەین ئـەوی تـریش ڕازی بـوو لەسـەر ئـەم بڕیـارە و كـەمێكی تـر ڕۆیشـتن لـە ڕێگـادا شـوانێكیان دیـت و چـوونە لای بزنێكیـان لـێ كـڕی و جلـەكانیان لـە كـوڕە وەرگـرت و پێیـان ووت: بـڕۆ لـەم نـاوە نـەمێنی بـا سـولّتان پێـت نـەزانێ و بـۆ خۆشـیان چـوونەوە لای سـولّتان و جلـە بەخوێنـەكانی كوڕەكـەیان بـۆ بـرد و پێیان وت: سولّتانمان خۆشبێ فەرموو ئەوەش جلەكانی كوشتمان.

کوڕەکـە زۆر ڕۆیشـت تـا لـە گونـدێك نزیـك بوویـەوە زۆر برسـی بـوو گوندەکـەش زۆر گـەورە بـوو لـە دەوری گوندەکـەش کانیـەکی لێبـوو چـووە سـەر کانیەکـە و لـەژێر دارێـك خـەوی لێکـەوت، لەخـەوا بـینی کەسـێك هاتـە لای پێـی وت: هەسـتەوە لـەفلان شـوێن دوو کوپـە زێـڕ هەیـە بۆخـۆت دەریـان بێنـە، ئـەویش هەسـتایەوە و بـینی خەونـە دیسـان خەوتـەوە دووبـارە خەونەکـەی بینیـەوە ئینجـا هەسـتایەوە و چـوو بـۆ شـوێنەکە کوپـە زێڕەکـانی دەرهێنـاو گیرفانـەکانی لـێ پـڕ کـرد و ئـەوەی مایـەوەش لـەژێر گڵەکـە شـاردیەوە چـوو بـۆ بـازاڕ نـانی خـوارد و دەسـتە جلێکـی جوانی کـڕی و لەبـەری کـرد وتـی: مـن دەبـێ خانووێـك لەسـەر ئـەم کووپانـە دروسـت بکـەم و بەخـەڵك بڵـێم ئەمـە قـەبری باوکمـە، پاشـان چـووە لای خـاوەن زەوییەکـە و لێـی کـڕی و خـانووێکی خۆشـی لـێ دروسـت کـرد ئـەو گونـدەش ئاغایـەکی هـەبوو نـاوی حەسـەن ئاغـا بـوو، بـەهۆی دەڵەمەنـد بـوونی لای ئـەم ئاغایـە و خـەڵکی گوندەکـە ڕێزێکـی زۆری هـەبوو وە زۆر کەسـی ناسـی لەبـەر ئەمـە چـەند کەسـانێك چـوونە لای حەسـەن ئاغـا و پێیـان وت: کـە کەسـێکی وا دەوڵەمەنـد پەیـدا بـووە و ناوبـانگی دەرکـردووە ئاگـاداری خـۆت بـە ئەگـەرنا دەسـەڵات لـەتۆ دەسـت دێـنێ بیکـوژە بـا نـەمێنێ ئـەم چـەند کەسانەش بـوون بـە دوو کۆمەڵـە کۆمـەڵێکیان وتیـان بیکـوژە ئـەوانی تـریش وتیـان مـەیکوژە کاغـەزێك بـۆ سـوڵتان مـەحموود بنووسـە هـەر کاتێـك ئـەو کـوڕە گەیشـتە لای تـۆ لەسـەری بـدە حەسـەن ئاغـا بەمـە ڕازیبـوو هەسـتا کاغـەزێکی نووسـی و دایـە کوڕەکـە و ناردیـە لای سـوڵتان، کوڕەکـەش پێیـان وت: مـن بۆچـی بچمە لای سـوڵتان وتیـان: تـۆ بـڕۆ سـوڵتان ئیشـی پێتـە لـەوێ پێـت دەڵـێ، ئـەویش هەسـتا ڕۆیشـت بـۆ لای سـوڵتان مـەحموود و کاغەزەکـەی لـەبن سـەری خـۆی نـا لـە ڕێگـادا مانـدوو بـوو لەسـەر کانیـەك لـە ژێـر سـێبەری دارێـك حەسـایەوە و خـەوی لێکـەوت لـەو کاتـەدا خـدری زینـدە گەیشـتە لای کوڕەکـە و دەرهێنـاو بەدەسـت خـەتی سـوڵتان مـەحموود لێـی نووسـی هـەرکاتێك ئـەم کـوڕە گەیشـتە لای تـۆ کچـم خـۆتی لـێ مـارە بکـە ئـەوکات سـوڵتان سـەفەری کردبـوو لەگـەڵ حەسـەن مەمەنـد و ئـەیاس کچـەکەی حـوکمی دەگێـڕا لـە جێگـای بـاوکی.
کاتێـك کوڕەکـە هەسـتایەوە دەسـتی لـە کاغەزەکـەدا و دیـتی مـاوە ڕۆیشـت چـووە مـاڵی سـوڵتان مـەحموود دوای سـەلام کردنـی کاغەزەکـەی دایـە دەسـت کچـی سـوڵتان، کچـەکە کاغەزەکـەی خوێنـدەوە دیـتی لێـی نووسـراوە (کچـم هـەر کاتێـك

ئـەو کـوڕە گەیشـتە لای تـۆ خـۆتی لـێ مـارە بکـە)، کچـەکەش قسـەی بـاوکیجێ بـەجێ کـرد و وەزیرەکـانی کـۆکردەوە و کاغەزەکـەی پیشـان دان و وەزیرەکـانش وتیـان: ئەمـە باوکتـە مـادام وایـە بەقسـەی بکـەو خـۆتی لـێ مـارە بکـە کچـەکەش خـۆی لـێ مـارەکرد بەقسـەی وەزیرەکـان، کچـەکە زۆری پـێ نەچـوو کـوڕێکی بـوو، کاتێـك سـوڵتان مـەحموود گەڕایـەوە لـە سـەفەر کـوڕی کچـەکەی چـووە باوەشـی سـوڵتان مـەحموود و لـە کۆشـی دانیشـت! سـوڵتان بـەوەزیرەکانی وت ئەمـە چییە؟ زۆری پێ سەیر بوو!

وەزیرەکـانیش وتیـان: سـوڵتانمان خۆشـبی کوڕێـك هاتـە ئێـرە کاغـەزێکی پـێ بـوو بەخەتی تۆ لێی نووسرابوو کە کچی تۆ خۆی لەم کوڕە مارە بکات.

سـوڵتان وتـی: مـن ئـەم کاغـەزەم نـەناردووە و کـەس بەقسـەی مـن نـەهاتووە، ئـەم کوڕە لەکوێیە؟ هەر ئێستا بۆم بێنن سەری دەبڕم.

ئـەیاس وتـی: سـوڵتانم خۆشـبی چـارەنووس بـەتۆ ناشـێوێنرێ و ڕەت نـاکرێ ئـەوە هەر ئەو کوڕەیە کە تۆ خستتە ناو ئاو.

وەزیرەکـانیش هـەمان قسـەی ئەیاسـیان بەسـوڵتان وت: کـە ئەمـە چارەنووسـە! سـوڵتانیش بەقسـەی کـردن و وەکـو زاوای خـۆی وە هـەروەها جـێ نشـینی قبـوڵ کرد.

**– سـوڵتان مـەحمودی غەزنـەوی و ئـەیاز وەك پاشـاو نـاوداری ئێـران پاڵـەوانی دەیان چیرۆکن، شاعیرانی کوردو ئێرانیش زۆر باسیان کردوون.**

# سیّ حیکایەتی ئەفسانەیی کوردی

کۆکردنەوە: دیمەن ناصح محمد

## ١. دەنکە هەنارە

هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو دوو کچی هەبوو لە دایکان جیا بوون، واتە یەکێکیان دایکی نەبوو، ڕۆژێك ئەو کچەی دایکی نەبوو چووە سەرکانی ویستی خۆی بشوات لەو کاتەدا بایەك هەڵی کردوو پارچەیەك خوری کەوتە پێشی، هەڵی گرت و بردی بۆ ناو ئەشکەوتیّ سەیری کرد پیرەیژنێك لەویّ یە خوری ئەڕێسیّ کچەکە ووتی: ئەوەخوریەکەتە پیرەژنەکەش زۆر دڵی پیّ خۆش بوو وەرە پرسیارێکت لیّ ئەکەم من جوانترم یان دایکت کچەکەش ووتی تۆ لەدایکم جوانتری، پیرەژنەکەش پیّ ی خۆش بوو پیرەژنەکەش کە سیحرباز بوو بەکچەکەی ووت: ئەگەر ئاویّ ڕەش هات خۆت مەشۆو مەچۆ ناوی بەلاّم ئەگەر ئاویّ سپی هات بچۆ ناوی، کچەکە پیرەژنەکەی بەجیّ هێشت و ئاوی ڕەش هات خۆی نەشوشت بەلاّم کاتیّ ئاوە سپی یەکە هات خۆی شوشت ئینجا زۆر جوان بوو چووەوەماڵ زڕدایکەکەی ی و خوشکەکەی زۆریان پیّناخۆش بوو کەکچەکە (بیّ دایکەکە) زۆر جوان بووە لیّ یان پرسی بۆ وا جوان بویتە ئەویش مەسەلەکەی بۆیان گێڕایەوە کچەکەی تر ویستی وەك ئەو جوان بیّ ئەویش چووە سەرکانی بۆخۆشوشتن بەهەمان شێوە پیرەژنەکەی بینی پیرەژنەکە پرسیاری لیّ ی کرد ووتی : من جوانترم یان دایکت کچەکەش ووتی:دایکم جوانترە لە تۆ پیرەژنەکەش پیّ ی ناخۆش بوو وتی ئەگەر ئاویّ سپی هات خۆت مەشۆ بەلاّم ئەگەر ئاویّ ڕەش هات خۆت بشۆ کچەکەش بەقسەی کردو چوە ناو ئاوە ڕەشەکەوە خۆی شوشت کتیّ دەرهات چوەوە ماڵ هموو دەموچاوی دومەڵ بوو. لەبەرئەوە ناوی کچەکەی کەیەکەم جار خۆی بەئاوە سپی یەکە خۆی شوشت و زۆر جوان بوو ناویان نا دەنکەهەنارە چونکە وەکو دەنکە هەنارە سووروجوان بوو بەلاّم کچەکەی تر کە دوەم جار خۆی بەئاوە ڕەشەکەشوشت ناویان لیّ نا دوگنە چارە چونکە دومەڵەکە زۆر ناشیرینی کردبوو. ڕۆژێکیان کوڕە پاشایەك هەبوو زۆر حەزی لە تۆپێن بوو لە پێش ماڵی دەنکە هەنارە یاری ئەکرد تۆپەکەی کەوتە ماڵی دەنکەهەنارەوە دەنکە هەنارە تۆپەکەی بۆی فریّ دایەوە کوڕە پاشا دەنکە هەنارەی بینی دڵی چوە سەری،کوڕە پاش چوەوە ماڵ بەپاشای وت دەبیّ ئەوکچەجوانەم بۆ بخوازی

پاشا چوو بۆ داخوازی دەنکەهەنارە باوکی دەنکەهەنار ڕازی بوو بەلاَم لێرە ماڵی کچەکە قێڵێکیان لە کوڕە پاشا کرد وتیان: دەنکەهەنارە زۆرجوانە زۆر کەس بۆ دخوازی دێ هەر ئەدرێتە شوو بەلاَم دوگنە چارەی کچیان ناشرینە کەس نایەتە داوای بۆیە بڕیاریان دا کەدوگنەچارە بدەن بەکوڕە پاشا، ڕۆژی ئاهەنگەکە دومەڵەکانی دوگنەچارەیان بڕی و تارایەکیان دایە بان سەرباو ناردیان بۆ کوڕکە لەوکاتەیا دەنکە هەنارەیان لەپشت کەندو شاردبۆوە، دەنکە هەنارە دوعای کرد وتی :خوایە بمکەیتە کەڵەشێرێ لە سەر سەربانی ماڵی کوڕە پاشا بقوقێنم.

لەوکاتەی دوگنەچارە هاتە ژوری ماڵی پاشا، کوڕەکە نەی زانی ئەوە دوگنە چارەیە کوڕەکە چوە لای دوگنەچارە لەوکاتەیا کەڵەشێرەکە کە (دەنکەهەنارە)یە قوقاندی ((قوقو قوقو قو دوگنەچارەیان دا بەشو، دەنکەهەنارەیان خستە پشت کەندو)) سێ جار وای وت، بەلاَم گوێیان نەدا پێی وتیان: ئەم کەڵە شێرە چیە بێنن سەری بڕین، سەریان بڕی و ئێسکەکەیان فڕێ دایە سەر زبڵخانە ئەو ئێسکە زۆرجوان بوو هەر بریقەی ئەهات ڕۆژێکیان پیرەژنێکی تر شتی خڕئەکردەوە لەسەر زبڵخانە ئەوپارچە ئێسکەی هەڵگرت و بردی یوە ماڵ و نایە پشت دەرگای ماڵی خۆیان کە ئەچوە دەرەوە بۆشت خڕکردنەوە کەئەهاتەوە، پێش ئەوەی بێتە ماڵەوە ئێسکەکە(کەبۆتەوە دەنکەهەنارە) خۆی ئەشاردەوە کە ئەهاتە ماڵەوە سەیری ئەکرد ماڵەکەی زۆرپاك و خاوێن و ڕێکە سەری سوڕ ئەما ئەی وت باشە ئەم ماڵە بۆ وا پاکوخاوێنە من ئەوها بەجێم نەهێشتووە، ڕۆژێکیان ویستی بزانێ ماڵەکەی چۆن وا پاك ئەبێتەوە لەکاتێکا ئەو بەپیسی بوجێ ی دێڵی پیرەژنەکە خۆی ئەشارێتەوە لەوکاتەیا کچێك ناوماڵەکەی بۆ پاك ئەکاتەوە پیرەژنەکە خۆی کرد بەژراو ووتی:من کەسم نیە مەسەلەکەی لەیەکەمەوە بۆی باس کرد کەچی بەسەرهاتووە ئینجا پیرەژنەکە کردی بە کچی خۆی.

دوایی پیرەژنەکە دەنکەهەنارە ئەباتەوە ماڵی پاشاو هەموو شتێکیان پێ ئەڵێ بۆیە کوڕەپاشادوگنەچارە دەرئەکات و دەنکەهەنارە شوبە کوڕە پاشائەکات وە ماڵی پاشاماڵی باوکی دەنکەهەنارە دەرئەکەن لەوێ ئینجا ژیانێکی خۆش *ئەبەنەسەرومناڵیان ئەبێ ئیتر ڕۆژێك باوکی دەنکەهەنارە بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان و دوگنەچارە بکاتەوە شێوەی خۆی ئەگۆڕی و خۆی ئەکا بەفەقیروماڵ بە ماڵ ئەگەڕێ و ماڵی دەنکەهەنارە ئەدۆزێتەوە دەنکەهەنارە نازانێ ئەوە باوکیەتی* بەلاَم باوکی ئەیناسێتەوە، وەباوکی دەنکەهەنارە ئەڵێ ئەتوانم ئەمشەو بمێنمەوە

لێـرە ئــەوانیش ئــەڵێن گوناحــە بابمێنێتــەوە، شــەو ئەمێنێتــەوە هــەمویان ئەخــەون بـــاوکی دەنکەهەنارەمناڵەکـــەی دەنکەهـــەنارە لـــەناولانك ســـەرئەبڕێ و ئـــەڕوا ئـــیتر دەنکەهــەنارە بــەیانی ئــەڵێ ئــەبێ بــۆ مناڵەکــەم لەخەوهەڵنەســێ کــاتێ ســەیر ئــەکا مناڵەکــەی ســەربڕاوە زۆر بــۆی ئــەگریێت بــەڵام دوایــی یــەکێك دێــنن کەلــەو شــتانە شـارەزایە سـەری مناڵەکـە بـە جیقنـە چـاك ئەکەنـەوە وەمـاڵی کـوڕە پاشـا مـاڵی بـاوکی دەنکەهــەنارە ئەدۆزنــەوەو تۆڵــەیان لێ ئەکەنــەوەو بــۆ هەتاهەتایــە بەخۆشــی ژیــان ئەبەنەسەر.

**– دەنکە هەنار زۆر شێوەی هەیە، ئـەوەی لێـرە سـەیرە بـاوك رقـی لـە کچـە بـێ دایـك ە جوانەکەیە ! !**

**٢– ئەحمەد**

هــەبوو نــەبوو ســێ بــرا هــەبوو ئەحمــەدو مەحەمــەدو مــەحمود بــوو بــەنۆرە یــەکیان شــۆرئەکردەوە بــۆ بیرێــك نــۆرە گەیشــتە ســەر ئەحمــەد، ئەحمــەد خــۆی ووتــی ڕام مەکێشــن دوای زۆر هــاواری کــرد ڕایــان نــەکێش ئــەمجا گوریســەکەی ئەحمــەد کەوتــە بـن حـەوت تەبەقـەی عـەرزەوە ئـەمجا ئەحمـەد چـاوی بەکچـێ کـەوت دێـوێ سـەری نابۆیــان باوەشــی کچــەکە، کچــەکەش باوەشــێنی ئــەکرد ئەحمــەد زلەیــەکی لــە دێوەکـەدا دێوەکـەش بەکچـەکەی ووت بـۆ ئـەهێڵی مەگـەز بمخـوا، ئەحمـەد بـە کچـەکە ئـەڵێ بـۆ باوەشـێنی ئەکـەی کچـەکەش بەئەحمـەدی وت ئـەم منـی بـردووە ڕاکـە هـەتا چـل براکـەی نەهاتونـە ئەحمـەد دێوەکـە ئـەکوژێ و ڕائەکاچـونکە چـل براکـەی دێ پـێش ئـەوەی بـڕوا کچـەکە پـێ ی ئـەڵێ: بـڕۆ دوبـەران واشـەرئەکەن یـەکێ سـپی و یـەکێ ڕەش خـۆت هەڵـدە بـان سـپی کـە ئەتباتـەوە سـەرزەمین کـاتێ ئەحمـەد خـۆی فـڕێ دا بـۆ بـان سـپی یەکـە کەوتـە بـان ڕەشـەکە حـەوت تەبەقـەی دیکـە بردیـوە ژێـر زەمــین لــەێ ئەچــێتە دێ یــەك چــووە مــاڵ پیرەژنــێ وتــی میمــی تــۆزێ ئــاوم دەیــە توێنیمـە پـیرەژن پێـی عەیبـە بڵـێ ئـاو نیـە میـزی داپێـی و کـوڕە خـواردی ووتــی ئــەم ئـاوە بـۆ سـوێرە ئـەویش ووتـی کـوڕم چیت لێ بشـارمەوە ئـەوە ئـاو نـەبوو شـتی تـر بـوو لەبـەر لەبـەر ئـەوەی ئـەژدیهایێ بـەری ئاوەکـەی گرتـووە هـەتا هەفتـەی جـارێ کچـێکی گـەنج نـەخوا ئاومـان نـاداتێ ئیمـڕۆ نـۆرەی کچـە پاشـایە کـوڕەش ووتـی مـن ئـەڕۆم ئەیفـەوتێنم ئەحمـەد دەسـی دایـە شـیرەکەی چـوو بـۆ لای ئەژدیهاکـە کچـە پاشـا هـات بـە ئەحمـەدی ووت ڕێـم دە نـۆرەم هـاتووە بـابمخوا دوایـی بـاوکم لـێم ئـەدا کچـەش سـینی یـەك خـواردنی پێیـە بـۆ ئەژدیهاکەئەحمـەد سـینی یەکـە لـە کچـەکە ئەسـەنێ شمشـێرەکەی حـازر ئـەکا کـە ئەژدیهاکـە دەم ئەگرێتـەوە بـۆ خـواردن

ئـەویش لەدەمیـەوە تـاکلکی ئـەیکا بـەدوو لەتـەوە ئـەمجا بـەقوڕو ئـاوو خـوێن تێکـەڵ ئـەبێ کچی پاشـا پەنجەیـەك خـوێن و قوڕاوەکـە ئداتـە پشـت ئەحمـەدو نیشـانەی ئـەکا ئـەمجا پاشـا ئـەڵێ کـێ ئـەو ئازاییـەی کـردووە؟ پاداشـتی ئەدەمـەوە. هـەموو یـەکێك لـە خـەڵکی ئـاوایی ئـەڵێ مـن کوشـتومە کچـی پاشـا ئـەڵێ بـاوە خـۆم ئـەزانم کـێ کوشـتویەتی نیشـانەم کـردووە کەکچـە ئەحمـەدی بـەباوکی نیشـان ئـەدا بـاوکی ئـەڵێ چیت ئـەوێ لـە مـاڵ و لـە زێـڕ مـەڕۆ عـەردو کـچ و هەرچیت ئـەوێ ئەتـدەمێ ئەحمـەد ئـەڵێ هیچـم نـاوێ بـەس بمبـەوە سـەر زەمـین پاشـا ئـەڵێ بریابـا حـەوت سـاڵ تـر کچمان بوخرابـە بـێ ئاوبوینایـە بـەس ئـەم قسـەیەت نەکردایـە پاشـا بەئەحمـەد ئـەڵێ بـڕۆ سـیمرخێ هەیـە لەسـەر دارێکـە هـەموو جـارێ بەچـکە ئـەکا بەچـکەکان پـەروازە ئـەبن حەزیایـەك دێ بەچـکەکان ئـەخوا بـڕۆ بزانـە ئـەو سـیمرخە بتـوانێ بتباتـەوە سـەرزەوی ئنجـا ئەحمـەد ئەچـێ ئـەو حەزیایـەش ئـەکوژێ ئینجـا سـیمرخەکەش دێـت ئـەڵێ کـێ ئـەم حەزیایـەی کوشـتوە پاداشـتی ئەدەمـەوە ئەحمـەد ئـەڵێ: هیچـم نـاوێ بـەس بمگەینـە سـەر زەوی ، سـیمرخەکە ئـەڵێ : خۆزیـا حـەوت سـاڵ دیکـە بوخرایـە بـەس ئـەم قسـەیەت نەکردایـە بـەڵام هەرئەتبـەم ئـەڵێ : بـڕۆ حـەوت کونـدە ئـاوو حـەوت کەلـەش حـەیوان بێنـە ئەحمـەد ئـەیانهێنێ و سـواری بـاڵی سـیمرخ ئـەبێ ئـەڕوا بـەرەو سـەرزەمین لـە کاتێکـا سـیمرخ هـەر ئـەڕواو ئـەڵێ توێنیمـە کوندەیـە ئـاوی ئـەداتێ ئـەمجا ئـەڵێ برسـیمەو کەلەشـی حـەیوانی ئـەداتێ لـەڕێ تـەواو ئـەبێ خواردنەکـەیان ، سـیمرخ ئـەڵێ برسـیمە ئەحمـەد هەنـدێك لـە ڕانـی خـۆی ئەکاتـەوەو ئەیداتـە سـیمرخەکە ، سـیمرخ گۆشـتی بنیادەمـە سـوێرە نـایخوا لـەبن زمـانی دای ئـەنێ کەئەگاتـە سـەرزەمین ئەحمـەد دائەبـەزێ خواحـافیزی لەیـەك ئەکـەن ئـەڵێ ئەحمـەد بـۆ ئەشـەلی ئـەڵێ پـام سـڕ بـووە سـیمرخەکەش ئـەڵێ : بـەخوا گۆشـتی تۆیـە لـەبن زمـانم ئـەڵێ هابیـدەوە قـەد ڕانـت ، ئەحمـەد ئەیکاتـەوە قـەد ڕانـی سـیمرخە کەزمانێکی پیادێنێ و چاکی ئەکاتەوە .

### ٣. سێ کچەکە

سێ کـچ ئـەبن دایکیـان ئـەمرێ بـەباوکیان ئـەڵێن : بـاوە ژن بێنـە باوکیـان ئـەڵێ هـەتا جـل وبەرگەکـەی دایکتـان نـەڕزێ ژن نـاهێنم ئـەمجا بێـوەژنێ ئـەڵێ جـل و بەرگـەکان بێـنن بـۆ لای مـن بۆتـان ئـەڕزێنم چـونکە ئەیویسـت شـو بـەباوکیان بکـات جلـەکانی دایکیـان پـڕ چـەوو لم ئـەکا ئەیداتـە عـەرزا هـەتا ئـەڕزێ ئـەمجا کچـەکان ئـەڵێن بـاوە جلـەکانی دایکـم ڕزا ژن بێنـە باوکـە ئـەڵێ : کچـەکان کـێ بێـنم فـلان بێـوەژن بێنـە کـە

ئەوەندەی خۆشە هەتا ئەیگوازنەوە ئەمجا ژنە ئەڵێ یان من نامێنم یان کچەکان لەم ماڵە نامێنن ئەمجا باوکەش بەناچاری هەرسێ کچەکەی ئەبا بۆ ئەو دەشتە ئەڵێ کچەکانم بابڕۆین بۆ دار ئەمجا هەتا دەنگی تەورەکەی من هات ئێوە دار بکەن ئەوسا خۆم بانگتان ئەکەمەوە ئینجا باوکی کودیەکی هێنا مێرویەکی کردە قەدی هەردەنگی ئەهات وایان ئەزانی دەنگی تەورەکەی باوکیانە دارئەبڕێ بەلاّم شەویان بەسەراهات باوکیان هەر دیار نەبوو ئەمجا گورگ هات ئەوانیش چونە بان دارێك بۆ بەیانی گورگەکە رۆیشت ئەوانیش کونێکیان لە عەرز هەڵدڕی و بە پەیژە چونە خوارەوە ماڵێکی زۆر خۆش بوو پڕ بوو لە کەندوی گوێزو مێوژو هێزە ڕۆن دانرابوو هەموو جۆرە خواردنێکی تیا بوو بۆخۆیان تێریان خواردو دوایش دێوەکە هاتەوەو وتی: بۆن دێ بۆنی بێگانان دێ لەم دەورو بانان دێ، کچەکان خۆیان لەپشت کەندو شاردەوە بەیانی دێوە هەستا نان کا ئینجا کچەکان هێرشیان کردە سەری و فڕێیان دایە ناو تەنورەکە دێوەش وتی: مادام وای لێ هات ها ئەوە کلیلی حەوت غورفە ئینجا دێوەش سوتاو کچەکان غورفەکانیان کردەوە هەر غورفەو شتێکی تیا بوو وەك ماین و کوڕی چواردە ساڵ و.......دوایش شویان کرد بە کوڕی پاشاو میر.

# خەجە شل و هەمبانە زێر

ئامادە کردنی: وەفا رەئووف ئیسماعیل

جارێکیان کیژو کاری گوندی خڕ بوونەوە بۆ دار کردن کردن بڕۆن وەڵلا لە داران بوون لەچیادا کاتەك هەندێ داریان کرد پاش نیورانەش چوون بۆ بڕەك حەسانەوە پاش حەسانەوە وتیان باتوزێ شایی بکەین دەستیان بە شایی کردن کرد ئاگایان لە چوونەوە نەما کاتێك سەیریان کرد دیتان ئەستێرە بە دیار کەوتیە دنیا تاریك داهات ولە لایەك حەپە حەپی سەگیان بۆ دەهات لە لایەکی ترەوە تروسکەیەك ئاگریان بینی وتیان بچین بۆ لای حەپە حەپی سەگەکەیان بچین بۆ لای تروسکە ئاگرەکە ؟ لە پاشان گوتیان دەچینە لای تروسکە ئاگرەکە بەلام نەیان دەزانی لای حەپی حەپی سەگەکە لای گوندی خۆیانە لە بەر تاریکی شەو بە هەر جۆرێك بێت چوونە لای تروسکە ئاگرەکە لە وێندەر تووشی (دیوێکی) گەورە هاتن و کیژو کارەکان زۆر ترسان و دیوێش چاوی بەو کیژو کارانە کەوت خەنی بوو بەلام تازە تووش بوون چی بکەن؟ دیو ووتی بۆخۆتان بنوون بەلام کچەکان لەترسان خەویان لینەکەوت (دێو) ووتی بۆ ئێوە نانون وتیان ئێمە لە مالەوە دایکمان برێشکەی بەگەنمی مانبۆ دەکات ئەویش هەستا بۆی کردن هەرنەنووستن (دیو) ووتی بۆ نانون وتیان تینیمانە ئەویش ئاوی بۆ هێنان ووتین ئێمە ئاوی لە (پێژینگی) دەخوینەوە دەبی کونی (بێژینکی) بە شەمێی ئەمانەش هەر بۆ ئەوەیان بوو (دێو) بڕواو ئەوانیش هەلێن (دێو) چوو پارچە شاخەکانی هێنابە کونی ئەشکەوتی وەنا دوای ئەوان سەبر سەبر پارچە بەردەکانیان لابرد و لە ئەشکەوت هاتنە دەرێ (کوندە دۆشاوەکیان) لە جێگایی خۆیان دانا (دێو) هاتەوە خەنی بوو ووتی نوستینە کاتیك (دێو) زانی هەلاتینە شێت بوو لە خەمان بەدوایان کەوت بەلام ئەوانی پێ نەگیرا یەکیکیان لێ بە جێ ما ئەویش (خەجەشل) بوو خوی شارد بووە (دیو) گرتی چونکە شەلە بوونەیتوانی رابکات (دێو) پاش چەند رۆژێك تەندوریکی دروست کرد وتی (خەجەشل) سوورت دەکەمەوە؟ بەلام (خەجەشل) هەرچەندە شەل بوو بەلام عاقل بوو خەجەشل بە دێو ی وت وەرەسەر تەندورەکە با

سەرت بڕۆنم پاریکە بە دێوە وەنا دێو مرد ورزگاری بوو خەجەشل و خوی (هەمبانە) کە زیرەکە گەرایەوە کە هاتەوە شەو درەنگ بوولە دەرگای دا ووتی من خەجەشلم دەرگایان لێ نەکردەوە باوڕیان پێ نەکرد بۆیە خەجەشل لە سەر هەمبانە زێڕی رەق بوە و مرد .

((هەبوو نەبوو))

هەبوو نەبوو کەچەریك هەبوو زۆر فەقیر بوو ئەو کەچەرە ئاششقی کچی ئاغابوو جارێکیان کەچەرەکە مریشکیك دەکرێ دەچێتە سەر گردێك دادەنیشێ وبیر دەکاتەوە کەچەر دەلێت ئەو مریشکە کەمن کڕیمە بەخێوی دەکەم تاگەورە دەبێت و هێلکەی دەکات و هێلکەکان هەلدەگرم تادەبنە مریشك و بەخێویان دەکەم و گەورەیان دەکەم دیسان مریشکەکان هێلکەی دەکەن و مریشکەکان ژمارەیان زوور دەبێت ئینجا من ئەو کاتە دەتوانم دەواجنیك بۆ خۆم دابینم ئەو جا من دەتوانم کچی ئاغا بینم کچی ئاغا لە پشتەوە گوی لەو قسانە دەبێت کچە ئاغا سەری سور دەمێنی و توورە دەبێت پارێك بە پیاوە کەچەرەکە و مریشکەکە دەنێ و کەچەرو مریشکەکان بەر دەبنەوە مریشکەکە دەکەوێتە بن چوکی کەچەرو هەندیکان ناو بیرێك واتە بیری ئاو کە لە نزیکی پیاوە کە چەرە کە بووە مریشکەکانی پیاوە کەچەرەکە هەمووی دەمرن کە چەریش دەچێتە لای ئاغی دەرێ ئاغا کچەکەت مریشکەکانی منی کوشت ئاغاش دەلێ باشە پارەت دەوێ یان مریشکت دەمێ کەچەریش دەلێ نەپارەم دەوێ نە مریشك بەو شتانە راوی نابم دەرێ من بەس مریشکی خۆم دەوی ئەگەر نا کچەکەتم بدێ ئاغاش تازە مریشکی خوی لۆلەکوی بیتەوە مردیە تازە ناچار بوو کچەکەی خوی بداتە کەچەر لە ئەنجام دا کچی ئاغا بوو بە خێزانی کەچەر .

((بووك و خەسوو))

دەگێرنەوە دەڵێن بووکێك و خەسوەك هەبوو زۆر ناکۆك و بە ینیان ناخوش بوو خەسووەکە زۆر رەزێل و چاو چنۆك بووە رۆچیکیان سەفەر دەکات بو شوێنیکی دوور هەندێك کەرەی (زبدە) لەماڵ دەبێ دەیکاتە ناو کەرەوان کەئەو کەرەوانە (لە پیستەی ئاژەڵ دروست کراوە) و زبدەکە بە قەد دیوارە بەداری

وەزێـر کەرەدانەکـە بـەقوور سـواغ دەدات بـۆ کـەرێ یەکـە پێـی بزانـێ . بووکـە کـەش چـونکە زۆری حـەزی لـە کـەرەێ بـوو زۆر فکـری دەکـردەوە بـۆ ئـەوەی بـە هـەر جۆرێـك بگـات بەکـەرەێ یەکـەو بیخـوا خەسـووەکەی پـێ نـەزانێ کـە ئـەو نزیـك بەکـەرەێ بـووە تـا گەیشـتە ئـەو بریـارەی کـەی کەرەکـەی خۆیـان بهێنـێ . سـواری پشـتی کەرەکـە بـوو و هێـدی هێـدی چـووە لای کـەرەدان ولێـی نزیـك بـووە و چـەنگێکی لێ دەرهێنـا کاتێـك خەسـووەکە هاتـەوە سـەیری کـرد گـووتی (سـم سمـی کەرەو چەنگك چەنگی مەیاسە سەرم سورمایە لە باس وخواسە).

- دروسـت بـوونی پەنـد و پەیدابوونی قسـەی نەسـتەق لـە ئـەنجامی کـار و ژیـان و ڕووداوەکانـەوە سـەر هەڵـدەدەن، بۆیـە هـەر پەنـد و گۆتـە و قسـەیەکی نەسـتەق ڕووداو و چیرۆکی خۆی هەیە وەك ئەم ڕووداو و قسە نەستەقە.

# شێتۆکە و ئاقلۆکە

**کۆکردنەوەی: شیلان محەمەد چژنی**

دوو برا دەبن لە لادێیەك یەکێکیا شێتۆکەیە ئەوی تریان ئاقلۆکە، کە دایك و باوکیان دەمرێ لادێیەکەیان بەجێ دێڵن و دەچنە لادێیەکی تر و دەچنە ماڵێك دەڵێنە ساحێب ماڵەکە کە شوانتان ناوێت؟ ساحێب ماڵەکەش دەڵێ بەڵێ شوانمان دەوێت. هەردوو برایەکە شێتۆکە و ئاقلۆکە لەلای خۆی دەیان کات بە شوان، ساحێب ماڵەکە گوتی: بڕۆن ئالیکی بدەن بەو ولاغانە شێتۆکەش دەچێت سەری گایەکانی بڕی و سەرەکانی لەناو ((کا))یەکە ناو ئاقلۆکە هات گوتی: شێتۆکە بۆ سەری ئەم گایانەت بڕیوە؟ شێتۆکە گوتی: ئاخر تاکو باش بلەوەڕن ئەوها نەبێت هیچ ناخۆن ئاقلۆکەش گوتی: وەرە با بڕۆین هەتاکو ساحێب ماڵەکە نەیکوشتووین شێتۆکە و ئاقلۆکە ڕۆیشتن و ئەم دێیەیان بەجێ هێشت چون بۆ دێیەکی تر تووشی ماڵێکی تر هاتن لە پیاوەکەیان پرسی ئەرێ مامە شوانت ناوێت؟ پیاوەکەش گوتی: بەڵێ شوانم دەوێت بوون بە شوانی پیاوەکە، بەیانی مەڕەکانیان برد بۆ لەوەڕ تا نیوەڕۆ ئاقلۆکە گوتیە شێتۆکە زۆرم برسییە بڕۆ نانی بێنە شێتۆکەش چووە ناو گوندەکە نانێکی زۆری هێنا، لە ڕێگا بینی زەوی درزی بردووە لەهەر درزێك پارچە نانێکی لەناو درزەی زەویەکە دەنا کە هاتەوە ئاقلۆکە گوتی: شێتۆکە ئەوە بۆ نانت نەهێناوە؟ شێتۆکە گوتی: نانی چی دایك و باوکم لە برسان دەمی خۆیان کردبۆوە و منیش نانەکانم هەموو لە دەمیان کرد ئاقلۆکەش گوتی: باشە وەرە شێتۆکە تۆ لەلای ئەو مەڕانە بە منیش دەچم خواردنی دەهێنم. چووە ناو لادێکە و خواردنی هێنا و لە دوورەوە بینی هەموو مەڕەکان کەوتوونەتە سەر زەوی ئاقلۆکەش گوتی: باشە دەبێ ئەم مەڕانە بۆ وا کەوتینە سەر زەوی گوتیە شێتۆکە ئەوە ئەو مەڕ و بزنانە بۆ وایان لێهاتووە؟ شێتۆکە گوتی: ئەوە گیای ناخۆن منیش سەری هەموویانم بڕی هەتاکو بلەوەڕێن ئاقلۆکە گوتی: وەرە با بڕۆین ئەم دێیەشیان بەجێ هێشت و ڕۆیشتن لە ڕێگا شێتۆکە ورچێکی کوشت و بینیان وا قافلەیەك لە دوورەوە دێن و خەڵکێکی زۆرن بە پاشا و وەزیر و زێڕێکی زۆریشیان پێیە ئاقلۆکەش بە شێتۆکەی گوت با بڕۆینە سەر داری شێتۆکەش گوتی: من ئەو ورچەش لەگەڵ خۆم دێنم بە هەر حالێك ورچەکەیان

بەسەر دارەکە خست قافلەکەش هاتن لە ژێر سێبەری دارەکە دانیشتن ئەوان لە کەیف و سەیف دابوون شێتۆکە گوتی: ورچەکە فڕێ دەدەم لەسەر دارەکە ورچەکەی فڕەدا خوارەوە خەڵکەکەش گوتیان ئاسمان ڕووخا هەر یەکە هەڵات هەندێك لە ترسا زمانیان شکابوو تەنها دوو کەس مابوونەوە ئەم دوو کەسەش شەلە و کۆرە بوون بەولا و بەولای دەکەوتن شێتۆکە گوتی: بەخوا هەر زمانی کابرای دەبڕم شێتۆکە هەڵسا زمانی کابرای بڕی ئاقلۆکەش زێڕ و لیرەکەی هەموو لەناو لە هەگبەی کرد و دوو هەگبەی پڕ کرد شێتۆکەش تیرەی خۆم پڕ کفتە دەکەم ئینجا بەیەکەوە سواری دوو ولاغ بوون و ڕۆیشتن، ڕێگاکە زۆر دوور و درێژ بوو، ئاقلۆکە لە ڕێگا زۆری برسی بوو گوتی: شێتۆکە کفتەکم بدێ. زۆرم برسییە، شێتۆکەش گوتی: ئەگەر زێڕەم لەگەڵ دەکەیە نیوە ئەگەر نا کفتەت نادەمێ تۆزێکی تر ڕۆیشتن ئاقلۆکە زیاتر برسی بوو ناچار ڕازی بوو کە زێڕەکەی لەگەڵی بکاتە نیوە شێتۆکە گوتیە ئاقلۆکە: دەوت بکەوە. کفتەیەکی لەناو دەمی نا وەخت بوو ئاقلۆکە بخنکێ کە گەیشتنە لادێیەك شێتۆکە گوتی: ئاقلۆکە با زێڕەکەی بکەینە نیوە. ئاقلۆکەش گوتی: شێتۆکە بڕۆماڵی ئاغای رووبەی بینە با زێڕەکە بەش کەین شیتۆکەش چوو رووبەی لە ماڵی ئاغای بینی بەڵام ئاقلۆکە پێی گوت: کەوا لەلای کەس نەڵێ زێڕ و لیرەی پێ بەش دەکەین دوایی ئاغا زێڕەکەمان هەمووی لێ دەستێنێت شێتۆکە گوتی: باشە هەرکە گەیشتە ماڵی ئاغا لەکن دەرگا گوتی: ئاغەژن ئاغەژن رووبەم دێ پانپانۆکەی پێ دەپێوم ئاغەژن زۆر زیرەك بوو چوو سەرکە بنیشتێکی هێنا بەبنی رووبەکەیەوە نا شێتۆکەش رووبەی هێناو لەگەڵ ئاقلۆکە لیرەکانیان بەش کرد و رووبەی بردەوە بۆ ئاغەژن ئاغەژنیش تەماشای بنی رووبەکەی کرد کە پارچە زێڕ بە بنیشتەکەی بنی نووساوە. چووە لای ئاغا و گوتی: دوو پیاو هاتوونە لادێ لیرەی گەلەك زۆریان پێیە و بە رووبە زێڕیان پیوایە ئاغاش چوار پیاوی خۆی نارد و گوتی: بەیانی هەردووکیان بێنە ماڵی ئێمە. ئاقلۆکەش گوتی: بە خوا شێتۆکە ئاغا دەمان کوژی با بچین سەری ئاغای ببڕین درەنگانی شەو شێتۆکە و ئاقلۆکە خۆیان کردە ماڵی ئاغا و سەری ئاغایان بڕی شێتۆکە گوتی: بە خوا سەری ئاغا دینمە ماڵەوە سبەی بە خەڵکی دەڵێم من سەری ئاغام بڕیوە ئاقلۆکەش زانی شێتۆکە ئەم کارە هەر دەکات گوتی: شێتۆکە با ئەمشەو زوو بخەوین بەیانی زوو هەڵسین ئاقلۆکە بەقەستی خۆی نواند تا شێتۆکە خەوی لێ کەوت ئینجا ئاقلۆکە هەڵسا سەری بزنێکی بڕی و لە شوێنی سەری ئاغای دانا و سەری ئاغاشی لە ژێر زەوی شاردەوە بەیانی بوو بە هەراو هۆریا

گوتیـان سـەری ئاغـای بـڕاوە شـێتۆکەش پـڕی دا سـەری بـزن و ڕایکـرد چـووە نـاو خـەڵك گـوتی: مـن سـەری ئاغـام بڕیـوە خوڵکەکـەش گرتیـان زۆریـان لێـدا و گوتیـان ئەمـە سـەری ئاغایـە یـان سـەری بزنـە ئاقڵۆکـەش گـوتی: شـێتۆکە بـا لـە ئێسـتاوە لـە یـەکتر جیـا بینـەوە زانـی ئەگـەر لەگـەڵ شـێتۆکە بەیەکـەوە بـن بـە هیلاکـی دەبـات بۆیە لە یەکتر جیا بوونەوە هەر یەکە و بە لایەکدا ڕۆیشتن.

**– ژیـان وەك ئـەوەی کـاری ڕێـك و جـوانی تێدایـە، هێنـدەش کـاری نامـاقووڵی تێدایە، ئەمەش لە نێو حەکایەتان ڕەنگ دەداتەوە.**

**پیرەژنە سحربازەکە**

دایـك و بـاوك و کچـێك دەبـن، کچـەکە نـاوی فاتمـە دەبێـت دایکـی فاتمـە دەمرێـت دوای ماوەیـەك بـاوکی ژنێـك دەهـێنێ، ئـەم ژنـە لەگـەڵ فاتمـە زۆر خـراپ دەبێـت و زۆر ڕقـی لـە فاتمـە دەبێتـەوە بۆیـە بـە بـاوکی فاتمـە دەڵـێ ئـەم کچـە لـەماڵ دەرکـە، بـاوکی فاتمـەش دەڵـێ کچـم وەرە بـا بچینـە داران دەچـن داری دەکـەن بـاوکی فاتمـە دەڵـێ: مـن دەچـم لـە شـوێنێکی تـر دار کۆدەکەمـەوە تـۆ لێرەبـە مـن ئێسـتا دێمـەوە، بـاوکی دەڵێتــە کچـەکە بـانگم بکـە منـیش وەڵامـت دەدەمــەوە باوکەکـە دەنگـی خـۆی لـە کودیلـە دەکـا کچەکە هـەر دەڵـێ بابـە کودیلەکـەش دەڵـێ ((هـۆ)) تـا شـەو دادێـت کچـەکە هـەر بـانگی بـاوکی دەکـات کودیلەکـەش هـەر دەڵـێ هـۆ کچـەکەش دەچـێتە لای بـاوکی دەبـینی بـاوکی لـەوێ نـەماوە بـەجێی هێشـتووە کودیلەیـەکی بــە دارێــوە کردیــە و فاتمــەش دەڕوات هــەر دەڕوات تــا دەگاتــە ڕووناکایــەك دەبینێـت وا پیرەژنـە دێوێـك دانیشـتووە ڕووخسـارێکی ناشـرینی هەیـە خـۆی دێـوە بـەلأم خـۆی کردۆتـە پـیرەژن کچـەکەش هاتـە ژوورەوە نـاو ئەشـکەوتەکە سـەیری ئــەملاو ئــەولای کــرد هــەمووی ســەلکە بەشــەر بــە دارێــوە کرابــوون زۆر ترســا و گـوتی: خودایـە چـۆن ڕزگـار بم پێشـی بـەیانی زوو هەڵسـا و شـتە سـیحرییەکانی پیرەژنەکـەی لەگـەڵ خـۆی بـرد هیچـی بـۆ نەهێشـت لیفکـە و شـە و سـابون و تەشـتی لەگـەڵ خـۆی بـرد گـوتی: دەچـم سـەرم دەشـۆم ژنـە سـیحرەکەش گـوتی: ئـاوم بـۆ بێنـە بێـژینگێکی دایـە و گـوتی: خـۆت ئـاوم بـۆ بێنـە فاتمـەش هـەر ئـاوی تێـدەکرد لەبـەر کـونی بێژنگەکـە پـڕ ئـاو نـەدەبوو بۆیـە زانـی ژنەکـە فێڵـی لێـدەکا و ڕایکـرد دێوەکــەش زانــی کچــەکە ڕایکــرد بــەدوای کــەوت و بــەلأم ژنــە دێوەکــە شــتە سـیحرییەکانی پـێ نییـە و کچـەکەش لیفکەکـەی بـۆ دەهـاوێ و هـاوار دەکـا دەڵـێ خودایـە ئـەو دار و بـەردەی هـەمووی لـێ بکەیتـە دڕك و زی و پیرەژنـە دێوەکـەش

بەهەر حاڵێك خۆی ڕزگار دەکات و ئەم جارە کچەکە سابوونەکەی بۆ دەهاوێ و دەڵێ خودایە ئەو شوێنەی بکەیتە لووسایەك بە هیچ شێوەیەك ڕزگاری نەبێت ئەم شوێنە ئەوەندە لووس دەبێت پیرەژنە دێوەکەش هەر دەڕوات هەر دەخزێ و بەردەبێتەوە و هەڵدەستێتەوە بەڵام ئەم جارەش هەر ڕزگاری دەبێت کچەکە ئەم جارە شەیەکەی دەهاوێت ئەو شوێنە دەبێتە داروبارێکی زۆر سەخت بەڵام پیرەژنەکە لەویش ڕزگاری دەبێت کچەکە ئەمجارە تەشتەکەی داوێت دەبێتە زێیەك و بەحرەك پیرەژنە دێوەکە دەڵێتە کچەکە ڕۆڵە گیان چۆن ڕزگار بویت لەم زێیە فاتمەش دەڵێ من دەستارێکم هێنا و گوریسێکم تێیەخست لە ملی خۆم کرد و پەڕیمەوە ئەتۆش وابکە دەپەڕیەوە پیرەژنەکەش وەکە کچەکەی دەکات نوقمی ناو ئاوەکە دەبێ و کچەکە لەم پیرەژنە دێوە ڕزگاری دەبێت و هەر دەڕوات تا دەگاتە شوێنێکی زۆر خۆش خانوویەکی زۆر خۆش و کە شەو دێ ئەو هەموو شوان و مەڕ و ماڵاتە هاتەوەفاتمەش خۆی لەپەنا کەندوویەکی ناو خۆی دەشارێتەوە سەیری کرد سەرپەرشتیاری ئەم هەموو مەڕ و ماڵاتە لە ژێر دەستی مەیموونێکە فاتمە شەو گوێی لە مەیموونەکە دەبێ و دەڵێتە خۆی ئەم شەو خۆت پیس نەکەی دەتهاوێمە ناو تەندووری فاتمەش کە زانی ئەوهایە شەو هەڵساوە یەك تەشت لۆرکەی گرتەوە و لەناو شەرواڵی کرد و پارچە گوریسەکی خستە ناوی مەیموونەکە کە بەیانی هەڵستاوە گوتیە خۆی ئەوە خۆت پیس کردووە فاتمەش پێش وەخت تەندووری سوور کردبۆوە مەیموونەکە ویستی خۆی لەسەر دابنێ فاتمەش ڕاست پاڵێکی پێوەناو خستیە ناو تەندووری ئینجا فاتمە بوو بە خاوەنی ئەم هەموو ماڵ و موڵکە.

- شێتۆکە و ئاقڵۆکە، بەشێوەیەکی تریش دەگێڕدرێتەوە لە دەقەکانی تر، زۆرتر شێتۆکە - گێلۆکەیە - لێرە زۆرتر تاوانکارە.

- پیرەژنە سحر بازەکە، ئەفسانەیەکە شتی تازەی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە باوکەکە بۆ ئەوەی کچەکەی بە هەڵە ببات، دەنگی خۆی -لە کودیلە دەکات- وەك ئەوەی بڵێ لە تەسجیل تۆماری دەکات، هەرچەند کچە بانگی باوکی دەکات کودیلە بە دەنگی باوکی وەڵامی دەداتەوە. ئەم کارەش لە تۆمار کردنی دەنگ دەچێ و وەڵامدانەوەکەش بەشێوەیەکی بەردەوام هونەرێکی ترە کە ئێستا تەکنەلۆجیای زانست ئەم کارە دەکات.

# مەلا ژنیٚ نۆبەت چەقە

**کۆکردنەوەی: تاڤگە تەیب عومەر**

**گێڕانەوەی: پورە خەجیج**

**(شێوەزاری خۆشناوەتی)**

ئەگێڕنۆ وارێن مەلایەکی دوو ژن هەبووینە، ئەو دوو ژنانە مەلاژن بوینە کەیفیان بە ئێکدی نەهاتیە. ئەو مەلاژنانە کردبووە سەرە ((نۆبەت)) خرِ ڕۆژێ ئێکەك ئیشی یەکردو ئەوی دی چەقەچەقیە کرد ئێجە دوایێ بووە شەڕیان. ئەوی ئیشیە کردن چی پیێ نەکرا هەر جوینی ئەدان، ئەوی ئیشی نەئەکرد یادەبا جوێنی دابانە جوێنی وی و خۆی کرِ کردبا یا دەبا چەقەچەقی دەگەر کردبا. ڕۆژەچی فەقێیەك هاتە مارێیان ئێجە ئەو فەقێیە ئیشیێ دەرێی لۆ ئەکردن. فەقێی گۆتە مەلاژنیێ گەورە گۆتی خێرتەگاتیێ کۆرەکم لۆ بکە گەلە دژونم ئاوێم لۆ گەرم کە خۆشۆم جلکانیشم لۆ بشۆ خێرتەگاتیێ.

بەران مەلاژنیێ گەورە گۆتیە فەقیێ برا ئەورۆم نۆبەت چەقەیە پێم ناکریێ. فەقێی گۆتە مەلاژنیێ ئێجە چیە ئەورۆ ئەمن لەباتی توو لە نۆبەت چەقەی دائەنیشم ئەتۆش لۆ من کۆریێ گەرم کەو هەڕوە بەر کۆریێ.

مەلاژنیێ گۆتە فەقێی باشە بەران کو وابی برا. گۆتیێ ئەبی ئەبی. ئێجە فەقێش هەستا جلچیێ مەلاژنیێ گەورەی دەبەرکردن و چوە ناوەندیێ ماریێ دانیشت خۆی حازر کردبوو لۆ چەقەچەقیێ مەلاژنیێ گچکە. لە مەلاژنیێ گچکە وابی ئۆ مەلاژنیێ گەورەیە دانیشتیە نەشی زانی ئۆوە فەقێیە و خۆی کردیتە مەلاژنیێ گەورە و جلچیێ وە دەبەرکردینە.ئێجە مەلاژنیێ گچکە دەستی بە جوینان و دوعایان کرد هەرچی هاتە سەر زاری نەی جێراوە و بە مەلاژنیێ گەورەی گۆ: بەران فەقیێ خۆی کرِ کردبوو هیچ دونجی لێوە نەدەهات و جوابی نەئەداوە و پشتی لیێ کردبوو. مەلاژنیێ گچکە گۆتی: ئەریێ ئەمن هەندە جوینانەت ئەدەمیێ ئەتو لۆ جوابێم نادەیۆ لۆچ دەنگان ناکەی؟ فەقێش خۆ بێدەنگ کردبوو چ جوابانی نادا تۆ مەلاژنیێ گچکە لە خەفەتان کە ئەبینی مەلاژنیێ گەورە خۆی لەبەر کڕکردیە و هیچی دانانیێ لە خەفەتان وەزگداو ئەمری. چونکە مەلاژنیێ گچکەی حەزی لێبوو مەلاژنیێ گەورەی

جـوابی چەقەچـەقێی بـداتێو دەگـەری وێراچـی چـونکە خـڕ ڕۆژێیـان جـوابی ئێکـدی ئەداو ئیللا ئەو ڕۆژی نەبی.

## پیستە گۆلك

ئـەجیرێو ئـەرێن پیرەژنەچـی سـیَ کـوڕ هەبووینـە هەرسـیَ کـوڕ وەخـتی ژن هینانیـان بـووە. ئێجـە پـیرەژن هەرەسـتی ژنـی لـۆ کـوڕی گـەورە دیـنی ئێجـە بـە ئـەمری ئـەو خوایـەی شـەویَ زاوا ئـەمری. دوایـیَ پـیرەژن هەرەسـتی لـۆ کـوڕیَ نـاوەنجی ژنـیَ دیـنی ئەویش بە ئەمری ئەو خوایەی ژنی لۆ دیتە بەر ماریَ و ئەمری.

مـاوە کـوڕیَ ئـاخیری ئـیَ گژکـە ئـیَ سـێیەمینی بـوو. ئێجـە مـامیَ ئـەو سـیَ کوڕانـە وارێتـە براژنـیَ خـۆ ((پیرەژنـیَ)) واریَ نـابی ئـەو جـارەی ئـەتو ژنـیَ لـۆ کـوڕی گچـکەی بـینی ئـەوجارەی ئـەمن بـەخۆ لـۆی دیـنم. مـامیَ کـوڕەی چـیژیَ خـۆی ئـەداتیَ ئێجـە گواسـتیانێو. هـەر نیـو سـەعاتی دەگـەردا بـوو عـەملی لـیَ پەیـدابوو بـە ئـەمری ئـەو خودایەی ئەویش مرد.

ئێجـە ژنـە نـۆ مـانجی خـۆی تـەواو کـرد وەخـتیَ منـدار بونێی داهـات. گۆتیـە داچـیَ خـۆی دایـیَ چـم بـووە لـۆچ دەنگـان ناکـەی زاری هـەر نـاگری وەبـریَ دوایـیَ گۆتیـە خەسـویَ خـۆ گـۆتییَ چـم بـووە مـامۆژن. خەسـوێش گـۆ ماچـبریم ڕۆرە پیسـتەکت بـووە.ئێجـە هەسـتان چـەقوویان لـە پیسـتەی داو بریـانێو دیتیـان حـەفت فەرخـەی تێـدا بـوون خـڕ وچـی فەرخـە زەنگەتـەی بـوون ئـیللا یەکـەك گـەورە بـوو دەناویـان دا ئـەوانی دی مـردن ئـەوی گـەورە و سـاخەکەیان بـەخێو کـرد بـویَ کـوڕ بـوو داپـیریَ ئـەو منـدارەی گۆ بـا نـاوی لـیَ نـێین ناویـان لـیَ نـا ((پیسـتە گۆلـك)).دوایـیَ کـوڕ گـەورە بـوو ئیشـی کـرد پارەچـی باشـی پەیـدا ئـەکرد بـە حـەراری داك و داپـیریَ خـۆی بـەخێو ئـەکردن گەلە بە وەفا و بە ئەمەك بوو.

ڕۆژەچـی گۆتیـە داپـیریَ خـۆ نـەنیَ هـانی پـارەت دەمـیَ لـۆ خـۆ بـڕۆ حـەجیَ ئێجـە پیرەژنیَ بە پاریَ پیستە کۆلچی حەج کرد.

((ئەوە بەسەرهاتی ڕاستەقینەیە))

- کۆکـەرەوەی ئـەم حەکایەتـە نووسـیویەتی: (ئـەوە بەسـەرهاتی راسـتەقینەیە) خـەیاڵی رەشـە خەڵکەکـە زۆر ئامادەیـە کـە کـارە خەیاڵیـەکان بـە ڕاسـت بزانـیَ، لـەوەدا زۆر جـار خوێنـدەوارو ڕۆشـنبیریش دەکەونـە نـاو ئـەم چـوار چـێوەیە، ئەوەتە کۆکەرەوەکە خوێندەوارەو قوتابی زانکۆیە ئەمە بە راست دەزانیَ!!

# گەنج ساڵح

**کۆکردنەوەی: گوڵستان حەیدەر محەمەد**

**ئارمیش گەنج ساڵح**

لە سەردەمێکدا لە وڵاتێکدا کابرایەکی فەقیر و هەژار هەبوو، لەگەڵ خێزانەکەیدا ژیانێکی ئاسایی و هەژاری دەبردە سەر، ئەو کابرایە ڕۆژانە ئیش و کاری ئەوە بوو دەچووە دارستان داری کۆدەکردەوە بژێوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی بەو کارە بە ڕێکوپێکی پەیدا دەکرد.

ڕۆژێک لە ڕۆژان کابرا چوو بۆ دار کۆکردنەوە لە دارستان خەریکی بڕینی بنە دارێک بوو، لەناکاو لەو بنە دارە خەزێنەیەکی گەلێك زۆری دیتەوە. نەیزانی چ لەو خەزێنەیەی بکات. هەستا بادەك لەو خەزێنەیەی هەڵگرت و هاتەوە ماڵی خۆی. کابرای هەژار کەوتە بیرکردنەوە لە خەزێنەکە، لەگەڵ خۆیدا دەیگوت من نازانم بە تەنیا چ لەو خەزێنەیە بکەم بەهەر شێوەیەك بێت لەمن ئاشکرا دەبێت. بەڵام باش ئەوەیە من بچم خۆم لەگەڵ وەزیردا بکەمە شریك و بۆ من و وەزیر خەزێنەکە بە نیوە بێت. شەوێ کابرای هەژار چووە دیوەخانی وەزیر... هەتا درەنگی شەو لە دیوەخانی وەزیر دانیشت، تا دیوەخانی وەزیر بە یەکجاری چۆڵ نەبوو هەر هەڵنەستا وەزیر پرسیاری لە کابرای فەقیر کرد، ئەرێ تۆ ناوت چیە؟ شەو درەنگی کردووە و وەختی نوستنە: کابرا گوتی: وەزیرم خۆش بێت من کارێکم هەیە، من هاتوومە تا پێت بڵێم من خەزێنەیەکم دۆزیوەتەوە و من دەمەوێ بۆ من و تۆ بێت بە نیوەیی وەزیر لەگەڵ کابرای هەژار ڕێکەوت. بڕیاریان دا بەیانی پێکەوە بچن ئەو خەزێنەیە بۆ خۆیان بێننەوە. کاتێك ڕۆژهەڵات وەزیر و کابرای فەقیر بەڕێکەوتن. چوون بۆ هێنانەوەی خەزێنەکە. ئەم خەزێنەیە نزیکەی حەفت بار و نیو بوو. وەزیر زۆر بە تەماع بوو بە کابرای هەژاری گوت: با پێنج بار بۆ من بێت چونکە من میوانم زۆر دێت و دیوەخانی من زۆر قەڵەباڵغە. با دوو بتر و نیویش بۆ تۆ بێت ئەم دوو بارە نیوەی بەشی تۆ دەکات و دەتوانی ژیانی خۆت و خێزانەکەشتی پێ بەریتە سەر. کابرای هەژار ڕازی بوو دیسان بەڕێکەوتنەوە جارێکی تر وەزیری بە تەماع گوتی: ئەی فەقیر ئەتۆ چ لەو زێڕ و پارە دەکەی با بارەك و نیو بۆ تۆ بێت و ئەوی تر بۆ من بێت چونکە من زۆر پێویستیم بەو زێڕانە هەیە. بەڵام، تۆ چی لێ دەکەیت. ئەوەندەی بۆت ماوەتەوە هەتا تۆ مابیت لە ژیاندا بەشت

دەکات. کابرای هەژار دیسان ڕازی بوو. هەندێکی تر لە ڕێگادا چوونە پێش و دیسان وەزیر گوتی ئەی هەژار با بارەك بە تەنیا بۆ تۆ بێت بەشت دەکات هەتا هەتایێ کابرای هەژار ڕازی بوو. ئیدی تا گەیشتنەوە ئاوایی وەزیر بە شەش بار و نیو ڕۆیشتەوە ماڵی خۆی. کابرای هەژاریش بە نیو باری خەزێنەکە گەیشتەوە ماڵێ. ژنی کابرای هەژار لە کابرای پرسی؟ کوا خەزێنەکە بۆچی بە دەستی بەتاڵێ هاتیەوە؟

کابرای هەژاریش باسەکەی لە سەری تا خوارەوە بۆ ژنەکەی گێڕاوە و پێی گوت وەزیر ئەوەی تری هەمووی بۆ خۆی برد. ژنی کابرای فەقیر زۆر تووڕە بوو بە کابرای ووت ئێستا دەچیتە لای وەزیر بەشی خۆت لە خەزێنەکە هەموو دەینیەوە هەتا نشیهینیەوە نایەوە ماڵێ. کابراش هەستا جارێکی تر چووە دیوەخانی وەزیر. تا دیوەخان چۆل بوو هەر هەڵنەستا. وەزیر لێی پرسیەوە: کابرا تۆ ناچیەوە ماڵی خۆت شەو درەنگی کردووە و وەختی نووستنە.کابراش گۆتی وەزیرم خۆش بێت من چوومەوە ماڵێ ژنی من زۆر تووڕە بوو بە منی ووت دەبێت بیتە لای وەزیر و بەشی خۆت لە گەنجینەکە هەموو بهێنیەوە بۆیە هاتوومە تا بەشی من لە گەنجینەکە بدەیەوە. وەزیر زۆر تووڕە بوو لە کابرای فەقیر. شیری خۆی دەرهێنا و سەری کابرای فەقیری بڕی. وەزیر لەبن تەختی خۆی ژێر زەمینی دروست کردبوو لاشەی کابرای فەقیری خستە ناو ژێر زەمینەکە تەختەکەی خۆی خستەوە سەر ژێر زەمینەکە. لەو کاتەدا ژنی کابرای هەژار دووکیان بوو. ڕۆژان بەسەرچوو ژنی کابرای هەژار کوڕەکی بوو ناوی لە کوڕەکەی نا ((گەنج ساڵح)).

ئەو کوڕ وەك منداڵی ئاسایی نەبوو زۆر زیرەك و بەهێز و خاوەن شان و تێگەیشتی بوو. کاتێك تەمەنی کوڕەکە گەیشتە حەفت هەشت ساڵان هەستا هەموو منداڵانی ئاوایی لەخۆی خڕ کردەوە و ڕۆژانە تەمرینی پێێ دەکردن لە بەرامبەردا هەریەکی بڕێك پارە یان زێڕێکی یان هەر شتێکی تر با پێیانی دەدا. هەتا وای لێهات هەموو منداڵان هۆگری گەنج ساڵح بوون بوونە لایەنگری ئەو تەنانەت کوڕی وەزیری پاشاش بووە لایەنگری گەنج ساڵح. ڕۆژان بەسەر چوو ئەو لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو ئەو سەردەم سەردەمی ئەسپ سواری و شمشێربازی و ڕاو و نێچیر و هێز و توانایی بوو، کاتێك وەزیر سەیری کرد منداڵەکان هەموو هۆگری گەنج ساڵح ببوون و کە ئەو بابی کوشتییە و بیری کردەوە جا لەسەر بیرکردنەوە وتی هەتا نەبویتە درەنگ با کارێك بکەم نەوەك ئەو کوڕە بزانێت کە من بابی ئەوم کوشتیە. پاشان تۆڵەی باوکی بکاتەوە.

وەزیــر هەســتاو ڕۆیشــتە لای پاشــا و گــوتی: پاشــای ئــازیز گــەنج ســاڵح هــەموو منــداڵانی ئێمــەی لەمــە کردیــە و ئــەو منداڵانــە گوێڕایــەڵی ئێمــە نینــە. هــە لــە بەیانییــەوە دەڕۆنــە دەرێ تــا درەنگــی ئێــوارە نایەنــەوە. یــەك لــە مــاڵ نییــە تــا بــەرداخێك ئاومــان بــۆ بێنێــت یــان خزمــەتی مێوانــان بکــات یــان هــەر هــیچ نــەبێت پــێڵاو جــووت بکــات. لــە کاتێکدا کــە ئێمــە دیوەخانمــان زۆر قەڵەباڵغــە، بــاش ئەوەیــە کــە چــیتر نــەهێڵین ئــەو منداڵانــەمان لــە مــاڵ بچــنە دەرێ پاشــا گــوتی تــۆ ڕاســت دەکــەی. پاشــا گۆتیــە غولامــان بــڕۆن بڵێنــە دایــك و بــاوکی هــەموو منــداڵان کــە نــەهێڵن لــە بــەیانی بــەولاوە یــەك منــداڵ بچــنە لای گــەنج ســاڵح. ئــەوی بچــیت ســەری دەبــڕین. ئەگــەر کــوڕی منــیش بێــت ئەمــە بڕیــارە و دەبــێ جێبــەجێ بکرێــت. بــۆ بــەیانی ڕۆژی پاشــتر پاشــا هەســتاو تەماشــای کــوڕی خــۆی کــرد، کــە کوڕەکــەی خــۆی ئامــادە دەکــات تــا بچێتە لای گــەنج ســاڵح و تــەمرینی خــۆی بکاتــەوە. پاشــا گۆتی: کــوڕی خــۆم تــۆ چ دەکــەی؟ وەرە مەچــوو هەرچــییەك تــۆ بتــەوێت مــن بــۆت پەیــدا دەکــەم و دەتــدەمێ ئەگــەر گــەنج ســاڵح زێــڕەك بــەتۆ بــدات مــن ســەد زێــڕت دەدەمــێ و هەرچــییەك تــۆ بتــەوێ مــن دەتــدەمێ. وە ئــەو ماڵــەی مــن هەمــە ئەگــەر بۆ تــۆ نــەبێت بــۆ کێیــە بــەڵام مــەڕۆ وەرە لــە مــاڵ بــە کــوڕی پاشــای گۆتی ئــەی بــابی خۆشەویســتم ئــەوە بڕیارێکــە مــن داومــە دەچــم بــۆ لای گــەنج ســاڵح و دەمــەوێت بــە ئارەقــەی نیوچــەوانی خــۆم بــژیم و بــژێوی خــۆم پەیــدا بکــەم مــن دەمــەوێ لەســەر دەستی خــۆم ببمــە کەســێکی خــاوەن دەســەڵات هەنــدەی پاشــا لەگــەڵ کــوڕی خــۆی کــرد کــوڕی پاشــا ڕازی نــەبوو هەرچــوو. ئیــدی پاشــاش هیچــی لەدەســت نــەهات. کاتێــك منــداڵانی تــر دیتیــان کــە کــوڕی پاشــا چــوویەتەوە لای گــەنج ســاڵح ئــەوانیش هــەموو هــاتن و چــوونەوە ســەر تــەمرین هــەموو لــەژێر فــەرمانی گــەنج ســاڵحدا بــوون. هەرچــییەك گــەنج ســاڵح بیگۆتبــا ئــەوان جــێ بــەجێیان دەکــرد نــەیان دەگــوت نــا. منــداڵان لەســەر تــەمرینی خۆیــان بــەردەوام بــوون و هــەتا تەمــەنیان گەیشــتە تەمــەنی گــەنجی. وە هــەر یــەك لــەمان وەك پاڵــەوانێکی لــێ هــاتبوو هــەمووش لــەژێر فــەرمانی گــەنج ســاڵح بــوون. ڕۆژێــك پاشــا خــەونێکی دیت هــەموو خــەڵك بــە وەزیــر و غــولام و خــوڵکی ئــاوایی بــە گــەورە و ڕیــش ســپیەوە خــڕی کردنــەوە گــوتی: ئــەی خەڵکینــە مــن خــەونم دیتیــە مــن دەمــەوێت بــە مــن بڵــێن کــە مــن چ خــەونێکم دیتیــە. تــەعبیری خەونەکەشــم چــییە پــێم بڵــێن. خەڵکــەکان زۆر بیریــان کــردەوە و زۆر هــاتن و چــوونەیانزانی پاشــا چ خــەونێکی دیتییــە. یــەکێك لــەناو خەڵکەکــە گــوتی: پاشــام خــۆش بێــت ئەگــەر گــەنج ســاڵح نــەزانێت تــۆ چ خــەونێکت دیتیــە ئــەوا هــیچ کەس نازانن کە تۆ چ خەونێکت دیتیە.

پاشـاش فـەرمانی بـە دوو غـولامی داو پێیـانی گـۆت کـە بچـن بـە زووتـری کـات گـەنج سـاڵحم بـۆ بێـنن. ئـەو دوو غولامـە چـوون. لەسـەر ڕێ گەیشـتنە دوو پاسـەوانی گـەنج سـاڵح غولامـەکان بـە پاسـەوانەکانی گـەنج سـاڵحیان ووت: ئـەرێ گـەنج سـاڵح لێرەیـە؟ بـا زوو بێـت هـەتا بچـین بـۆ لای پاشـا چـونکە پاشـا کـاری بـە گـەنج سـاڵحە... ئـەو دوو حەرەسـە چـوونە لای گـەنج سـاڵح پێیـان ووت. گـەنج سـالح وتـی بـڕۆن لـەو غولامانـە بـدەن. بیانێرنـەوە بـۆ لای پاشـا پاسـەوانەکانیش لـەژێر فـەرمانی گـەنج سـاڵح دەرنەچـوون تێریـان لـە دوو غولامەکـە داو گەڕندنیانـەوە بـۆ لای پاشـا. پاشـا وتـی چییە بۆ گـەنج سـاڵحتان لەگـەڵ نییـە؟ کەسێك لـە خەڵکەکـە وتی پاشام خـۆش بـی خـۆ (گـەنج سـاڵح) کەسێکی کـەم نییـە هـەر ئـەوها بـە ئاسـانی بـە دوای بنێـری ئـەویش بێـت، دەبێـت بـە ڕێـز و حورمـەتێکی زۆرەوە بنێـری بەدوایـدا پاشـاش هەسـتا دوو غـولامی تـری نـارد بـە دوایـدا بـەڵام ئـەم جـارە بـە شـێوازێکی تـر زۆر بـە ڕێـز و حورمـەتی زۆرەوە کاتێـك گـەنج سـاڵح هاتـە دیوەخـانی پاشـا و پاشـا ڕێزێکـی زۆری لـێ گـرت و پاسـەوانەکانی گـەنج سـاڵح چـواردەوری دیوەخـانی پاشـایان گـرت بـوو نـەوەك کەسـێك زیانێـك بـە گـەنج سـاڵح بگەیـەنێت. پاشـا ووتـی: مـن بۆیـە ناردوومـە بـە دوای تـۆدا کـە بزانـی مـن چ خـەونێکم دیـوە و تـەعبیری خەونەکەشـم بـۆ بکـە. گـەنج سـاڵحیش ڕاوەسـتاو تەماشـای پاشـای کـرد و ووتی پاشـام شـەوی دوێـنێ تـۆ لـە خـەودا دیـت کـە حـەوزێك پـڕی ئـاو بـوو ماسـییەك سەری خۆی تێدا هێنابووە دەرێ.

پاشـا گـۆتی تـۆ ڕاسـت دەڵێـی مـن ئـەو خەونـەم دیتیـە بـەڵام مانـای چییە؟ گـەنج سـاڵحیش گـۆتی تـەعبیری خەونەکـەت ئەوەیـە کـە ژنەکـەت لەگـەڵت خائینـە. لـە ڕۆژەوەی کـە تـۆ هینایـت ئـەویش دوو کـافری لەگـەڵ خـۆی هینایـە هـەموو ڕۆژێـك دەچـێتە لای ئـەو کافرانـە و ئـەو دوو کـافرە خیانـەت لـە تـۆ دەکـەن ئەگـەر بـاوەڕ ناکـەی هەسـتە بابچـین نیشـانت بـدەم. پاشـا هەسـتا لەگـەڵ گـەنج سـاڵح چـوو. لـەناو قەسـری پاشـادا ژێـر زەمینـەك هـەبوو ئـەو دوو کـافرە لـەو ژێـر زەمینـە بـوون کاتێـك پاشـا دوو کافرەکـەی دیـت و بڕیاریـدا سـەری هـەردوو کافرەکـە بـبڕن و ژنـی خۆشـی بکوژێـت. گـەنج سـاڵح گـۆتی: پاشـام خـۆش بـی ئەگـەر دەتـەوێ ژنـەکی باشـت بـۆ دەبینمـەوە بـەس تـۆ چـەك و شمشـێر و ئەسـپم بـدێ بـۆ خـۆم و لەشـکرەکەم. مـن دەچـم ژنێکـی باشـت بـۆ دەبینمـەوە پاشـاش هەرچـییەك گـەنج سـاڵح ویسـتی دای بـەو. گـەنج سـاڵح لەگـەڵ لەشـکری خـۆی ڕێکـەوتن و ڕۆیشـتن ماوەیـەك لەسـەر ڕۆیشـتنی خۆیـان بـەردەوام بـوون. هـەتا لـە دوور هەنـدێك خێمـە و خیوەتیـان دیـت.

کاتێك پرسیاریان کرد بۆیان دەرکەوت کە ئەوە لەشکری (قەرالیٚ کوفریە) کە سەرکردەی کافرەکان بوو.

گەنج ساڵحیش جوابی بۆ وان نارد کە ئەگەر تا بەیانی نەبنە مسولمان ئەوا هێرشیان دەکەنە سەر لەشکرەکەیان. قەرالی کوفری وەڵامی گەنج ساڵحی داوە کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك ڕازی نین کە ببنە بە مسوڵمان. بەیانی زوو گەنج ساڵح بە لەشکری خۆی هێرشی کردە سەر لەشکری قەرالی کوفری هەموانیان لەناو بردن قەرالی کوفری ژنێکی زۆر جوان و کچێکی زۆر جوانی هەبوو ئەو ژن و کچە موسڵمان بوون و گەنج ساڵحیش لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ وڵاتی خۆیان و بە پاشای وت: پاشام خۆش بی ئەوە ژنێکی زۆر باشم بۆ تۆ هێناوە من دەڵێم لەو دونیایەدا کەس لەو ژنە باشتر نییە. پاشاش وتی هەتا گەنج ساڵح ژن نەهێنیٚ من ژن ناهێنم گەنج ساڵحیش ووتی گەورەم وامەڵیٚ من زۆر کاری ترم ماوە ئەبیٚ جیٚ بەجێیان بکەم پاشاش ووتی: باشە بزانم تۆ چ کارێکت هەیە دەبیٚ جیٚ بەجێیان بکەی. گەنج ساڵحیش ووتی: من پێت دەڵێم کە چ کارێکم هەیە بەڵام من حەز دەکەم بە ئامادەبوونی ئەو خەڵکانە باسی کارەکەم دەکەم هەتا باسی منیش تەواو نەبێت نابێت کەس لە دیوەخانیٚ بچێتە دەرەوە ئینجا ئەگەر هەر کەسێك ئیشێکیان هەیە با ئێستا بچن کارەکەیان بکەن. دوای ئەگەر من دەستم بە باسەکە کرد لێناگەڕێم کەس لە دیوەخانی پاشا بچێتە دەر. دوای کۆبوونەوەی خەڵك لە دیوەخانی پاشادا هەموو کاربەدەستانی پاشا و وەزیر و زۆر لە خەڵکەکە ئامادەبوون. پاشاش ووتی: دەی گەنج ساڵح تۆ چ باسێکت هەیە؟ گەنج ساڵح وتی: من دەمەوێت شتێکتان بۆ بگێڕمەوە ئەویش ئەوەیە: کە لە سەردەمێکدا پیاوێك هەبوو زۆر فەقیر و هەژار بوو بە هەژاری لەگەڵ ژنی خۆیدا دەژیا خەریکی دار کۆکردنەوە بوو تا بژێوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی پەیدا بات ڕۆژێکیان لەکاتی بڕینی بنە دارێکی ئەستووردا لە بنە دارەکە گەنجینەیەکی گەلێك زۆری دیتەوە و نەیزانی چ لەو گەنجینەیە بکات بۆیە بیری کردەوە و ووتی با لەگەڵ وەزیردا ڕێك بکەوم گەنجینەکە بۆ هەردووکمان بە نیوە بێت. لەو کاتەوەش وەزیر دانیشت بوو لەلای دەستە ڕاستی پاشادا زۆر دڵی بەم قسانە توند بوو زانی کە گەنج ساڵح دەیەویٚ باسی مەسەلەکەی ئەو و بابی خۆی بکات. بۆیە هەندێك کۆخی و ووتی پاشام خۆش بێت من دەچمە دەرەوە. پاشاش ووتی نا وەزیر سەرەتا ووتمان نابیٚ کەس بچێتە دەرەوە تا باسەکەی گەنج ساڵح تەواو نەبێت. وەزیر دانیشتەوە و گەنج ساڵحیش باسی بابەتەکەی وەزیر و بابی خۆی کردەوە و ووتی: ئینجا وەزیرکە

زۆر بە تەماع بوو ویستی خیانەت لە کابرای هەژار بکات. لەو کاتەوە وەزیر زۆر تووڕە بوو وتی: پاشا گیان چۆن دەهێڵی ئەم کوڕە ئەو قسانە بکات. پاشاش وتی: بۆ خۆ باسی تۆ ناکات ئەمە باسی وەزیرێك دەکات لە سەردەمێکدا. گەنج سالحیش وتی: نەخێر باسی ئەم وەزیرە دەکەم و کە چۆن کابرای هەژاری کوشتووە کە دەکاتە باوکی من و لاشەی خستۆتە ژێر زەمینەکەی ژێر تەختەی خۆیەوە کاتێك پاشا لەگەڵ گەنج سالحدا چوون بۆ دیتنی لاشەی باوکی گەنج سالح دیتیان کە لاشەی باوکی گەنج سالح لەوێیەو لە ژێر تەختی وەزیری. بۆیە پاشا بڕیاریدا وەزیر بکوژن و گەنج سالحیشی کردە جێگری خۆی و ئینجا پاشا و گەنج سالح بەیەکەوە زەماوەندیان کردو ژنیان هێنا.

- لە تاقیکردنەوەی ئەم دوو ساڵەی کە داوام لە قوتابیەکان دەکرد بابەتی فۆلکلۆری کۆبکەنەوە هەندێ لە قوتابیان ئەم کارەیان بە ئەرك دەزانی و شتی سەیریان دەکردو ، هی وا هەبوو لە گۆڤار یان کتێب بابەتی وەردەگرت و دەیهێنا ! ! کە من گوتبووم بابەتی کۆکراوە نابێت، هەموو بابەتی وەرگێڕاوی دەهێنا، هەموو بابەتی نووسەرێکی دەهێنا کە نووسەرەکە خۆی نووسیبووی، ئەوانەی هەستم پێ کردبێ لام داون ! بەڵام، ئەم ((گەنج سالح)ە وەك دەبینن یەك دەقەو بە دوو شێوەزاری جیا نووسراوە، ئەمەش کۆکەرەوە، دەقی ساڵی پێشووی وەرگێڕاوەتە سەر شێوەزارێکی تر ومنیش بەو هۆیەکە یەك دەقەو بە دووشێوەزار نووسراوە، بلاوم کردەوە.

# وەسیەتی پاشا

**گێڕانەوەی: خانم عبدالله**
**پلەی خوێندەواری: نەخوێندەوار**
**تەمەن: ١٩٥١- دەربەندی گۆمەسپان**
**کۆکردنەوەی: سۆران مامەند عبدالله**

پاشایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو گوتی: ئەگەر مردم سێ شەو وەرنە سەر قەبرم ئەوجا پاشا مرد، برایە گچکەکە هاتە لای براکانی گوتی: بابمان ئەو وەسیەتەی کردیە، ئەوانیش گوێیان لێ ڕانەگرت و نەچوون، ئەوجا هاتە لای دایکی و گوتی: دایە هیچ کەچە شیرمان نییە؟ ئەویش کەونە شیرەکی بابی دایێ ڕۆیشت چووە سەر قەبری بابی، شەو ڕاکشا خۆی شاردەوە دیتی ماینەکی سپی دێو هەر سپی هەموو شتێکی سپی دەکرا شیرەکی لە ملی دا ملی دێوی پەڕاند هینایەوە مارەوە گوتی: دایە هەریگرە، دیسان چووە لای برایەکانی گوتی: هیچم نەدیوە بەرام هەر دەچم وەسیەتی باوکمە ئەنگۆ نایێن، ئەوانیش گوتیان: بڕۆ کەچەر ئەمە نایێن. دیسان شەو ڕاکشا دیتی سوارێکی تر ماینێکی سۆر هەر سۆر هەموو شتێکی هەر سۆر بوو، شیرەکی لە ملی دا و ملی پەڕاند وەك جاری پێشوو هینایە لای دایکی پێی گۆت: هەریگرە لای کەس باسی مەکە، عەینەن بەو قەرارە چووە لای برایەکانی ئەوانیش دەریان کرد ڕۆیشت شەو ڕاکشا بینی سوارێك هەمووی ڕەش بوو، شیرەکی لە ملی دا ملی ویشی پەڕاند، سێ شەوەکە تەواو بوو وەسیەتی بابی هێنا جێی. پاشای ئەوکاتی بانگی ڕاهێشت سێ کچم هەیە گورزەکی هاوێشتە ناو بیرێ گۆتی ئەوەی ئەو گورزە بینتە دەرێ لۆخۆی کچەکان ببات ئەویش چووە لای براکانی گۆتی: ئەگەر یارمەتیم بدەن وراغەکم بدەنێ ئەوانیش دەریان کرد ئەویش گەڕاوە مارەوە جلوبەرگی سپی لەبەر کرد بە تاخمی سپی هاتە دەرێ چووە مەیدانێ لەوێ دوو جاری هاتووچۆ کرد گورزەکەی دەرهێنا و کچی یەکەمی هێنا بە دایکی گۆت بیشارەوە با کەس نەزانی، دیسان چووە لای براکانی گۆتی: ئەگەر شتەکتان هەیە بمدەنێ ئەوانیش وەك و جاری پێشوو گۆتیان بڕۆ کەچەر ئەوە ئەمە غەمبارین نازانین ئەو سوارچاکە کێ بوو کچی پاشای برد. لە بۆ سبەینێ دیسان پاشا بانگی ڕاهێشت لە بۆ کچی دووەم ئەویش دیسان ئەوجاری بەرگی سۆری لەبەر کرد هات بە سواری سۆر دیسان هاتووچۆی کرد سەرکەوتوو بوو کچی

دووەمیشی هێناو وەکی جاری پێشوو هێنایەوە ماریٚ بە داکی گوت: بیشارەوە کەس نەزانی ئەوجا چووە لای براکانی وەکو دوو جارەکەی تر ئەوجارەی براکانی گوتیان نەڕۆی هەر دەتکوژین کەچەر وەکو جارەکانی تر بۆ کچی سێیەم خۆی ئامادە کرد جلوبەرگی ڕەشی لەبەر کرد کچی سێیەمیشی هێنا و بردی خەرکەکە زۆر سەرسام بوون و نەیانزانی ئەم سوارچاکانە کێ بوون وەکی ئەم کارەشی کرد بۆ ئەوەی وەکو براکانی نەبێت ئەو شتە چاکانەی کردیتی لە بۆ ئەوانیش بی بۆیە بانگێهشتی کرد گوتی: مەولودی دەکەم چووە لای براکانی گوتی: هاتیمە دەعوەتتان کەم مەولودی دەکەم ئەوانیش هەر وەکو پێشتر فشەیان پێکرد گوتیان: کوڕە کەچەر ئەتوو خۆت هەیە هەتا مەولودت هەبی! دوای پیرەژنی دایکی لەگەر چەند پیرەژنەکی کە گوتیان عەیبە ئەو برا گچکەتانە هەڕون لەبۆ مەولودەکەی ئەوانیش ووتیان: باشە دەچین. ئێوارە داهات پاش ئەوەی مەولود تەواو بوو نانیان خوارد برا گچکەکەی گوتیە دوو برا گەورەکەی ئەنگو مەڕۆن ئەوانیش پێیان سەیر بوو! گوتی: لەگەڵم وەرن ئەوانیش چوون دەرگایەکی کردەوە هەر سێ سەری سوارە دێوەکانی تێدا بوو دەگاریەکی تری کردەوە هەر سێ کچەکانی پاشای تێدا بوو گوتی: ئەو سوارچاکە من بووم ئەوانیش سەریان سوڕما! ئەوجا کچەکانی پاشای کچە گەورەکەی لە برا گەورەکەی مارە کرد کچە ناوەندیەکەی لە برا ناوەندیەکەی مارە کرد کچە گچکەکەش برا گچکەکەی لەخۆی مارە کرد. ئەوجا براکانی پەشیما بوونەوە گوتیان: ئەمە برا گچکە و ئەتوش برا گەورەمان بە. پاش هەفتەیەك بەسەر بوکێنی هەرسێ خوشکەکە تێپەڕی هەرسێ خوشکەکە چوونە کۆڕێ لەبۆ کۆر کردن پیرەمێردەك هات ناوی حەیدەرە شەل بوو گوتی: پێویستیم بە ئاگرە ئەوانیش گوتیان: ئەمە بەبێ جلکین ژنی برا گچکەکەی کە دەکاتە ژنی ئەحمەدی گوتی: ئێوە لۆ وا بێ ڕەحمن ئەوانیش گوتیان ئاخر جلکمان لەبەر نییە بەس ئەو چوو ئاگری بداتێ حەیدەرە شەل ڕاسەن بردی و فراندی، ئەوجا خەبەر لە بۆ ئەحمەدی چوو گوتیان: حەیدەرە شەل ژنی فراندی خوشکی ئەحمەدی ئەگەر دەچی هەندەك حاجیلەی بە پێکەنینەی بکرە بڕۆ ئەوێندەر بڕێ حاجیلە بە پێکەنینە ئەویش ڕۆیشت گەیشتە وێندەرێ گوتی: حاجیلە بە پێکەنینە ژنەك لەناو هەمووان پێکەنی و ئەحمەد ناسیەوە بردی لە ڕێی دێوەکی گەیشتێ ئەحمەدی گرت پاچەپارچەی کرد لەناو جۆرکێکی کرد و بە سواری وراغی ڕەوانی کردەوە، کە خوشکی دیتی دەستی بە گریانێ کرد دوو کۆتر لەسەر دارێ بوون گوتیان ئای ئەگەر خوشکی ئەحمەدی جیقنەی مە بکوڕێنی

پارچەی ئەحمەدیش لەگەر بکوڕێنی ئەحمەد چادەبێتەوە خوشکیشی وەی کرد ئەوجا ئەحمەد چابوەوە گۆتی: دەچمەوە. خوشکی گۆتی: مادام دەچی برۆ لای مەلای ئەویش چووە لای مەلاش گۆتی: برۆ جوانە ماینەکی بینە لەکن کولانکەی خانی بیبەستەوە ئەگەر بژانگی لە کولانەکەی خانی. چووە دەرێ ئەوا ژنەکەت پێ دێتەوە ئەگەر نا خۆت ماندی مەکە کە سبەی هەستاوە دیتی ئیشەکەی دەبێت ئەوجا مەلا ووتی برۆ مەڕەکە بکڕە بیکە دوو پارچە بدە بەو دوو گورگەی لە ڕێی بەحرێ ڕاوەستاون ئەو بەحرەی جوانە ماینەکی تێدایە دەتگەینتە کن ژنەکەت ئەویش چوو وەی کرد تا گەیشتە ژنەکەی هینایەوە خەبەر گەیشتە حەیدەرە شەلی گۆتیان ئەحمەد ژنی خۆی بردەوە گەیشتنە بەرامبەر یەك جوانە ماینەکان خوشك بوون جوانە ماینی ئەحمەدی گۆتیە جوانە ماینی حەیدەرە شەلی ئەوەندەی برندکە دوایی بە عاردی دادە جوانە ماینی حەیدەرە شەلی ئەوەندەی برند کرد بە عاردی دادا تا بووە چرمۆکە بە عاردیەوە نووسا ئەوجا ئەحمەد ژنەکەی گەڕاندەوە لای خوشکی خەبەر چووە لای براکانی ئەوانیش یەکە و دەسترە زێڕیان لە بۆ ئەحمەدی هیناو حەفت شەو و حەفت ڕۆژ ئاهەنگیان گێڕا بە خۆشی و شادی.

## تەیری هەزار تەیر

هەبوو نەبوو دوو کچ هەبوون، دایکیان پێش مردنی پێی گۆتن: کچەکانم کە مردم دەستەکی من لێکەنەوە لە لبادی بگرن با زڕادکتان پێتان لێبدات. شەو هات ڕۆژ هات و ڕۆیشت دایکیان مرد. ئەوجا بابیان ژنی هیناوە، ئەو ڕۆژە داهات کە دایکیان گۆتبووی دیارە ئەوکات ئەم شتە لبادی لەبۆ لێدانی کراوە بۆیە ئەم زڕداکە چەند لەو دوو کچە ناسکۆکانەی دەدا بەم لبادە ئەم کچۆکانە قەرەو و جوانتر دەبوون. تا مودەتەکی بەردەوام بوو زڕداکەکە سەیری پێهات! بۆیە لبادەکەی کردەوە دیتی دەستی ژنەکی تێدایە، بۆیە گۆتی: ئەمە شتێکی تێدایە ئەگەر نا لە بۆچی ئەوانە چەندیان لێدەدەم هەر قەرەو و جوانتر دەبن! بۆیە لبادەکەی هێنا لە باتی دەستەکە دارەکی لەناو دانا ئەوجا پێی لێدەدان، وەی لێهات ئەو دوو کچۆکە زۆر زەرد و لاواز بوون بەوەش نەوەستا کچەکان گۆتیان دەچینە مازیان لەگەر خەرکی داوای نانیان کرد، زڕداکیان دوو فەردە سەرگینی لەبۆ دانان دوو نوردیە نانی لەسەر دانا لەبۆی بەستان ئەوانیش نەیان زانی، ڕۆیشتن بەرێکەوتن تا گەیشتنە چۆلاتی کە زۆر دوور کەوتبوونەوە لە دوورا قەسرەکیان دیت کە چوون لە

قەسرەکە نزیك ببنەوە گۆتیان: ئەوە شتەکی تێدایە هەر بۆیە لە قەسرەکە خۆیان شاردەوە دوای زۆری پێنەچوو دێو هاتەوە گۆتی: بۆن دێ بۆن دێ بۆنی بێگانان دێ لەم ئەرز و مەکانە دێت گۆتی: بە چ بنووم بە بەڕی عەلەی بە جاجمی کەسك و سۆر؟ گۆتیان: ناوەڵلا بەجلی تازی لەناو ئاخوڕی تازی گۆتی: چ بخۆم ئەستوکی هەرزن شیری بزنی دوای چوون مەنجەرە ئاوەکیان برق برق کوڕاند پاشان بە دێویان داکرد دێو بووە چرمۆکە ئەوجا سبەینە داهات چوونە قەسرێ دیتیان سوارەك لەدوور بوو ئەوانیش هاواریان کرد بانگی کرد سوارەکە هات گۆتیان: لێرە ڕزگارمان بکە ئەوجا ئەمە دوو شتی سەیرت لەبۆ دەکەین. بەران نەیانزانی سوارچاك پاشایە یەك لە کچەکان گۆتی: ئەگەر من بینی خەلانچەکەی زیرت لەبۆ دەکەم ئەوسەر و ئەوسەری دیوەخانی بگری ئەوی تر گۆتی: ئەگەر من بینی کچەکی کاکۆڵ زێڕو کوڕەکی قاقۆڵ زیوت لەبۆ دەینم. ئەوجا هەردووکی لەخۆی مارە کرد هینایەوە، پاشا ژنەکی هەبوو کە زانی زۆری پێناخۆش بوو، بەران لەبەر پاشای هیچی پێنەدەکرا، پاش ماوەکی ژنی نوێی پاشا زگی بوو خەبەر گەیشتە پاشا کەوا ژنەکەت منداری دەبی، پاشا فەرمانیدا دیوەخانی برازێننەوە ئەوجا ژنی پاشا کوڕ و کچەکی بوو یەکیان قاقۆڵی زێڕ و یەکیان قاقۆڵی زیو ژنی گەورە گۆتی: پاشا بزانی ئەمن تەراق دەدا هەستا دوو گوجیلەی سەی داناو کچ و کوڕەکەی هەردا ناو چارەکی گەورە. خەبەر چووە لای پاشا گۆتیان پاشام خۆش بی ژنەکەت دوو گوجیلە سەی بووە فەرمانی دا ئەو ژنەی لە حەفت پیستی بدرون بیکەن بە پرد ڕۆژێ بەسەری هاتوچۆ بکەن ئەوانیش ئەوەیان کرد لەلایەشکە مندارەکانی ناوچاری خوا وای لەبۆ هینان بزنەکی پیرەژنێکی بێکەس فێربوو دەچووە ناو چاری تا شیری لە گوانی دەما دەیدا مندارەکان پیرەژن چوو یەقەی شوانی گرت گۆتی: ئەتو ئەو بزنەی دەدۆشی شوانەکە ووتی: پیرەژن ئەمن لەو هەموو بزنانە بۆچی بزنی تۆ دەدۆشم! بۆخۆت بزانە دەیدۆشی. پیرەژنیش خۆی گرت و بەدوای بزنەکەی کەوت هەتا دیتی بزنەکە خۆی هەردایە چارەکی وا دوو منداری تازە بوو شیری دەخۆن ئەویش هەری گرتن لەبۆ مارەوەی بردەوە بۆ خۆی بەخێوی کردن تا هەراش بوون کچەکە لە مارەوە تەونی دەکرد کوڕەکەش لە دەرێ بوو قاشۆکانێی دەکرد، زڕداکی زانی کە ژنی گەورەی پاشا بوو هاتە لای کچەکە گۆتی: ڕۆرە تۆ لەمارەوە بێزار نابی ئەویش گۆتی: بەڕێ وەڵلا بەس چ بکەم زڕداکەکە گۆتی: دەڕێن بولبولی خۆشەویست هەیە بڕێ براکەت لە بۆت بینی ئەویش بە براکەی گۆت براکەشی ڕۆیی لە ڕێدا تووشی خدری زندەی بوو گۆتی: ها ڕۆرە لە بۆ

کێنـدەر دەچـی؟ گـۆتی: دەچـم بولبـولی خۆشەویسـت لـەبۆ خوشـکم دەیـنم خـدری زنـدە گـۆتی ڕۆرە پێـت نایـەت. گـۆتی: هەردەچـم. گـۆتی: مـادام دەچـی لـە ڕێگـا دوو گـورگ هەیـە، مـەڕەکی بکـڕە بـدە گورگـەکان، لـەوان قورتـارت دەبـی دەگەویـە عـەردی قونجرکـە بـرێ: بریـا مـارم لێرەبـا، لـە دوایـێ دەگەیـە کـانی کـێم دەخنکـی مسـتەکی لێبخـۆوە بـرێ ئـای چـەند خۆشـە، دوایـە دەگەیـە دوو دەرگـای یـەکیان پێـوە نەدرایـە پێوەیـدە یـەکیان داخرایـە بیکـەوە، ئـەویش چـوو وای کـرد بولبـولی خۆشەویسـتی هینـا لـە گەڕانـەوە گۆتیـان کـانی کـێم و خـوێنی بیگـرە. گـۆتی: نـا بابـە بـڕۆ گەیشـتە عـەردی قونجرکـە گۆتیـان: بیگـرە. گـۆتی: نـا بابـە بـڕۆ ئـەوجا بـە سـەلامەتی هاتـەوە، هینـای کـە زڕداکیـان زانـی ئـەوجارە بـە فێرەشـیکە هاتـەوە گـۆتی: هـا ڕۆرە بولبولەکـە کـوە ئـەویش گـۆتی: وەڵـلا هـیچ نییـە بـێ دەنگـە گـۆتی: ڕۆرە دەرێـن فـەرخۆرەی شـێران هەیـە بـا بـڕوات ئـەوت لـەبۆ بـینی کـە براکـەی هاتـەوە گۆتی: هـا خوشـکم لـۆ بێدەنگی وا غـەمباری؟ ئـەویش گـۆتی: بـرام ئـەو بولبولـە هـیچ نییـە دەرێـن فـەرخۆرەی شێران هەیـە براشـی گـۆتی: بـە چـاوان دەچـم لـەبۆت دێـنم ڕێگـای گرتـە بـەر دیسـان تووشـی خـدری زنـدە بـوو، گـۆتی: هـا فـەرخۆرەی مـامی لـەبۆ کێنـدەرێ دەچـی دیسـان؟ ئـەویش گـۆتی: دەچـم فـەرخۆرەی شـێران دەیـنم. پێـی وت: ڕۆرە زۆر زەحمەتـە ئـەوا حـەفت سـارە دێـو پێـی کێمـی کردیـە هـەر هێشـایە لـەجێی خـۆی نەڕۆیشـتیە ئـەویش گـۆتی: هـەر دەچـم خـدری زنـدەش گـۆتی: مـادام هـەر دەچـی پەلـە دارەکـی تیژکـە خـۆت لـەبن پێـی دێـوی بشـارەوە دێوەکـە سـێ جـار دەرێ کێیـە هـەتا پێسـت و ئێسـکی بکـرۆژم. ئـەتۆش دارەکـی لـەبن پێـی ڕاکـە ئـەو کـێم و ئێشـی چـەند سـارەی هـەیتی نـامینێ پاشـان دێوەکـە دەرێ بخـوازە مـارێ دنیـایێ، ئـەوجا ئـەویش وادەکـاتن دێوەکـە لـەو کـێم و ئێشـەی ڕزگـار دەبـی دەرێ بخـوازە مـارێ دنیـایێ، بـرا گچـکەکەش دەرێ فـەرخۆرەی شـێرانم دەوێ دێـویش دەرێ ئـەوا حـەفت سـارە پـێم هێشـایە بریابـا حـەفتی دیـش هێشـابایە ئـەو داوایـەت نـەکردبا بـەرام بـڕۆ ئـەوا لـە شـینکۆکەی گـەمان دەکـەن پێیـان بـرێ فەرخۆرینـە داکتـان مردیـە دوو پێدەکـەنن، دووش دەگـریێن، ئەوانـەی پێدەکـەنن بیـان هینـە ئـەویش دەچـی وادەکـاتن ئـەوەی پێدەکـەنن دەیـان بـاو دەیـان هـینی یسـان ژنـە گـەورەی پاشـا کـە زڕداکیتیـان زانـی گـۆتی: ئـەوا بـەهیچ ناچـی فێرەکـانم سـەر نـاگری بۆیـە گـۆتی: هـا ڕۆرە لـۆ ئـەوها غـەمباری کچـەکە دیسـان؟ گـۆتی: وەڵـلا ئەوانـەش هـیچ نـارێنو. زڕداکەکـە گـۆتی: شـتێکی زۆر عەنتیکـە هەیـە ئەگـەر برایەکـەت لـەبۆت بـینی باشـە کچـەکەش گـۆتی: چـییە ئـەویش گـۆتی: تـەیر هـەزار تـەیر کـە برایەکـەی هاتـەوە وەکـو جـاری پێشـو خوشـکەکەی داوای لێکـرد

براکەشـی گـۆتی: گـویێ مـەدەیێ لـەبۆت دەیـنم بـەڕیێ کەوتـە ئـەو جێگایـەی کـە تەیرەکـەی لـیێ بـوو نێزیـك بـۆوە گـۆتی: تـەیری هـەزار تـەیر براکـەی هـەتا نـاو قـەدی بـووە بـەرد. ئـەوجارە گـۆتی: تـەیری هـەزار تـەیر. ئـەوجارە هـەتا ملـی بـووە بـەرد. سـێیەم جـار گـۆتی: تـەیری هـەزار تـەیر لـە شـەقی بـارانی دا بەگـەری کـەت. هاتنـەوە تـەیری هـەزار تـەیر گـۆتی: بـا بچـینە کـن پاشـای ئـەوان زۆر پێیـان عەنتیکـە بـوو ئـەو تـەیرە قسـەی دەکـات! بەگـەری کـەتن چـوونە لای پاشـا تـەیری هـەزار تـەیر بـە پاشـای گـۆت: پاشـام ئـەو کچـە و کـوڕە منـداری توونـە ژن و خـورام کارەکانـت ئـەوهایان کـرد لەبـەر خۆیـان هـەر بۆیـە پاشـا هەسـتا ژنەکـەی لـە حـەفت پیسـتی نـابوو. هینایـە دەریێ ژنـە گەورەکـەی و ئـەوانی لەگـەری بـوون فرێـی دانـە نـاو بـیریێ بۆیـە تـەیری هـەزار تـەیر خۆشی شادی هێناوە ناو ئەم خێزانە ئەوجا کراسم دڕا و هیچم پیێ نەبڕا.

ئەحمەد میران

هـەبوو نـەبوو کـەس لـە خـوای گـەورەتر نـەبوو، پیاوێـك هـەبوو نـاوی ئەحمـەد مـیران بـوو، ڕاوچـی بـوو، دەچـووە ڕاویێ، هێلکـەکی شـکاند کچـەکی جـوانی لـیێ هاتـە دەریێ، ئـەویش نـان و ئـاوی پـیێ نـەبوو، کچـەکە مـرد. ئـەوجارەیان نـان و ئـاوی لەگـەر خـۆی بـرد، هێلکـەکی شـکاند هیچـی تێـدا نـەبوو. هێلکـەکی دی شـکاند کچـەکی زۆر جـوانی تێدا بـوو نـان و ئـاوی دایـیێ ژیا ئـەوجا لەگـەر خـۆی هینایـەوە لەسـەر کـانی داینـا گـوتی: دەچـم لەشـکری دەیـنم ئـەتوو لێرەبـە هـەتا دێمـەوە هـەر یـەکێکی دەهـات جـەڕەی بـە زەوی دادەدا و دەیگـوت ئـای ئـەو جوانییـە هـی مـن بـا هـەتا ژنـەك هـات گـۆتی: بمبـە لای خـۆت. ئـەویش گـوتی: رووتم. پاڕایـەوە ئـەویش بردیـە لای خـۆی پـارەکی پێوەنـا فرێـی دایـە نـاو کـانی بـووە دوو کـۆتری سـپی دایـان لـە شـەقەی بـالّ. دوایـی ئەحمـەد لەگـەر لەشـکری دێتـەوە دەریێ بـۆ ئـەوهات لێهـات هەنـدی چـاوەڕێی تـوو بکـەم دەریێ کـەبووت بـۆ ئـەوها درێـژ بـووە دەریێ هەنـدی گـاس کـەم هـۆ ئەحمـەد هـۆ ئەحمـەد ئـەویش دەریێ ئـەتوو هـەو نیـی، بـەس بـا هـەوبی، کۆترەکـان دەچـنە لای پـیرە مێردەکـی جووتیـار هـەموو ڕۆژیێ دەرێـن هـۆ مـام جووتیـار ئەحمـەد مـیران لـە مـارە سۆریێ چاوشینی لە پاری نەمینیێ مارو حاری وەکی ئەمنی کردە کۆتری حەودالّە.

مـام جووتیـاریش بـە ئەحمـەدی دەریێ ئـەویش شـك دەکـات دێـت خـۆی لـەناو جـواری دەشـارتەوە هـەر کـە کۆترەکـان دێـن دەیـان گـری و دەیانباتـەوە بـۆ مـاریێ، کـە سـۆریێ چاوشـین چـاوی پێەکـەویێ هەنجـەتی دەبێتـەوە دەریێ (ژانم ژانـی کوڕانـە، گۆشـتی کۆترۆکـەم دەرمانـە)، ئەحمـەدی ناچـار کـرد کۆترۆکـەی کوشـتەوە لـەناو تەشـتیێ

کوشتیەوە پشکە خینەك پەڕی بووە دار قەسپەکی جوان کاتێك ئەحمەد چووە بن دار قەسپەکە قەسپی لێ دەباری، کەچی کاتەك سۆرەی چاو شین دەچووە بن دار قەسپەکە قەرسەقەلی لێ دەباری، هەستا چی کرد شوژنی لە مندڵەکەی رادەکرد، دەی گوت ئەوا لەبۆ لانکی دار قەسپ دەگریێ. ئەحمەدیش ناچار بوو دار قەسپەکە ببڕێتەوە پارچەکانی فڕێدا پیرەژنێك لۆخۆی هەری گرتەوە بردیەوە ماریێ کچەکی زۆر جوانی لێدەرچوو بەرام پیرەژن نەیزانی چونکە خۆی دەشاردەوە کە پیرەژن دەچووە دەرێ مارەکەی جوان خاوێن دەکردەوە پیرەژن سەری سوڕ دەما ! ڕۆژێکی خۆی گرت کچەکی زۆر جوان لە پەنای هاتە دەرێ ئەویش گۆتی: قسەی مەکە ئەتوو داك ئەمن کچ پیرەژن ووتی: باش ڕۆژەك ئەحمەد لە پێش ماری پیرەژن تۆپانێی دەکرد تۆپەکە کەوتە ماریێ پیرەژنێ ئەحمەد هاواری کرد پیرەژن. ئەو تۆپەمان لۆ هەردەوە پیرەژن لەماریێ نەبوو کچەکە نەیزای چ بکا ناچار بوو هەندەك پەڕۆ و پاری لەدەستی خۆی پێچا هەتا بە دەستی پیرەژنی بچی تۆپەکەی لۆ هەردانەوە ئەحمەد بینی گۆتی: ئەوە دەستی پیرەژنی نییە دوای ئەحمەد یەقەی پیرەژنی گرت گۆتی: ئەتوو کچت هەیە؟ پیرەژنیش گۆتی: ئەوە من کچم لەکێ بوو! ئەحمەدیش یەقەی بەرنەدا پیرەژن ووتی: باشە بەرام کچی من بەو جۆرە دیتیە دەستاری گەر کچان هاتنە مارتان بەرێی مافور ڕێژەکەی ئەوجا دەستاریان لێ کرد و هەتا نیوەی شەو بەند و بالۆریان بەسەر یەك هەردەگوت ئەوجا سۆرێ چاوشین چووە بن کچی پیرەژنێ بایەکی بەردا گۆتیان کچی پیرەژنێ بایەکی لێ بەربوو، کچی پیرەژنیش گۆتی: بەخوای گۆلکە سۆرەم بمرێ ئەمن نیمە ئەوجا زانیان هەموو کارە خراپەکان سۆرەی چاوشینە ئەوجا ئەحمەد سۆرەی گرت و لێکی هەرزاڕند کچی پیرەژنێی لە خۆ مارەکرد.

### مەڕۆکە و بزنۆکە

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورە نەبوو، مەڕۆکە و بزنۆکە هەبوون، بزنەکە گۆتیە مەڕۆکە: با خانییەکی لۆخۆمان دروست کەین لە سەرما و سۆرەی زستان خۆمان بپارێزین چونکە زۆر سەرمات دەبی بەران مەڕەکە فشەی پێکرد گۆتی ئەمن بەو خوریە خۆم دەپارێزم، بەرام سەرما و سۆر هات. شەوەکی زۆر سارد بوو لەبەر ئەوەی بزنەکە لەخەو هەستا دیتی مەڕەکە لەسەرمان ڕەق بویتەوە بزنەکە هەستا مەڕەکەی پارچەپارچە کرد پیستەکەی کردە ڕەشمار پێچکەکەشی چەقاند بزنەکەش دوو بەچکەی هەبوو بەناوی (جەنگیلە و پەنگیلە)ی دایێ لەوێ دەژیان

شـەوەکی گـورگ هـات هـەردووکی خـوارد گـورگ و بـزن بـووە شـەڕیان گۆتیـان دەچـیتە لای مـەلای دەچـین هـەتا ئـەو شـەرعە دەکـەین پێشـی بچـن بـزن یـەك مەنجـەر ماسـتی ئامـادە کـرد گـورگیش هەمبانـە تۆکـەکی پـڕ تـڕ و فسـی کـرد چـوونە لای مـەلای هـەر گەیشـتنە وێنـدەر هەمبانـەی کـردەوە تۆکەکـە دەرپـەڕی بـە کاریتـەی خـانی کـەوت کاریتـە شـکا یەکـە کیکـە بەچـاوی مـەلای کـەوت چـاوی مـەلای کـۆرە بـوو ئـەوجا مـەلا زوو زانـی حـەقی بزنەکەیـە خـەتای گورگیـە بۆیـە جەنگیلـە و بەنگیلـەی لـە گـورگی ستاندەوە ئەوجا بزنەکە بە در خۆشی گەڕاوە مارەوە.

- پاشـا و سـێ کـوڕ، زۆر دووبـارە دەبێتـەوە، بـەردەوامیش کـوڕی گچـکە، هەرچـەندە غـەدری لـێ دەکـرێ بـەلأم ئـازا و چـاکەکارە لەگـەڵ دوو براکـەی تـری، لـەم ئەفسـانەیەش ڕەگـەزەکانی ئـەمجۆرە چیرۆکە دووبـارە دەبنـەوە، سـێ شـەو و سـێ ئەسـپ هـەر ئەسـپەی ڕەنگێـك سـێ دێـو و، کوشـتنی دێوەکـان و تـا کۆتـایی ئەفسانە.
- تـەیری هـەزار تـەیر – تـەیر و هـوزار – بولبـولی خـۆش ئـاواز، دەقـی زۆر و شـێوەی زۆریـان هەیـە کـە بـەردەوام مـەرجی گـرانن لـە پاڵـەوان داوا دەکرێـت. ڕەگـەزەکانی ئەفسـانەی ئـەم دەقـە زۆرن، بوونـە بـەرد، کـوڕی قـاقۆڵ زێـڕ و کچـی قـاقۆڵ زیـو و.......
- مەڕۆکـە و بزنۆکـە ئـەو حیکایەتـە کۆنەیـە کـە زۆر دووبـارە دەبێتـەوە و بـەڕای مـن حیکایـەتێکی زۆر کۆنـە و بـۆ سـەرەتای قۆنـاغی دروسـت کردنـی گونـد دەگەڕێتـەوە، کـە مـرۆڤ تـازە بـە دەسـتی خـۆی خـانوی بـۆ خـۆی دروسـت دەکـرد. ئەمـەش حیکایەتی گیاندارانە.

# كۆشكە سحراویەكانی تەمەن

**كۆكردنەوەی: دانا ئیبراهیم خدر**

**گێڕانەوەی: ئیبراهیم خدر ئیبراهیم**

**تەمەن: ٥٠ ساڵ – قەڵادزە**

لە دووری شارێك دوورگەیەك هەبوو لەناو ئەو دوورگەیەدا كۆشكێك هەبوو، لەناو ئەو كۆشكەدا پیرەژنێك و ئەژدیها ئەژیان ئەو پیرەژنە كچێكی لابوو كە ئەو كچە ناوی رۆزماری بوو، تابڵێی كچێكی جوان و دەست ڕەنگین بوو، پرچێكی درێژ و ڕەنگ زەردی هەبوو، چاوی شین بوو، كچێكی زۆر باڵا بەرز و قەد باریك.... بوو زۆر نەرم و نیان و ناسك بوو. دوو هاوڕێی هەبوو كە لەگەڵی لەناو ژوورەكەی خۆیدا ئەژیان دوو هاوڕێیەكانی (كەروێشك و ئەژدیهایەكی بچووكی كچ). كەروێشكەكە هاوڕێی رۆزماری بوو، دوو گوێی درێژ و دوو لاقی پان و قردێنەیەكی لە ئێخە بوو، ڕەنگێكی خۆڵەمێشی هەبوو. ئەژدیها بچووكەكە هاوڕێی رۆزماری بوو ئەو ئەژدیهایە كچ بوو ڕەنگێكی سەوزی هەبوو، كلكێكی لە دواوە بەجێ مابوو دوو باڵی بچووكی لەسەر پشتی هەبوو ملوانكەیەكی پەمەیی و قردێنەیەكی پەمەیی پێوە بوو، برژانگەكانیشی بۆ سەرەوە بەرز كردبوونەوە زۆر ترسنۆك و لاسار بوو. پیرەژنەكەش دوو كاربەدەستی هەبوو، یەكێكیان سمۆرەیەكی جاسوس بوو ئەوەكەی تریشیان ئەژدیها گەورەكە بوو كە باوكی ئەژدیها بچووكەكە بوو. سمۆرە جاسوسەكە ئەو سمۆرەیە جاسوس بوو كارەكەری پیرەژنە جادوكەرەكە بوو كە هەڵدەستا بە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی كە لە ناوەوە و دەرەوەی كۆشك ڕووی ئەدا، ڕەنگێكی ڕەشی هەبوو. زۆر لاواز بوو هەتا بڵێی ناشرین بوو گازی لە هەموو شت ئەگرت. ئەژدیها گەورەكە كە باوكی ئەژدیها بچووكەكە بوو ئەژدیها گەورەكە كاربەدەستی پیرەژنەكە بوو، كە هەڵدەستا بە گواستنەوەی پیرەژنەكە لەو دێ بۆ ئەو دێ لەو شار بۆ ئەو شار.

رۆزماری لەبەر ئەوەی كچێكی دەست ڕەنگین بوو، بەردەوام خەریكی دروستكردنی ئەو وێنانە بوو كە لە دەورووبەریدا هەبوون لە ژوورەكەی خۆیدا وێنەی گوڵی لەسەر سیسەمەكەی لەسەر دۆڵابەكەی لەسەر دەرگایەكەی لەسەر

هەموو شتەکان وێنە و گوڵی جوانی دروستکرد بوو، بەردەوام لەگەڵ هاوڕێیەکانی خەریکی وێنەکێشان بوو گاڵتەیان بەیەکەوە دەکرد...

لە دەوروبەری دوورگەکەدا پیرەژنەکە سحری لێ کردبوو هیچ کەس نەیدەتوانی لەو دوورگەیە نزیک ببێتەوە هەموو بەیانییەك پیرەژن لەماڵ ئەهاتە دەرەوە، رۆزماری بە تەنها لەماڵەوە دەمایەوە لەگەڵ هاوڕێیەکانی. رۆزماری بەردەوام پرسیاری لەخۆی ئەکرد دەبێ کەسی وەك من هەبێ؟ بە تەنها و دوور لە کۆمەڵ بژی. رۆزماری هەموو رۆژێك لەناو کۆشکەکەدا ئەگەڕا ژوور بە ژوور دەرگا بە دەرگا تا لە کۆتایدا دەرگایەکی دۆزیەوە کە ئەو دەرگایە بەرەو ژێر زەمینێکی ئەبرد وردە وردە ڕۆیشت، تا ڕووناکییەکی لێ بەدیار کەوت، هاوڕێیەکانی زۆر داوایان لێ کرد کە نەچێت چونکە ئەیانزانی تووشی ناخۆشی ئەبێ لەگەڵ پیرەژنە جادوکەرەکە. بەڵام، رۆزماری گوێی بە قسەکان نەدا هەر ڕۆیشت ووتی: بە زووترین کات دەگەڕێمەوە چەند ڕۆیشتبا سەوزایی زیاتری ئەبینی دوای دارستان و ڕووبار و گوڵ و گوڵزار... ئەبینی. هەر ڕۆیشت هەر ڕۆیشت تا نزیك بۆوە لە باخچەیەك لە دوورەوە سێ کچی جوانی بینی کە بەرەو ڕووی ئەهاتن. ئەو سێ کچە لە کچە پاشا ئەچوون لە شێوە و ڕوخساریان دا لەسەر ئەسپ بوون. لەسەر ئەسپەکە دابەزین دەستیان کرد بە گاڵتە کردن لە کاتی گاڵتە کردنیاندا یەکێك لە سێ کچەکان کەوتە ناو چاڵێکەوە، رۆزماریش خێرا خێرا ڕایکرد بۆ لایان، بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات بەهۆی کەزیە درێژەکانی رۆزماری کەزیەکەی خستە ناو چاڵەکەوە بۆ ئەوەی کچەکە ڕزگار بکات. زۆری نەما بوو بۆخۆشی بکەوێتە ناو چاڵەکەوە کەسێك لە پشتەوە ڕا رۆزماری گرتەوە کچەکەی ناو چاڵەکەشی ڕزگار کرد، ئەو کوڕەش برای سێ کچەکان بوو ئەو کوڕە زۆر سوپاسی رۆزماری کرد کە خوشکەکانی ڕزگار کرد. رۆزماری بەهۆی جوانییەکەیەوە زۆر سەرنجی کوڕەکەی ڕاکێشا بوو کە لەوکاتەوە یەکتریان ناسی سۆز و خۆشەویستی کەوتە ناو دڵی هەردووکیانەوە، کوڕەکە ناوی لە کچەکە پرسی کچەکەش ناوەکەی پێ گۆت: کە ناوی رۆزمارییە کە لەو کاتەدا خوشکە بچووکەکەیان کۆڕەکەی مەشغول کردبوو و هەر لەو کاتەی کە کوڕەکە مەشغول بوو رۆزماری بەپەلە چووە ماڵەوە نەیتوانی بزانێ کوڕەکە کێیە؟ ناوی چییە؟ سمۆرە جاسوسەکە هەر لەو کاتەوەی کە رۆز ماری لە ماڵ دەرچوو تا کاتی گەڕانەوەی هەر بە دواوەی بوو رۆزماری هاتەوە ماڵ لەگەڵ هاوڕێیەکانی دانیشت و ئە چیرۆکەی بۆ هاوڕێیەکانی گێڕایەوە باسی دیمەنی

جـوانی سروشـتی کـرد و باسـی دیمـەنی جـوانی شـارەکەی کـرد لـە ناکـاو پیرەژنەکـە لێـی هاتــە ژوورەوە پێـی گـوت: ئـەمرۆ بـۆ کـوێ چـوو بـووی؟ لەگـەڵ کـێ دوای؟ کێـت بـینی؟ ڕۆزمـاریش نـەیتوانی درۆ بکـات ڕاسـتی بـۆ بـاس کـرد پیرەژنەکـە زۆری ئـازاردا تـا نـاوی کوڕەکـەی پـێ بڵـێ: بـەڵام، نـەیتوانی چـونکە نـاوی کوڕەکـەی نەئـەزانی. زیـاتر لەبـەر ئـەوەی بـوو کوڕەکـەی لەبـەر چـاو لاببـات بـەهۆی دارە سـیحراوییەکەیەوە کەرەسـەکانی وێنەکێشـانی لـێ شـکاند و دەرگاشـی لەسـەر قوفـڵ دا ئـەو کـار و کردەوەیـە ڕۆزمـاری زۆر دڵگـران کـرد و زۆر خەفـەتی پـێ خـوارد لـەوەی کـە جـارێکی تـر نـەتوانی ئـەو دیمەنـە جوانانـە ببینێتـەوە زیـاتر بـەوە دڵگـران بـوو کـە نەیـدەتوانی بـۆ جـاری دووەم خۆشەویسـتەکەی ببینێتـەوە. شـەو خـەوی بـینی لـە خەویـدا خۆشەویسـتەکەی لـە پەنجەرەکـەی بـانگی ئـەکرد پێـی ئـەگوت: ڕۆزمـاری ئـەوە هـاتم ئـەویش لـە پەنجەرەکـە کەزیەکـەی هەڵدایـە خـوارەوە بـۆ ئـەوەی کوڕەکـەی پـێ بێتـە ژوورەوە لـەناکاو پـیرەژن هاتـە ژوورەوە کارەکـەی لـێ هەڵوەشـاندەوە. کـە لـە خـەو هەڵسـا سـەیری کـرد خـەو بـوو ڕاسـتەقینە نـەبوو. ئاسـودە بـوو بـەیانی کـە ڕۆژهـەڵات هاوڕێیـەکانی هاتنـە لای ڕۆزمـاری ڕۆزمـاری زۆر بێتاقـەت و غـەمبار بـوو هاوڕێکـانی تەماشـایان کـرد بێتاقـەتی غـەمباری ڕۆزمـاری لـە شـکانی کەرەسـەی وێنـە کێشـانەکەی دایـە لـە ناکـاو کەروێشـکەکە کـە فلچـەیەکی ئەفسـوناوی وێنەکێشـان لـەژێر مێزەکـەی ژووری دۆزیـەوە دای بـە ڕۆزمـاری گـوتی: مـن و ئـەژدیها بچـووکەکە ئەچـین لـە گوڵـە سـوورەکان ڕەنگـی سـۆرت بـۆ دروسـت ئەکـەین لـە گـەڵا سـەوزەکان ڕەنگـی سـەوزت بـۆ دروسـت ئەکـەین بـۆ ئـەوەی دەسـت بــە وێنــە کێشــان بکەیتــەوە، ڕۆزمــاری زۆر ســەری ســوڕما بــوو لــە فلچــە ئەفســوناویەکە نوســینێکی زۆر جــوانی لەســەر هەڵکەنــدرابوو زۆر ســەرنجی ڕاکێشـا، هـەر کەروێشـکەکە و ئـەژدیها بچـووکەکە گەڕانـەوە ژوورەکـەی ڕۆزمـاری، ڕۆزمـاری دەسـتی کـرد بـە وێنەکێشـان لەسـەر دیـواری ژوورەکـە هاوڕێیـەکانی بــەهۆی پەنجەرەکــەوە ئــەیانتوانی بێنــە ژوورەوە هەرچــەندە کــە ژوورەکــە پەنجـەرەی زۆر بـەرز بـوو کـاتێ لەسـەر دیوارەکـە وێنـەی ئاسمـای کـرد و وەکـو ئـەوەی کـە ئاسمـانێکی ڕاسـتەقینە بـێ ڕۆزمـاری ووتـی: مـن تـەنها لـە خەیاڵمـدا ئاسمـان هـەبوو، خـۆ ئێسـتا ئـەم وێنەکێشـانە بـوو بـە ئاسمـان ئینجـا هەسـتی کـرد ئـەو فلچـە ئەفسـوناویە هەرچـی لـە خەیاڵیشـدا بێـت دەیکێشـێت بـە وێنـەی ڕاسـتەقینە، ئینجـا ڕۆزمـاری بـە هاوڕێکـانی گـوت: هاوڕێیـان وەرن ئـەو دیمەنـە جوانـەی مـن بینیومـە بۆتـان ئەکێشـم پـاش کێشـانی ئـاو و باخچـە و شـێوەی

گوندەکـە و دارسـتـان و... ڕۆزمـاری هەسـتی کـرد لـەناو وێنەکـەدا پەپوولەیـەکی ڕاسـتەقینە هاتـە دەرەوە بـەرەو ژوورەکـەی ڕۆزمـاری دەسـتی وێنەکـەی دا دەسـتی چـوو بـۆ نـاو و وێنەکـە پاشـان بـە هاوڕێیـەکانی گـۆت: مـن بـەختی خـۆم تـاقی ئەکەمـەوە ئـەمجارەش بـا بـزانم چـیم بەسـەر دێ؟ کاتێك ڕۆزمـاری خـۆی کـرد بـەناو وێنەکـەدا خـۆی لـەناو باخچـەی خـانوی کـوڕە پاشـا بینیـەوە ئەوسـەر و ئەوسـەری ماڵەکـەی کـرد کـوڕ پاشـای بینیـەوە فڵچـەی وێنەکێشـانەکەی کـە بـە کـوڕە پاشـا شـاد بـوو کـوڕە پاشـا پێـی گـوت: زۆر بـە دواتـا گـەڕام ئەوسـەر و ئەوسـەری شـارەکەم کـرد تـۆ لـە کـوێ بـووی کـە جێـت هێشـتم دارودەسـتەکانم زۆر بـەدواتا گـەڕان بـەڵام نەیاندۆزیـەوە کـوڕە پاشـا بـە ڕۆزمـاری گـۆت: تـۆ لـە منـت نەپرسـی کـە نـاوم چـییە؟ ڕۆزمـاریش ووتـی: پێویسـت ناکـات نـاوت بـزانم... ووتـی بۆچـی؟ ڕۆزمـاری گـۆتی: ئـەو باسـە بـۆ دوایـی بێـت ڕۆزمـاری ووتـی تـەنها دەمـەوێت بـزانم کـێ ئـەو نوسـینەی لەسـەر فڵچـە ئەفسـوناوییەکە هەڵتکەنـدووە چـونکە وا هەسـت ئەکـەم ئـەو فڵچـەیە لـە خێزانەکەمـەوە بـۆم ماوەتـەوە کـوڕە پاشـا بـە ڕۆزمـاری گـۆت ئاسـنگەرێك هەیـە لـە شـارەکەمان هـەر تـەنها ئـەو شـك ئەبـەم بـا بچـین بـۆ لای بزانـی ئـەو چـی ئـەڵێ؟ کـە چـوون بـۆ لای ئاسـنگەرەکەز ئاسـنگەرەکە ویسـتی بـە ڕێـزەوە بەرامبـەر کـوڕە پاشـا ڕاوەسـتێ پێشـوازییەکی باشـی لـێ بکـات بـەڵام کـوڕە پاشـا نەیویسـت خـۆی نیشـان بـدات وەکـو کـوڕە پاشـا ڕۆزمـاری پرسـیاری لـە ئاسـنگەرەکە کـرد گـوتی: مامـە کـێ ئـەم نووسـینەی کـردووە لەسـەر ئـەم فڵچـە ئەفسـوناویە؟ کـە تەماشـای دەسـت و خەتەکـەی کـرد ووتـی ئەمـە دەسـت و خـەتی براکەمـە کـە لـە دیـوی شـارەکەدا ئـەژیت ڕۆزمـاری بـە کـوڕە پاشـای گـوت وەرە بابچـین بـۆ لای بـەڵام کـوڕە پاشـا بـە ڕۆزمـاری گـوت ئێمـە لـە جەنگـداین لەگـەڵ شـارەکەی ئەوبـەر ئـەوبوو ڕۆزمـاری بـە هەناسـە سـاردی ویسـتی بـەرەو ماڵـەوە بڕواتـەوە کـە لـەو شـوێنەی لێـی هـاتبوو پـێش ئـەوەی بڕواتـەوە کـوڕە پاشـا پێـی ووت: بـەیانی ئاهـەنگێك سـاز ئەکـەین منـیش حـەز ئەکـەم تـۆش پێـی بـۆ ئاهەنگەکـە ڕۆزمـاریش لـە وەڵامـدا ووتـی: نـاتوانم بـەڵێن بـدەم بـەڵام ئەگـەر بـۆم ڕەخسا دێم... .

پاشـان لـە دەرگـای باخچـەی پاشـاوە بـە فڵچـە ئەفسـوناویەکەی وێنـەی ژوورەکـەی خـۆی کێشـا و تـوانی بەڕێتـەوە ژوورەکـەی خـۆی. ڕۆزمـاری بـۆ ڕۆژی دوایـی بـیری لـە ئاهەنگەکـە کـردەوە کـە چـۆن بچـێت؟ ئـەوەبوو وتوویـژی لەگـەڵ هاوڕێکـانی کـرد لـەبارەی ئاهەنگەکـە لەوکاتـەدا کـە باسـی ئاهەنگەکـەی دەکـرد بـۆ هاوڕێیـەکانی لـەو

کاتـەدا ئـەژدیها بچـووکەکە بـیری کـردەوە بـە ڕۆزمـاری گـوت بۆچـی فلّچـەکە بـەکار نـاهێنی؟ بـۆ ئـەوەی جـوانترین جلـت لەبـەردابێت ڕۆزمـاری لـە وەلاّمـدا ووتـی: بەڕاسـتی بیرێکـی جوانـە! بەرامبـەر ئاوێنەکـە ڕاوەسـتا و فلّچـە ئەفسـوناوییەکەی لەسـەر سـەری خـۆی دانـا و لەسـەرەوە تـا خـوارەوە بـە خـەیاڵ جلێکـی جـوان و تەسریحەکی جـوان و پێلاّوێکـی جـوان جـار لـەجار جـوانتر جلـی بـۆ خـۆی دروسـت ئـەکرد تـا جـوانترین شـێوەی لـە جلوبـەرگ تـاقی کـردەوە خـۆی ئامـادە کـرد بـۆ ئاهەنگەکـە سمـۆرە جاسوسـەکە گـوێی لـەو قسـانە بـوو ئـەو هەواڵانـەی بـۆ پیرەژنەکـە ڕاگەیانـد پیرەژنەکـە لێـی هاتـە ژوورەوە بـە نهـێنی کارەکـەی زانـی بـوو دووبـارە زۆری پـێ گـوت: نـاوی ئـەو کـوڕە چییە؟ ڕۆزمـاریش هـەر دەیگـوت نـازانم! نـازانم! ئـەوەبوو فلّچـەکەی لـێ شـکاند سـحری لـە ژوورەکـەی کـرد ووتـی: ئـەی ژوور ببـە بـە زینـدانێك بـۆ ئـەم کچـە درۆزنـە تـاوەکو بـە هـیچ شـێوەیەك نـەتوانی بێتـە دەرەوە وە هـیچ کەسـێك نـەتوانێ بێتـە ژوورەوە. پـیرە ژنەکـە بـە سـحر خـۆی هینایـە سـەر شـێوەی ڕۆزمـاری ڕۆیشـت بـۆ ئاهەنگەکـە بـۆ ئـەوەی ئـەو خۆشەویسـتییەی لـێ لـەناو بـەرێت، ڕۆزمـاریش زۆر غـەمبار بـوو کـە لـەناو زینداندا بـوو دوورە لـە هاوڕێکـانی و دوورە لـە کـوڕە پاشـا. لـەم کاتـەدا ئـەژدیها بچـووکەکە فێـری فـڕین بووبـوو کەروێشـکەکەی لەسـەر پشـتی خـۆی دانـا لـە پەنجـەرەوە قسـەی لەگـەڵ ڕۆزمـاری ئـەکرد نـەی ئـەتوانی بێتـە ژوورەوە ڕۆزمـاری بـە ئـەژدیها بچووکەکەی ووت: باوکـت ئـەتوانێ یارمـەتیمان بـدات بـۆ ئـەوەی ڕزگـارم بکـات لـەو زیندانـەدا ئـەژدیها بچـووکەکە چـوو بـۆ لای ئـەژدیها گەورەکـە کـە بـاوی بـوو پیرەژنەکـە ئـەژدیها گەورەکەشـی زینـدانی کردبـوو لەبـەر ئـەوەی ئـەژدیها بچـووکەکە هاوڕێیـەتی ڕۆزمـاری ئـەکرد. زۆر لەبـەر بـاوکی پاڕایـەوە کـە ڕۆزمـاری ڕزگـار بێـت یارمـەتی بـدات بـۆ ڕزگـار کردنـی بـاوکی پێـی گـوت: نـاتوانم یارمـەتیت بـدەم چـونکە ڕۆزمـاری درۆی کـردووە هاوڕێکـانی سـوێندیان خـوارد ڕۆزمـاری درۆ ناکـات ئـەژدیها گورەکـەش ووتـی: ئەگـەر ڕۆزمـاری درۆ ناکـات ئـەتوانێ لـە پەنجەرەکـە خـۆی فڕێداتـە خـوارەوە. بـێ ئـەوەی سـحرەکە کـاری تـێ بکـات هاوڕێکـانی بـە خێرایـی چـوون بـۆ لای پەنجەرەکـە بـە ڕۆزماریـان گـوت: هەرچـەندە ڕۆزمـاری دەترسـا ڕۆزمـاری بـە دڵنیـایی ئـەیزانی درۆ ناکـات ڕۆزمـاری لـە پەنجەرەکـە خـۆی فڕێدایـە سـەر پشـتی ئـەژدیها بچـووکەکە. ڕۆمـاری ڕزگـاری بـوو وورده وورده بـەرەو شـارەکە کەوتنـە ڕێ لـەناو ئاهەنگەکـەدا کـوڕە پاشـا وایزانـی پیرەژنەکـە ڕۆزماریـە چـونکە پیرەژنەکـە بـە سـحر خـۆی هینـابووە سـەر شـێوەی

ڕۆزمـــاری پیرەژنەکـــە هەوڵیـــدا ئـــەو کـــوڕە پاشـــایە لـــە ئاهەنگەکـــەدا جیـــا بکاتـــەوە ئەیویسـت کـوڕە پاشـا بکـوژێ ڕای کـرد کـوڕە پاشـا دوای کـەوت تـا لـە ئاهەنگەکـە هاتنـە دەرەوە پیرەژنەکـە دەسـتی کـرد بـە بـەکارهێنانی جـادو بـۆ ئـەوەی کـوڕە پاشـا لـەناو بـەرێت هـەر لـەو کاتـەدا بـوو کـە جـەنگاوەرەکانی دوژمنیـان کەوتنـە گیانیـــان لـــەناو کۆشـــکەکەدا شـــەڕ ڕووی دا لـــە نێـــوان هـــەردوولادا. کاتێـــک کـــە پیرەژنەکـــە ســـەرۆکی جـــەنگاوەرە دومنـــەکانی بـــینی دوژمـــنی کـــۆنی خـــۆی بـــوو سەرکردەکە بە پیرەژنەکەی گوت تۆ لێرە چی ئەکەی؟

پیرەژنەکـەش پێـی گـوت: تـۆ لێـرە چـی ئەکـەیت؟ هـۆی ڕوودانـی جەنگەکـە کـە لەنێوانیانـدا ڕوویـدا ئـەوە بـوو ئـەو کەسـەی کـە سـەرکردەی جـەنگاوەرە دوژمنـەکان بـوو بـاوکی ڕۆزمـاری بـوو دوژمـنی مـاڵی کـوڕە پاشـا بـوو کاتێـک کـە ڕۆزمـاری تەمـەنی (٣-٤) مـانگ بـووە ڕۆزمـاری لـێ بـزر بـووە لەوکاتـەدا وای ئـەزانی کـە بـاوکی کـوڕە پاشـا ڕۆزمـاری دزیـوە، ئـەوەبوو بـاوکی ڕۆزمـاری هـۆی جەنگەکـەی بـۆ پیرەژنەکـە ڕوون کـردەوە کـە بۆچـی ئـەو جەنگـە ئـەکات؟ لـەو کاتـەدا پاشـا زانـی بۆچـی ئـەو جەنگـەی لەگەڵـدا ئـەکات پیرەژنەکـە دای لـە قاقـای پێکـەنین ووتـی مـن کچەکەتم بردووە ئەوە هەژدە ساڵە لای منە.

ڕۆزمـاری لەبـەر دەرگاکـە ڕاوەسـتا بـوو بـاوکی ڕۆزمـاری ووتـی: بۆچـی کچـەکەی منـت بـرد؟ خـۆ تـۆ هاوڕێیـەکی نزیکـی مـن بـووی! پیرەژنەکـەش لـە وەڵامـدا ووتـی نـەخێر مـن هـاوڕێی نزیکـت نـەبووم بـەڵکو خۆشەویسـتت بـووم تـۆ منـت نـەهێنا مـن زۆر تـۆم خۆشدەویسـت ڕقـم لـە تـۆ و ژنەکـەت بـوو، بۆیـە ویسـتم بـەهەرە شـێوەیەک بـێ تۆڵـەی خۆمـت لـێ بکەمـەوە ئـەویش بـە دزیـنی ڕۆزمـاری تـوانیم تۆڵەکـە بکەمـەوە لەوکاتـەدا ڕۆزمـاری بەپەلـە هـات خـۆی کـردە نـاو باوەشـی بـاوکی ووتـی: باوکـە مـنم ڕۆزمـاری ئـەو پیرەژنـە مـنی بردبـوو. پیرەژنەکـە ویسـتی جادوویـان لـێ بکـات بـەڵام ئـەژدیها بچـووکەکە بـەهۆی ئـاگری دەمیـەوە ئـاگری بـڵاو کـردەوە نەیهێشـت کاریـان لـێ بکـات پیرەژنەکـە ووتـی هـەر دەبـێ ڕۆزمـاری بکـوژم ئەمـە تاکـە ڕێگەیـە ڕۆزمـاری هـەڵات بـەرەو باخچـەکەی کۆشـکی پاشـا بـەرەو لای ئـەو دەرگایـە ڕۆیشـت کـە وێنـەی ژوورەکـەی خـۆی لـێ دروسـت کردبـوو پیرەژنەکـە بـە ڕاکـردن بـە دواوەیـەوە بـوو ڕۆزمـاری خـۆی لـە پشـت دەرگاکـە شـاردەوە کاتێـک پیرەژنەکـە هاتـە ژوورەوە دەرگاکـەی لـە دەمـی پیرەژنەکـە ڕاکێشـا پـیرەژن خـۆی لـە ژووری ڕۆزمـاری بینیـەوە زۆری هەوڵـدا جادووەکـەی ژوورەکـە هەڵوەشـێنێتەوە بـەڵام نـەیتوانی چـونکە خـۆی وای دانـابوو کـە ئـەم ژوورەوە ببێتـە زینـدانی هـەتا

هـەتایی بـۆ کەسـێکی درۆزن پیرەژنەکـەش خـۆی درۆزن بـوو کەوتـە زینـدانی بـۆ هەتا هەتایی.

ئینجـا کـوڕی پاشـا داوای رۆزمـاری کـرد لـە بـاوکی رۆزمـاری بـۆ پێـك هێنـانی ژیـانی هاوسـەری بـەهۆی ئـەو خۆشەویسـتییەی لـە نێوانیانـدا هەیـە دەسـتیان کـرد بـە ئاهـەنگ گێـڕان بـە بۆنـەی بەیـەکتر گەیشـتنی رۆزمـاری و کـوڕە پاشـا بـۆ ژیـانی هاوسەری هەردووکیان ژیانێکی خۆشیان بەسەر برد.

- هەرچـەندە ئەفسـانەکان کەسـایەتی و ڕەگـەزی ئەفسـانەییان تێدایـە، بـەڵام کـار و خەسڵەتەکان هـەر کـاری مـرۆڤن، مـرۆڤ بـە هـەموو جۆرەکانییـەوە، ڕق و خۆشەویسـتی و مەسـەلە دەروونیـەکان کۆمەڵایەتییـەکان، هێـز گـەلێکن کـە گـەڕی ئەفسـانە و حیکایەتـەکانی گیانـداران و بـەر ئاگردانیـان لەسـەر دەسوڕێ.
- ئەم ئەفسانەیە زۆرتـر لـە وەرگێـڕان دەکـات، تاکۆکردنـەوە، چـونکە شـوێن و ڕەوشـت و کەرەستەکان زۆریـان لـە هـی رۆژئـاوا دەچـن و کەرەسـتەی تـازەو شارسـتانی ئـەوانی تێدایـە. بـەڵام کۆکردنـەوە نووسـیویەتی لـە بـاوکی وەرگرتووە؟!.

# سوڵتان مەحمود

**کۆکردنەوەی: ئاوارە سەلاح فەتاح**

**گێڕانەوەی: مریەم سلەیمان محەمەد ٤٦ ساڵ**

**نەخوێندەوار بوو خەڵکی ناوچەی زەڵم**

ڕۆژێـک لـە ڕۆژان دەبێـت،سـوڵتانێك دەبێـت نـاوی (سـوڵتان مـەحمود) دەبێـت سـوڵتانی شـاری (خەزێنـە) دەبێـت موسـڵما نابێـت سـێ ژنـی دەبـێ وەزیرێکـی دەبێـت زۆر زیـرەك دەبێـت (سـوڵتان مـەحمود) لـە زۆربـەی کارەکانیـدا پـرس بـەم وەزیـرە دەکـات و متمانەیـەکی زۆریشـی پێیـەتی ڕۆژێـك (سـوڵتان مـەحمود) بڕیـار دەدات لەگـەڵ وەزیرەکەیـدا بچـن بـۆ سـەفەر بـۆ ماوەیـەکی دووروودرێـژ لـە سـەفەر دەمێننـەوە ڕۆژێـك لەگـەڵ وەزیـردا ڕێیـان دەکەوێتـە دێیـەکی بچـکۆلانە دەچـنە پـەنای چـادرێك دەبیـنن ژن و پیـاوێکی لێیـە ژنەکـە منـداڵی دەبێـت لەوکاتـەدا پیـاوی ژنەکـە بـە سـوڵتان و وەزیـر دەڵێـت کـە لەوێـدا لاچـن چـونکە ژنەکـەم شـەرم دەکـات تـا منداڵەکـەی دەبێـت. دوای ژنەکـە منـداڵی دەبێـت کـوڕێکی جـوانی دەبێـت لەوکاتەشـدا سـوڵتان خـۆی (٣) ژنـی دەبـی ژنـە بچـوکەکەی لـەکاتی لـەدایك بـوونی ئـەو کـوڕەدا ژنـی (سـوڵتان) منـداڵی دەبـێ کچـێکس جـوانی دەبـێ لەوکاتـەدا وەزیـر دەسـت دەکاتـە پێکـەنین سـوڵتان بـە وەزیـر دەڵـێ بـۆ پێدەکـەنی ئـەویش دەڵێـت (ئـەو کـوڕەی ئێسـتا لـەدایك بـوو ە دەبێتـە هاوسـەری کچـەکەت) بـاوکی کـوڕە شـوان دەبێـت زۆر هـەژار دەبـن (سـوڵتان) بـیر دەکاتـەوە بـۆ ڕێگایـەك کـە ئـەو کـوڕە لـەناو ببـات بـە هـەر ڕێگایـەك بێـت بۆیـە سـوڵتان داوا دەکـات لـە بـاوکی کوڕەکـە کـە ئـەو منداڵـەی بـداتێ یـان پێـی بفرۆشـن بـە هەرچـەند پـارە بێـت چـەند داوا بکـەن دەیـان دەمـێ، دایـك و بـاوکی منداڵەکـە ڕازی نـابن پاشـان دوای زۆر کردنێکـی زۆر ڕازی دەبـن کـە منداڵەکـەی بـدەنێ ئـەو شـەوە سـوڵتان و وەزیـر لـە مـاڵی شـوانەکە دەمێننـەوە (سـوڵتان) بـە دایکـی منداڵەکـە دەڵـێ کـە نـابێ ئەمشـەو شـیر بـدەیت بـە منداڵەکـەت پاشـان ڕۆژ دەبێتـەوە سـوڵتان بـە وەزیـر دەڵێـت: منداڵەکـە هـەڵگرن بـا بـڕۆین. دەڕۆن دەڕۆن تـا دەگەنـە بیرێـك سـوڵتان بـە وەزیـر دەڵێـت (کوڕەکـەم بـدەرێ سـوڵتان کوڕەکـە هەڵدەداتـە بیرەکـەوە دەڵـێ (دەبـا بـبێ بـە زاوامـان) ئینجـا

سـولّتان و وەزیـر دەڕۆن منداڵەکـە لـەناو بیرەکـەدا جێـدەهێڵن بـە عـەقڵی خۆیـان مـردووە. پیـاوێکی دەوڵەمەنـد دەبێـت بـەس منـداڵیان نابێـت ڕۆژێـك لەگـەڵ چـەند قافلەیەکـدا دەچـن بـۆ دەرەوە بـۆ گـەڕان ماوەیـەکی زۆر دەگـەڕێن دوای ئـەوە ڕێیـان دەکەوێتـە ئـەو بـیرەی کـە منداڵەکـەی تێدایـە پیـاوە دەوڵەمەندەکـە فـەرمان بـە یـەکێك لـە نۆکـەرەکانی دەکـات کـە ئـاو لـە بیرەکـە بهێننـە دەرەوە چـونکە تینویـەتی لەوکاتـەدا دولچـەکە بـەرز دەکاتـەوە زۆر قـورس دەبـێ، سـەری دەسـوڕمێ هـەموو پیـاوان بـانگ دەکـا کاتێـك دولچـەکە بـەرز دەکەنـەوە دەبیـنن کـوڕێکی جـوانی تێدایـە پەنجەیـەکی شـیری لێـدێ ئـەم منداڵـە ئـەم ماوەیـە بـەو پەنجـە شـیرەی ژیـاوە، بـە ئـەمری خـوا لەبـەر ئـەوەی ئـەو پیـاوە منـداڵی نییـە منداڵەکـە هەڵدەگرێتـەوە بۆخـۆی کـە خـۆی بـەخێوی بکـات پاشـان دەیباتـە ماڵـەوە پاشـان ژنەکـەی زۆری پـێ خـۆش دەبێـت چـونکە منـداڵیان نـابێ بۆیـە ژنەکـە زۆر بـەجوانی بـەخێوی دەکـات. ئـەم کـوڕە گـەورە دەکـەن تەمـەنی دەبێـت بـە بـە (١٥)سـاڵ ڕۆژێـك (سـولّتان مـەحمود) لەگـەڵ وەزیرەکەیـدا لـە گەڕانـدا دەبـن لـە سـەفەرە دووروودرێژەکەیانـدا ڕێیـان دەکەوێتـە ئـەو شـارەی کـە کوڕەکـەی تێدایـە پاشـان خـەڵکی شـارەکە پێشـوازییەکی زۆر گـەرم لـە سـولّتان و وەزیـر دەکـەن ڕێزیـان لـێ دەگـرن نانیـان بـۆ ئامـادە دەکـەن، نـان دەخـۆن و پاشـان چاییان بـۆ دەهێـنن ئـەو کەسـەی کـە چـایەکەیان بـۆ دەهێنێـت کوڕەکەیـە وەزیرەکـە لـەو کاتـەدا کوڕەکـە دەبـینێ زۆر زیـرەك دەبـێ ئـازا کوڕەکـە دەناسـێتەوە دەسـت دەکاتـە پێکـەنین سـولّتان پێـی دەڵـێ بـۆ پێدەکـەنی؟ وەزیـریش پێـی دەڵـێ ئـەو منداڵـەی کـە تـۆ کردتـە نـاو بیرەکـەوە ئـەو کـوڕە ئێسـتا مـاوە ئـەوەتا (چـا)ت بـۆ دەهێنێـت. سـولّتان سـەری دەسـوڕمێ زۆریشـی پـێ نـاخۆش دەبێـت بۆیـە بیردەکاتـەوە کـە پیلانێـك دابڕێـژێت بـۆ ئـەوەی ئـەو کـوڕە لـەناو ببـات! بۆیـە بـە بـاوکی کوڕەکـە دەڵێـت یـەکێکم بـۆ پەیـدا بکـە بـۆ ئـەوەی نامەیـەکم هەیـە دەینووسـم بـۆ خێـزانم لـە شـاری (خەزێنـە) بـۆم ببـات بـاوکی کوڕەکـەش دەڵێـت ئێسـتا پـەنجا پیـاوت بـۆ پەیـدا دەکـەم (سـولّتان) دەڵێـت مـن کەسـم نـاوێ تـەنها کوڕەکـەی خـۆتم دەوێ بـاوکی کوڕەکـەش دەڵـێ نـاتوانین ئـەو بنێـرین چـونکە ئێمـە تـەنها ئـەو کوڕەمـان هەیـە دایکـی دڵـی نایـە سـولّتان دەڵێـت ئەگـەر ڕازی نـەبن هـەر ئێسـتا کوڕەکـەتان دەکـوژم. پاشـان کوڕەکـە دەڵێـت: بابـە مـن دەڕۆم بـانمکوژن (سـولّتان) کاغەزەکـە دەنووسـێ مـۆری سـولّتانی لـێ دەدەن لـەناو کاغەزەکـەدا

نووسـراوه "گـەورەكانى مـاڵى مـن ئـەم كـوڕەى كـە ئێسـتا ئـەم نامـەم پـێ نـاردووه هــەر هاتــە پێشــەوه دەيكـوژن بـۆم سـەر دەبـڕن" ئەمـە كورتــەى نامەكـە بـوو كوڕەكـە كاغەزەكـەى دەكاتـە گيرفانييـەوه و دەچـێت بـۆ شـارى (خەزێنـە) دواى ماوەيـەكى زۆر لـە گـەڕان پاشـان دەگاتـە شـار خـوار مـاڵى (سـوڵتان) باخچـەيەكى جوانى تێدا دەبـێ ئـەو باخچەيە لـەناو مـاڵى كچـى سوڵتان دايـە ئـەو كچەى كـە خـوا بــۆ ئــەو كــوڕەى دانــابوو كوڕەكــە دەچــێتە باخچــەكەوه ئەســپەكەى لــەوێ دەبەســتێتەوه دەم و چـاوى دەشـوات و زۆر مانـدو دەبـێ خـەوى لـێ دەكـەوێت. لەوكاتــەى كوڕەكــە خــەوتووه كچــەكە لەگــەڵ كارەكەرەكــەى دێتــە باخچــەكەوه كچـەكە ئەسـپێك دەبينى سـەرى سوڕ دەمـينێ! دەڵـێ: بـە كارەكەرەكـەى ئـەم ئـەم ئەسـپە هـى كێيـە؟ پاشـان هـەردووكيان دەگـەڕێن بـزانن خـاوەنى ئـەم ئەسـپە كێيـە دواى ئـەوه كچـەكە كوڕەكـە دەبينێـت كـە خـەوتووه زۆر جـوان دێتـە پـێش چـاوى عاشـقى دەبێـت كچـەكە بـە كارەكەرەكـەى دەڵێـت: تـۆ بـڕۆ بـزانم ئـەم كـوڕە چـى دەكـات لێـرە بۆچـى لێـرە خـەوتووه دواى ئـەوەى ئـەو دەڕوات كچـەكە وردە وردە لێـى نزيـك دەبێتـەوه دەبينێـت كاغـەزێك لـەناو گيرفـانى كوڕەكەدايـە سـوك سـوك كاغەزەكــە لــەناو گيرفانيــدا دەردەهێنێــت دەيخوێنێتــەوه، ئــەوجا ئــەزانى بــە مەسـەلەكە ئـەو نامەيـە ئـەدڕێنێ كاغـەزێكى تـر دەردێـنێ ئـەم نامەيـە دەنووسـێ "بـۆ گـەورەكانى مـاڵى مـن ئـەم كـوڕەى كـە ئێسـتا ئـەم نامـەم پێدا نـاردووه دەيكـەن بـە زاوام مـەلا دێـنن كچـەكەم لـەم كـوڕە مـارە دەكـەن" پاشـان مـۆرى سـوڵتانى لـێ دەدات (سـوڵتان) باوكيــەتى مــۆرى دەبێـت پاشــان دەيكاتــە گيرفــانى پاشــان كچـەكە بـەجێى دەهێڵـێ ئێـوارە دەبـێ كوڕەكـە هەڵدەسـتێ لـە خـەو ڕێدەكـەوێ بـۆ مـاڵى (سـوڵتان) دەڵێـت ميـوانى سـوڵتان هـاتووه پێشـوازييەكى گـەرمى لـێ دەكـەن پاشـان كوڕەكـە نامەكـە دەدات بـە ژنەكـەى دەيخوێنێتـەوه دايكـى بـە كچـەكەى دەڵێت دەبـێ تـۆ شـو بكـەيت بـەو كـوڕە چـونكە باوكـت فـەرمانى داوه كچـەكەش بـە گاڵتـە دەسـت دەكاتـە گريـان دەڵێـت چـۆن وا دەبێـت مـن شـو بكـەم بـەم كـوڕە پێشـى خـۆش دەبـێ بۆيـە دەگريـێ كـە پێـى نـەزانن پاشـان كچـەكە لـە كوڕەكـە مـارە دەكــەن ژيــانێكى بەختــەوەريان دەبێــت دواى (٣) ســاڵ دەبنــە خــاوەن كــچ و كــوڕێكى جوانكيلــە ڕۆژێــك هــەواڵ دێــت كــە ئــەمڕۆ ســوڵتان لەگــەڵ وەزيــردا دەگەڕێنـەوه، پاشـان هـەموو خـەڵكى شـارى (خەزێنـە) خۆيـان ئامـادە دەكـەن بـۆ پێشـوازى كـردن هـەموويان سـوارى ئەسـپ دەبـن ڕێدەكـەون كچـى سـوڵتان سـوارى

ئەسپێك دەبێت لەگەڵ كوڕەكەی، زاواكەشی سواری ئەسپێك دەبێت. لەگەڵ كچەكەی، پاشان بەڕێ دەكەون پاشان ڕێگایەكی زۆر دەبڕن دوای ئەوە خەڵكی سوڵتان و وەزیر دەبینن وەزیر لە دوورەوە كوڕەكە دەبینن بە سواری ئەسپێك هاتووە بۆ پێشوازییان دەست دەكاتە پێكەنین، سوڵتان دەڵێت: بۆ پێدەكەنی؟ وەزیر دەڵێت: ئەو كوڕەی كە تۆ ناردت كە نامەكە بداتە دەست ماڵەوە بیكوژن ئەو كوڕ ئێستا زاواتە ئێستا هاتۆتە پێشوازیت. دوای ئەوە لەیەكتر نزیك دەبنەوە (سوڵتان) زۆر سەری دەسوڕمێ پاشان تەواو لە یەكتری نزیك دەبنەوە سوڵتان دادەبەزێ لە ئەسپەكەی دەچێتە لای زاواكەی ماچی دەكات پاشان كچەكەی ماچ دەكات كچەزاكانی دەكاتە باوەشی و ماچیان دەكات پاشان فەرمان دەدات بڕۆنە ماڵەوە كە دەچنە ماڵەوە سوڵتان هەموو چیرۆكەكە بۆ كوڕو كچەكەی و ژنەكانی دەگێڕێتەوە بە زاواكەی دەڵێت: كە ئەو پیاوە باوكی تۆ نییە بەڵكو باوكی تۆ پیاوێكە ئێستا لەناو دێیەك دەژی وەختی خۆی من تۆم كڕیوەتەوە بۆیە كوڕەكە بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ لای باوكە ڕاستەقینەكەی پاشان بەیانی دەبێتەوە كوڕەكە بە ژنەكەی دەڵێت: خۆیان ئامادە بكەن بەڕێ بكەون بۆ ئەو دێیەی كە باوكە ڕاستەقینەكەی لێیە پاشان بەڕێ دەكەون دوای گەڕانێكی زۆر دەگەنە دێیەكە شوێنێكی زۆر بچووكەلەیە بەڵام كوڕەكە باوك و دایكی ناناسێتەوە چونكە كاتێك ئەویان بردووە ئەو منداڵ بووە، بەڵام باوكی كە كوڕەكە دەبینی دەیناسێتەوە دەچێتە پێشەوە پێی دەڵێ: تۆ كوڕی منی. باوكی مەسەلەكەی بۆ دەگێڕێتەوە كوڕەكەش بەهەمان شێوە بۆیە هەردووكیان بە یەكتر شاد دەبنەوە باوكی بووكەكەی و كوڕەزاكانی ماچ دەكات دەچنە ماڵەوە بە دایكیشی شاد دەبنەوە كوڕەكە بڕیار دەدات كە لەوێ خانوویەك دروست بكات و ژیانی خۆی لەوێ پێك بهێنێ.

**- سوڵتان مەحمود غەزنەوی، بەزۆر شێوە هاتۆتە نێو حەكایەتی كوردی و بوەتە پاڵەوانی زۆر چیرۆكی سەیر، لەم حەكایەتەش پێ لەسەر (چارەنوس) و (قەدەر) دادەگیرێ، كە كەس ناتوانێ چارەنوسی كەسێكی تر بگۆڕێ، با ئەو كەسە شا و سوڵتانیش بێت.**

# پاشا و جوڵەك

**کۆکردنەوەی: شەیدا بەهائەدین عارف**

**گێڕانەوەی: عەدلە حەمە ڕەشی، ٥٥ ساڵ**

**نەخوێندەوارە، هەڵەبجەیی**

ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاو و ژنێك دەبێت لە لادێیەکا ژیانێکی ئاسایی بەسەر دەبەن پیاوەکە ئیشی جوڵەك دەبێت ژنەکەی زۆری لێ دەکات ببێت بە مەلا ئینجا پیاوەکەشی دەڵێ: ژنەکە من هەر ئیشی جوڵەکی دەزانم مەلایەتی هەروا ئاسان نییە نازانم.

ژنەکەشی دەڵێ بۆچی؟ ئەوانەی کە ژنی مەلان کە ئەچن بۆ کانی هەموو خەڵك ڕێزیان لێ دەگرن و ئەبێ تۆش ببی بە مەلا و منیش ببم بە مەلاژن. پیاوەکەشی دەڵێ ئەی ژنەکە من چۆن ببم بە مەلا کە هێشتا نوێژ و شایەتوومان نازانم.

ژنەکەشی دەڵێ لەم لادێیەدا با بچین بۆ لادێیەکی تر با کەس نەمان ناسێ. ئەویش هەڵدەستێ کەرێکیان دەبێت هەموو شتێك دەپێچێتەوە و جلی مەلای لەبەر دەکات و ڕێ دەکەون و دەچن بۆ شوێنێکی تر، ئەو لادێیە مەلایان نابێ خەڵکی لادێیەکە جواب بۆ پاشاکەیان دەنێرن کەوا مەلایەك هاتووە بۆ لادێیەکەیان. بۆیە پاشا دەڵێت: پێشوازییەکی باشی لێ بکەن پێی بڵێن بزانە پێش نوێژیمان دەکات پاشا ڕێزێکی زۆری لێ دەگرێت و دەڵێت ئاوایەکەت ڕوون کردەوە بەخێرهاتنی دەکات وە پاشا داوا لە مەلا دەکات و دەڵێت ئەمڕۆ دەبێت بەر نوێژیمان بۆ بکەیت.

وە مەلا دەڵێت: ئەی خوا من هیچ نازانم وە کاتێك دەست دەکات بە نوێژکردن پێڵاوەکانی لەلای خۆی دادەنێت بۆ ئەوەی ڕابکات. پاشاش پێڵاوەکانی لەلای خۆی دادەنێت کاتێك ئەیەوێت بچێت بۆ سوجدە دەست بۆ پێڵاوەکانی دەبات و ڕادەکات و پاشا بەدوایدا ڕادەکات لەوێدا مزگەوتەکە دەڕوخێت. کاتێك کە دێنە دەرەوە پاشاکە دەڵێت: ئەی مەلا کە تۆ زانیت ئەم مزگەوتە دەروخێت بۆچی بە ئێمەت نەوتووە؟ مەلاکەش دەڵێت: لەبەر چاوم بووە کە بڕوخێت. ڕۆژێکیان پاشا بانگی مەلا دەکات. ئەی مەلا کوپێك زێرم دزراوە ئەگەر تۆ ئەو کوپەم بۆ بدۆزیتەوە و دزەکانم بۆ بگریت پاداشتی زۆرت دەدەمێ مەلاکەش هیچ حساب

نازانێت بۆیە (٤٠) بەرد هەڵدەگرێت و (کولەکەیەك) دادەنێت. هەر ئێوارەیەك بەردێك دەخاتە ناو کولوکەکەوە لەو کاتەدا یەکێك لە دزەکان سەیری مەلا دەکات بۆ ئەوەی بزانێت چی دەکا و چی دەڵێت ئەو دزە ئەڕوات بۆ لای دزەکانی تر بۆ ئەوەی بە دزەکانی تریش بڵێ کە مەلاکە پێی زانیون ئەوانیش هەڵدەستن دەچن بۆ لای پاشا بۆ ئەوەی لێیان خۆش ببێت وە دزەکان کوپەکەی بۆ دەبەنەوە و داوای لێبوردنی لێ دەکەن وە پاشاکەش نایکات بە نامەردی گوێی دزەکان کون دەکات و یەکی ئەڵقەیەکیان لە گوێ دەکات. وە دزەکان دەکات بە خوڵامی مەلا و پاشاکەش لەبەر ئەوەی مەلاکە ئیشی باشی بۆ کردووە بۆیە لەبڕی پاداشتی دەداتێ ماڵێکی دەداتێ.

ڕۆژێك مەلاکە لە ماڵی خۆیدا یادی ئیشی جۆلاکیەکەی دەکاتەوە دەستی دەجولێنێت وە پاشاکەش لە پەنجەرەکەوە چاوی لێ دەبێت وە هەرچی لە پاشایەکەیە مەلاکە دەڵێت خانوەکەت دەڕوخێت بۆیە پاشاکە لە ماڵەکەی خۆی ڕادەکاتە دەرەوە و سوتفە لەوکاتەدا خانووی پاشاکە ئەڕوخێت ئینجا پاشاکە بانگی مەلا دەکات ئەڵێ ئەوە چۆن زانیت کە ماڵەکەمان دەڕوخێ. مەلاکەش خۆی تەریق ناکاتەوە ئەڵێ خۆم قسەم نەکرد.

ئەم مەلایە چونکە پیاوێکی بێ گوناح بووە لە ترسی ژنەکەی هەموو ئە کارانەی کردووە بۆیە خودا بەزەیی پێیدا دێتەوە لە هەموو ناخۆشییەك ڕزگاری دەکات هەموو شتێکی بۆ ئاسان دەکات.

## هاوڕێ

ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو هاوڕێ ئەبن یەکێك ناوی (ڕەزا) ئەبێ ئەوی تریان ناوی (ئەحمەد) دەبێت هاوڕێیەتی ئەم دوو کەسە لە زانکۆوە دەست پێدەکات چوار ساڵی زانکۆ پێکەوە بەسەر دەبەن دوای ئەوەش دوو ساڵی سەربازیش تەواو دەکەن ئەحمەد و ڕەزا زۆر زۆر یەکیان خۆش دەوێ و هاوڕێیەتیەکی پتەو لە نێوانیاندا هەیە دوای تەواو بوونی سەربازی لێك جیا دەبنەوە و هەر یەکەو بۆ شاری خۆی دەگەڕێتەوە ئەحمەد بۆ شیراز و ڕەزا بۆ ئەسفەهان.

دوای ماوەیەکی دوور و درێژ ڕەزا بۆ بینینی ئەحمەد دەڕوات بۆ شیراز هەفتەیەك لەوێ دەبێت ڕۆژی دوایی ڕەزا کە دەیەوێت بگەڕێتەوە ئەحمەد دەڵێت نانی ئەم نیوەڕۆیە لەسەر بانی دەخۆین. پێکەوە دەچنە سەربانی بۆ خواردنی نان ئەحمەد دەڵێت: ڕەزا خەبەرێکی خۆشم پێیە بۆت ڕەزا دەڵێت جارێ لێگەڕێ با

نانەکـەمان بخـۆین. ئەحمـەد دەیـەوێت بڵـێ کـە دەسـگیرانم هەیـە. بـەڵام رەزا لـە قەشمـەربازی مـەجالی ئەحمـەد نـادات پـاش کـەمێك کچـێکی دراوسـێی مـاڵی ئەحمـەد دێتـە سـەریان رەزا سـەیری دەکـات و دڵـی لێـی دەچـێت. پاشـان دەڵـێ بـە ئەحمـەد کـە شـتێکت پـێ دەڵـێم بـێ دڵـیم نەکـەیت. بڵـێ بـە ماڵـەوەتان کـە ئـەو کچـە جوانـەی دراوسـێتانم بـۆ داوا کـەن، ئەحمـەد زۆر تێکدەچـێت بێـدەنگ دەبـێ چـونکە ئـەو کچـە تاکـە خۆشەویسـتیتی و دەزگیرانـی ئەحمـەد دەبێـت. دوای بێـدەنگی ئەحمـەد رەزا دیسـان دەڵـێ چـی بـوو بـۆم داوا دەکـەی؟ بـە هاورێیـەتیمان سـوێند دەخـۆم دڵـم بشـکێنی عـاجز دەبم ئەحمـەد دەڵێـت باشـە بـەڵێنت پـێ دەدەم کـە ئـەو کچـە ببێتـە هاوسـەری تـۆ دوای ماوەیـە دێنـە خـوارەوە رەزا دەڕواتـەوە بـۆ شـیراز ئەحمـەد بـە ماڵـەوەیان دەڵێـت کـە نـابێ کـەس قسـە بکـات وە نـابێ رەزا هەسـت بـەم مەسـەلە بکـات پاشـان دەڕوات بـۆ لای دەسـگیرانەکەی کـە نەسـرینی نـاو دەبـێ ئەحمـەد دەڵـێ: نەسـرین بـۆ شـتێکی وا هـاتووم ئەگـەر منـت خـۆش دەوێ قسـەم ناشـکێنی و بـۆ لەمـەودوا مـن و تـۆ وەك خوشـك و بـرا وایـن و هـیچ کـاتێکیش بـیر لـەوە نەکەیتـەوە کە من و تۆ خۆشەویستی یەك بوین.

چـونکە تـۆ ئێسـتا خۆشەویسـتی ڕەزای کـە خۆشەویسـترین هاورێمـە نەسـرین هەرچـی هـەوڵ دەدات کـە ئەحمـەد لـەم بڕیـارە پەشـیمان کاتـەوە بـەڵام ئەحمـەد هـەر لەسـەر بڕیارەکـەی خـۆی سـوور دەبێـت (نەسـرین)یـش هەرچـەند زۆر بەلایـەوە سـەختە بـەڵام دڵی ئەحمەدی پێ ناشکێ ئەڵێ هەرچی تۆ بڵێی.

پاشـان ئەحمـەد تەلـەفۆن دەکـات بـۆ رەزا پێـی دەڵـێ کـە (دایـك)ی بهێنێـت بـەڵام رەزا لەبـەر ئـەوەی (دایکـی)ی ناسـاغەو وە بـاوکی مـردووە بۆیـە دوو پـوری لەگـەڵ خـۆی دەبـات بـۆ شـیراز و ئاهـەنگ و شـیرینی خواردنـەوە. تـەواو دەبێتـو رەزا بـە دڵێکـی زۆر خۆشـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەسـفەهان لەگـەڵ نەسـریندا وە ئەحمەدیشـی بـە دڵێکـی پـڕ لـە غەمـەوە لـە شـیراز دەمێنێتـەوە ماوەیـەکی زۆری بەسـەردا دەچـێ کـە ئەحمـەد ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ غـەمبارتر و بێتاقـەت تـر دەبێـت لەبـەر نەسـرین چـونکە نەسـرین زۆر خۆشەویسـت بـوو بەلایـەوە وە سـەختە کـە لـەبیری بکـات بۆیـە ناچـار دەبـی پـەنا دەباتـە بـەر مـادەی بێهۆشـکەر وە دوای ماوەیـەك ئەوەنـدە لاواز دەبێـت کـە وەك شـێتی لـێ دێـت کـە وای لێـدێت دایـك و بـاوکی پێـی دەڵـێن: تـۆ ئـابرووی ئێمـەت بـردووە وە پێـی دەڵـێن ئـەم ماڵـە جێـی تـۆ نییـە و دەری دەکـەن. بۆیـە ئەحمـەد ئـاوارە و دەربـەدەری شـەقامەکان دەبێـت دوای ماوەیـەك کـە هـیچ کـەس جێـی ناکاتـەوە دەڵێـت: خـۆ مـن هاورێیـەکم هەیـە کـە پیـاوەتیم زۆر بـووە بـۆی ئەگـەر

داوای گیانیشی لیّ بکەم نالّێت نا بۆیە بڕیار دەدات کە بڕوات بۆ ئەسفەهان بۆ لای ڕەزا پاش چەند ڕۆژێك دەچێت بۆ مالّی ڕەزا و لە دەرگا دەدات ڕەزا دەرگای بۆ دەکاتەوە ئەحمەد بەخۆشحالّیەوە دەیەوێت دەست بکاتە ملی ڕەزا بەلاّم ڕەزا پێی دەلّیّ من تۆ ناناسم دوورکەورەوە لێرە ئەحمەد بە گومانەوە دەلّیّ: ڕەزا منم ئەحمەد هاوڕێت بەلاّم ڕەزا دەرگاکە بە ڕوویدا دادەخا و دەلّیّ بڕۆ ئەحمەدی لاواز و دۆڕاو کە ئومێدی بە ڕەزاش نەماوە خەمەکانی زیاتر بوو بە هێواشی لە شەقامەکاندا تێدەپەڕی کە لەناکاو دوو کوڕی شەقاوە ڕێی پیّ دەگرن و پێی دەلّێن لێرە چی دەکەی؟ ئەحمەد بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن ئاوای بەسەر هاتووە بەلاّم دوو کوڕەکە ئەلّێن تۆ تلیاکت لیّ بڕاوە ئەو پارەیە بگرە بیدە بە تلیاك با هۆشت بکرێتەوە ئەحمەد سەری سوڕ دەمێنیّ دەلّێت ڕەحمەت لەو دوو شەقاوە کە زۆر لە هاوڕێیەکەی خۆم باشترن پاشان دەڕوات لەناو بازاڕدا دەگەڕێت ئافرەتێکی بەتەمەن لە سەیارەیەکی مۆدیل بەرزی دەبیّ ئەحمەد سەردەخا و دەلّیّ کوڕم بۆ وات بەسەر هاتووە بۆ خوت داوە بەم تلیاکەوە ئەحمەد بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە وە دەلّیّ: من خاوەنی شەهادەم ئافرەتە بەتەمەنەکە پێی دەلّیّ ئەگەر بتەویّ من یارمەتیت دەدەم کە ڕزگارت بێت لەم بار و دۆخە. بەلاّم تۆش بەلّێنم پیّ بدە کە هەرچی من ئەلّێم لە قسەم دەرنەچی تا بە تەواوی باش دەبیەوە پاشان دەیباتەوە مالّی خۆیان ئافرەتەکە بە ئەحمەد دەلّێت: من هیچم لەتۆ ناوێت بێجگە لەوەی کە من کچێکی تاقانەم هەیە کە لە زانکۆ دەخوێنێت کاتێك دەگەڕێتەوە تەنهایە لە مالّ من ئەمەوێت کە تۆ ئاگات لە کچەکەم بێت چونکە من خۆم سەرقالّی ئیشی شەریکەم زۆر درەنگ دێمەوە بۆ مالّ ماوەیەك بەسەر دەچیّ ئافرەتەکە ئەحمەد دەبات بۆ لای پزیشك بۆ ئەوەی کە ئەحمەد تەرکی مادە بیّ هۆش کەرەکان بکات ئەحمەد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لەباشی دەکات ڕۆژانە بە خوێندنی ڕۆژنامە خۆی سەر گەرم دەکات.

پاشی ماوەیەك ئەحمەد بە تەواوی باش دەبێتەوە ئافرەتەکە پێی دەلّیّ کە من تەمەنم کردووە وە خاوەنی شەریکەیەکی گەورە و سەرمایەکی زۆرم چونکە کچەکەم سەرقالّی خوێندنە لەم ماوەیەشدا تۆم بۆ تاقی بوەتەوە ئەمەوێت تۆ بکەم بە مدیری شەریکەکەم ئەحمەد زۆر خۆشحالّ دەبیّ وە دەلّیّ بەلاّم من لە ئیشی شەریکە نازانم دوای ئەوەشی سەرسام ماوم کە تۆ بۆچی ئەم هەموو باشییە لەگەلّ من دەکەی؟ ئافرەتەکە پێی دەلّیّ: تۆ زۆر کوڕێکی پاکی دوای ئەوەش کەسم لە تۆ باشتر دەست ناکەویّ ڕۆژانێکی زۆر بەسەر دەچی کە ئافرەتەکە دەلّێت ئەحمەد من دەمەوێت پێت بلّێم کە (مەهنان)ی کچم بدەم بە تۆ

چونکه خۆشی حەز دەکات. وە هیوارم ڕەتی نەکەیتەوە ئەحمەدیش دەڵێت من لە مەهناز باشترم دەست ناکەوێت ڕازی دەبێت کە مەهناز بێنێت ماوەیەك دوای گواستنەوەی مەهناز بەیەکەوە دەچن بۆ ڕێستورانتێك لەوێ کە دادەنیشن ئەحمەد چاوی بە ڕەزا دەکەوێت کە لەگەڵ نەسرین دانیشتوون ئەحمەد بە مەهناز و دایکی دەڵێت: ئەوە ئەو هاوڕێیەی منە کە هەرچی ناخۆشیم بەسەر هات لەبەر ئەو بوو ئەحمەد دەیەوێت بڕوات لەگەڵ ڕەزا بەشەڕ بێت. بەڵام دایکی مەهناز نایەڵێت و دەڵێت: ئێرە شوێنی ئەوە نییە وە پاشان ئەحمەد پەیکێك شەراب دەخواتەوە بە دەنگێکی بەرز دەڵێت خەڵکینە ئەوە ئەو هاوڕێیە بوو کە بەئەشقی ئەو زانکۆ و سەربازیم تەواو کرد ئەمە ئەو هاوڕێیەم بوو کە نەسرینی خۆشەویستم دەسگیرانم پێ بەخشی وە نەم هێشت خۆی بزانێ کەمێکی تر دەخواتەوە و دەڵێ خەڵکینە ڕەزا وەو هاوڕێ بێوەفایە بوو کە چوومەماڵیان منی دەرکردە دادەنیشێ پاشان ڕەزا هەڵدەستێ ئەویش شەراب دەخوا و دەڵێ ئەوە ئەو هاوڕێیەمە کە هات بەر دەرگا لەبەر ئەوەی کە دەمزانی نەسرین خۆشەویستی ئەو بوو حەزم نەکرد بەو شێوەیە ئەحمەد ببینێ بۆیە مەجبوور بووم ووتم ناتناسم وە من ئەو هاوڕێیە بووم کە ئەو دوو کوڕەم نارد کە پارە بدەن بە ئەحمەد وە ئەو ئافرەتەم نارد کە یارمەتی ئەحمەد بدات وە کەمێکی تر شەراب دەخوات و دەڵێت بە خۆشی ئەو هاوڕێ خۆشەویستەم کە ئێستا لەپاڵ دایکم و خوشکەکەمدا دانیشتووە.

ئەو کات ئەحمەد دەگری و وە دەزانی کە ڕەزا چ هاوڕێیەکی بەوەفا بووە.

– ئەم حەکایەتە بەڕاستی لە فلمێکی ئێرانی دەچێ! هەرچەندە من فلمێکی ئاوام نەدیوە، بەڵام. حەکایەت، تەواو حەکایەتێکی - یان- ڕووداوێکی ئێرانییە، ئەویش بەهۆی ناوەکان، مەحمود = ڕەزا = نەسرین = مەهناز = هەروەها شاری شیراز و ئەسفەهان و دیسان پەنابردن بۆ -تلیاك- کە ئێران تلیاك کێشی زۆرە، هەروەها ڕووداوەکە تازەیە و باسی دەرچوانی زانکۆ و سەرباز دەکات، ئەمەش بەڵگەیەکی گرنگی بەردەوامی دروست بوونی حەکایەت و ئەفسانەیە.

# پاشایەکی ئارام و لەسەرخۆ

کۆکردنەوەی: پشتیوان مەحمود ئیسماعیل

گێڕانەوەی: حاجی عەبدوڵڵا، رابیعە قادر

دەگێڕنــەوە دەڵــێن پاشــایەك هــەبوو، پیــاوێکی زۆر چــاك و پاشــایەکی زۆر دادگــەر زۆر خزمــەتی وولاتەکــەی دەکــات و زۆر رێــز لــە خــەڵك دەگرێــت و بــە چــاوی یەکســان ســەیری هــەموو خــەڵك دەکــات. پاشــایەکە کــوڕ و کچــێکی دەبێــت ئــەم پاشــایە یەکێکــە لــەو پیاوانــەی کــە هــەرگیز بــیر لــە زوڵــم و زۆرداری ناکاتــەوە بەیــەك، پاشــایەکی دڵ گــەورە و دڵفــراوان و خــاوەن هەڵوێســتی خۆیــەتی پاشــایەتی دەکــات بــەبێ ئــەوەی هــیچ کێشــە و گیروگرفتێــك هــەبێت، هــەر کەســیش هــەژار و نــەدار و دەســت کــورت بوایــە ئــەوا دەســتی یارمــەتی بــۆ درێــژ دەکــرد و یارمــەتی دەدا لــە ســەروەت و ســامانەکەی خــۆی پێــی دەبەخشــی ڕزگــاری دەکــردن لــە تــاڵاوی مــەرگ و قــاتوقڕی و برســیەتی. بــە تێپــەڕ بــوونی ڕۆژگــار دەســەڵات و ســەروەت و ســامانی پاشــا بــەرەو کــزی و فــەوتان دەچــوو، هــەتا هیچــی نــەماو پاشــایەتی لەدەســتدا، کــە بــارودۆخی ژیــانیش زۆر گــران بــوو نەیدەزانی چی بکات و چۆن نانی بۆ منداڵەکانی پەیدا بکات پاشا دەستی کرد بە بیر کردنــەوە و تــەگبیر کــردن دوای ئــەوەی کــە زۆری خەفــەت دەخــوارد لــە چ ژیانێــك و خۆشــگوزەرانییەك ئێســتا نــان نییــە بیخــوات بۆیــە بــیری ئــەوەی بــۆ هــات کــە کچــەکەی خــۆی بفرۆشــێ بــۆ ئــەوەی کوڕەکــەی و خێزانەکــەی بــژێنێ، کــە ســەردەمێکی زۆر ناخۆش و سەردەمی کۆیلە و بەندایەتی بوو، بۆیە کوڕەکەی گوێی لە قسەی باوکی بــوو کــە خوشــکەکەی دەفرۆشــێت زۆری پــێ نــاخۆش بــوو زۆریــش دڵگــران بــوو بۆیــە چــووە لای دایکــی و بــاوکی وتــی: نــا بابــە کــاری وا مەکــە شــوورەییە بــۆ ئێمــە کــاری وا بکــەین باوکــە مــن بفرۆشــە و ئێــوە هــەر ســێکتان بەیەکــەوە بــژین، بــۆ منــیش خــوا گەورەیــە چــارەی خــۆم دەکــەم باشــە، باوکیشــی بــە چــاوی پــڕ گریــان و دڵــی ســوتاوی کوڕەکــەی بــردە بــازاڕ و فرۆشــتی، بــە پــارە و بــە ئازووقــەوە گەڕایــەوە ماڵــەوە. بــەمجۆرە کــوڕە پاشــا بــوو بــە کۆیلــە و بەنــدە و بردیــان بــۆ شــوێنی کــارکردن پێشــتر کــوڕە جــوامێر و کــوڕە پاشــا ئێســتاش کۆیلــە دوای تێپــەڕ بــوونی چــەند ســاڵێك دەنگوباسی کوڕە پاشا پەیدا بوو بۆ باوکیان گێڕایەوە کە کوڕەکەی ئێستا لە فلان دەڤەری لەگەڵ گا جۆت و ئیش و کاری پێدەکەن ئاغا کە گوێی لەو قسەیە بوو زۆری پێ ناخۆش بوو خەریك بوو دەمرد، زۆری بەزەیی بە کوڕەکەی هاتەوە و دڵی

بۆی دەسوتا ئاگای لە خۆی نەما بوو. لە تاوی کوڕەکەی ڕێگای گرتە بەر و بە سۆراغ و پرسیار کردن کوڕەکەی خۆی دۆزیەوە و خۆی گەیاندە لای کوڕەکەی دوای ماچ کردن و باوەش بە یەکتری باوکەکە بە چاوی پڕ گریان بە کوڕەکەی وت کوڕم چاوم بەرایی نادات بەم چەشنە بتبینم پێشتر کوڕە پاشا و ئێستاش لەگەڵ گوێ درێژ و مانگا جووت دەکەی. کوڕەکە بە ئازاییەکی لەسەرخۆ دڵی باوکی دەدایەوە. بابە گیان ئێوە خۆشبن من هیچم ناوێ ئەوەش دێت و بەسەر دەچێت بە تێپەڕ بوونی کاتو ڕۆژگار پشتیوان بە خوا هەمووی باش دەبێت بەم جۆرە کوڕەکە باوکەکەی ناردەوە و دڵی داوە و وتی بابە ئارام بە. دوای ماوەیەکی تر خاوەن کۆیلە هیچ ئیشێکی بەم کوڕە نەمابوو بۆیە بردیە بازاڕ و فرۆشتیەوە. ئەمجارە کوڕە پاشا کەوتە دەست کۆمەڵە پیاو ماقولی گەورە و پاشا و بەگزادە. بەمجۆرە کوڕەکەیان بردە ناو کۆشك و کردیان بە چایەچی و پێیان گوت دەبی بە قاوەچی پاشا و ئێرە ئیش و کارت دەبێ کوڕە جوامێر زۆر شوکر بوو بە شوێن و پیشەی خۆی دەستی کرد بە ئیش کردن و بێ ئەوەی هیچ درێغییەك لە ئیش و کارەکانی بکات زۆر بە ڕێکەپێکی ئیش و کارەکانی خۆی ئەنجام دەدا. هەرچەندە خەڵکێکی زۆر خراپ و دز و جەردە و ڕێگر و ناحەز دەبن بەلاّم دەتوانێ لەگەڵیان خۆی بگونجێنێ. دوای ئەوەی کاروانێك دەگاتە ماڵی پاشای لەکار کەوتوو تومەزانە هەر چ کاروانێك بێت سۆراغ و پرسیاری کوڕەکەی دەکات پێیان دەڵێت هیچ دەربارەی کوڕەکەم نازانن. ئەوانیش وەلاّمی دەدەنەوە بەڕێ وەڵلا کوڕەکەت لەلای فلاّن پاشا بۆتە قاوەچی پاشا ئەم خەبەرە دەزانێ زۆر دڵخۆش دەبێ وە دلگرانیش دەبێ بە سەرێك دەڵێ کوڕەکەم لە ژیاندا ماوە ڕزگاری بووە لە مردن و کۆیلەیی و بووە بە قاوەچی ئەو ولاّتە. دیسان باوکی کوڕە خۆی پێ نەگیراو ملی ڕێگای گرت و ئارامی لێ بڕا تا گەیشتە لای کوڕەکەی کە ئامێزی پیا کرد و ماچی کرد کوڕم نەمردم ئەمجارەش تۆم دیتەوە کوڕەکەم بەیەکەوە دەچینە لای پاشاو لێی دەپاڕێینەوە ڕەحمی پێماندا بێتەوە و ڕزگارمان بکات لەم کۆیلایەتییەو لەگەڵ خۆم بێیتەوە بە خوا دایك و خوشکت زۆر شێت و شەیدان بۆ بینینت.

بەخوا ئارامم نەماوە بەوجۆرە بت بینم. بەلاّم کوڕەکە زۆر لەسەرخۆیی و عاقلاّنە دڵی باوکی دایەوە و پێی وت بابە (سەبر تاڵە بەرهەمەکەی شیرینە) نابێ بێ هیوا بین پشتیوان بەخوا ئەوەش بەسەر دەچێت کوڕەکە بەمجۆرە باوکی زۆر بەڕێزەوە ڕەوانە کردەوە بۆلای دایك و خوشکی لەگەڵ ئەو خەرجییەی کە لە قاوەچییەتی دەستی کەوت بوو. خەڵکی ئەو ولاّتە زۆر خراپ و خراپەکار بوون ناویان بە زوڵم و ستەمکار ڕۆیشتبوو تا دوایی پاشای ئەو ولاّتە مرد ئەم پاشایە تەنها یەك کچی

هـەبوو كـە تاقانـە بـوو بۆيـە دواى پرسـەو سەرەخۆشـى كچـە پاشـا خەڵكەكـە كۆدەكاتـەوە بـۆ ئـەوەى پاشـايەكى تـر هەڵبـژێرن بـەلآم خەڵكەكـە زۆر سـەر لـێ شـێواو سـەرەڕۆ دەبـن كـەس حسـاب بـۆ كـەس ناكـات بۆيـە بـەم شـێوەيە كچـى پاشـا زۆر تـوڕە دەبێـت و هـاوار دەكـات بەسـە ئـيتر بـڕۆن كـۆترێكم بـۆ بهێـنن. يـەكێك ئـەم كـۆترە هەڵـدا بفـڕێ بـۆ ئاسمـان لەسـەرى كـێ بنيشـێتەوە ئـەوا دەبێتـە پاشـاى وڵات دەبـێ هـەمووش لێـى ڕازى بـن منـيش خـۆمى لـێ مـارە دەكـەم. بـەمجۆرە كۆترەكـەيان فڕانـد بـۆ ئاسمـان و كۆترەكـە هـەر فـڕى و شەنسـى كـوڕە قاوەچـيەكە لەسـەر سـەرى ئەنيشـێتەوە، بـەپێى مەرجەكـە كوڕەكـە دەبێتـە پاشـا دواى ئـەوەى خەڵكەكـە هـەموو كرديـان گلـەيى و هـات و هـاوار و نـا ڕەزايـى خۆيـان دەربـڕى بۆيـە كچـە پاشـاش تـوڕە بـوو لـە خەڵكەكـە خەڵكەكـەش وتيـان چـۆن دەبـێ كوڕێـك ئيشـى كۆيلايـەتى و قاوەچـى ديوەخـان ببێتـە پاشـا كچـى پاشـاش بڕيارى‌دا جـارێكى تـر بـۆ جـارى دووەم كۆترەكـە كـە بفڕێننـەوە بـۆ ئـەوەى تـەواو دڵنيـا بـن كـە بـزانن هەڵـەى كـردووە يـان پاشـايەكى شـياوتر هەڵبـژێرن لـە كـوڕە قاوەچـيەكە ديسـان كـە كۆترەكـەيان بـەرز بـۆ ئاسمـان هەڵفڕانـد دووبـارە كۆترەكـە بەسـەر سـەرى خەڵكەكـەوە فـڕى و بـۆ جـارى دووەم لەسـەر سـەرى كـوڕە قاوەچيەكە نيشـتەوە ديسـان خـەڵك دەسـتيان كـرد بـە گلـەيى و هـات و هوريـا ديسـان قسـەى پێشـوويان دووبـارە كـردەوە چـۆن دەبـێ كـوڕە قاوەچـييەك ببێـت بـە پاشـاى ئێمـە كچـە پاشـا بڕيارى‌دا جـارێكى تـر كۆترەكـە بفڕێننـەوە بـۆ ئاسمـان بـەمجۆرە بـۆ جـارى سـێهەم كۆترەكـەيان فڕانـد بـۆ ئاسمـانێكى دوور بـەرز و كـوڕە قاوەچـيەكەيان خسـتە ژێـر پێـى خۆيـان و زۆريـان لێـداو شـارديانەوە دواى ئـەوەى كۆترەكـە بەسـەر سـەرى خـەڵك هـەر دەگـەڕاو دەسـوڕا هـەتا بـە ژيرايـەتى خـۆى بـۆ جـارى سـێهەم كـوڕە قـۆزە قاوەچيەكەى دۆزيـەوە لـە وێـوە كچـە پاشـا بڕيارى‌دا كـە ئـەم كـوڕە قـۆزە دەبێتـە پاشـى وڵآت و منـيش خـۆى لـێ مـارە دەكـەم بـەمجۆرە كـوڕە قاوەچييەكە چـووە سـەر تـەختى پاشايەتى و تـاجى پاشايان لەسـەر نـا ئـەو كـوڕە كـە بەنـدە و كۆيلـە بـوو ئێسـتا جـوانترين كـچ بۆتـە خێزانـى لـەوێوە كوڕەكـە دەسـتى بـە ژيـانێكى نـوێ كـرد و دەسـتى كـرد بـە سـزادانى خـەڵك و بـە چـاوى يەكسـان سـەيريهەمووانى دەكـرد زوڵـم و زۆردارى لەكـەس قبـوڵ نـەدەكرد هـەر كەسـێك سەرپێچـى بكردبـا بـە سـزاى خـۆى دەگەيشـت خـەڵكى ئـەم وڵآتـە زۆر خـراپ بـوون بۆيـە پاشـاى نـوێ بڕيـارى دابـوو كـە قـانون سـەروەرى هـەكوان بێـت و هـەموويان بـەپێى دەسـتور و ياسـا و قـانون و يەكسـانى و دادگـەرى دەبـێ بـژين. خەڵكەكـەش لەدەسـتى بێـزار بـوون چـونكە زۆرى سـزا دابـوون لەسـەر كـارى تـاڵان و دزى و جـوردەيى بۆيـە خەڵكەكـە بڕياريانـدا بچـنە لاى بـاوكى و شـكايەتى لـێ بكـەن كاتێـك چـوونە لاى بـاوكى، بـاوكى كوڕەكـە يەكسـەر هـەواڵى

کوڕەکـەی خـۆی پرسـی، کوڕەکـەم چـۆنە؟ ئـەوانیش وەڵامیـان دایـەوە کـە کوڕەکـەت زۆر باشـە و بـووە بەپاشـای وڵات، بـاوکی زۆر دڵـی خـۆش دەبێـت و زۆری پـێ خۆشـە بـەڵام پێـی دەڵـێن کوڕەکـەت زۆر تونـد و ڕەقـە لەگـەڵمان لـە دەسـتی ێـزار بوینـە بـاوکی ئەمەشـی زۆر پێنـاخۆش دەبێـت بۆیـە بڕیـار دەدات کـە لەگـەڵ ئـەم کاروانـە بچـێتە لای کوڕەکـەی کاتێـك پاشـا دەزانێـت بـاوکی دێـت بـۆ لای دەچـێتە خزمـەتی و فـەرمووی لـێ دەکـات و زۆر ڕێـز و ئیحترامـی دەگرێـت و دەیبـات بـۆ نـاو کۆشـك و نـاو بـاغ و ماڵەکـەی بـەڵام بـاوکی پێـی دەڵێـت کـوڕم ئێمـە کـێین و تـۆ چ دەکـەیت؟ باوکـە ئەمانـە شایسـتەی سـزادانن. لەوکاتـەی کۆترەکـە بەسـەر سـەریان فـڕی وتـی (پاشـا لێیانـدا) باوکـە بیسـتت، بـەڵێ تێگەیشـتم زانـیم بۆیـە کوڕەکـە بـاوکی بـەڕێ کـرد و داوای لێکـرد دایکـی و خوشکەکەشـی بهـێنێ بـۆ ئێـرە و لێـرە بەیەکـەوە دەژیـن، ئـەم کـوڕە قـۆزە خێزانەکـەی خـۆی زۆر خۆشدەویسـت و زۆری ڕێـز لـێ دەگـرت لـە هـەمان کاتـدا کچـەکەش کـوڕە قاوەچـییەکەی هـەر لـە دیوەخـان و کـاتی قاوەچـی بـووە خۆشـی ویسـتووە و چـۆتە دڵـی زۆر بـەکارەکان و ڕەفتـاری سەرسـام بـووە کوڕەکـە هـەر بـەردەوام دەبێـت لـە کارەکـانی خـۆی و سـزادانی تاوانبـاران بۆیـە خەڵکەکـە بیردەکەنـەوە ئەگـەر تۆبـە نەکـەین بـەخوا هـەموومان لـەناو دەبـات یـەکمان نایـەڵێت ئـەم ئیشـە بـۆ ئێمـە دەرنـاینێ بـا هـەموومان بەیەکـەوە تۆبـە بکـەین و لـە قسـەی پاشـامان دەرنەچـین بـزانین چـارەنووسمان چـی لـێ دێـت دوای ئـەوە خەڵکەکـە بەگشـتی پـەیمانیا دا تۆبـە بکـەن و جـارێکی تـر دزی و جـەردەیی و ڕێگـری نەکـەن و نەچـن بـۆ لای کـاری خـراپ ئیـدی ئـارامی و یەکسـانی و خۆشـی و شـادی گەڕایـەوە بـۆ ئـەم وڵاتـە و هـەموویان بـەدوو کـار و پیشـەی ڕەوانـی خۆیـان کـەوتن وە دایـك و خوشـك و بـاوکی هـاتن بـۆ لای کوڕەکـەیان و بڕیاریانـدا هـەموویان بەیەکـەوە بـژین لەوکاتـەش کۆترەکـە بەسـەریاندا هـەڵفڕی پاشـا ئێسـتا تـەواوە زۆرباشـە بـەمجۆرە کوڕەکـە بـە هـێمنی و عـەقڵ و تێکۆشـانی ژیرانـەی خـۆی تـوانی خـۆی بگەیەنێتـە تـەختی پاشـایەتی و ببێتـە خـاوەن جـوانترین کچـی وڵات و تـوانی ئـەم وڵاتـە لـە دز و جـەردە و خراپـە و خراپـەکاری ڕزگـار بکـات و جـارێکی تـر بەباوەشـی دایکـی شـاد بـۆوە و لەگـەڵ خێزانەکەی دەستی کرد بە ژیانێکی تازە و نوێ.

- ئـەم حیکایەتـە، فێـری سـەبر گرتنمـان دەکـات و پێمـان دەڵێـت: ڕۆژگـارو ژیـان دەگۆڕێن و ڕاست و پاك هەر دەگەنە ئامانجی خۆیان.

# خاکمار

کۆکردنەوەی: هەرێم ئیبراهیم ئەحمەد

فەرمان محسن عبدالله

دەگێڕنــەوە دەرێــن پاشــایەك هــەبوو، ئــەو پاشــایە ســێ کــوڕی هــەبوون، کــوڕی گــەورە نــاوی ئەحمــەد بــوو ئــی ناوەنجیشــی نــاوی محەمــەد بــوو ئــی گچکەکەشــی نــاوی خاکمــار بــوو، دەرێ خاکمــار هەرچــەند گچــکە بــوو بــەران ئــیش و کارەکــان هــەر ئــەو دەیکــردن لەبــەر ئــەوەی لــەوان ئــازاتر و ئــاقرتر بــوو، دەرێ ئــیش و کاریشــیان هــەر ڕاو و ڕاوشــکار بــوو، وەی لێهــات تەمــەنیان گــەورە بــوو مــووی سـپییان لــە ڕدێــنی پەیــدا بــوون دەرێ ڕۆژەکیــان خاکمــار لــە ئاوێنــەی تەماشــای خــۆی کــرد دیــتی مــوی سـپی لــە ڕدێــنی پەیــدا بوینــە، بــە براکانی گــۆت توخــوا ئــەنگۆ پیــاون شــەرم و بەخۆیــە، گۆتیــان لــۆ بــرام چ بــووە، خاکمــاریش گــۆتی: ئــەنگۆ تەماشــای خــۆو کردیــە ئــەوە ڕدێــن و سـپی بــووە ڕدێــن و مــاش و برنجــی بــووە هێشــتانەکە ژن و نەهینایــە، دەی بــا بچــینەوە مــارێ، ئەچــینە کــن بــابی پێــی ئــەرێین ســێ ژنــان لــۆ بــینی هەرســێ ژن خوشــك بــن لــە داك و بــابی هەرســێکیش جــوان بــن هەرســێکیش ئــاقر و بــەڕێ و جــێ بــن، گۆتیــان باشــە، دەرێ چــوونۆ ئێــوارێ لایانــدا دیوەخــانێ بــابی، چــاو قاوەیــان خــواردەوە بــابی پێــی ســەیر بــوو هەرســێکیان هاتینــە دیوەخــانێ لێــی پرســین هــا کوڕینــە ســەبەب چــییە ئــەورۆ هاتینــە دیوەخــانێ؟ گۆتیــان بابــە ئــەوە ئەمــە مــوێ سـپین لــە ڕدێــنی پەیــدا بووینــە هــەتا ئــەلعان ژن نەهینایــە، دەنــەوێ ســێ ژنــان لــۆ بــینی هەرســێ ژن لایــق و جــوان و زەریــف بــن هەرســێکیش خوشــك بــن لــەداك و بــابی، ئــەوجا لــەماوەی حەفتــەکی ئەگــەر ئــەو ســێ ژنانــەن لــۆ پەیداکــەی باشــە دەنــا ئەمــە بــەخۆ ئــەڕۆین و بــەدودا ئەچین هــەتا ســێ ژنــان لۆخــۆ پەیــدا ئەکــەین، بابیشــی گــۆتی: وەڵــلا ئــەمن زۆرم پــێ خۆشــە ئــەوەی لەبــەر دەســتی خــۆم دایــە لــە مەملەکــەتی خــۆم لــە·هــەمووی ئەگــەرێم ئەگــەر ژنــێ ئــەوها پەیــدا بــوون ئــەوە لــۆو دەیــنم ئەگــەر بــە مێــردیش بــن ئــەوا پێیــان تەراقــە دەم،دەرێ لــەماوەی هەفتــەکی پاشــا ئــەوەی لەبــەر دەســتی خــۆی بــوو هــەمووی گــەڕا بــە ئــەمرێ خــوای ئــەوها پەیــدا نــەبوون ســێ خوشــك لــە مــارەکی بــن هەرســێك جــوان و زەریــف و ئــاقر بــن لــە داك و بــابیش خوشــك بــن، پــاش ئــەو هەفتــەی هەرســێ بــرا هەرســتان بــار و بارخانــەیان حــازر کــرد هەســپیان زیــن کــردن لــە هەســپیان ســواربوون، هەرچــەندی بابیــان لێــی پاڕانــەوە کــوڕم شــتی ئــەوها

لەگەرەمن مەکەن ئەمن هەر ئەنگۆم هەیە ژن زۆرن لۆو دەینم، ئەوانیش گۆتیان نەخێر بابە ئەمە سەرکن هینایە و نایگێڕینەوە، دەرێ خوا حافیزیان لە داك و بابیان کرد و ڕۆیشتن.

دەرێ عادەتی ئەو وەختی ئەوها بوو تیریان دەهاویشت تیریان لەکێندەر وە عاردی کەتبایە ئەو شەوی لەوێ ئەمانەوە و لەوێ میوان ئەبوون، تیری یەکەمیش عایدی ئەحمەدی بوو، چونکە ئەحمەد برا گەورە بووو هەرستا تیرەکی هاوێشت ئۆبار بە ملی ئەو مامۆستایەی ئەمن گێم لێ بوو دەرێ تیرەکە شەو و ڕۆژەکێ ڕۆیی، دەرێ ڕۆیشتن تەماشایان کرد تیر لەناو باغەکی وەعاردی کەتیە ئەو باغە تەماعی حەفت سارەی پێوە پووچەکە بووە مێشی نێر نەوێرایە نزیکی ئەو باغەی بی، گۆتیان بەخوای جێیەکی خۆشە وراغان لێ بەڕەڵاکەین تێر تەرە و میوە و تەعامی ئەخۆین، خاکمار گۆتی: براینە ئەگەر بە قسێ من ئەکەن لێرە میوان نابین ئەوە بێ سەبەب نییە ئەو باغە ئەوها هیچی لێ نەخورایە و هیچی لێ نەشکایە، گۆتیان ئەتوو چی هەتا ئەمە بەقسێ تو بکەین، یاڵڵا دەی باری بێخن دەرێ باریان لێخست و تێر میوە و تەعامیان خوارد و لێ کەوتنە خەوێ، هەسپیان لێ بەستنەوە لەناو گیای و وەختی مەغریبێ لێ کەوتنە خەوێ، خاکماریش دەیزانی ئێرە مەملەکەتی دێوانە هەرستا شیری لەخۆی حەمایل کرد سواری هەسپی خۆی بوو چەك و سیلاحی لەخۆی قەیم کرد و وەکی حەرەسەك و پاسەوانەکی ڕاوەستا، دەرێ نیوە شەوی تەماشای کرد گرمەی دێو هات، دەرێ دێوی سپی هات گۆتی: خاکمار لە عاسمانان تەرەبم کردی لەسەر عاردی وەبەر دەستم کەتیو ئەوە حەفت سارە مێش نەوێرایە لەو باغەی من میوان بی ئەتو دێی لە باغی من میوان بی، گۆتی: دێوە زۆر ناماقولیان مەکەو با برام وەخەبەر نێن ئەترسێن وەرە بابکەوینە مەیدانێ، دەرێ دێو گۆتی: بەچە بکەین، دەرێ خاکماریش گۆتی: بەکەمەندان، ئەرێ کەتنە بەرامبەری یەکدی بەکەمەندان هەتا بەری بەیانی یەکدیان هیناو برد، هەنگینێ خاکمار لەبەر خوای پاڕاوە گۆتی: خوایە زەلیلی بەردەستی دێوم نەکەی، نەسرەتم بدەی بەسەریدا سەرکەوم، ئەرێ قوەتی دا خۆو دێوی لەعاردی دا سەری دێوی بڕی دوو کەپوو لێوی لێ کردنۆ لەناو جانتای نان و مەیتەکەشی برد فرەیداو خوین و میونەکەشی لابردو ئەوجا هەرستا ئاگری هەرکرد چای لێنا لۆ برایان و وەخەبەری هینان، برایان هەستان و دەست و چاویان شوشتن و نان و چایان خوارد و شمەکیان لە هەسپی بارکرد و سواری

هەسپیان بوون لێیاندا ڕۆیشتن، خاکماریش لەکنە وانی باس نەکرد برێ ئەمن ئەو شەو شتەکی ئەوهام کردیە.

ڕۆژی دووەم نۆبەتی محەمەدی برای بوو، محەمەدیش تیرەکی هاویشت شەو و ڕۆژەکی ڕۆیی تەماشایان کرد عەینەن ئەو تیرەش لەناو باغەکی وە عاردی کەتیە سەدجار لەو باغەی خۆشتر بوو، خاکماریش گۆتی: براینە بەقسێ من بکەن لەو باغەی میوان مەبن ئەوباغە بێ ئەسەر نییە، گۆتیان: عەمرت نەمینێ بێ غیرەت شەوێ دیکە چت دیتیە هەتا ئەو شەو ببینی، چت دیتیە ئاخر شەوێ دیکە دەرێ خاکماریش گۆتی: کەیفی خۆیت و، دەرێ هەسپیان بەرەڵلا کردن لەناو گیای بە خۆش چوونە ناو باغێ تێگەڕان تێریان تەعام و میوەجات خوارد، کەول و سێ قەلاتیان لێ ڕاهێخست و لێکەوتنە خەوێ، خاکماریش وەکی شەوێ دیکە شیری لەخۆ قەیم کرد و سواری هەسپێ بوو ڕاوەستا لۆ حەرەسیاتی، دەرێ بە دەردی شەوێ دیکە نیوەی شەوێ هارەی دێوی ڕەش هات، گۆتی: خاکمار لە عاسمانان تەرەبم دەکردی لە عاردی وەبەر چنگم کەتی، وەڵلا دەبی بتکەمە دەنکە جۆیەك لەبن ددانی خۆمت دانێم، ئەتۆ شەوێ دیکە سەرێ برای منت بڕیەو گۆتی: زۆر ناماقولیان مەکە دێوە بابرایەکانم وەخەبەر نێن دەترسێن وەرە مەیدانێ ئەوجا ئەوی خوای پێدابن، دەرێ کەتنە مەیدانێ دیسان بەکەمەندان هەتا بەرەبەری بەیانی کەس زەفەری بەکەس نەدەبرد و دەرێ خاکمار لە خوای پاڕاوە گۆتی: خوایە نەسرەتم بدەی زەلیلی بەردەستی دێو نەکەی، دەرێ ئەو دێویشی لە عاردی داو سەری بڕی و کەپوو لێوی لێکردنەوە و دەناو تورەگەی ناو مەیتەکەشی فڕەدا سبەینێش هەرستا ئاگری هەرکردو چای لێناو برایەکانی لە خەوێ وەخەبەر هینان و دەست و چاویان شوشتن و نان و چایان خوارد، بارو بارگەیان تێکناو سواری هەسپیان بوون کەوتنە ڕێی، دەرێ ئەوجارە نۆبەتی خاکماری بوو لۆ تیر هاویشتنێ، دەرێ خاکمار تیرەکی هاوێشت دوو شەو و دوو ڕۆژان ڕۆیشتو تیرەکەش چوو بوو لە جێیەکی وەعاردی کەوت بوو لە دار و بەردی بەولاوە هیچی دی لێ نەبوو، گۆتیان تەماشاکە تیریشی لە خۆ خراپترە لە کێندەری وەعاردی کەتیەو گۆتی: ئەوجا چ بکەم براینە ئەوا بەختی من ئەوها بوو و دەرێ ئەو شەوی لەوێ مانەوە خاکماریش لەبەر ئەوەی دوو شەو بوو نەنوستبوو، ئەو شەوی بە ئیسراحەت نووستو کە هەرستا تەماشای کرد زۆر درەنگە کە تەماشی کرد ئاگری وێنەمایە، دوور بە دووری تەماشای کرد تروسکاییەکی ئاگری دیار بوو گۆتی: وە باشە بچم لەو ئاگرەی تروسکە ئاگرەکی بینم لەگەر دەست کە

چـروەکی ئـاگری لـۆ برایـانم بیـنم نـەوەك هەرسـتن لـێم عـادز دەبـن، دەرێ بـەرەو تروسـکە ئاگرەکـە ڕۆیـی لـە ڕێـی گەیشتە پیرەمێردەکـی خەرەکـەکی لـەکن بـوو ئـەو خەرەکـەی هـەر دەسـووڕاند ئۆبـار بـە ملـی ئـەو مامۆسـتایەی ئـەمن گـێم لـێ بـووە دەرێـن ئـەو پـیرە مێـردە شـەوو ڕۆژێ هەردەکردنـەوە، دەرێ خاکمـار سـەلامی لـە پیرەمێـردی کـرد و پیرەمێـردیش سـەلامی لـێ وەرگرتـەوە گـۆتی: مـام ئیختیـار ئـەوە خـەریکی چـی گـۆتی: پـارەوان ئـەمن مـەئمووری شـەو و ڕۆژانم، شـەو و ڕۆژان هەردەکەمـەوە، ئـێ گـۆتی: مامـە هـەتا ئـەمن دێمـەوە مەهێڵـە ببێتـە ڕۆژ بـا هـەر شـەو بـی، ئـەویش گـۆتی: باشـە، ئـەرێ خـەرەکی ڕاگـرت تـا چـیتکە ڕۆژ نەیەتـە پـێش، خاکمـار قـەول بـوو بـڕوات دەرێ پیرەمێـرد گۆتی: کـوڕم ئـەو تروسـکە ئـاگرە دیـارە ئـەوە ئـی پیرەژنـە دێوییـە ئەگـەر چووی هـەرو مـەمکی ڕاستی بمـژە هـەتا بـە کوڕی خـۆت قبـوور نـەکا بـەری نـەدەی ئەگـەر نـا بـە عیلمـی سـیحر دەتکاتـە بـەرد، ئـەوی گـۆتی: باشـە، دەرێ بـەدوو تروسـکایەکە داچـوو تەماشـای کـرد لـە نزیـك ئاگرەکـەی پیرەژنـە دێـوێکی لـێ بـوو مـەمکی ڕاسـتەی هـەردابووە سـەر ملـی چـۆپەی مـەمکی چەپەشـی هـەردابۆوە سـەرملی ڕاسـتەی ئـەوجا دیسـان ئۆبـار بـە ملـی ئـەو مامۆسـتایەی ئـەمن گـێم لێبـووە دەرێـن ئاسـنی ئەڕێسـت جـیرەی ئاسـنی دەچـووە بـەر عەرشـی خـوای هەنـدەی دەنـگ دەهـات وەکـی ئاسـنی ئەڕەسـتن، دەرێ خاکمـار چـوو بـەو وەسـفەی پیرەمێردەکـەی لـۆی کردبـوو مـەمکی ڕاسـتەی مـژی لـە پشـتەوە، گـۆتی: وەرە وەرە خـوات بـە قوربـانی ئـەو مامۆسـتایەی کـە ئـەو شـتەی فێـر کـردی دەنـا بـەخوای دەمکردیـە کرمـەك بـە عاردیـدا دەمبردیـە خـوارێ، بـەرام وەرە بـەکوڕی خـۆمم قبـوورم کـردی، دەرێ خاکمـار چـوو لەگـەر پیرەژنـە دێـوی بوونـە بـرادەر، پـیرەژن گـۆتی: کـوڕم ئـەمن حـەفت کـوڕم هەنـە ئـەو کوڕانـە بێنـەوە دەتکـوژن، ئـەمن تەلیسـمەکت لـێ دەخـوینم لـە عـاردت ئەبەمـە خـوارێ، دەرێ تەلیسـمەکی لـێ خوێنـد کردیـە کـرم و بـە عاردیـدا بردیـە خـوارێ، ئـەرێ بەینـەك پێچـوو کوڕەکـان هاتنـەوە گۆتیـان: دایـە بـۆن دێ بـۆنی بنیادەمـان دێ، ئـەویش گـۆتی: ڕۆرە چـوو لـێ بشـارمەوە ئـەمن وەخـتی خـۆی مێـردم بـە بنیادەمـەکی کردبـوو کـوڕەکم لـەوی پـەیا بـووە ئـەلعانیش ئـەوە کوڕەکـەم هاتیتـەوە براینگۆیـە ئـەوجا ئەگـەر قبـووری ئەکـەن هـەتا بیهینمـە دەرێ دەنـا نایهینمـە دەرێ بـزرم کردیـە جـا گۆتیـان لـەوەی باشـترەبی ئەمـە برایـەکن پەیـدا بـی، دەرێ پیرەژنـە دێـو تەلەسمەکـەی هەروەشـاندەوە خاکمـار هاتـە دەرێ دەسـت و دەمـی یەکـدیان مـاچ کـرد لەگـەر دێـوان بوونـە بـرای یەکـدی، دەرێ پیرەژنـە دێـو گـۆتی: کـوڕم لـە کـێ بـوون لـەکێ دێنـەوە، گۆتیـان دایـە لـە شـاری

بەغدایێ دێینەوە، پاشایەکی لێیە سێ کچی هەنە، ئەمە تەماحین لە کچێ وی کردیە بەس زەفەرێی پێ نابەین قەراتی هەن بردی لێیە حەرەسی زۆرن، ئەوجا خاکمار دەدری خۆی گۆتی: ئەوەی ئەمن لەدو دەگەڕام ئەوەیە قەت لەوەی باشتر نابی وەباشە بە فێران دێوەکان ببەمە قەسرێ پاشای، ئەوجا خاکمار گۆتی: ئەمن لەگەرە خۆ ببەن ئەمن واکەم بچینە کن ئەو کچانە، ئەوانیش گۆتیان باشە لەسەر ملی خۆیان دانا هەندەی برێی یەك و دوو گەیشتنە کن قەراتێ پاشایو خاکمار فێرزان بوو گۆتی: ئەنگۆ ئەمن پێشی وەسەر دیواری بێخن ئەمنیش ئەنگۆ یەك یەك دەست دەگرم وەسەرو دێخم، دەرێ خاکمار چووە سەر دیواری، خاکماریش پاڵەوانەکی بێ ڕەزا بوو، ئەو دێوانە هەرچی وەسەر کەت خاکمار شیرەکی لەملی ئەدا و ملی قەدە کرد و ئەکەت ئەودیوی حەوشێ، هەتا هەر حەفتی بەو ئەوعەی کوشتن ئەوجا دەرێ کەپوو لێوی هەموانی لێکردنەوە و دەناو تورەگەی نان و ڕمی خۆی لە حەوشێ پاشای چەقاند بەخۆشی لە قەسرێ پاشای وەسەر کەت تەماشای کرد کچەکانی پاشای هەریەکەیان غورفەی خۆی جیاواز بوو، زانی کیە غورفە هی خوشکی گچکەیە گۆتی: ئەو لۆمن بی باشە، ئەو کچە گچکەش ناوی ڕێحانە بووو دەرێ چوو ماچەکی لە ڕوومەتێ کرد و ئەنگوستیلەی خۆی دەگەر گۆڕیێ چرایێ سەرینگانێ هینا پێشینگانێ و ئی پێشینگانێ هینا سەرینگانێ بەکن غورفەی پاشای داچوو دیتی مارەك دەیەوێ بچیتە غورفەی پاشای، دەرێ شیرەکی لەملی ماریدا و سەرەکەی لێ کردەوە و لەناو جانتای ناو کەلەشی ماری لەوێ بەجێ هێشت و هاتە دەرێ و لە تەوێلەی ماری پاشای وراغەکی دەرهینا و لێیدا بەرەو کن برایان گەڕاوە، وەکی گەڕاوە تروسکە ئاگری برد و هاتەکن پیرەمێردی، پیرەمێرد گۆتی: هەی مارت کاول بی پارەوان ئەوە ڕۆژ ڕۆژی نیوەڕۆیە لۆ هەندە تاخیر بووی، ئەرێ وەکی پیرەمێرد خەرەکی هەرکردەوە تەماشای کرد نوێژی نیوەڕۆیێ بوو، خاکمار هاتەوە کن برایان ئاگری هەرکرد بە عەجەلە چایەی لێنا و کە برایەکانی هەرستان زۆریان خۆ لە خاکماری تورە کرد ئەتوو لۆ هەندە درەنگ هەرستای لە خەوێ چات حازر نەکردیە، دەرێ گۆتی: براینە چبکەم خەوم لێ کەوت بوو ئەمنیش وەڵاهی بەدەستە خۆم نییە، دەرێ هەر کوی بوو نانەکەیان خوارد و بارو بارگەیان تێکنا و سواری هەسپان بوو جەرەوێ وراغیان شۆڕکردەوە و ڕۆیشتن.

ئەوجا بێینە سەر باسی پاشای، پاشا و کچەکانی حەفت سار بوو ناوێران بێنە شاری لەبەر ئەو دێوانە، سبەینێ کە پاشا لە خەوێ هەرستا دیتی حەفت دێو

کوژراینــه و ڕمــەك لەحەوشــیٚ چــەقایەو مــارەك لــەكن دەركــیٚ وی کوژرایــە پێــی زۆر سـەیر بــوو، دەریٚ لــە دونایــب و وەزیرانــی نــارد وەرن بــزانین تــەکبیری چــییە و بـزانین کـیٚ ئـەو فەتحـەی کردیـە تـا خـەراتی بکـەین، دەریٚ نایب و وەزیرەکـان هـاتن گۆتیـان پاشـا ئـەوە نیشـانەی خـۆی بەخۆیەوەیـە ڕمـی خـۆی لـە حەوشـیٚ چـەقاندیە هـەر کەسـەکی ئـەو ڕمـەی پـیٚ هەرقـەنیٚ دیـارە ئـەو ئـەو فەتحـەی کردیـە، دەریٚ پاشـا بـانگی ڕاهێشـت ڕەحمـەتی لـەوی بـابی هەرکەسـەکی بـیٚ لـە حەوشـی مـاری پاشـای خـۆی تـاقی بکاتـەوە، ئـەو ڕمـەی هەرقـەرێنیتن ئـەوە دیـارە ئـەو فەتحـەی ئـەوی کردیـە پاشـا خـەراتی ئـەکا، ئـەجا دەریٚ ئۆبـار بـە ملـی ئـەو مامۆسـتایەی ئـەمن گـێم لــیٚ بــوو، جـاحێری بەغـدایٚ هــەموو هــاتن لـۆ ئـەوەی خۆیـان تـاقی بکەنــەوە، دەریٚ هــەر جـاحێرەکی دوو ســیٚ فــران لــە حەوشــیٚ پاشــای دەچــوو دەهــاتن خۆیــان دەرمــی دەکــرد پێیــان هەرنەقــەرا، دەریٚ دوودەو بەردەبوونــەوە هـەموو دانیـان دەشـکا، دەریٚ جـاحێری بەغـدایٚ هـەموو بـیٚ دان مابوونـەوە، پاشـا بـەو نەوعـەی هیچـی پـیٚ نـەکرا، نایب و وەزیـران گۆتیـان پاشـا ئـەتوو ئیشـەکی بکـە لەسـەر هـەموو ڕێیـان چـایەخانەیەکی دابـنیٚ، هـەر کەسـەکی لـەو چـایخانە میـوان بــوو بابــە خــۆرایی چــای بخــواو بــە خــۆرایی لــەویٚ بنــوی و هەرچــی ویســت بــا بـەخۆرایی بیـدەنیٚ، بـەران دەبـی سـەربردەکی بگێڕیتــەوە، ئەگــەر لـەو ســەربردانە شــتەکت وەدەســت کــەوی دەنــا بــەو نەوعــەی نــەبی هــیچ شــتەکت وەدەســت ناکـەوی. دەریٚ ئەگـەر زۆری پێچـوو ئەگـەر کـەم خاکمـار و برایـەکانی هـاتن بـەرە و شــاریٚ بەغــدایٚ گەیشــتنە چــایخانەکی لەســەر ڕێــی خۆیــان ســەلامیان کــرد و سـەلامیان لـیٚ وەرگرتنـەوە زۆریـان بـەخێر هینـان زانیـان ئەوانـە پاشـازادەن چـونکە هــەموویان جلــی پاشــایەتیان لەبــەردابوو، نانیــان خــوارد و چــایان خــواردەوە و ئیسـراحەتیان کـرد، سـاحێبی چـایخانەکە گـۆتی: پاشـازادەینە ئەمـە شـتەکما هەیـە هەرچـی بێتـە ئـەو چـایخانەی دەبـی سـەربردەکی بگێڕیتـەوە ئـەوجا ئـەنگۆش دەبـی سـەربردەکمان لـۆ بگێڕنــەوە، ئەحمــەد و محەمــەدان گۆتیــان وەڵــلاٚ چ ســەربردان نــازانین، خاکمــاریش گــۆتی: ئــەمن ســەربردەکی خــۆش دەزانم ئەگــەر پــێم بــاوەڕ بکـەن، برایـەکانی گۆتیـان بابـە بـەو منـدارەی بـڕوا مەکـەن ئـەوە چ نزانـی، سـاحێبی چـایخانەکەش گـۆتی: ئەمـە چیشـن بـە مندارێدایـە ئەمـە دەنـویٚ سـەربردەکن لـۆ بگێڕیتـۆوە، خاکمـاریش گـۆتی: دەرێـن پاشـایەك هـەبووە لـە شـاری بەغـدایٚ بـەس نـازانم شـاری بەغـدایٚ لـە کێنـدەرەو ئـەرێن سـیٚ کچـی هەبووینـە ئـەو سـیٚ کچـانە لەبـەر دێـوان نەوێرانــە بێنــە دەریٚ، سـبەینەکی پاشـا لەخـەویٚ هەسـتایە دیتـیتی ئـەوە حـەفت دێـو سـەریان بڕیـە و مـارەکیش لـەپێش دەرکـەی غورفـەی پاشـا

کوژرایـه و ڕمـەکیش لـەناو حەوشـەی قەسـریّ پاشـای چـەقێندرایە، دەڕێـن پاشـا لـەدووی ئـەو کەسـەی دەگـەڕیّ کـەوا ئـەو فەتحـەی کردیـە لـۆ ئـەوەی خـەڕاتی بکـات، ئەگـەر پێشـم بـاوەڕ ناکـەن ئـەو ئیشـە ئەحمـەدی بـرام کردیتیـو ئەحمـەدیش گـۆتی: هەی بـە قوڕێـت داکـە ئـەمن کـەنگی ئـەو ئیشـەم کردیـە ئـەمن لـە حـەیاتی خـۆم دێـوم نەدیتیـە، دەریّ سـاحێبی چـایخانەکەی لـەدری خـۆی گـۆتی: ئـەو قسـانە بـیّ سـەبەب نییـە، خاکمـار و برایـەکانی بـردە کۆشـکی پاشـای، پاشـاش زۆر بەخێرهاتنی کردن و زانی ئەوانە پاشازادە و پاڵەوانن.

پاشـا گـۆتی: کیهانتـان ئـەو فەتحـەی کردیـە، خاکمـاریش گـۆتی: پاشـا ئەحمـەدی بـرام بـوو، ئەحمـەدیش گـۆتی: هـەی بـە قـەڕێت داکـە ئـەمن کـەنگی ئـەو ئیشـەم کردیـە، گـۆتی: دەنـا محەمـەدی بـرام بـوو، ئـەویش هـەمان قسـەی ئەحمـەدی کـرد، خاکمـاریش تـوڕە بـوو سـواری هەسـپی بـوو دوو فـران لـە حەوشـی پاشـا هـات و چـوو خـۆی دەرمـی کـرد لـە بـن و بۆچـەوە دەری هینـاو تورەگەکەشـی هینـا کـەپو و لێـوی دێوەکـانی بـەگۆڕیّ وەرکـرد، کـە ئەحمـەد و محەمـەدان ئـەو شـتەیان دیـت یەکسـەر لـەخۆ چـوون، دەریّ ئاویـان پێدا کـردن و وەخـۆ هاتنـەوە، پاشـا کـە زانـی خاکمـار ئـەو شـتەی کردیـە پێـی گـۆت: کـوڕم بخـوازە مـاری دنیـاییّ، خاکمـاریش گـۆتی: پاشـام خـۆش بـی ئـەمن هـەر سـەلامەتی تـوم دەوێـت مـاری دنیـاییم لۆچیە ئـەمنیش وەکـی تـو پاشـامە، دەریّ نایـب و وەزیرەکـانی پاشـا گۆتیـان پاشـا ئەوانـە سـیّ برانـە ئـەتوش سـیّ کچـت هەنـە لـۆ پێشکەشـیان ناکـەی لەوانـەت باشـتر وەدەسـت ناکـەوی، دەبـی ئـەتوش کچـەکانت هـەر بـەمێرد بـدەی ئـەوجا بدەیـە وانـە باشـترە، پاشـاش گـۆتی: فکرەکـی چـاکە، دەریّ پاشـا گـۆتی: خاکمـار کـوڕم ئـەمن سـیّ کچـم هەنـە لـە بـاغی لـە دارەتـی دنیـاییّ هـەر ئـەو سـیّ کچـەم هەنـە ئـەوا پێشکەشـی تـوم کـردن، دەریّ خاکمـاریش گـۆتی: کچـی گـەورە بـا لـۆ ئەحمـەدی بـی و کچـی مامنـاوەنجی لـۆ محمـەدی بـی کچـی گچکەشـت بـا لـۆ مـن بـی، دەریّ مـەلایان هینـا و کچـەکانیان لـیّ مـارە کـردن و حـەفت شـەو و حـەفت ڕۆژان شـاییان گێـڕا، ئەوجا هەرکەیان چوونە سەر سەراو پەردەی خۆیان.

دەریّ ئەگـەر مانگـەك پێچـوو ئەگـەر دوو مـانگ، خاکمـار و براکـانی چـوونە کـن پاشـای گۆتیـان پاشـا ئەمـەش وەکـی تـو مەملەکـەتی خۆمـان هەیـە داك و بـابی خـۆن بـەجیّ هێشـتیە ئەگـەر ئیـزن بـدەی دەڕۆینـەوە، پاشـاش گـۆتی: کـوڕم هـەتا ئـەنگۆ لێـرە بـن هـەر خزمـەت و ئەکـەم، بـە کـەیفی خـۆش بـن چ لێـرە ئـەبن چ ئـەڕۆن، دەریّ خـوا حافیزییـان لـە پاشـای کـرد و وەڕێکـەوتن لـۆ مەملەکـەتی

خۆیـان لـە ڕێـی گەیشـتنە پیرەژنـەکی پیرەژنەکـە بـە خاکمـاری گـۆت کـوڕم ئێسـتا لەسـەر ڕێـی ئەگەنـە دوو ڕێیـان یـەکیان ڕێـی هاتێیـە حـەفت قۆناغـان دوورە، ئـەوی دیکـەیان ڕێـی نەهاتێیـە دوو قۆناغـان دوورە، ئـەجا ئـەنگۆ بـە ڕێـی هـاتیّ دا بـڕۆن سـەلامەترە، دەریّ ڕۆیشـتن وەکـی پیرەژنـی وەسـف کردبـوو گەیتنـە ئـەو دوو ڕێیـەی، یـەکیان نوسـرا بـوو ڕێـی هـاتیّ حـەفت قۆنـاغ ئـەوی دیکـەیان نوسـرا بـوو ڕێی نەهاتیّ دوو قۆناغ دوورە.

دەریّ خاکمـار گـۆتی: براینـە بـا بـەو ڕێیـەی دابـڕۆین بـەڕێی هـاتی هەرچـەند دووریشـە بـەرام سـەلامەترە، ئـەوانیش گۆتیـان هـەر ئـەو مـابوو حـەفت قۆناغـان ببڕین ئەمـە تاقـەتن لـەکیّ بـوو، ئەمـە لۆخـۆ بـەو ڕێیـەی داڕۆیـن دوو قۆناغـان دوورە ئەگـەینۆ مـاریّ، ئەحمـەد و محەمـەد و خێزانـەکانیان چـوونە ڕێـی نـەهاتیّ، خاکمـاریش گـۆتی: ئێسـتا نەچـم دوایـی بچـمۆ مـاریّ بـابم بـریّ کـا براکانـت ئـەمن هـەنگیّ چ بـرێم هـەر لێشـم قبـوور ناکـات، دەریّ بەناچـاری لـەدوو برایـەکانی چـوو، لـە ڕێـی گەیشـتنە بـاغ و باغاتـەکی میوەی حـەفت سـارەی پێـوە پوچـکە بـوو بـوو، گۆتیـان ئەمـە ئـەو شـەو لێـرە دەبـین، خاکمـار هەنـدی گـۆتی: لێـرە نـابین، ئـەوان گۆتیـان ئەمـە لێـرە ئـەبین ئـەتوش کـەیفی خۆتـە، خاکمـاریش لەبـەر خـاتری بـابی ئـەویش لەگـەریان مـاوە، دەریّ برایـەکانی خاکمـاری بـە خـۆو بـە خێزانـەکانیان لـەناو ئـەو باغـەی تـیّ گـەڕان و ئەسـوڕان خۆیـان لـە میـوە و تـەعامی تێـر کـرد و ئـەوجا هـەر یەکـەی لەگـەر خێزانـی خـۆی لـیّ کەتنـە خـەویّ، خاکمـاریش بـە دەردی شـەوانی پێشـی شـیری لـە خـۆی حـەمایل کـرد و سـواری هەسـپیّ بـوو بـووە حەرەسـی خێزانەکەشـی لـەکنی ڕاوەسـتا، دەریّ نیـوەی شـەویّ گرمـەی دێـوی گـەورە هـات، گـۆتی: خاکمـار لـە عاسمانـان تـەرەبم کـردی لەسـەر عـاردی وەچـنگم کـەتی ئـەتو دوو بـراو ئـامۆزات کوشـتیمە وەڵلا دەبـی بتکەمـە پارچـە گۆشـتەك لـەبن ددانـی خـۆم داتنـێم لـەبن دەسـتی مـن قورتـارە بـی، گـۆتی: دێـوە زۆر نـەڕە نـەڕیّ مەکـە بـا براکـانم وەخەبـەر نـێن ئەترسـێن، وەرە بـا لـۆ یـەك بکەوینـە مەیـدانیّ، ئیشـی دێـوانیش شـەڕە شـیر نـەبوو، گـۆتی: بـە چ بکـەین گـۆتی: بـە کەمەنـدان، دەریّ هـەتا بەربـەری بـەیانی یەکـدیان هینـا و بـرد زەفـەریان بەیەکـدی نـەبرد، بـەرە بـەری بـەیانی براکـانی خاکمـاری لـەبن بـەتانی تەماشـایان کـرد ئـەوا خاکمـار لەگـەڵ دێـوی شـەڕیەکا، بەسـەر چـاوی خۆیانـدا داوە گۆتیـان هـەتا ئەمـەی نەخواردیـە، خاکمـار لـەوەی تـوڕە بـوو گـۆتی: دێـوە بوومـە دیلـی تـوو وازم لـیّ بینـە، هەنـدی ژنەکـەی گـۆتی: وەمەکـە وەمەکـە، گـۆتی: نـەخێر ئـەمن تـازە بوومـە دیلـی دێـوی شـەڕی ناکـەم، گۆتیـە ژنەکـەی ئەگـەر ئـەمن مـاوەی حـەفت سـاران نەهاتمـەوە

ئەگەر لۆخۆ مێردیەکەی ئەمن منعم نییە و ئاگاشت لەخۆ بی، ئەرێ برایەکانی لێیادا سواری هەسپی بوون ژنی خاکماریش لەگەرەوان سواری هەسپێ بوو ڕۆیشتن، دێویش خاکماری لەسەر ملی خۆی داناو بردیە پاش چیای قاقێ کە چووە وێندەرێ خاکمار تەماشای کرد ئەوە خوشکی دێوی لەوێیە مەرجانەی جادویان پێگۆ، ئەرێن مەرجانە ژنەکی هەند ناشرین بوو، لێوەکی بەخۆ دادابوو لێوێکیشی ڕاخستبوو لێوی هەندە گەورە بوو، ئەرێ مەرجانە گۆتی: خاکمار دەوەرە ئەمن بەتەنێ لێرەمە بەرکەم هەندەکم لەکن دابنیشی و ڕۆژی پێکەوە قسان بکەین و دابنیشین گۆتی: باشە، دەرێ دێو ڕۆژی ئەچووە ڕاوێ و دەهاتەوە ئێواران کەلەشە گۆشتی دەهێناوە پێکەوە دەیان کردە کەباب و دەیان خوارد.

ڕۆژەکی دێوی گۆتی: خاکمار ئەگەر دەتەوێ ئەمن ئەتوو ئازاد کەم، بڕۆ کچێ قەڕاری فەرەنگانم لۆ بینە، ئەمن ئازادت ئەکەم.

ئەوجا با بێینەوە سەر باسی برایەکانی خاکماری، برایێ خاکماری کە چوونەوە، ئەو شارە هەمووی ڕەشی پۆشی بوو، وەکی چوونەوە بۆ شایی و زەماوەند بەلاّم خاکماریان لەگەڵ نەبوو، بابی گۆتی: کانی خاکمار، ئەوانی گۆتیان بابە خاکمار بێ غیرەت بوو لەگەر دێوی بەشەڕ هات دێو تێکی شکاند و خواردی، هەندی ڕێحانە گۆتی: وەنییە، بابیشی بە قسەی کوڕەکانی بڕوا کرد.

ئەوجا بێینەوە سەر باسی دێوی، دێو گۆتی: ئەگەر کچی قەراری فەرەنگانم لۆ بینی ئەوە ڕزگارت ئەکەم، ئەجا ۆتی دێوە ئەمن تسوانم قەڕاری فەرەنگان مەملەکەتی لە کێیە، ئەمن کوە گەمە وێندەرێ، گۆتی: ئەمن هەتا سەر حدودت ئەبەم ئەرێم ئەوە ڕێی ماری قەڕاریە، ئەوجا ئەگەر هینات ئەوە ئازادت ئەکەم ئەگەر نەشت هینا ئەوە هەر بە دیلی ئەمینیەوە، دەرێ دێو خاکماری لەسەر ملی دانا بردییە سەر حدودی گۆتی: ئەوە ڕێی ماریێ قەراری فەرەنگانە، ئەو ڕێیە هەڕاست ئەچیتە پێش ماریان، دەرێ دێو گۆتی: ئەمن لێرابم هەتا ئەتو دێیەوە، دەرێ خاکماریش وەڕێکەوت لۆ ماری قەراری، لە ڕێی گەیشتە ئاشەکی تەماشای کرد ئەوە بە حەفت ژنان نانی ئەکەن بە حەفتانیش ئەیبرژێنن بە حەفتانیش ئەکەنە پار و ئەدەنە کابرایەکی، ئەو کابرایەش هەر هاوار ئەکا ئەی هاوار لە برسان مردم، دەرێ خاکماریش گۆتی: پەکو لەو عاجیباتیەی خوایە، دەرێ کابراش گێی لێ بوو گۆتی: ئەوە عەجایبە یان ئەوە عەجایبە ئەرێن کابرایەك هەیە ناوی خاکمارە دوو برا دێوی کوشتینە لەگەر حەفت ئامۆزایان

دەیەویٚ بچی کچی قەراری فەرەنگیان بینی، خاکماریش گوتی: ئەگەر ببینی چی لیٚ دەکەی، کابراش گوتی: وەڵلاهی وەعدم دایە ببینم وەگەری ئەکەوم و یارمەتیشی ئەدەم، وەڵلاهی گوتی: ئەگەر بروابیم پیٚ ئەکەی ئەمن خاکمارم، دەریٚ کابرا هەستا وەگەر خاکماری کەت، دەریٚ لەویٚ رۆیشتن تەماشایان کرد کابرایەك دەوی بە رووبارەکی وەنایە ئەو ئاوەی هەموو دیٚتە ناو دەمی هەر ئەشریٚ ئەی هاوار خنکام لە تیٚنان، ئەریٚ خاکماریش گوتی: ماشەڵلا عەنتیکەیە، دریٚ کابراش گوتی: ئەوە عەنتیکەیە یان ەوە عەنتیکەیە ئەریٚن خاکمارەك هەیە دوو دیٚوی کوشتینە لەگەر حەفت ئامۆزایان قەولە بچی کچی قەراری فەرەنگتنیش بینی، دەریٚ خاکماریش گوتی: ئەکەر ئەتو ئەو پاڵەوانەی ببینی چی لیٚ کەی، گوتی: وەڵلاهی قەولم دایە وەگەری بکەوم و یارمەتیشی بدەم، دەریٚ خاکماری گوتی: ئەگەر بروام پیٚ بکەی ئەمن هەوم، دەریٚ کابرا دەوی لە ئاوی کردەوە و وەگەر خاکماری کەت، ئەریٚ لەویٚش وەریٚکەتن تەماشایان کرد سەیەك لەویٚ کەتیە هەموو قالبی گرو بووە پیس، ئەریٚ خاکمار دری زۆر پیٚ سووتا هەرستا سەیەکەی خاویٚن کردەوە و خواردنی دایێ و دەریٚ سەیەکە بەکاری خوای وەقسە هات گوتی: خاکمار ها دوو موان لە کلکی من ببە هەر کاتەکی پیٚویستت بە من بوو ئە موانە هەرکروزیٚنە ئەمن ئەگەمە کنە تو، ئەوجا گوتی: ئەتو بەخیٚوچی ئەتو ئەوە بەخۆ گرو بووی هەتا یارمەتیم بدەی، سەیەکەش گوتی: بەکەلکت دیٚم ئەتو ببە، مووەکانی هەردا گیرفای لیٚیان دا رۆیشتن، دەریٚ داخیلی شاری قەراری فەرەنگیان بوون، دەریٚن دو ریٚ هەبوون لۆ شاری قەراری فەرەنگیان، ریٚیەکیان ئەچتە ناو قەسری پاشای ئەوە ئی میٚوانان بوو، ریٚیەکیشیان ئەچتە ناوەندی شاری، ئەو شارە باغەکی لیٚ بوو لەناو ئەو باغەی کورسییەك دانرا بوو هەر کەسەکی داخوازیکەری کچی قەراری بایە لەسەر ئەو کورسییە دائەنیشت، دەریٚ خاکماریش لەگەر جەماعەتی خۆی لیٚیاندا رۆیشتن بەرەو ناوەندی شاریٚ لەویٚش چوونە ناو باغەکەی، خاکماریش لەسەر کورسییەکە دانیشت، دەریٚ خاکمار لەسەر کورسی دانیشت، جارچی جاریدا بانگی کرد گوتی: پاشا بەرگی نویٚت موبارەك بی، داخوازی کەریٚ کچت هاتینە، پاشاش داوای لە نایب و وەزیرەکانی خۆی کرد گوتی: برۆن ئەو داخوازی کەرانە بینن، بزانن چیان دەویٚ، دەریٚ داخوازی کچیٚ قەراری شەرت و شروتی هەبوو، ئەوەی ئەو شەرت و شروتانەی جیٚ بەجیٚ کردبایە ئەوە ئەبووە دەستگیرانی وی دەنا لەسەریان دەدا، دەریٚ پاشا لەدو خاکمار و جەماعەتەکەی ناردن، هاتن لە دیوەخانیٚ

دانیشـتن و بـەخێرهاتنیان کـردن و ڕێزیـان گـرتن و چـایە و قاوەیـان خـواردەوە، گـۆتی: پاشـا زادەینـە ئـەنگۆ لـۆ داخـوازی کچـیٚ مـن هاتینـە، گۆتیـان بـەریٚ، گۆتی: بەقسـیٚ مـن ئەکـەن ئەگەڕێنــەوە لەبــەر ئــەوەی ئــەتوو پاشــا زادەی حــەزیٚ ناکــەم لەســەرت دەم، چـونکە کچـیٚ مـن شـەرت و شـروتی هەنـە، ئـەوی ئـەو شـەرتانە جـیٚ بـەجیٚ نـەکا ئـەمن لەســەری ئــەدەم، خاکمــاریش گــۆتی: پاشــا ئــەمن ســەرەکم هینایــە و نایگێرمــەوە، شەرت و مـەرجی خـۆ بـریٚ ئەگـەر پـێم جـیٚ بـەجیٚ کـرا ئـەوە کچـیٚ تـو بـووە ئـیمن ئەگـەر پێشـم جـیٚ بـەجیٚ ەکـرا ئـەوە ئـەوکاتی خـوێنی منـت لـیٚ حـەرار بـی لەسـەرم دە، گـۆتی: زۆر چـاکە، شـەرتی یەکـەم چـییە؟ گـۆتی: سـبەینیٚ ئـەزانی جـارەك پێـت نـارێم، دەریٚ پاشـا هەرسـتا سـەد مەنجـەرە شـیوی لێنـا لەگـەر سـەد مەنجـەرە مەرەگـەی، ئـەوجا گـۆتی: وەرن ئـەو شـیوەی هـەموو بخۆنـو ئـەوە مـەرجی یەکەمـە، ئـەوجا گـۆتی: پاشـا قـەت مـەرجی ئـەوها دانرایـە ئـەتو مەرجـەکی ئـەوها دابـنیٚ بـە ئینسـانیٚ جـیٚ بـەجیٚ کـریٚ، ئـاخر سـەد مەنجـەر شـیو هـەمووی مەنجـەریٚ زنجـیردار ئـاخر ئـەوە کـو بـەمن ئـەخوریٚ، پاشـاش گـۆتی: ئـەدی ئـەمن پـێم نـەگۆتی ئـەوەل جـار داخـوازی کـەریٚ کچـیٚ مـن بـە مەرجـە، ئـەریٚ خاکمـار لەبرسـا مـردی وەبـیر هـاتۆ پێـی گـۆت وەرە کاکـە ئـەتوم ئەگـەر لـۆ ئـەورۆ نـەبی لۆچیە؟ لەبرسـا مـردی گـۆتی: وەڵڵایـی دەمـی لـیٚ نـادەم، کـوڕە هەی داکت چـا هـەی بابت چـا کـو دەمـی لـیٚ نـادەی ئـەدی ئـەتو لـۆ چ لەگـەرە مـن دای، گـۆتی: ئـەمن بـە ئۆنـدەی ڕازی نـابم، ئـەمن بـە ئۆنـدەی کـو تێـر ئـەخۆم، دەریٚ خاکمـار و لــە تێنــان خنکــای هەرســتان بــە هەرچــی حــارەکی هــەبوو مەنجەرەکـەیان خـوارد، لەبرسـا مـردی گـۆتی: بـەخوای بەشـێمن نـامێنیٚ، ئـەریٚ هـەر دەسـتی وە بـنی مەنجـەریٚ دادەهینـا دەگـەروی خـۆی ئـەکرد و تەقـەی مەنجـەریٚ دەهـات فرێـی ئـەدا هـەتا ئـەخیری مەنجـەری خـوارد، دەریٚ جـار چـی جارپـدا بـانگی کـرد گـۆتی: پاشـا بـەرگی نوێـت موبـارەك بـی ئـەوە شـەرتی یەکـەمیان بـەجیٚ هینـا، کـە پاشـا گێـی لـەو قسـانە بـوو دەسـتەکی هاتـە پـێش و یـەکی هاتـە دوایـیٚ، دەریٚ پاشـا بـانگی نایـب و وەزیرانـی کـرد گـۆتی: شـەرتەکی وەهـام لـۆ دابنـێن پێـی جـیٚ بـەجیٚ نـەبیت، دەریٚ نایـب و وەزیرەکـان گۆتیـان پاشـا ئـەتو لـەناو حەوشـی کۆشـکی حـەوزەکی گـەورەت هەیـە، پێیـان بـریٚ ئـاوی ئـەو حـەوزەی هـەمووی لـۆ بخـۆوە، دەریٚ پاشـا بـانگی خاکمـاری کـرد وۆتـی کـوڕم شـەرت دووەمـم ئەوەیـە ئـاوی ئـەو حـەوزەم هـەمووی لـۆ بخـۆوە، دەریٚ خاکمـاریش گـۆتی: پاشـام ئـەو هـەموو ئـاوە کـو دەخورێـت و بـا ئینسـان پەرداغـە ئـاوەك یـان دوو پەرداغـە ئـاوان بخواتـەوە بـەس حـەوزە ئـاوەك کـو دەخورێتـەوە، پاشـاش گـۆتی: کـەیفی خۆتـە کـو دەیخۆیـەوە بیخـۆوە ئەگـەرنا ئـەوە جـەلاد ئامادەیـە و لەسـەرت ئـەدا، دەریٚ خاکمـار چـوو داوای لـە تێنـان خنکـای کـرد گـۆتی: ئـەتوم لـۆ ڕۆژەکـی ئـەوها

نـەبی ئـەتوم لـۆ چـییە وەرە ئـەو ئـاوەی بخـۆوە، دەریّ لـە تێنـان خنکـای دەوی بـە حـەوزی وەنـا قورەکەشـی لەگـەر هەرلووشـی، هـەمووی خـواردەوە، جارچـی بـانگی پاشـای کـرد گـۆتی: پاشـام خۆشبی بـەرگی نوێت موبـارەك بـی وەڵـلاّ ئـەو شەرتەشـیان جیّ بەجیّ کرد ئەوجا ئەمن چ بکەم.

دەریّ پاشـا سـەیەکی هـەبوو ئـەو سـەیە حـەفت سـار بـوو بـەس خزمـەتیان ئـەکرد هـەموو ڕۆژیّ هێلکـە و ڕوون و گۆشـتیان ئـەدایێ، دەریّ پاشـا سـەیەکەی هینـا دەریّ گـۆتی: خاکمـار دەمـەوێ سـەیەکی پـەیا بکـەی لەگـەر سـەی مـن شـەڕی پـێ بکـەی، ئەگـەر سـەی تـو بەسـەی مـن وێـرا ئـەوە ئـەوکاتی شـەرتەکەت بـردەوە ئەگـەر نـا ئـەوە سـەری خـۆت حازرکـە سـەرت ئـەبڕم، پاشـا وەی دانـابوو هـیچ سـەیەك بـە سـەی وی نـاوێرێ، خاکمـار گـۆتی: پاشـا ئـەمن لـەو شـارەی سـەی لـە کێنـدەریّ پەیداکـەم، جـا گـۆتی: پـڕی بازاڕینـە لۆخـۆت بـڕۆ سـەیەکی بینـەوە دەگـەر ئـی مـن بـە شـەڕی بینـە، ئـەریّ خاکمـار کەچـە سـەیەکەی خـۆی وەبیرهاتـەوە، ئـەریّ مووەکـانی هەرکروزانـد سـەیەکە دەم و دەسـت لـەویّ حـازر بـوو گـۆتی: فـەرموو پاشـا چـت دەویّ لـۆت جـیّ بـەجیّ کـەم، گـۆتی: دەمـەویّ سـبەیێ لەگـەر سـەی پاشـات بەشـەڕ بیـنم ئەگـەر پێشـی بوێری نـزانم پێـی ئـەوێری یـان نـا، گـۆتی: خـەمت نـەبی وەڵـلاّ سـبەینێ عالـەم خڕبـۆوە مەیـدان جـۆش درا سـەیان هینـا بەشـەڕیان هینـان، دەریّ سـەی پاشـای خـۆی دەو سـەی کـرد ئـەو سـەیە خـۆی وەعـاردی دێخسـتوو قـوڕە قـوڕی ئـەکرد لـەولای لـۆ ئـەولای غـاری ئـەدا هـەتا سـەی پاشـای مانـدی بـوو، چـونکە سـەی پاشـای هێلکـە خـۆر بـوو، ئـەریّ سـەی خاکمـاری لەبنـەوە خـۆی دەملـی سـەی پاشـای کـرد دەبنـە خـۆی نـا هـەتا هەناسـەی لـیّ بـڕی ئـەجا لەسـەری هەسـتا، ئـەریّ بانگیـان کـرد پاشـا بـەرگی نوێـت موبـارەك بـی ئـەو شەرتەشـت دۆڕانـد، پاشـا داوای لـە نایـب و وەزیـران کـرد شەرتەشـکەی لـۆ دانـێن، دەریّ شـەرتەکی زۆر عەنتیکـەیان دانـا ئـەوجارە کـە هینایـان سـەت تەنەکـە گـەنم و سـەت تەنەکـە جـۆ و سـەت تەنەکـە بـرنج و نیسـك و سـەت باتمـان هـەرزن و ئەوانـەیان هـەموو تێکـەراو کـردن لـە درەوەی کۆشـکی، گۆتیانـە خاکمـاری هـەتا سـبەینێ دەبـی هـەمووی لێـك جوایەزکەیـەوە، ئـەریّ خاکمـار دەسـتەکی کەتـە پـاش و یەکـەکی کەتـە پـێش نـەیزانی چ بکـا خـەم دایگـرت ئـەوە وەکـی نـان خـواردن و ئـاو خواردنـەوی نـەبوو، دەریّ هـەتا نیـوە شـەویّ لـەزگ بـوون دوو تەنەکـەیان پـێ لەیـەك جوایـەز نەکرانـەوە، دەریّ لەبرسـا مـردی گـۆتی: خاکمـار ئەگـەر ئـی خـواردیّ بایـە هـەمووم لـۆ خـواردی لـە تێنـا خنکـای گـۆتی: خامـار ئـی ئـاو خواردنـەوەی بـا هـەمووم لـۆ خواردییـەوە بـەس ئەمـە چ لـیّ بکـەین، ئـەریّ خاکمـار لـە عێـدزیان چـوو لەسـەر جۆگـە ئـاوەکی دانیشـت، ئـەریّ کۆمـەرە مێـرووەك خـڕ ببونـەوە ڕێیـان نـەبوو

بپەڕنەوە، خاکمار شیری خۆی لۆ پێدا ڕاهێشتن یەک یەک مێرووەکان لە جۆگەی پەڕینەوە، ئەریٚ شای مێرووان هات گۆتی: پاشازادەم مادام ئەو چاکەت لەگەرە مەکرد هەر ئیشەکی بەمە بکریٚ داوابکە تا لۆت جیٚ بەجیٚ بکەین، ئەوجا گۆتی: مێروونە ئەنگۆ بەو گچکەییەی چو پێدەکریٚ، شای مێروانیش گۆتی: ئەتو ئیشەکەی بریٚ ئەگەر پێن بکریٚ ئەوە لۆت جیٚ بەجیٚ ئەکەین، ئەگەر پێشن نەکریٚ ئەوە نایکەین، خاکماریش گۆتی: ئەو هەموو دانەوێرە هەیە گەنم و جۆ و برنج و نیسک و هەرزن تێکەڕاو کرایە لۆن لێك جوایەز کەنەوە، شای مێروانیش گۆتی: پاشازادە هەرو بەبیٚ خەمی بنوو ئەوە ئیشی مەیە، هەتا سبەینیٚ هەرەستی هەریەکە کۆمەری خۆی بە جوایەز دانرایە، دەریٚ خاکماریش چوو لێی پارداوە لیٚ کەتە خەویٚ، سبەینیٚ هەروەکی هەرستا هەرکویان گۆتبوو مێرووەکان ئەوها بوو، هەر دانەوێرەیەك کۆمەری خۆی بەجوایەز بوو، بانگی پاشایان کرد گۆتیان پاشا ئەو جارەش بەرگی نوێت موبارەك بەخوای ئەو شەرتەشت دۆڕاند کچەکەت تازە بۆ ئی ئەوان، ئەریٚ بانگی مەلایان کرد و کچیٚ قەراریان لە خاکماری مارە کرد، خاکمار هەرستا و کەژاوەی هینا لە وراغانیان بار کرد کچیٚ قەراریان لەناو کەژاوەی نا لێیاندا ڕۆیشتن، ئەوان لە شاری چوونە دەریٚ برەکی ڕۆیشتن، نایب و وەزیرەکان گۆتیان باشە پاشا ئەتو ئەو کچەت لۆ دەبەر دەستی ئەو کابرایە نا، لۆ لەشکرەکی نانێری لەڕێی بیکوژن و کچەکەش بیننەوە، گۆتی: وەڵڵا شتەکی چاکە، هەتا ئەوان لەشکریان حازر کرد و وەخۆ کەتن بەدویاندا چوون، خاکمار و جەماعەتەکەی گەیشتنەوە ئەو ڕووبارەی ك لەتێنان خنکای دەوی پێوە نابوو، لەشکریش گەیشتە وێندەریٚ ئەریٚ لە تێنان خنکای دەوی بە ڕووبارییەوە نا گۆتی: ئەنگۆ بپەڕنەوە، دەریٚ خاکمار و جەماعەتەکەی پەڕینەوە، لەشکری قەراری فەرەنگانیش گەیشتە ناوەندی ڕووباری لەتێنان خنکای دەوی لە ڕووباری کردەوە و لەشکرەکە نیوەی بە ڕووباری داچوو، ئەوجا دەریٚ خاکمار لەوێندەریٚ دوعا خوازی لە لەتێنان خنکای کرد، ڕۆیشتن گەیشتنەوە ئاشی لەبرسا مردیش لەویٚ ماوە، خاکمار دوعا خوازی لیٚ کرد و وەڕێکەوتن چوونەوە کن دێوی کە لەسەر حدود چاوەڕوانی خاکماری ئەکرد، ئەوجا دێو خاکمار و کچی قەراری لەسەر ملی دانان و بردنیەوە پشت چیای قاف کن مەرجانەی جادووی، دەریٚ کە چوونەوە وێندەری دێو گۆتی: ئەوجا خاکمار ئەتوو ئازادی ئەگەر ئەڕۆی خواحافیزت بی، خاکماریش گۆتی: دێوە ئەمن تازە لەگەرەنگۆ لیٚ ڕاهاتیمەو ئەوجا چار پێنج ساری پێچوینە نزانم داك و بابم ماینە نەماینە، ئەمیش ئەوا لۆخۆم لێرە لەگەرەنگۆ دابم، دێویش گۆتی: ئەوجا کەیفی خۆتە، ئەگەر ئەڕۆی برۆ نارۆی لێرەبە، خاکمار لەبەر ئەوەی بوو هەتا کچی

قـەراری لەگـەرە خـۆی ببـات و دێـویش بـە فێرەکـی بکـوژێ، ئـەوجا دەریّ ئۆبـار بـە ملـی ئـەو مامۆستایەی ئـەمن گـێم لـیّ بـووە دەرێـن ئـەو دێـوە ڕوحـی لەکنـە خـۆ نـەبوو، دەریّ خاکمـار وەیگۆتـە کچـیّ قـەراری گـۆتی: بـە فـرت و فێـران نـازو فیـزان پێـی ئاشـکرا بکـە داخـوا ڕوحـی لـە کێنـدەر دانایـە، گـۆتی: باشـە، دەریّ ئێـواریّ وەکـی دێـو هـاتۆ لـە ڕاویّ کەلەشـە حەیوانـەکی وێبـوو هاتـەوە تەماشـای کـرد کچـیّ قـەراری خـۆی عێـدز کردبـوو قسـەی نـاکردن چـاوی بـە گریـان بـوون، دەریّ دێـو شـێت بـوو گـۆتی: وەرە بـزانم لەبـەر چ ئـەوها عێـدز ئـەگرێی، گۆتی: سـوانم دیـارە بـڕوات بـەمن نییـە پـێم نـارێی داخـوا ڕوحـی خـۆت لـە کێنـەر دانایـە، دێـویش گـۆتی: چیشـت بـە ڕوحـی منـە، ئـەویش گـۆتی: نـابی بـزانم ئـاخر دوایـیّ شـتەکت لـیّ بـیّ ئـەمن خـەمی تومـە، دەریّ دێـو گـۆتی: ڕوحـی مـن هێلکەکـە دەنـاو زگـی کـار مـامزەکی دایـە هـەموو ڕۆژانـی جومعـان دێتـە سـەر کـانییّ دەرمانـاویّ، گـۆتی: زۆر باشـە ئـەوە درم داکـەت، دەریّ ڕۆژی جومعـە خاکمـار چـووە سـەر ئـەو کانییـەی دیـتی وا مامزەکـە لەسـەر کانییەکەیـە، دەریّ تیرەکـی دەرهینـا نـاوی خـوای لـیّ هینـا نیشـانەی لـیّ گـرت تیرەکـەی لێـدا کـار مـامزی بـەرداوە، چـەقوی دەرهینـا سـەری بـڕی و ورگـی هـەردڕی و هێلکەکـەی دەرهینـا، دەریّ وەکـی هێلکەکـەی دەرهیـا دێـو لـەویّ حـازر بـوو، گـۆتی: داك چـا ئـەوەی ئـەمن کردیـە ئـەتو نەکـەی، ئـەریّ خاکمـار هێلکەکـەی بـە عـاردی دادا دێـە لەوێنـدەریّ ڕاسـت تـەواو بـوو، هاتـەوە کـن ئەشـکەفتیّ لەگـەر کچـی قـەراری سـواری هەسـپیّ بـوون، هەرکـە بگەڕێنـەوە لـۆ مەملەکـەتی خاکمـاری، مەرجانـە گـۆتی: ئـەدی ئـەمن نابـەن لەگـەرە خـۆ، گۆتیـان ئەتووهـەر لێرەبـە چ لـە تـوو بکـەین، دەریّ لێیانـدا ڕۆیشـتن ئـەوجا ئەگـەر حەفتـەك پێچـوو ئەگـەر بیسـت ڕۆژی پێچـوو ئەگـەر مانگـەکی پێچـوو دەریّ داخیلـی مەملەکـەتی خاکمـاری بـوون، کـە گەیشـتنە نێزیـك شـاری، تەماشـایان کـرد بـە دوو منـداران لـە مندارەکی ئـەدەن، هـەر ئـەرێن ئـەو شـەو داکـت مـارە ئەکـەنۆ خاکمـار گـۆتی: هـەبی و نـەبی ئـەوە کـوڕی منـە، لەبـەر ئـەوەی ڕێحانـە زگـی هـەبوو کـە خاکمـاری بـەجیّ هێشـت، ئـەریّ لـە منـدارەکان نزیـك بوونـەوە گـۆتی: وەرە کـوڕم بـزانم لـۆ لێتـەدەن ئەوانـە، گـۆتی: خـارە ئـەمن ئـەوە پێـنج شـەش سـارە ئـەوە بـابم بـزر بـووە، ئـەرێن دێـو خـواردیتی، مامەکانیشـم قەولـە ئەوشـەو داکـم مـارە بکەنـەوە، ئـەمنیش لەبـەر هەنـدیّ ئـەگرییّم و ئەوانـەش لـێم دەدەن، خاکمـاریش بـەدزی پێـی گـۆت هـەرو بـەداکت بـریّ بـابم هاتـەوە، ئـەریّ ئـەویش لـە خۆشـیان غاریـداوە مـاریّ گـۆتی: دایـە بـابم هاتـەوە، دەریّ خاکمـاریش وەکـی چـووە ژووریّ مـاریّ بـۆ شـایی و زەماوەنـد و سـەیران، حـەفت شـەو و حـەفت ڕۆژان دۆر و زوڕنـا لەوشـارە گـەڕا، خاکمـاریش لـۆ ئـەوەی تـۆرەی لـە برایـان بکاتـەوە سـبەینیّ بـانگی مـەلای کـرد و گـۆتی: بـڕۆ لەسـەر بـانی مزگـەفتیّ بـانگ

ڕابێـره بـرێ ڕەحمـەت لـەوی و لـە بـابی سـبەینێ گـاوان و شـوان ئەچـنە کـن حـەیوانی ئـەمن هـەردوو برایـێ خـۆ ئەکەمـە گـاوان و شـوان، لەبـەر ئـەوەی پیـاو نـەبوون و بـە پیـاوەتی لەگـەرە مـن نەجولانـەوە، دەرێ سـبەینێ یـەکی کـردە گـاوان و یـەکی کـردە شـوان گۆپـارەکی لەدەسـت نـان گـۆتی: یـەڵلا برۆنـە کـن حـەیوانی، بەخۆشـی لـەجێی بابی دانیشت بوو بووە پاشا، ئەمنیش حەکایەتم بڕا و چشم پێ نەبڕا.

- **لێکدانەوەی هەندێ ووشە**
  - حەمایل/ لەخۆ بەستن.
  - کەول و سێ قەلات/ پێخەڤ نووستنی ئەو سەردەمی بوو.
  - مەئموور/ بەرپرس.
  - پالەوانەکی بە ڕەزا/ پالەوانەکی بێ وێنە.
  - گروو/ گەر (نەخۆشییەکی پێستە).
  - مەیدان جۆشدرا/ مەیدان ئامادە کرا.
  - شیری خۆی لۆ پێدا ڕاهێشتن/ شیری خۆی لۆ کردنە پرد.

**تێبینی:.**

ئـەم هەقایەتـەم لـە بـاوکم بیسـتووە و ئێسـتا لـە ژیـان مـاوە ئـەویش لـە مـام حەمـەدی شـێخ تـەهای کونەفلوسـەیی گـێ لێبـووە، مـام حەمـەدیش لـە تەمـەنی (٧٠) ساڵیدا لە ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوایی کردووە.

– **ئەفسـانەیەکی زۆر تـەواوە و هـەموو رەگـەزەکانی ئەفسـانەی تێدایـە، فیکـرەی سـەرەکی ئەفسـانەکە یـەکجار کۆنـە، ئـەوەی کـە زۆر نوێیـە خاکمـار لـە ڕێگـا توشـی پیرەمێـردی خـەڕەك گێـڕ دەبـێ، کـە مـەئمووری شـەو و ڕۆژە، لەسـەر داخـوازی خاکمــار شــەو ڕادەگــری و لێناگــەڕێ ببێتــە ڕۆژ، کــە ئەمــەش جۆرکـە لـە ڕاگـرتنی زەمـەن، کەڕەگـەزێکی گـرنگ و نـوێی ئەفسـانەیە لـە نێـو ئەفسانەی کوردییدا.**

# كورته چیرۆك

**كۆكردنەوەی: سەمیرە حەمید هەمزە**

**دەڵێن: پشیلەی ڕەش شەیتانە!**

دەگێڕنـــەوە دەڵـێن: ماڵێـك هــەبوو كوڕێكیــان هــەبوو زۆر حــەزی لــە حــەیوانات دەكـرد، هەربۆیـە لـە مناڵیـەوە پشـیلەیەكی بچـوكی بۆخـۆی لـەماڵی خۆیـان ڕاگـرت بـوو، بـەلاّم كوڕەكـە زۆر هـۆگری ئـەو پشـیلەیە بـوو بـوو، پشـیلەكە چـاوێكی كـوێر بـوو، كوڕەكـە هـەموو كـات پشـیلەكەی لـەلا بـوو، هـەموو خـواردنێكی پـێ دەداو زۆر بـــەجوانی خزمـــەتی دەكـــرد و زۆر خۆشـــی دەویســـت، وای لـــێ هـــاتبوو ئـــەو پشیلەیەش بـە شێوەیەكی وا هـۆگری ئـەو ماڵـە و ئـەو كـوڕە بـوو بـوو هـەرگیز لێیـان دوور نەدەكەوتــەوە، ئــەو كــوڕە بــۆ هــەر جێگایــەك بڕۆیشـتبایە ئـەو پشـیلەیەی لەگـەڵ خـۆی دەبـرد هـەتا كوڕەكـە گـەورە بـوو ئـەو پشـیلەیە لـە ماڵیـان بـوو، وەكـو ئەنـدامێكی ئـەو ماڵـە وابـوو، پشـیلەكە ڕەش بـوو جارێكیـان كوڕەكـە چـووە بـازاڕ و جلوبـەرگێكی جـوانی كـڕی تـا لەبـەری بكـات، جلـەكانی كـە هێشـتا لەبـەری نـەكرد بوو لە ماڵەوە هەڵی گرت بوو.

شـەوێكیان كوڕەكـە دەچێتە سـەر جێگـای نوسـتن و بـۆ ئـەوەی بنـوێ بـەلاّم هێشـتا تـەواو خـەوی لـێ نەكـەوت بـوو دەنگێكـی دەبیسـت و دەڵێـت حەمـە كـۆر حەمـە كـۆر وەرە ئـەمڕۆ شـاییمان هەیـە بـاب ڕۆیـن، كوڕەكـەش هـەر ئاگـادار دەبێـت و خـەوی لـێ نەكـەوتووە بـەلاّم خـۆی وا نیشـان دەدات كـە خـەوی لـێ كـەوتووە بـەوەی كـە هـیچ قسـەیەك ناكـات و نـاجوڵێ لـە جێگـای خۆیـدا، ئەوەنـدەی پـێ ناچـێ حەمـە كـۆر كـە (پشـیلەكەیە) شـەو بـەبێ دەنگـی بـەبێ چـرپە بـەدوای ئـەو دەنگـەی كـە بـانگی دەكـات دەڕوا و جلــە نوێیــەكانی كوڕەكــە لەگــەڵ خــۆی دەبــات، وە لــە ڕێگـادا پشـیلەكە جلـەكانی كوڕەكـە لەبـەر دەكـات و كوڕەكـەش هـەر بـە دوایـدا دەڕوات. تـــا جێگایـــەكی دوور دەبڕێـــت بـــە دوای پشـــیلەكە ئینجـــا لـــە دووریـــان دەوەسـتێت و دەبینێـت حەمـە كـوێر دەگاتـە لای جنۆكـەكانی و بـە جلوبـەرگێكی جـوان هــەر لەگــەڵ جنۆكــەكان هەڵپــەڕكێ دەكــات تــا نزیــك دەبێتــەوە لــە بــەرە بـەیان، كوڕەكـە ئەمـەی بـە چـاوی خـۆی بینی و پاشـان گەڕایـەوە بـۆ جێگـای خـۆی و حەمـە كـۆر جگارەیـەك دەكێشـێ و بـە جگارەكـەی جلـە نوێیەكـەی كوڕەكـە كـون

دەکات، پاشان حەمە کوێر دێتەوە ماڵیٚ و جلەکان لە شوێنی خۆی دادەنێت، هەر وەکو جاران خۆی بێدەنگ دەنوێنیٚ و بەڵام کوڕەکە پێی دەڵێت: ها حەمە کوێر ئەمە ئەم شەو لە کویٚ بویت ئەوە هەڵپەڕکێتان هەبوو ئەویش کە جنۆکەیە دەڕوات و ئەو ڕۆیشتنەی کە دەڕوات وون دەبێت و ئیتر نایەتەوە و کەس نایبینێت.

## پیاوێکی ژیر

**ئەو کەسەی کە ئەم چیرۆکانەی بۆ گێڕامەوە:**

**ناوی: ڕەحمە خلیل ئەحمەد**

**ئاستی خوێندەواری: نییە**

**شوێنی ژیانی: کەرکوك لە دایك بووی : ١٩٣٥**

دەگێڕنەوە دەڵێن: پیاوێك و ژنێك دەبن لە دەشت دەبن لە زەمانی زوو، پیاوەکە برادەرێکی دەبێت و زۆر خۆشی دەوێت برادەرەکەی زۆر زیرەك و ژیر دەبێت، هەموو جارێك کە دێتە ماڵی ئەو پیاوە زۆر قسەی خۆش دەکات و مەسەلەی خۆشیان بۆ دەگێڕێتەوە.

لە ماڵیان دادەنیشێت و تەواو لە هەڵسوکەوتی خێزانی ئەو پیاوە شارەزا دەبێت و ڕۆژێك ئەو پیاوە ژیرە دەچێتە ماڵی برادەرەکەی واتا پیاوی ژنەکە دەڵیٚ ئەم ژنەی تۆ چۆنە لەگەڵت؟ ئایا هیچ دەچێتە دەشت و لە دەرەوە یاخود بڵێین لە دەشت ئیش دەکات؟ لەو کاتەشدا کاتێکی وابوو کە خەڵك بەگشتی کاری دەکرد هەتاوەکو ژنانیش کاریان دەکردوەکو کا کوتین و قەسەڵ کۆکردنەوە و کشتوکاڵ کردن... هتد. پیاوەکەش دەڵیٚ بەڵیٚ ئەم ژنەی من هەر لە بەیانییەوە دەچێتە دەشت و تاوەکو ئێوارە ئینجا دەگەڕێتەوە ماڵەوە چونکە ئیش دەکات لە دەشت و پاشان قەسەڵ و شت دێنێتەوە بۆ سوتاندن، هاوڕیٚ ژیرەکەشی کە پیاوێکی زۆر ژیر دەبێت و تەواو لە هەڵسوکەوتی ژنەکە شارەزا دەبێت و بە پیاوەکە دەڵیٚ ئەو ژنەی تو مارە، پیاوەکەش دەڵیٚ چۆن وایە ئەویش دەڵیٚ بەڵیٚ وایە و ئەو ژنەی تو مارە ئەگەر بڕواشم پیٚ ناکەیت خۆت تاقی بکەوە و بزانە وایە یان نا، پیاوەکەش هیچ دەنگ ناکات و یەکسەر بە ژنەکەی ناڵێت تۆ ماری، کە یەکەمجار برادەرەکەی پێی دەڵیٚ ئەو ژنەی تو مارە هەر بڕواشی پیٚ ناکات و دەڵێت چۆن شتی وا دەبێت ماری چی و من ئەو

خێزانــەی خــۆمم زۆر خــۆش دەوێــت، برادەرەکەشــی دەڵێــت بــڕۆ ژنەکــەت تــاقی بکــەوە ئــەویش دەڵــێ چــۆن تــاقی بکەمــەوە و چــۆن بــزانم مــارە یــاخود نــا و چــۆن بڕوات پێ بکەم.

برادەرەکەشــی دەڵێــت: کــە ژنەکــەت بــەیانیان چــوو بــۆ دەشــت بــڕۆ لــە دوای و بزانــە قســەکەم ڕاســتە یــان نــا، پیاوەکــەش بــەیانی زوو هــەر کــە ژنەکــەی دەچــێتە دەرەوە و بــۆ ئــەوەی بــۆ دەشــت بــڕوات، پیاوەکــەش دوور و نزیــك لــە دوای ژنەکــەی لــە دوای ژنەکــەی دەڕوات. ژنەکــەش هــەر دەڕوات تــا لــە ئــاوایی دوور دەکەوێتــەوە پاشــان دەچــێتە نــاو پــەرژینێك و هەرکــە گەیشــتە نــاوی خــۆی دوو ســێ جــار ڕادەوەشــێنێ و جلــەکانی خــۆی لەبــەر دەکاتــەوە و جلــی مــار لەبــەر دەکــات پاشــان بــزر دەبێــت، پیاوەکــەش کــە دوور و نزیــك هــەر چــاوی لێیــەتی بــۆ ئــەوەی بزانــێ چــی دەکــات هەرکــە ژنەکــەی بــەم شــێوەیە دەبــینێ یەکســەر دەگەڕێتــەوە ماڵــەوە و لــە دڵــی خۆیــدا دەڵێــت بزانــە ئــەم هاوڕێیــەم چــەند ژیــرە و دەبێــت لێــی بپرســم بــزانم چــارەم چییە لەگەڵ ئەم ژنە.

ئێــوارە دادێ و ژنەکــە هــەر وەکــو چــەند ڕۆژە بــە جلــی جــاران دەگەڕێتــەوە ماڵــەوە و کۆڵــە قەسەڵێکیشــی لەگــەڵ خۆیــدا هێنــاوە پیاوەکەشــی هــیچ دەنــگ ناکــات و ناڵێــت تــۆ مــاری و بــەهیچ شــێوەیەك خــۆی وا دەرناخــات کــە ژنەکــەی هەســت بکــات کــە پیاوەکــە زانیویــەتی مــارە، ڕۆژێکیــان هــاوڕێ ژیرەکــەی هــەروەك و جــاران دێتــەوە بــۆ ماڵیــان و لێــی دەپرســێت چــیت کــردەوە و بــۆت دەرکــەوت؟ ئایــا ئێســتا بــڕوا دەکــەی؟ پیاوەکــەش دەڵێــت بــە ڕاســتی قســەت زۆر ڕاســت بــوو ئــەم ژنــەی مــن مــارە و بــە چــاوی خــۆم بینــیم، کــە خــۆی کــردە مــار و ون بــوو، ئێســتا چــی بکــەم باشــە، هــاوڕێ ژیرەکەشــی دەڵێــت هــەتا زووە خــۆتی لــێ دەربــاز بکــە و بیکــوژە نــەوەك ڕۆژێــك لێــت تــوڕە بێــت و زیانێکــت پــێ بگەیــەنێ، پیاوەکــەش شــەوێکیان ژنەکەی لەناو جێگادا دەکوژێت.

– لــەم دوو حەکایەتــە، واتــا پشــیلە و پیــاوێکی ژیــر، هــەردووکیان لەســەر بنــەمای بــڕوا بــوون بــە کــراس گــۆڕین = تناســخ – و ئەوەتــە پشــیلە دەبێتــە جنۆکــە و ژن دەبێتــە مــار. ئــەم خــۆ گۆڕینــە لــە مرۆڤــەوە بــۆ دڕنــدە و ئــاژەڵان لەوانیشــەوە بــۆ مــرۆڤ لــە حیکایــەتی گیانــداران و ئەفســانان، ئەفســانەی کــوردی و هــی هــەموو نەتــەوان، نموونــەی زۆرە.ســەیر لەوەدایــە حەکایــەتخوان وای دەگێڕێتــەوە، وەك ئــەوەی بــە چاوی خۆی دیویەتی و هیچ گومان لە ڕووداوەکە ناهێڵێتەوە.

# نهێنی کابرای زین دروو

کۆکردنەوەی: سامان محەمەد فەتاح

## کورتە پێشەکییەك

ئەو کەسەی کە ئەم چیرۆکانەم لە زمانییەوە وەرگرتووە ناوی (جەلال)ە کە ناسراوە بە (جەلالی موختار) کە کاتی خۆی موختاری دێکەی خۆیان بووە هەر بۆیە نازناوی (موختار)ی وەرگرتووە (جەلال موختار) ساڵی ١٩٤٢ هاتۆتە ژیانەوە و ئێستاکە لە شارۆچکەی (باوەنوور) یان (پێبان) نیشتە جێیە و لەوێ دادەنیشێت وە کاك جەلال موختار وەکو خۆی گوتی ئەم چیرۆکانەی لە باوکییەوە وەرگرتووە و سا لەبەر ئەوەی چیرۆکەکانی باوکی بۆ هەموو ئەو میوانانەی کە دێنە میوانیان ئەگێڕێتەوە، بۆیە لە بیریانی نەکردووە و لە یادی ماوە کە زیاد لە هەشتا چیرۆك دەبێت وە کوڕەکەی کە ناوی (وەلید)ە و ئێستاکە مامۆستایە لە قوتابخانەی پێبانز خەریکی نوسینی چیرۆکەکانی باوکییەتی بۆ ئەوەی بڵاوی بکاتەوە و بیخاتە بەردەمی خوێنەران و خزمەتێك بە گەلەکەی بکات، جا لە کۆتاییدا ئەوەی ماوە بیڵێم زۆر بە داوای لێبوردنەوە کە هەر کەم و کورتییەك لەم چیرۆکانەدا هەیە.

هەبوو نەبوو لە کۆندا دەگێڕنەوە کوڕێك و داکێك دەبێت، کوڕەکە ناوی (ئەسیر) بوو.دایکی ناوی (حەلیمە) بوو، لە ولاتێکی وەك ئێران دەژیان، ئەم کوڕە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە باوکی دەمرێت ئیتر ئەم کوڕە بۆ بژێوی ژیانی ئەبێت بە شوانی ئەو شارە و لەبەر ئەوەی ئەم کوڕە کەچەڵە بۆیە لەناو خەڵکدا بە کەچەڵ دەناسرێت، ماوەی چەند ساڵێك شوانی دەکات و هەموو ڕۆژێك وڵاخەکانی بەبەر دەرگای ماڵی پاشادا دەبات. بۆیە کە کچی پاشا ئەبینێت حەز لە کچی پاشا دەکات، ئیتر کە ئەسیر ئێوارە وڵاخەکانی دەهێنێتەوە بە دایکی ئەڵێ.

ئەسیر: دایکە حەزم لە کچی پاشایە.

دایکی: کوڕم شتی وا نابێت.

ئەسیر: دایکە دەبێت بەیانی تا دێمەوە لە شوانی خوازبێنیت کردبێ بۆ من.

حەلیمە: بە دڵێکی تەنگەوە دەڵێ باشە.

بەیانی کە ڕۆژ دەبێتەوە ئەسیر وەك هەموو ڕۆژانی تر ولاخەکانی بەڕێ دەکات، حەلیمەی دایکی دەڕوات بۆ مالی پاشا بەلام لەبەر ئەوەی شەرم دەکات لەوەی کە پاشا دەری بکاتە دەرەوە کە کچی پاشا شو بە کوڕە کەچەلێك ناکات، لەبەر ئەوە دایکی ئەسیر لە نزیك مالی پاشا دادەنیشێت تا ئێوارە کە ئەسیر لە شوانی دێتەوە بە حەلیمەی دایکی ئەلێ خوازبێنیت کرد بۆم حەلیمەی دایکی کوڕم ئەوەی ڕاستی بێت ڕۆیشتم بەلام پاشا میوانی زۆر بوو وەختی قسەی نەبوو.

ئەسیر: دایکە دووبارە برۆ بۆ مالی پاشا.

حەلیمە: باشە کوڕم.

ڕۆژی دووەم حەلیمە دیسانەوە دەڕوات بۆ ئەو شوێنە دادەنیشێت کە ڕۆژی پێشوو لێی دانیشت بوو، تا ئێوارە لەوێ ئەبێ ئێوارە دەگەڕێتەوە بۆ مالێ بە دەستی بەتالێ، ئەسیریش کە لە شوانی دەگەڕێتەوە بە دایکی دەلێ چیت بۆ کردم؟

حەلیمە: کوڕم ئەمڕۆش پاشا هەر میوانی زۆر بوو، بەیانی دەڕۆمەوە بۆ لای پاشا.

ڕۆژی سێیەم دایکی ئەسیر دەڕواتەوە لە شوێنی ڕۆژانی پێشوو دادەنیشێت تا ئێوارە، لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژە پاشا دایکی ئەسیر دەبینێت، ئێوارەی سێیەم پاشا بانگی دایکی ئەسیر (حەلیمە) دەکات دەپرسێ هەی پیرەژن ماوەی ئەم سێ ڕۆژە ئیش و کارت چی بوو لەوێ دادەنیشتی؟ حەلیمە زۆر بە ترسەوە دەلێ پاشا گیان ئەوەی ڕاستی بێت کوڕەکەم حەزی لە کچەکەتە.

پاشا: بێ هیچ قسەیەك دەلێ: بەیانی کوڕەکەت بهێنە بۆ مالمان. ئەسیر و دایکی کە هاتن، پاشا خەلکێکی زۆری لە پیاو ماقولان و کاربەدەستانی کۆکردەوە:

پاشا: لەناو ئەو خەلکە کە ئامادە بوون، ئەلێ شوانی ئەم شارە داوای کچەکەی کردووم منیش لە بری هەموو پارەوپولێکی ئەم سەردەمە، داواکارییەکم هەیە لێی، پاشا ڕووی دەمی کردە ئەسیر و وتی داواکارییەکم لێت هەیە کوڕە کەچەلێ، ئەسیریش دەلێ دەلێ فەرموو پاشای ولات.

پاشا: ئەلێ کوڕە کەچەلێ ئەگەر ئەتەوێ کچەکەت بدەمێ پرسیارێکم لێت هەیە، ئەسیر دەلێ فەرموو، پاشاش ئەلێ ئەسیر کابرایەکی (زین)دوور هەیە

هـەموو ڕۆژێـك زینێـك دروسـت ئـەكات ئێـوارە تـەواو بـوو هـەڵی دەوەشـێنێتەوە و خـۆڵ و خـاك و ئـەو زینـەی دروسـتی كردبـوو دەیكـات بەسـەر خۆیدا پاشـان بـۆ مـاڵ دەڕواتەوە بۆ ماڵ وە منیش داواكارییەكەم ئەوەیە بزانە بۆ ئەم كارە دەكات.

ئەسیر: دەڵێ باشە گەورەم مۆڵەتی پێنج ڕۆژم بدەرێ.

پاشا: مۆڵەتی كوڕە كەچەڵ ئەدات (ئەسیر).

ئەسـیر: دەڕواتـەوە بـۆ مـاڵ ئێـوارە خـەڵكی شـار ئاگـادار دەكاتـەوە كـە سـەفەرێكی لـە پێشـدایە دەیـەوێت بـۆ سـەفەر بـڕوات پێیـان دەڵێـت كـە ئـیتر نـاتوانم شـوانی وڵاخـەكانتان بكـەم، ئەسـیری شـوان شـەو هـەموو شـتێكی سـەفەر ئامـادە دەكـات، بـەیانی زوو بـەڕێ دەكـەوێ بـەرەو ئـەو شـارە كـە كـابرای (زیـن) درووی لێیـە، ماوەیـەكی زۆر كـە ڕێ دەكـات و دەكەوێتـە ناوچـەی جـەزیرەوە لـە دوور دەبینێـت كـە چـەند كەسـێك شـەڕ دەكـەن زۆر بـە تـوڕەیی لەیـەك ئـەدەن، ئەسـیر لـە دوور بـینی كـە شـەڕیانە ویسـتی خۆیـان لـێ دوور بخاتـەوە، بـەڵام یـەكێك لـە شـەڕكەرەكان بـانگی كـرد بـە دەنگێكـی بـەرز هـۆ كـابرای ڕێبـوار وەرە ببـە ناوبـژیوانمان لەسـەر شـتێكی سـادە شـەڕ دەكـەین، ئەسـیر لێیـان نزیـك بـووەوە پرسـی لێیـان ئـەو شـتە سـادەیە چییە لەسـەری شـەڕ دەكـەن، یـەكێكیان وتـی ئـەم فەرشـە و عەسـایە و كڵاوێكـە، ئەسـیر وتـی: ئـەم فەرشـە چـییە و ئـەم عەسـایە چـییە و ئـەم كـڵاوە چـییە، یـەكێك ووتـی ئـەم فەرشـە بچـیتە سـەری و كڵاوەكـە لەسـەر كـەی و عەساكەی بكێشـی پیـادا نیـازی هـەر وڵاتێكـت هـەبێ بـە ئـەمری خـوا لـەوێ ئەبیتـەوە، ئەسیر وتـی بەهـەر سـێ كابراكـە تـیر و كـەوانتان پێیـە، یـەكێك لـە كابراكـان وتـی: بـەڵێ ئەسـیر ئـەڵێ لەسـەر ویسـتی خۆتـان سـێ تـیر بهـاون بـە سـێ ئاڕاسـتە هـەر كـەس زوو تیرەكـەی بهێنێتـەوە ئـەوە فەشـەكە و كڵاوەكـە و عەسـاكە هـی ئـەو كەسـەیە، ئەسـیر سـێ تـیر دەهاوێـژێت هەرسـێكیان بـەدوای یەكـدا ڕادەكـەن بـۆ ئـەوەی زوو بیهێننـەوە هـەر كـە ئـەوان ڕادەكـەن ئەسـیر بـە خێرایـی دەچـێتە سـەر فەرشـەكە و كڵاوەكـە لەسـەر دەكـات و عەسـاكە بـە فەرشـەكەدا دەكێشـێت و دەڵێـت خوایـە لـە شـاری كـابرای (زیـن) دوور بنیشـێتەوە، كاتێـك هـەر سـێ كـابرا دەگەڕێنـەوە سـەیر دەكـەن نـە ئەسـیر دیـارە نـە فـەرش و كـڵاو و عەسـاكە بۆیـە دەسـتیان لـە دوای هـەر سـێ شـتەكە دەردەچـێت ئەسـیریش لـە شـاری كـابرای زیـن دوور دەبێـت، بەهـەر شـێوەیەك بێـت كـابرای (زیـن) دوور ئەدۆزێتـەوە و دەڕوات بەلایـەوە سـڵاوێكی لـێ دەكـات و ئـیتر قسـە ناكـات سـەیری دەسـتی كـابرای زیـن دوور دەكـات تـا ئێـوارە، كـابرای زیـن دوور تـا ئێـوارە باشـترین

زیـن دروسـت دەکـات و دەیـەوێت بیفرۆشـێت خـەڵك سـەودای دەکـات، کـابرا دەڵێـت بـە چـەندی دەیفرۆشـیت، دەڵـێ بـە (٤٠) لـیرە، بۆیـە بـە کـابرای دەفرۆشـێت، کـابرای کڕیـار زینەکـە دەبـات و چـەند مـەترێك دەڕوات، کـابرای زیـن دوور بـانگی دەکـات و زینەکـەی لـێ وەردەگرێتـەوە و لیرەکـەی دەداتـەوە بـە کـابرای کڕیـار ئـیتر کـابرای (زیـن) دوور زینەکـە هەڵدەوەشـێنێتەوە خـۆڵ و خـاك و خشـمەکەی دەکـا بەسـەری خۆیـدا و دەڕواتـەوە بـۆ مـاڵ و ئەسـیریش دەبـات بـۆ مـاڵ، کاتێـك ئەسـیر دەڕواتـە مـاڵی زیـن دوورەکـە دەبینێـت لـە مـاڵی زیـن دوورەکـە لـە وێرانەیـەك زیـاتر هیچـی نییـە، بەهـەر شـێوەیەك بێـت خـواردنێکی سـادەی بـۆ ئامـادە دەکـات و زۆر دەخوازێـت کـە ئەسـیر نـان بخـوات بـەڵام ئەسـیر نـان نـاخوات و بـە کـابرای زیـن دوور دەڵـێ: نـان نـاخۆم تـا هۆکـاری ئـەوەم پـێ نـەڵێی کـە بـۆ ئـەو زینـەت دروسـت کـرد و فرۆشـتت و ئینجـا لـە کـابرات سـەندەوە و هەڵتوەشـاندەوە. کـابرای زیـن دوور: بـە ئەسـیر دەڵـێ نانەکـەت بخـۆ دوای نانەکـەت پێـت ئـەڵێم ئەسـیر نـان دەخـوات و هـەمان پرسـیار دووبـارە دەکاتـەوە، کـابرای زیـن دوور بـە ئەسـیر دەڵـێ بـڕۆ بـۆ شـاری شـام، لـەوێ جەزیرەیـەك هەیـە بـەناوی (سـەحرا) لـە لـەو ناوچـە تـەنیا دارێـك هەیـە لـەبن ئـەو دارە کابرایـەك هەیـە کـوێرە هەمیشـە ئـەم دەسـتەواژە دووبـارە دەکاتـەوە کـە ئـەڵێ (ئـەمڕۆ بـاڵای تەحیاتـە، ویـژدان نیـوەی ئیمانـە، ئـەوەی ویـژدانی نـەبێت ئیمـانی نییـە) ئەسـیر بـە قسـەی کابرای زیـن دوور دەکـات و خـوا حـافیزی لـێ دەکـات، لـە مـاڵی زیـن دوور دوور دەکەوێتـەوە، دەچـێتە سـەر فەرشـەکە و کڵاوەکـە لەسـەری دەکـات و عەسـاکەی لـێ دەدات بـە نیـازی ڕۆیشـتن بـۆ لای کـابرای کـوێر لـە بیابانـە چۆڵەکە کـە لـەبن دارەکـە دەبێـت دەڕوات پـاش کـەمێك دەگاتـە لای کـابرای کـوێر بـە گەیشـتنی بـۆ لای، کـابرای کـوێر هەسـتی پـێ دەکـات کـە کەسـێك لـە نزیکیـەتی بۆیـە بـەخێرهاتنی دەکـات، ئەسـیریش وەڵامـی دەداتـەوە لـەو کاتـەدا وەخـتی نـانی نیـوەڕۆ دەبێـت لـە غەیبـەوە سـینییەك دێـت خـواردنێکی دوو نەفـەری لەسـەرە کـابرای کـوێر داوا لـە ئەسـیر دەکـات کـە نـان بخوات ئەسـیر دەڵـێ نـان نـاخۆم، کابرای کوێر کوڕم نان بخۆ ئـەو سینیە نـانی دوو نەفـەرە ئەسـیر دەڵـێ نـان نـاخۆم تـا بەسـەرهاتی خـۆتم بـۆ نەگێڕیتـەوە کـابرای کـوێر دەڵـێ: باشـە بـەڵام دوای نـان، ئەسـیر نـان دەخـوات و دیسـان هـەمان پرسـیار دووبـارە دەکاتـەوە و، کـابرای کـوێر دەڵـێ کـوڕم دەبێـت بڕۆیـت بـۆ شـاری (غـەزن)ە، بزانـە ئـەو شـارە بـۆ وێـران بـووە، هاتیـەوە هـەموو شـتێکت پـێ دەڵێم، ئەسـیر خـوا حـافیزی لـە کـابرای کـوێر دەکـات و بـە نیـازی شـاری غەزنـە دەچـێتە سـەر فەرشـەکە و کڵاوەکـە لەسـەر دەکـات و عەسـاکەی لـێ دەدات، دەگاتـە شـاری

غەزنــە، دەبینێـت شــارێکی وێـران و چــۆڵ و هۆڵــە، زۆر بــەناو شــارەکەدا دەسـوڕێتەوە تـا دەگاتـە ناوەڕاسـتی شـارەکە، لـە دوورەوە خانوویـەك دەبینێـت لـە شـێوەی سـابات کـە کابرایـەکی لێیـە باوەشـێنی کابرایـەکی تـر دەکـات، ئەسـیر وردە وردە دەڕوات لێیـان نزیـك دەبێتـەوە، کـابرای باوەشـێنکەر لـە دوورەوە ئیشـارەتی بـۆی کـرد کـە نزیـك نەبێتـەوە بـەڵام گـوێی پـێ نـەدا، ئـەو کابرایـەش کـە پـاڵ کـەوتووە و باوەشـێن دەکرێـت بـە کـابرای باەشـێنکەر دەڵێـت سـەگە ڕەش بـۆنی مرۆڤــی غــەریب دێــت لــە شــارەکەی بــاوکم، لــەم قســانەدا ئــەبن ئەســیر خــۆی دەگەیەنێتـە لایـان و سـڵاوێك دەکـات، ئـەو کابرایـە کـە پاڵکـەوتووە دەڵـێ نـەمگوت بـۆنی مرۆڤـی غـەریب دێـت، دوای حەوانـەوەی ئەسـیر لـە هـەردوو کـابرا ئەپرسـێ بـۆ ئـەم شـارە ئـاوا وێـران بـووە، کـابرای باوەشـێن کـراو دەڵـێ کـوڕم هـەر کەسـێ هۆکـاری وێـران بـوونی ئەمشـارە بزانێـت لـە سـێدارە دەدرێـت، ئەگـەر بـڕوا ناکـەیت سـەگە ڕەش ئـەو دوو ژوورە پێشـانی ئـەو کـوڕە جوانـە بـدە، ئەسـیر لەگـەڵ کـابرای باوەشـێن کـەر سـەیری هـەردوو ژوورەکـە دەکـات کـە یـەکێکیان هـەر سـەری مرۆڤـە و ئـەوی دیـان لاشـەکەیەتی دەگەڕێتـەوە لای کـابرای باوەشـێن کـراو دەڵێـت ئێسـتا هۆکـاری وێـران بـوونی ئـەم شـارەم پـێ بڵـێ و ئینجا لەسـەرم بـدە کـابرای باوەشـێن کـراو کـوڕی پاشـای شـاری غەزنەیـە نـاوی (جـەنگین)ە، جـەنگیز بـە ئەسـیر دەڵێـت کـوڕە جوانەکـەم ئـەم شـارەی تـۆ دەیبـینی پـێش چـەند سـاڵێك لەمـەو پـێش وا نـەبوو، (٢٠٠) سـاڵ لەمـەو پـێش بـاوکم و دایکـم هەرچـی خـەڵکی ئـەم شـارەیە لەگـەڵ بـاوکم چـوونە دەرەوە بـۆ سـەفەر بـاوکم شـای ئـەم شـارە بـوو (غەزنـە) کـە ڕۆیشـت هـەموو کلیلـی ڕاسـپاردەکانی ئـەم شـارەی دایـە دەسـتی منـەوە تـەنها کلیلـی ژوورێـك نـەبێت ئـەم کـابرا کـە لامانـەوە دانیشـتووە وەزیـری بـاوکم بـووە هەمیشـە بـاوکم بـە سـەگە ڕەش بـانگی کـردووە، ئـەم سـەگە ڕەشـە وتـی جـەنگیز باوکـت هـەموو لـەزەتی ژیـانی لـەو ژوورە دایـە کـە کلیلەکـەی نـەداوە بـە دەسـتەوە، بەهـەر حـاڵ کـوڕە جوانـە ئـەم سـەگە ڕەشـە وای لـێ کـردم دڵـم گـەرم بـوو. بـەیانی بـەدوای بـاوکم و خـەڵکی شـار کـەوتم و گەیشـتمەوە ئـەو شـوێنەی کـە بـاوکمی لـێ بـوو کـە نزیـك بوومـەوە لـە بـاوکم، لـە دوورەوە پێـی وتم ئـاخ کـوڕە سـەگە ڕەش هـەڵی خەڵەتانـدی ئـەزانم بۆچـی هـاتووی ئاگـات لـەخۆت بـی لـە کـاتی سـەیر کردنـی ئـەو ژوورە خـۆر نەیەتـە ژوورەکـە کـە گەیشـتمە لای بـاوکم کلیلـی ئـەو ژوورەی دایـە دەسـتم و گەڕامـەوە بـۆ لای سـەگە ڕەش ئـیتر ڕۆژێـك ئـەم سـەگە ڕەشـە وتـی: جـەنگیز بـڕۆین سـەیری ئـەو ژوورە بکـەین، کـە کلیلەکـەی هینـا وە منـیش ڕۆیشـتم دەرگاکـەم کـردەوە تیشـکی خـۆر هاتـە ژوورەوە لـەناو ژوورەکـە حـەوزێك ئـاوی

تێدا بوو کە تەنها ماسییەکی تێدا بوو کە تیشکی خۆری بەرکەوت ماسییەکە مرد زۆر ماسییەکەم ئەودیو ئەودیو پێ کرد بەلام ماسییەکە مرد بوو بە مردنی ئەو ماسییە ئەم شارە وێرا بوو، ئیتر لەو ڕۆژەوە نە باوکم نە خەڵکی شار نەگەڕانەوە، کوڕە جوانەکە ئەمە بووە هۆی وێران بوونی ئەم شارە. جەنگیز بە خزمەتکارەکەی (باوەشێن کەرەکەی) وت ئێستا برۆ لە سێدارەی بدە، پێش لە سێدارە دانی ئەسیر داوا لە جەنگیز دەکات کە مەجالی بدات (٢) ڕکات نوێژ بکات جەنگیز دەڵێ فورموو نوێژی خۆت بکە.

ئەسیر دەچێتە سەر فەرشەکە و کلاوەکە لەسەری دەکات و بە نیازی گەیشتن بۆ لای کوێرەکە خۆی دەرباز دەکات، کە دەگەڕێتەوە لای کابرای کوێر سلاو لە کابرای کوێر دەکات، کابرا کوێرەکەی ژێر دارەکە بەخێرهاتنی دەکات و لێی دەپرسێ کە چۆن گەڕایتەوە ئەسیر دەڵێ: بۆ کابرای کوێر، کوێرەش دەڵێت شاری غەزنە هەرکەس چووبێتە ناو شاری غەزنە بە سەلامەتی نەگەڕاوەتەوە ئەسیریش بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و وە بە کابرای کوێر دەڵێت تۆش بەسەرهاتی خۆتم بۆ باس بکە، کابرای کوێریش بە ئەسیر دەڵێ من کوڕی پاشای ئەو شارەم کە ناوی (غەزنە)یە ڕۆژێك باوکم لەگەڵ وەزیرەکانی هاتنە دەرەوە بۆ ڕاوشکار منیش لەگەڵ کوڕێکم هاتمە دەرەوە کوڕەکەم ناوی (جەزەر) بوو لە کاتی ڕاوکردن جەزەری کوڕم زۆر هیلاك و تینووی بوو پێی وتم باوکە ئاو دەخۆم منیش شارەزا بووم لەم بیابانە کە تەنها ئەم بیرە بوو کە لە نزیك ئەم دارەیە کە لێی دانیشتووین کوڕەکە (ئەسیر) بزانە بیرەکە ماوە؟

ئەسیر: بەڵێ ماوە ئەی پیاوی کوێر.

کابرا کوێرەکە بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و وتی ئەسیر دۆلکەیەکم بەپەلە خستە خوارەوە بۆ ناو بیرەکە لە بری ئاو لیرە گەوهەر هاتە دەرەوە، لەوکاتەدا جەزەری کوڕم وتی باوە گیان بەشی بابا گەورەم، منیش زۆر بێ ویژدان بووم تەماح باز بووم هەر بۆیە جەزەری کوڕم خستە ناو بیرەکەوە جا لەو ڕۆژەوە ئەسیر گیان خوای گەورە هەردوو چاومی لێ سەندەوە، ئەسیریش زۆر بە ووردی گوێی لە کابرای کوێر دەگرت، کابرای کوێریش وتی: ئیتر لەو ڕۆژەوە لەژێر ئەم دارەم بۆیە هەموو ڕۆژێك نوێژ دەکەم و ئەم چەند ووشە وەك زیکر دووبارە دەکمەوە (ئەمڕۆ بالای تەحیاتە، ویژدان نیوەی ئیمانە، ئەوەی ویژدانی نەبێت ئیمانی نییە) ئیتر لەدوای قسەکانی ئەسیر خوا حافیزی لە کابرای کوێر کردوو دیسانەوە دەچێتە سەر فەرشەکە و کلاوەکە لەسەری

دەکـات و بـە نیـازی ڕۆیشـتنی بـۆ لای کـابرای زیـن دوور کـە عەسـاکەی پیـادا دەکێشـێ دەگەڕێتـەوە شـارەکەی کـابرای زیـن دوور وە پـاش کـەمێك دەگاتـەوە لای زیـن دوورەکـە سـلاوێکی لـێ دەکـات کـابرای زیـن دوور بـە خێـر هاتنـەوەی دەکاتـەوە، ئەسـیر دوای بەسـەرهاتەکەی شـاری غەزنـە و کـابرا کـوێرە، داوای لـێ دەکات کە زین دوور باسی خۆی بۆ بکات بۆ هـەموو ڕۆژێك زینێك درویت دەکات و دوای تـەواو بـوونی کـە ئێـوارە ئـەکات دەیفرۆشـێت و دوایـی لـە کـابرای کڕیـاری وەردەگرێتـەوە و هـەڵی دەوەشـێنێتەوە، کـابرای زیـن دوور بـە ئەسـیر دەڵـێ منـیش دوو کـوڕم هـەبوو کـە زۆر خۆشـم ئەویسـتن ڕۆژێـك کـە دەڕۆیشـتمەوە بـۆ مـاڵ چـوومە ژوورەوە سـەیرم کـرد کـوڕە گەورەکـەم لەبـەر دەرگـا کـەوتووە و تۆزێـك خـوێنی لـێ ڕۆیشـتووە، کـوڕە بچـوکەکەمیش لـە پلیکانەکـە کـەوتووە و هۆشـی نـەماوەو منـیش بۆیـە داوام لـە خـوای گـەورە کـرد هـەردوو کوڕەکـەم لـێ بسێنێتەوە، لـەو ڕۆژەوە هـەردوو کوڕەکـەم بـووە بـە دوو کـۆتر و ئێسـتا لـە مـاڵن، منـیش لـەو ڕۆژەوە هۆشـم لـە سـەرە خـۆم نـەماوە، بۆیـە هـەموو ڕۆژێـك زینێـك دروست دەکـەم، هەرکـە کوڕەکـانم دەکەوێتـەوە بـیر هـەر کـە بـیرم نـامینێ یەکسـەر دەکەومە هەڵوەشاندنەوەی.

ئەسـیر زۆر سوپاسـی کـابرای زیـن دوور دەکـات و دەگەڕێتـەوە شـارەکەی خـۆی، وە هـەموو ئـەو بەسـەر هاتـەی لـەلای خـۆی لـە کتێبێکـا ئەنوسـێت بـۆ ئـەوەی پێشکەشـی پاشـا و وڵاتەکـەی بکـات، ئەسـیر کـە گەڕایـەوە بـۆ مـاڵ بـۆ بـەیانی دەڕوات بـۆ لای پاشـای شـارەکە و بەسـەرهاتەکان دەخاتـە بەردەسـتی پاشـاکەی و ئـەڵێ گـەورەم ئـەوەی ویسـتت بـۆم کـردی، پاشـاش بـە ئەسـیر دەڵـێ کـوڕە کەچـەڵ تـۆ ئیشـی خـۆت ئەنجامـداوە، بـەیانی لـە ئاهـەنگێکی گـەورە کچـەکەی خۆمـت پێشـکەش ئەکـەم، پاشـاش داوا لـە خـەڵك دەکـات بـۆ ئامـادەبوونی دیـارکردنی کچـەکەی خـۆی لـە کـوڕە کەچـەڵ کـە شـوانی شـارەکە بـوو هەرچـەندە خـەڵك داوا لـە پاشـا دەکـەن کـە کچـەکەی نەداتـە کـوڕە کەچـەڵێکی شـوان، بـەڵام پاشـا لـە بڕیـاری خـۆی پاشـگەز نابێتـەوە، بۆیـە کچـەکەی خـۆی پێشکەشـی ئەسـیر دەکـات، ئەسـیریش ئـەڵێ گـەورەم پاشـا لـەباتی شـیربایی ئـەم کچـەی تـۆ هیچم نییـە بتـدەمێ تـەنها ئـەم دیارییـە نـەبێت ئـەویش بریتییـە لـە فەرشـێك و کڵاوێـك و عەسـایەك نیـازی هـەر شـوێنێك بکـەیت ئەتگەیەنێتـە ئـەو شـوێنە گـەورەم کـە تـۆ ئەتـەوێت، پاشـاش کـە بڕیـاری خـۆی داوە، بۆیـە ئەسـیر لـە دوای حـەوت شـەو و حـەوت ڕۆژ دەبێتـە خـاوەنی کچـی پاشـا و لـە شـوانێکەوە ئەبێتـە وەزیرێکـی پاشـا ئیتر هەر لەو سەردەمەوە تا دەمرێت لەگەڵ پاشا ئەمێنێتەوە.

## چیرۆکی هەر خۆم بەخۆم کرد

کابرایەك کچێکی هەبوو هەر کاتێ کەسێك بهاتایە بۆ خوازبێنی کچەکەی باوکی کچەکە کە دەیزانی هاتوونەتە خوازبێنی کچەکەی دەڕۆیشت ئاگرێکی دەکردەوە یەك قازانگی کەورە ئاوی دەخستە سەری، وە جیا لەو ئاگرە ئاگرێکی تری دەکردەوە لە تەنیشت هەمان ئاگر کە چای ئەخستە سەری بۆ ئەو خەڵکەی کە هاتوونەتە ماڵیان، وە خەڵکەکە بە باوکی کچەکەیان وت هاتووینە خوازبێنی کچەکەت بۆ فلانە کەس، ئەویش یەکسەر دەیگوت کچی من پێشکەشە بە ئێوە، وە خەڵکەکە وتیان ماڵت ئاوا بێ دەبا دەست ماچ کەین، باوکە گوتی پێویست ناکات، ئەوانیش وتیان مەسرەفی کچە چەندمان لێ ئەستێنیت، باوکە گوتی مەسرەف ناسێنم، ئەو کوڕەی کە ئەبێت بە زاوای من ئەبێت ببینم، خەڵکەکە ناردیان بە دوای کوڕەکەدا کە کچەکەیان بۆ داوا کردووە پاشان کوڕەکە هات بۆ ناو خەڵکەکەو باوکی کچە بە کوڕە من کچی خۆمم داوە بە تۆو بەلام پرسیارێکم هەیە لە تۆ کوڕەکە وتی: فەرموو، باوکی کچە وتی ئەو ئاوە کە بەسەر ئەو ئاگرەوەیە ئەڵێت (قولێ قولێ و ئاخ ئاخ!) مانای چییە؟ کوڕە گوتی نازانم پاشان باوکی کچە گوتی هەرکەسێ نەزانی مانای ئەو (ڕستە چییە) کچی خۆمی نادەمێ، چەند کەسی بەم شێوەیە جواب کرد، بەلام کچەکەی خۆی کوڕێکی خۆشدەویست بۆیە هاتەوە ماڵێ، خۆی خەمبار دەرخست لەبەر چاوی باوکی، ئەو کوڕەی کە کچەکەی خۆشدەویست کچەکە کە چاوی بەو کوڕەیە کەوت بۆیە ئیتر خۆی خەمبار کرد لەدوای ئەوەوە، باوکەکە گوتی بۆ کچم خەمباری؟ کچە وتی نەخۆشم، باوکەکە گوتی با بتبەم بۆ لای دکتۆر، گچە گوتی گەر منت خۆشدەوێ مانای ئەو ئاوەی کە دەکولێت بەردەوام بەسەر ئەو ئاگرەوەیە مانای چیە؟ باوکە وتی کچە ئەو قسەیە بۆتۆ ناشێت، کچە وتی مانای وایە باوکە تۆئەو مانایەت لە کچی خۆت کە منم خۆشتردەوێت باوکە وتی باشە من پێت دەڵێم مانای چییە، باوکە مانای ئەو قولێ قولە و ئاخ ئاخەی ئاگرەکەی پێ گوت بۆی باس کرد، کچە وتی باوکە خەمەکەم تۆزێك سارێژ بوو، کچە یەکسەر ڕۆیشت کوڕەکەی بینی کە خۆشی ئەویست یەکسەر باسی ئاو کولاندنەکەی بۆ کوڕەکە باس کردو کە مەرجیبە شوودانی کچەکەیە بۆ هەر کەسێ کە بزانێت مانای چییە لەلایەن باوکەوە. پاشان کوڕە کۆمەڵێکی نارد بۆ لای باوکی کچە بە مەبەستی خوازبێنی کچەکە کە خۆشیدەویست، ئەوانیش داوای ئەو کچەیان کرد بۆ کوڕەکە کە ناردوونی باوکەکەیش بەهەمان جارەکانی پێشووی پێشوازی لێ کردن و ڕازی بوو، داوای

کـرد کوڕەکـە ببینێـت. ئـەوانیش ناردیـان بـە دوای کوڕەکـەدا و، کوڕەکـەش هـاتو بـاوکی کچـە گـوتی کوڕەکـە مـن ڕازی بـووم کچـی خۆمـت بـدەمێ بـەو مەرجـەی یـەك پرسیارم هەیـە و تـۆش بتـوانی وەڵامـم بدەیتـەوە بـە ڕاسـتی، کـوڕەش وتـی فـەرموو پرسیارەکەت بکـە، باوکـە وتـی مانـای ئـەو (قـوڵ قـوڵ و ئـاخ ئـاخ !)ی ئـاوە لەسـەر ئـەو ئـاگرە مانـای چییە؟ کـوڕە وتـی ئـەو ئـاوەی لەسـەر ئاگرەکـە دەکوڵێـت دەڵێـت خـۆم بـەخۆمم کردباوکـە دەڵێـت چـۆن خـۆی بـەخۆی کـرد؟ کـوڕە دەڵێـت ئاوەکـە دەڵێـت چـوومە بـنی دار دارم پـەروەردە و گـەورە کـرد ئێسـتا دارەکـە بـووە بـە ئـاگر و مـن دەکوڵێنێـت ئـەوە خـۆم بـە خـۆمم کـرد، بـاوکی کچـەش دەڵێـت زبـانم ببڕێـت منـیش خـۆم بـەخۆمم کـرد، ئەگـەر مـن قسـەم بـۆ کچەکەی خـۆم نەکردایـە کـەس ئـەو گـرەوەی لـێ نەدەبردمـەوە کـە تـۆ بـەو شـێوەیە لـەمنت بـردەوە، خـۆم بـەخۆمم کرد.

### چیرۆکی هەریەکە و بە خەیاڵێك

ماڵێـك هـەبوو سـاحێبی ماڵەکـە کـەڕ بـوو، واتـە پیاوەکـەیان کـەڕ بـوو وە ژنەکـەش کـەڕ بـوو، کچێکیان هـەبوو ئـەویش کـەڕ بـوو، یـەك کوڕیـان هـەبوو ئـەویش کـەڕ بـوو، کـە لـە ژێـر خـانووی ژنێکـی کـەڕدا بـوون کـە نـاوی فاتمـە کـەڕ بـوو، ڕۆژێـك پیاوەکـە لەخـەو هەسـتا و ڕۆیشـت بـۆ لای کۆمـەڵێك کاریـان دەکـرد بـە مەبەسـتی دزی لێیـان، پـێش ئـەوەی دزی بکـات یـەکێکیان بـەخێرهاتنی کـرد، ئـەویش ووتـی مـن بـە ڕیشـی سـپییەوە دزیـم نـەکردووە، کـابرای کـەڕ هاتـەوە بـۆ مـاڵ وتـی بـە ژنەکـەی چـوومەتە لای ئـەو کۆمەڵەیـە وتوویانـە تـۆ دزیـت کـردووە، ژنەکـەی بـە پیاوەکـەی وت کـە ئەویش هـەر کـەڕە ئـەو گۆشـتەی کـە لـە بـازاڕ داوە پێـت هاوردایـە مـن هـەر لـێم دەنـا بـۆ نیـوەڕۆ، کچـە کەڕەکـە هاتـەوە بـۆ مـاڵ دایکـە کەڕەکـەی وتـی پێـی لـە بـازاڕ گۆشـتیان داوە بـە باوکـت گۆشـتەکەی نەهاوردۆتـەوە لێـی بنـێن، کچـەکە وتـی ئـەو کابرایـە جـوان بێـت یـان نـا ئەگـەر ئێـوە ڕازی بـن مـن شـوی پـێ دەکـەم، بـرا گەورەکـەی هاتـەوە کچـەکە پێـی وت کاکـە ئـەمڕۆ هاتوونـە خـوازبێنیم، کوڕەکـە وتـی مـن بێـت و دەسـتم بـۆ فاتمـە کـەڕ نـەبردووە، کوڕەکـە چـوو بـۆ لای فاتمـە کـەڕ وتـی فاتمـە مـن کـەی دەسـتم بـۆ تـۆ درێـژ کـردووە، فاتمـە کـەڕ وتـی باردەکـەن یـان بـار ناکـەن ملتـان دەشـکا سـەری مانگـەو کرێـی خانووەکـەم بـدەنێ. ئەمانـە هـەر یەکە و خەیاڵی خۆی هەبووە و کە دەریان دەبڕی بۆ یەکتری.

## چیرۆکی سێ برا

ئەم سێ برایە کچیان خۆشدەویست هەر یەکە و بە جیا بۆخۆی خوازبێنی کچەی دەکرد، کچە زۆر ئاقڵ بوو نەیدەویست ئسێ برایە لەخۆی عاجز بکات لە هەمان کاتدا نەیدەتوانی نیازی هەرسێکیان بهێنێتە دی کچە هەستا بیری کردەوە، داوای لە هەرسێ براکە کرد گوتی هەر یەکەتان بە فکری خۆی ئیشێك ئەنجام بدات کە منی پێ رازی بکات، یەکەم کوڕ هەستا لەسەر شاخێکی زۆر بەرز ئاشێکی دامەزراند ئاشەکە بە با گەنمی دەکرد بە ئارد، کوڕی دووەم لەسەر زنجیرە شاخێکی زۆر درێژ کەڵەکێکی دروست کرد وەك سیاج ئایا هەرچەن درێژ بێ ماوەکەی، کوڕی سێهەم رۆیشت کارێزێك هەبوو ئەو کارێزەی پاك کردەوە کە کوڕەکە زانی کارێزەکە ئاوەکەی زۆرە زەراعەتێکی پان و بەرینی لەبەردەم کارێزەکەدا دروست کرد، هەرسێ براکە لە دوای ئەنجامدانی ئیشەکانیان رۆیشتن بۆ لای کچەکە پێیان گوت وەرە بۆ سەیری پرۆژەکانمان کە دروستمان کردووە، کچە هەستا لەگەڵیان چوو بۆ سەیری ئیشی کوڕی یەکەم و کە ئاشەکە بوو دەست خۆشی لە کوڕی یەکەم کرد پاشان لە دوای دەست خۆشی گوتی بەداخەوە کوڕە گوتی بۆ بەداخەوە کچە وتی ئەگەر ئاشەکەت بای نەبێت رەفز دێنێت و ئاردت بۆ دروست ناکات، پاشان رۆشت بۆ لای پرۆژەی کوڕی دووەم دەست خۆشی لێ کرد، پاشان گوتی بەداخەوە کوڕە وتی بۆ کچە وتی ئەمە کەڵەکە یەك بەردیان لێ دەربچێت ئەوانی دی دەرمێنە خوارەوە، پاشان کچە رۆیش بۆ سەیری پرۆژەی کوڕی سێیەم چاوی کەوت بە زەراعەتە پان و بەرینەکەی دەست خۆشی لێ کردوو وتی لە داهاتوودا من بۆ تۆ دەبم.

- لە ئەفسانەی نهێنی ژین دروو، باس لەوە دەکات، هەکەس لە دنیا خەمێکی هەیە و هەرکەسەش کێشە و نهێنی خۆی هەیە. ئەم جۆرە ئەفسانانە زۆر دووبارە دەبنەوە، کە پاڵەوان بەدوای نهێنیدا دەگەڕێ رەگەزی ئەفسانەیی زۆرە و = بەرماڵ و کڵاوی سەفرە جن و دار عەساکە کە ئەمانە لە حیکایەتی تر میراتی جنۆکەیە بۆ نەوەکانی.
- چیرۆکی هەر یەکە و بە خەیاڵێك. باسی چەند کەسێکی کەڕ دەکات، کە هەرچی لێیان دەپرسن، هەر باسی خەیاڵی دڵی خۆیان دەکەن، لەجیاتی ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە هەر کەس بەخەم و خەیاڵی خۆیەوە سەرگەرمە.
- چیرۆکی سێ برا و کچەکەش، زیرەکی کچە نیشان دەدا، لە هەڵبژاردنی دەستگیرانەکەیدا، لەوەی کە ئاو و زەراعەت لە ئاشی باو شورەی بەرد بە گرنگتر دەزانێ.

# باره پوشکه

**کۆکردنەوەی: دلشادی مەلا ئەسعەد بەلْکانەیی**

**ئاراس رەحمان بەکر**

**گێڕانەوەی: عبدالله حوسێن مەعروف (حاجی عبدالله)**

دەگێڕنەوە کە دوو برا هەبوون، برا گەورەکە ژنی هەبوو، هەردوو براکە لەگەڵ برازنەکەیان ئەچوون بە ڕۆژ بارە پوشکەیان ئەکرد و ئەیان فرۆشت.

ڕۆژێك برا بچووکەکەی بارە پوشکەکەی بردە شاری قرانی گاور. قرانی گاور شارێك بوو لە نزیك شارەکەی ئەمان و هەموو دانیشتوانەکەی جوولەکە بوون و وە پاشاکەیان پێیان دەگوت (قرانی گاور). وە لە شاری قرانی گاور کوڕەکە بارە پوشکەی بە پارەکی باش فرۆشت و ئێوارە گەڕایەوە بۆ ماڵ، بابی خۆی و برا و برازنەکەی رسقی و خواردنی پەیدا کردبوو وە ئێوارە بە برا گەورەکەی گوت: برا با ماڵمام بەرینە شاری قرانی گاور قرانی گاور قەولی داوە پێم کە کارێکی باشمان بۆ دابین بکا. برا گەورەکە گوتی ئاخر برا ئێمە مسوڵمانین و بۆ ئاینەکەمان زەرەری دەبێ بچینە ناو ئەو جولەکانە. بەلاّم برا بچوکەکە لەگەڵ برازنەکەی توانیان کە برا گەورەکە ڕازی بکەن و بچنە شاری قرانی گاور وە بە براکەی گوت: کە ئەو بە ئاینی خۆی و ئێمەش بە ئاینی خۆمان. وە لە شاری قرانی گاور هەموویان کاریان دەکرد هی یەکیان مەسرەفی ماڵی دەکرد و ئەوانی تریان پاشەکەوت دەکرد.

پاش ماوەیەکی زۆری پێ چوو کە لە شاری قرانی گاور بوون و زۆر دەوڵەمەند بوون. هەستان ڕۆژێ پیاو ماقولاّنی شارەکەیان دەعوەت کرد. بەلاّم میوانەکان لە کاریْ سەریان سوڕما بوو کە برا ڕیش سپییەکە خزمەتی میوانەکانی دەکرد وە براکەی تری لەگەڵ میوانەکان دانیشت بوو. کە خواردن هاتە بەردەست میوانەکان گۆتیان کە نانەکە ناخۆین تاکو نەزانین ئەم برا گەورەیە و ڕیشی سپییە بۆ دەبێ خزمەت بکا و بۆ ئەوەی تریان خزمەت ناکا؟ براکان تەماشایەکی یەکتریان کرد و برا بچوکەکە گوتی: کاکە ڕاستە من ڕیشم سپییە برای بچوکم میوانەکان نەیان سەلماند برا بچوکەکە گوتی باشە بۆتان بەحس دەکەم بەلاّم هەندێ درێژە. گوتیان قەیناکا.

برا بچوکەکە کەوتە قسە و گوتی: ئێمە ڕۆژێک لەگەڵ قرانی گاور چوینە سەر بەحر و سواری بەلەم بوین لە بەحرەکە چوینە ناو دورگەیەک و کە دیم ئەوە هەمووی کۆمەڵ کۆمەڵ زێڕ و زیو دانراوە ئێمەش تۆڕو گەمیەمان پێ بوو هەموومان پڕ کرد و کردمانە سەر پشتی بەلەمەکە. قرانی گاور فەردەیەکی دایە من و گوتی: تۆش بڕۆ ئەم فەردەیە بۆ خۆت پڕ بکە. کە من چوومە سەر کۆمەڵەکان وەختێ کە ئاگادار بوومەوە قرانی گاور بە خۆی و تۆڕ و گەمیەکانەوە لە بەحریان داو ڕۆیشتن و منیان بەجێ هێشت.

گوتی برام مامەوە. ئەی میوان... رووح لە جێیەکی سەختەوە دەرنایەت. ڕۆژێک هاتە ئەقڵمەوە بڕۆم بەم دەم زێیەدا بزانم قەت تووشی ئاوەدانییەک نابم، بەو دەم ئاوەدا هەوراز بوومەوە. کەم ڕۆیشتم زۆر ڕۆیشتم هەندێ ئەمە شاخ هەبوو سێ چوار کەسی بەسەرەوە بوو، کە منیان دیت گوتیان: ئاااای ئاااای... ئەمەش دەردەکەی ئێمەی بەسەرا هاتووە. وەختی کە چوومە لایان گوتم ئەوە ئێوە چی دەکەن لێرە؟ گوتیان ئێمەش عەمەلەی قرانی گاور بووین لەم دورگەیە بەجێمانی هێشت. گوتم باشە ئەی چی دەخۆن چی دەخۆنەوە؟ گوتیان کاکە چی بخۆین بۆق و ماسی دەگرین و دەیدەین بەسەر ئەم کەوڵە شاخەدا و ((چەچە برژ)) دەبێ و دەیخۆین.

ئەی میوان... چەند ڕۆژێ لەگەڵیان رامان بوارد دوایی بە برادەرەکانم گوت با بەم جێگایە هەوراز بینەوە. کە زۆر یان کەم ڕۆیشتین توش بە شارێ بوین کە هەرچی خواردن و خواردنەوە هەیە تێیدا هەبوو بەس شارەکە چۆڵ بوو کەسی تێدا نەبوو چۆڵ و هۆڵ بوو.

هەر خواردمان و خواردمانەوە هەتاکو دەوری مەغریب. پیرێژنێکمان لێ دەرکەوت گوتی ئەی ڕۆڵە ئەی ئادەمی ئەوە چی دەکەن لێرە؟ گوتیان میمی ئەم شارە بۆ وا چۆڵە؟ گوتی ڕۆڵە ئەمە شاری (پاشای شکور)ە دەعبایەک بەم شارە فێر بووە مرۆڤ دەخوا ئەوا ئەوە ئەم شارەی چۆڵ کردووە.

ئەی میوان... هەتاکو مەغریب خواردمان و لەرزین لە ترسا. شێرێکم دەس کەوت ((زولفەقار)) بوو. وە قەسرێکم بەرچاو کەوت نۆ قات بوو ئێوارە چووینە ئەو قەسرە هەموو نهۆمەکان دەرگا و پەنجەرەکانمان پێوەدا و چوینە قاتی بانی.

ئـەی میـوان... وەختێکمـان زانـی هـەر نـۆ نهۆمەکـە دەرگاکـەی گـوتی غـرت... کرایـەوە.دەعبایـەك کـە شـێوەیم نـەدیت بـوو هاتـەماڵـەوە گرتیـە هـێلاّ تەکـەمان و بـردی ڕۆیـی کـاتی دەعباکـە هاتـەوە گرتـی بـە هێلاتەکـەی تـرم و گرتـی و بردیـە دەرەوە.

بـەرێ! گـوتم ئـەوجا نـۆرەی منـە هەڵسـام بـەو زولفـەقارە جـێ پـای خـۆم کـردەوە و چـومە بـن دیدەگـە. کـاتێکم زانـی دەعباکـە هاتـەوە و تەماشـای کـرد مـن لـەبن دیدەگەکـەم گـەلێ هـەوڵی دا دەسـتی نەگەیشـت پـێم دەرچـووە دەرەوە چـووە بـان خـانی لـە ڕاسـت مـن خانییەکـەی کـون کـرد و هـەڵی کـۆڵی و پـەلی بـۆم شـۆڕەوە کـرد. منـیش زولفەقارەکـەم ڕاوەشـاند و مسـکەکیم نـا بـە سـینگ خۆمـەوە هـەتاکو بەیانی من لەبن ئەو خانییە مامەوە و ئەو ئەو زولفەقارە بە سینگمەوە بوو.

ئـەی میـوان... بـەیانی کـرد دنیـا ڕووناکـەوە بـوو لـە رووح خـۆم بێـزار بـووم دەسـتم شـل کـرد و ئـەو دەعبایـە ورشـەی هـات و کەوتـە نـاو ژوورەکـە. کـە کەوتـە نـاو ژوورەکە دیقەتم دا بۆ بۆ زولفەقار لە بەینی هەردوو دەستانی هاتبووە دەر.

ئـەی میـوان... دەعبایەکـەم کوشـت و لـەوێ هاتمـە دەرەوە. هـەتا ئەوەنـدەم کـرد بـوو بـە نیـوەڕۆ. کـاتێ پـیرەژن ئـەو ئـەو پیرەژنـەی ئـەولجار بەدەرکەوتـەوە گـوتی: ئـەی ڕۆڵـەی ئـادەم ئـەتۆ ماویـت؟ گـوتم: بـەڵێ مـن مـاوم بـەلاّم ولاّشـەکانم دەعباکـە خـواردنی و منـیش بـە زولفەقارەکـە دەعباکـەم کوشـت. پـیرەژن گـوتی: ئـەی بـە قوربانـت بم دەعباکـەت کوشـت بـا بچـین سـەیری بکـەین. ئـەرێ وەڵـلا ئەمـە ئـەو دەعبایەیـە ئـەم شـارەی چـۆڵ کـردووە. گـوتی لێگـەڕێ ئـەمڕۆ سـبەی ئـەم شـارە ئاوەدان دەکەمەوە.

پیرەژن لەپێکی کرد بە خوێنی دەعباکەدا و دای بە ناو شانمدا.

ئـەی میـوان... پـیرەژن بـەم لاو بـەو لادا قاقـەز و نامـەی دەنـارد و پاشـا هاتـەوە سـەر کـاری خـۆی و دووکانـەکان کرایـەوە و ئاسـنگەر چـووە سـەر کـاری خـۆی و دارتـاش هـەروا هـەر کـەس وەکـو جـاران کەوتـەوە کـار. پـاش ماوەیـەك وەزارەت دانیشـت و تـەکبیریان لـەم چاکەیەی مـن کـرد بـەس کـەس نەیـدەزانی مـن بوومـە بانگـەوازیان کـرد کـە کێیـە ئـەم چاکەیەی لەگـەڵمان کـرد بـا بـێ بـۆ دیـوانی پاشـا. هەرچـی ڕاسـت دەببـووە دەچـووە دیـوانی پاشـا پیرەژنیـان دانـا بـوو دەیگـوت ئەمـە هـەو نییـە. تـاکو منیـان دیتـەوە و بردمیانـە مەجلیسـی پاشـا و وەزارەتـەوە لـەوێ

پـیرەژن گـوتی: بـەڵێ ئـەم کابرایـە بـوو پشـتمیان هـەڵماڵی و مـن خوێنەکـەی پیرەژن دابووی بەناو شانمدا هەر مابوو.

ئـەی میـوان... وەزارەت دانیشـت و ئـەمری کـرد کـە چـی بکـەین چـی نەکـەین لـە دواییـدا گوتیـان کـە قابیلـە بیکـەین بـە زاوای پاشـای شـار. ئـەمان لێـرە پاشـا گۆتی: دەیکەم بە زاوای خۆم بەڵام ئەم شارە شاری پاشای شکورە.

ئـەی میـوان... بـە منیـان گـوت کـە ئێمـە دەتکـەین بـە زاوای پاشـا بـەڵام کـە خـوا چیت بەسەر بێنێ دەبی شکور بی.

ئەی میوان... ئەمە هەر بەدەم خۆشە.

ئـەی میـوان... خـۆ دەزانـن کـە مـن بـۆ ماوەیـەکی زۆر نـە خـۆم شوشـتبوو نـە تراشـم کـرد بـوو. هـەموو گیـانم توکەکـەی وا درێـژ ببـوو ببـووم بـە دەعبایـەکی ڕووت. خزمـەتکار بردمیـە حـەمام و حـەمام لـە میشـمیان کـرد. پـاك شوشـتمیان لـە حـەمام و دوایـی بردمیانـە لای دەلاك و لـە سـەرمەوە تـاکو بـنی پێمیـان تاشـی، ئـەمجا بـەرگێکی پاشـایانەیان لەبـەرم کـردوو لـە شـان پاشـا دایـان نـام و مـەلایان هێنـا و کچـەکەی پاشـایان لـێم مـارە کـرد. بەشـەرتێ هەرچـی موسـیبەتێ بەسـەرما هـات، دەبـێ شـکور بم. ئەگـەرنا فـڕێم دەدەنـە نـاو ئـەو بـیرەی کـەس نـازانێ چـەندە قولـە و سـەری لـە کوێیـە و بـنی لـە کوێیـە بـەس ئەوانـەی کـە دەمـردن فڕێیـان دەدانـە نـاو ئەو بیرەوە.

ئـەی میـوان... کابرایـەك زاوای پاشـا بـێ ئـیش و کـاری نییـە وسـێ کـوڕم بـوو لـە کچـی پاشـا. ئـەمجا هـیچ ئـیش و کارێکمـان نییـە لەگـەڵ وەزارەت و پاشـا دەچـووین بـۆ (ڕاو). ڕۆژێـك هاتمـەوە کـوڕێکم مـرد بـوو هـات کەلیمـەی کفـر بـە دەممـدا بـێ ژنەکـەم نەیهێشـت ناشـکوری بکـەم. سـێ ڕۆژ چـوومە ڕاو هەرسـێ کوڕەکـەم مـردن. بـەڵام ژنەکـەم نەیدەهێشـت کـە کفـر بکـەم. ڕۆژێکـی تـر چـووبووینە گـەڕان لەگـەڵ پاشـادا و کـاتێ هاتمـەوە ژنەکەشـم مـرد بـوو. دیـارە هـیچ ئاگـام لـەخۆم نـەبو نـا شـکوریم کردبـوو وە کفـرم کردبـوو. ئـەمانیش لەسـەر عـادەتی خۆیـان کـە ئـەوە بـوو هەرکەسـێ کفـری بکردایـە نـانی (چـل ڕۆژ و چـل شـەو)یـان بـۆ دادەنـا و فڕێیـان دەدایـە نـاو ئـەو بـیرەوە لەگـەڵ مردووەکـەیا. لەبـەر ئـەوەی کـە مـن زاوای پاشـا بـووم و ئـەو چـاکەیەم لەگـەڵ شـارەکەدا کـرد بـوو، نـان و ئـاوی چـل ڕۆژ و شـەویان بـۆم دانـا و بەسـتایانە پێشـمەوە و ژنەکـەمیان فرێدایـە خـوارەوە بـۆ نـاو بیرەکـە و

لــە دوایــەوە منیشــیان لــە دوای ژنەکەمــەوە فــڕێ دایــە خــوارەوە. کەوتمــە حــەوت تەبەقەی زەوی.

ئــەی میــوان... رووح لــە جێیــەکی ســەختەو دەرنایــەت و نــان و ئاوەکــەم خــەریك بــوو تــەواو دەبــوو نــازانم شــەو بــوو یــان ڕۆژ وەختــێکم زانــی قرمــە قرمــێ لــەناو چاڵەکەدا دەهات منیش چوومە ناو کەلێنەکەوە گوێم بەرێ هەبێ و نەبێ لەسەر زەوییــەوە هــاتووە. تومــەزە ئەمــە دەعبایەکــە و بــۆ کــەلاك خــواردن هــاتووە. کــە گەیشــتە ڕاســتم منــیش منــیش وەختێکــی زانــی پــەلاماری کلکــیم دا دەعبایەکــە ڕاپــەڕی و ڕای کــرد مــن کلکــیم بەرنــەدا هــەر ڕای کــرد تــەواو هــیلاك بــوو زەردایــی دونیــام لــێ دەرکــەوت دەعباکــە پــەکی کــەوت هەنــدێ ڕاوەســتا بــەڵام کونەکــە تاریــك و گچــکە بــوو نەیــدەتوانی بســوڕێتەوە تەماشــام بکــا. وەختێکــی زانــی مــن نوکــە چەقۆیەکم کرد بە تەنگیا.

ئــەی میــوان... دەعباکــە لــە ترســا وا ڕاپــەڕی و ڕای کــرد کلکــی لــە دەســتم پســا و مــن لــەناو ئــەو کونــەدا مامــەوە بــەس زەردایــی دونیــام لــێ دەرکــەوت بــوو دەعباکــە ڕای کرد.

ئــەی میــوان... چــەند مــدەتێ بــە زگــە خشــێ و بەهــەر نــەوعێ بــوو هاتمــەوە ســەر زەوی کــە هاتمــەوە ســەر دونیــا ســەیرم کــرد دەعبایــەکم لــەو دەعبایــەی کــە کوشــتبووم دەعبــاترم. هــەموو توکــەکانی لەشــم لەســەرمەوە تــا بــن پامــە. لــە ترســی ڕاوچــی ئــەی میــوان بەشــەو دەهاتمــە دەرەوە و بــەڕۆژ خــۆم دەشــاردەوە. هاتمــەوە ســەر ئــەو تەمــە شــاخانەی کــە لەگــەڵ برادەرەکــانم دابــووم. زگــم زۆر بــۆ برادەرەکــانم ســوتا و تــاوێ بۆیــان گریــام. هاتمــەوە خــوارەوە هاتمــەوە نــاو کۆمــەڵ زێــڕ و زیوەکە.

ڕۆژێــك کــە دیقەتمــدا قرانــی گــاوڕ خــۆی و تــۆڕو گەمیەکــەی هاتــەوە ســەر زێــڕ و زیوەکــە لــەپاش ئــەوەی کــە پەڕینــەوە و مــن خــۆم شــاردەوە لــە پەنایەکــەوە کــاتێ کــە تــۆڕ و گەمیەکــەیان بــە نیــوە کــرد مــن کــە لــە تــۆڕ و گەمیەکــەم دەزانــی خــۆم کوتــا بــەناو تــۆڕ و گەمیەکــەوە و قرانــی گــاوڕ و پیاوەکــانیم لــەو جەزیرەیــە بــەجێ هێشــت. وە ئــەم ماڵــەی کــە ئێــوە دەیبیــنن مــن بــەم نەوعایەبەدەســتم هێنــاوە بۆیــە مــن ڕیشــم ســپی بــووە و ئــەو بــرا گەورەمــە و مــن بــرا بچــوکم، هــەر دەبــێ مــن خزمــەتکار بم ئــەوەش ژنــی قرانــی گــاوڕە لــەدوای ئــەوەی کــە بــەجێم هێشــت و لــە خۆمم مارە کردووە کە ئێستا ژنی منە.

حیکایەت گێڕ: (دەسکێ گوڵ و ڕێحانەم هێناو دام بە لوتی ئێوەدا)

## مەکری ژنان

ئەگێڕنــەوە کــە کوێخاژنێــك و مــەلاژنێك و زابتــەژنێك هــەبوو. ڕۆژێــك لــە دێیــەك تازیەیــەك دەبــێ هەرســێکیان دەچــن بــۆ تازیەکــە. لــە ڕێگــای تازیەکــە کــە لــە دێیەکــەوە بــۆ دێیــەکی تــر دەچــوون ملوانکەیــەك دەدۆزنــەوە. کوێخــاژن گــوتی: مــن دیمەتــەوە و دەبــێ بۆ مــن بــێ. مــەلاژن گــوتی: نــا مــن دیمەتــەوە. زابتــەژن گــوتی: نــا من دۆزیومەتەوە من لە پێش ئێوە بینیم.

مــەلاژن گــوتی: ئــەوە پیاوێکــە خوشــکم بــا چــاوەڕێ بکــەین تــاکو ئــەو پیــاوە دێ و بــزانین ئــەم پیــاوە ئــەم ملوانکەیــە دەدا بــە کامــەمان ئەوانــەی ترمــان گلــەیی نەکەین.

کــابرا گەیشــت و پێیــان وت کــە ئێمــە ئــەم شــتەمان دۆزیوەتــەوە تــۆ بــۆ هــەر یــەکمان دایبنێیــت ئــەوەی ترمــان گلــەیی نــابی. کــابرا تومــەزە (ســەیاح)ە زێڕەکــەی وەرگــرت گــوتی ئــۆف وەڵــڵا بابــە ئەمــە شــتێکی باشــە هــەر لــەناو دەســتی مایــەوە و ژنــەکان هەرســێکیان چــاوەڕێیان بــوو گوتیــان ئــەی باشــە بــۆ هــەر لــەناو دەســتت ڕاتگرتــووە نایــدەی بەکــەسمان. کــابرای ســەیاح هەســتێکی ڕاگــرت و گــوتی وەڵــڵا نایــدەم بــە کەســتان تــاوەکو مــەکری خۆتــانم پــێ نــەڵێن و بــۆم بــاس نەکــەن. ئینجــا گوتیــان مــام سەیاح با دانیشین و مەکری خۆمانت بۆ باس بکەین.

یەکــەم کــەس مــەلاژن گــوتی: مــام سەیاح بــا مــەکری خۆمــت بــۆ بــاس بکــەم. مــەلاژن گــۆتی: مــن حــەزم لــە فەقێکــەی خۆمــان بــوو غــەرەم دەرەســت (تەشــی) لــە بــن غەرەکــەوە لەغــەم (کــون)ێکــم لێــدا بــوو بــۆ نــاو حوجرەکــەی فــەقێ. عالــەم هەســتی کرد بوو کــە مــن حــەزم لــە فەقێکەمــە مــەلاژن گــوتی بــە مــەلام گــوت مــەلا فەقێکــەمان ژنێکــی هێنــاوە عەینــەن منــە. دەبــڕۆ مــەلا ســەردانێکی فەقێکــە بکــە. مــەلا ڕۆیــی بــۆ حــوجرەی فــەقێ منــیش بــە لەغەمەکــەدا چــوومە لای فــەقێ و لای دانیشــتم. مــەلا هــات و ســەری کــردە ژوورەکــەی فەقێــدا و بــە تونــدی گەڕایــەوە و منــیش گــوتم مــەلا چــویت؟ مــەلا گــوتی چــوزانم. گــوتم بــڕۆ فەقێکــەت چــەند ســاڵ فــەقێی خــۆت بــووە. بــۆ ئەوەنــدە شــەرمەونی. گــوتی مــەلام ڕەوان کــردەوە و دیســان لــە لەغەمەکــەوە چــوومە شــان فــەقێ دانیشــتم. مــەلا هــات و ســەلامی کــرد و منــیش شــانیم مــاچ کــرد و پێڵاوەکــەیم کــردە تاقەکــەوە و عەباکــەیم کــردە قەڵەمەکــەیا. گــوتی مــەلا کــەمێك دانیشــت و هەڵســا و ڕۆیــی بــۆ مــاڵ خۆمــان. منــیش بــە ڕێگــای لەغەمەکــەوە چــوومە

سەر کارەکەی خۆم. کاتێکم زانی مەلا هاتەوە. گوتم مەلا. گوتی ها. گوتم چووی؟ گوتی: ئا چووم گوتم: ئێی دەوەرە قسەم بۆ بکە. تخوا ژنەکە چۆن بوو. مەلا گوتی بەخوا ئەوندە ژنەکە بە مەعریفەتە ئەما مەلاژن بەخوا ئەڵێی سەری تۆ براوە و بەوەوە نراوە.

ژنەکە گوتی: ئێ خۆ مەلا بەچاویخۆت بینیت. سبەی ئەچیە سەر قاوە منداڵ و توار و خوێڕی و خوار بڵێن ژنەکەی مەلا حەزی لە فەقێیەکەیتی. ئەوا تۆش سێ تەڵاق بخۆ بڵێ ئەوە ژنی من نییە خۆم چوومەتە ماڵی فەقێ و ژن خۆیەتی.

بەیانی مەلا چووە سەر قاوە و منداڵەکان و گەنجەکان بە مەلا پێدەکەنین. مەلا بەمکارەیان زۆر تورە بوو. بەڵام کوێخا گوتی مەلا ئەوانە گەنجن و بۆ خۆیان وا پێدەکەنن. مەلا گوتی: دەزانم بەچی پێدەکەنن! بەخوای خۆم چوومەتە ماڵی فەقێ و ئەوە ژنی خۆیەتی و ژنی من نییە بەهەر سێ تەڵاقم. پیاوە ماقوڵەکانی سەرقاوە گوتیان ماڵت بەقوڕ نەگیرێ مامۆستا ئەو جاحێڵانە بۆخۆیان پێدەکەنن تۆ بۆ تورە دەبی دەهەستە بڕۆوە سەرێ لە ماڵ خۆتان بدە. گەنجێکیش لە پشت مەلاوە گەیشتە مەلاژن و گوتی مەلا تەڵاقتی داوە. مەلاژنیش چووە لای فەقێ دانیشت. مەلا هاتەوە تەماشای کرد کەس لەسەر غەرە نییە و چۆڵ و هۆڵە. ئەم جیرانی کرد ئەو جیرانی کرد گوتی مەلاژن لێرە نییە؟ گوتیان نە.لەم سەین و بەینەدا بوو مەلا بەتەك حوجرەکەی فەقێدا هات گوتم مەلا ئەوە لەچی دەگەرێی من مەلاژنم تۆ تەڵاقت داوم و تەڵاقت کەوت. لەپێش چاوت من شو بەم فەقێیە دەکەم. مەلاژن گوتی مام سەیاح من ئەم مەکرەم لە پیاوەکەم کرد.

مایەوە ژنە کوێخا و ژنە زابت. ژنە کوێخا گوتی: مام سەیاح منیش حەزم لە جوتیارەکەی خۆمان کرد. گوتی ڕۆژێ بە جوتیارەکەم گوت بچۆ هەندێ ماسی بگرە و دوو سێ لاتیش تۆو بدە. ماسییەکان لوناو لاتەکە بکەنە خۆڵەوە. لەرز و تا بێنە خۆت و وەرەوە بۆ ماڵ. جوتیارەکە لەرز و تای هێنایە خۆی و کارەکانی جێ بەجێ کرد و هاتەوە ماڵ و چووە بن جێگاوە. کوێخا لەسەر قاوە بوو. چووم لە قاپی دیوەخانەکەدا دانیشتم و دەستم نایە ڕوومەتمەوە، بە کوێخام گوت باش قوم لە قاوە بدە ماڵ جوتەکەت جوانە. کوێخا گوتی: بۆ کوێخاژن بۆچی بووە وا دەتەوێ سەر و دڵم بگری. گوتم: ئەی جوتیارەکەمان لە زوویەکەوە هاتۆتەوە لەرزی هێناوەتە خۆی و نەخۆشە وا لەبن جێگادایە.

هەندێ فـەلاح و مـەڕدار و خـەڵکی گونـدی لـە دەوری کوێخـا دانیشـت بـوون بـە فەلاحـەکان بەهەرچـییەکیان گـوت گوتیـان پێمـان نـاکرێ و کارێکیـان بـۆ خۆیـان دەدۆزیەوە.

هـیچ چاری نـەما کوێخا کەچە کلاشێکی لـەپا کرد و چوو بۆ جووت. بەتـەما نـەبوو بچـێ بـەس کـە دیـتی چـەند لاتیکـە تـۆو دراوە و تۆوەکـە خەسـار دەبـێ بۆیـە بڕیاریـدا خـۆی بچـێ و جوتەکـە تـەواو بکـا. دەسـتی کـرد بـە جـووت کـردن چـەند خـەتی جـوتی کـرد. ماسـیەکی زۆری دیتـەوە. ماسـیەکانی هـاوردەوە بـۆ مـاڵ. گـوتی کوێخـاژن ئـەم ماسـییانەم گرتـووە. گـوتم ئۆیـف ئـەم ماسـییانە شـتی گـەلێ چاکە. گـوتم کوێخـا ئـەم ماسیانەت چۆن گرتـووە گـوتی لـەناو خـەتی جـوت. گـوتم بـەخوا شـتێکی چـاکە. کوێخـا پێمـی گـوت کوێخـاژن بۆمـان سـوور بکـەوە ئێـوارە هەندێ لە پیاوەکان لەسەر ڕێی مزگەوت دێنمەوە.

گـوتم بەسـەر چـاو کـام پیـاوی زەریفـە لەگـەڵ خـۆتی بهێنـەوە. کـە ئـەو ڕۆیـی بـۆ مزگـەوت و منـیش ماسـییەکانم کـردە بـەر چـارۆگمەوە و بردمـە دەرەوەی ئـاوایی فڕێمـدا. یـەك ماسـی بچـوکم کـردە گیرفـانم. ئـەو ئێوارەیـە گسـکم نـەدا و نانیشـم نـەکرد مـەلای مـەغریب بـانگی داو دوای نوێـژ کوێخـا لەگـەڵ کۆمـەڵێ پیـاوانی ئـاوایی هاتـەوە مـەلا لـە پێشـیانەوە بـە هـەرەداوان دەڕۆیـی. کـاتێ کوێخـا و میوانـەکان دایـان لـە قـاپی حەوشـە و چـاوم پێیـان کـەوت ڕاپـەڕیم بـە تونـدی و گسـکێکم دا لـەناو ماڵەکـە و جێگـام ڕاخسـت. فـەرمووم لـە مێوانـەکان کـرد هـەموویان بـەڕێز دانیشـتن و کوێخـا لـە خـوار میوانـەکان دانیشـت بـوو منـیش چـووم لـە خـوار کوێخـاوە لێـی دانیشـتم کوێخـا پێمـی گـوت هەڵسـە ئاشـەکە بێنـە. خـۆم بـە سـاحێبی قسـەکەی کوێخـا نـەکرد. کردیـە دووەم جـار هـەر خـۆم بـە سـاحێب قسـەکەی نـەکرد. کـە سـێیەم جـار بـە دەنگێکـی بـەرز گـوتی ئاشـەکە بێنـە. منـیش وەك کەسـێ کـە هـیچ ئاگـام لـە دونیـا نـەبێ کـەدام بەسـینگخۆمدا و گـوتم: ئەیـەڕۆ پیاوەکـە ئاشـی چـی؟ کوێخـا بـە توڕەبوونـەوە دارسـا بـۆم و گـوتی ئـەی مـن ماسییەکانم نـەگرتبوو بـۆم هێنـای بۆمـان بکـەی بـە ئـاش. دام بـە سـینگی خۆمـدا و گـوتم: ئەیـەڕۆ بـەخوا پیاوەکـەم شـێت بـووە. وەختـێکم زانـی کوێخـا پـەلاماری دام و کەوتـە سـەر و گوێچـەلاکم بـەلام میوانـەکان دەسـتیان گـرت و نـەیان هێشـت لـێم بـدات. کەوتمـە دوعـاو پاڕانـەوە و گـوتم بـەخوا کوێخـا شـێت بـووە کوێخـاش لەسـەر قسـەکانی خـۆی سـور بـوو. کـاتی میوانـەکان کوێخـا گـرت و دەسـت و پایـان بەسـتایەوە کردیانـە بـان کـەرێك و ویسـتیان بیبـەن بـۆ ((ئۆمـەر مەنـدان)) گلیـانم

دایەوە. هەر بە دەست و پا بەستراوەیی دام ناو بە جەماعەتەکەم گوت موسیّ بێنن بان مەلاّشویم بۆ برندار بکەن، هەندیّ تورش و خویّم بۆ کرد و نامە بان مەلاّشوی و پێچامەوە جێگایەکم بۆ ڕاخست و نوێنەکانمدا بە بانیدا بەیانی کە هەستاین کوێخا مردبوو، لەتاو ئازارەکەی. منیش پاش ماوەیەك شوم بەو جوتیارەی ئێستای خۆمان کرد. منیش ئەم مەکرەم لە پیاوەکەی خۆم کرد مامە سەیاح. مامە سەیاحیش گوتی پەح لەو مەکرە.

مایەوە بە ژنەزابت کە مەکری خۆی بۆ مام سەیاح باس بکات. ژنە زابت گوتی منیش پیاوەکەم زابت عەسکەریە بوو تەقاوت بوو بوو، بووبوو بە کەلاك هیچ شتێکی نەما بوو، حەزم لە جیرانەکەی خۆمان کرد بوو، نەمزانی بە چ نەوعیّ زابتە کەلاك لە کۆڵە خۆم بکەمەوە. ڕۆژیّ چوومە شار لەشار بارگیرێك و دەرمانی بیّ هۆشکردن و قلینج و مالینج(زین و لغاو) لەگەڵ ئاوێنەیەك و بەرگێکی زابتانەی چاکم بۆ کڕی. دەرمان بیّ هۆشکەرەکەم دا بە مێردەکەم و کە بیّ هۆش بوو دام بە کۆڵم داو بردم لەدوور ئاواییەکە دامنا... هاتمەوە بارگینەکەم کوڵیّ کایا و ئاوێنەیەکا بردم و لەویّ پاك ڕیشم تاشی و کایەکەم لە سیّ چوار جیّ کۆمەڵ کۆمەڵ دامکرد و بارگینەکەم لەسەر کۆمەڵێکیان بەستایەوە. ئاوێنەکەم کردە قەد زینی بارگیرەکەیا.

کابرا کاتیّ بەیانی بەهۆش خۆی هاتەوە تەماشای کرد لە دەووروبەریدا چی قەوماوە بە ئاوێنەکە تەماشایەکی خۆی کرد بەرگێکی زابتیم لەبەر کرد بوو لە ئاوێنەکە تەماشای دەم و چاوی کرد تراشی پاك پاك کراوە و روتبەکانی بە قەدەیەوەیە. بارگیرەکەی بە زینەوە لە تەکیەوە بەستراوەتەوە. وتی نا بەریّ هەبیّ و نەبیّ من ئێوارە لێرە ئۆر دوریەکەمان هەڵداوە ئەوانڕۆیشتوونە و من بەجیّ ماوم. زۆر بەپەلە سواری ئەسپەکەی بوو. بەتەك ماڵی خۆماندا هات بە توندی سوعالی لە خۆم کرد گوتی: (ئۆردیکە هەرە جێرسەنە) منیش بە ئیشارەت لایەکم پیّ نیشاندا و گوتم ئۆردیکە واوە واوە. ئەو تاوەی کە دای و ڕۆیشت نازانم ملی شکا یان لە شاخ هەردێرا چی بەسەر هات و چی بەسەر نەهاتووە.

منیش پاش ماوەیەك شوم بە کوڕە جیرانەکەی خۆمان کردەوە. منیش ئەم مەکرەم لە پیاوەکەی خۆم کرد. مام سەیاح گوتی پەح لەم مەکرە!

مـام سـەیاحیش گـوتی وەڵـلا مـادام ئـەوها مـەکرۆن و ئـەو مەکرانـەتان کـردووە منـیش ئـەوە ملوانکـە زێڕەکـە بۆخـۆم دەبـەم و نایـدەم بـە کەسـتان. کـابرای سـەیاح ڕۆیشت و ژنەکانی بەجێ هێشت.

دەسکێ گوڵ و ڕێحانەم هێنا و دام بە لوتی ئێوەدا...

## سێ کۆسە

بـە ژنێـك و پیاوێـك یـەك جـوانیماینیـان هـەبوو.ماڵیـان لـەخوار گوندەکـەوە بـوو. ژنەکـە بـە پیاوەکـەی گـوت پیاوەکـە ئـەم جـوانی ماینـە بـەرە و بیفرۆشـە ۆ خـەرجی ئـەم زسـتانە. سـێ کۆسـەش هـەبوون بـۆ هەڵخەڵەتانـدنی پیـاوی فـەقیر لەسـێ کـۆڵان دەوەسـتان و تـەکبیریان لـە پیـاوی گێـل و فـەقیر مـاڵ دەکـرد. لـە دوورەوە کۆسـەکان ئـەو کابرایـەیان بـینی بـەرەو لایـان دەچـوو جـوانی مـاینێکی بـە دەسـتەوەیە و دەچـێ بـۆ مەیـدان. لـە بـەینی خۆیـان تـەکبیریان لـە کـابرا کـرد کـە چۆن چـۆنی ئـەو جوانی ماینـەی لـێ بستێنن. هـەر یەکـە چوونە سـەر کـۆلانێ. کـابرا گەیشـتە کۆسـەی یەکـەم گـوتی هـا خـارە ئـەو (نوێنگینـەت) بەچـەند؟ کـابرا گـوتی نا کاکە ئەمـە جوانی ماینـە نـوێنگین نییـە. کۆسـەکە گوتی نـا کاکـە تـۆ نـازانی ئەمـە نوێنگینە. کابرا نەیدا پێی.

چـووە لای کۆسـەی دووەم گـۆتی هـا مامـە ئـەو (گۆلکـەت) بەچـەند؟ کـابرا سـەری لـەو قسـانە سـوڕ دەمـا گـوتی نـا بابـە ئێسـتا لەسـەر کۆڵانەکـەی تـر زەلامێـك گـوتی نوێنگینـە گۆلـك نییـە. کۆسـەکە گـوتی ئـەویش نـەیزانیوە ئەمـە هێشـتا گۆلکـە و نەبووە بە نوێنگین. کابرا لەوەش لێیدا ڕۆیشت.

چـووە لای کۆسـەی سـێیەم و هـا... خاڵـە ئـەم بزنـەت بەچـەند؟ کـابرا بـە توڕییەکـەوە گـوتی: بـزن نییـە. کۆسـەکە گـوتی بـا خاڵـە تـۆ نـازانی ئەمـە بزنـە. کـابرا هەسـتێکی ڕاگـرت و گـوتی ئـەی ئێسـتا لـەولاوە هـاتم یـەکێ گـوتی نوێنگینـە و یـەکی تـر گـوتی گۆلکـە و تـۆش دەڵێـی بزنـە. کـابرای کۆسـە گـوتی نـا خاڵـە تـۆ نـازانی ئەمـە بزنـە. بـەس ئەگـەر لێـرە بـڕۆی بـەولاوە لێـت نـاکرم. کـابرای فـەقیر تـۆقی و گـوتی بچـمە خـوارتر دەبـێ بـە گیسـك. مـەجبوور بـە بـزن بـە کۆسـەی ئـاخیری فرۆشـت. کـابرای فـەقیر هیچـی پـێ نـەکراو پارەکـەی ڕێـوڕێ بـۆ ژنەکـەی هێنایـەوە و ژنەکـەی پێـی گـوت: هـا پیاوەکـە جـوانی ماینەکـە هیچـی کـرد؟ پیاوەکـە گـوتی: وەڵـلا ژنەکـە جـوانی مـاین نـەبوو. گـوتی لـە فـلان کـۆڵان پێمیـان گـوت نوێنگینەکـەت بـە چـەند لـە فـلان کـۆڵان گوتیـان گۆلکەکـەت بـە چـەند و لـە فـلان شـوێنیش گۆتیـان

بزنەکەت بە چەند؟ منیش گوتم هەتا نەبووە بە گیسك با بە بزن بیفرۆشم دامە کابرای سێیەم بە بزن و ئەمە پارەکەیەتی. ژنەکە وەکو مەرد سوێندی خوارد کە تۆڵە لە سێ کۆسەکە بکاتەوە. بە پیاوەکەی گۆت: بڕۆ لە بازاڕ دەستی جلی جوان و پۆشین و جوتێ پێلاوی سوور و ئاوێنە و کلدان و سێ تیخ داخمەداری حوکمەتی بکڕە. کابرا چووە بازاڕ و هەموو شتەکانی کە ژنەکەی داوای کرد بوو کڕیانی و بردیەوە بۆ ماڵ.

ژنەکە خۆی گۆڕی و پۆشینی کردە سەری و چاوی ڕەش کرد و پێلاوەکانی لەپێ کرد. جێگاو مەکانی کۆسەکانی لە پیاوەکە پرسی و بە پیاوەکەی گوت تو لەماڵ بەو من دەچم بۆ بازاڕ. چوو گەیشتە کۆسەی ئەولی شانێکی دا لە شانی و گوتی بۆ ئەوەندە جوابت بۆ دەنێرم شەوێ نایەیت بۆ لام. کۆسە گوتی: کا کەس پێمی نەگوتووە ژنەکە گوتی: (لوغ لوغە) لەناو دەمت بدا وا بەزمانی خۆم پێت دەڵێم. کۆسە گوتی کەی بێم. ژنەکە گوتی لەگەڵ مەغریبدا وەرە مەوعیدی ماڵەکەی وەرگرت و هەندێ پارەی کردە گیرفان ژنەکەوە. لەپاش ئەوەی کە ژنەکە ڕۆیشت بانگی حەماڵی کرد و فەردەیەك برنج و کەلەشێ گۆشتی بۆ ماڵیان نارد. کابرای حەماڵ بردی. چووە لای کۆسەی دووەم بەهەمان حاڵ. کۆسە گوتی کەی بێم. گوتی بەینی عیشا و مەغریب. ئەویش مەبلەغێ پارەیدا بە ژنەکە و ژنەکە ڕۆیشت و کۆسەی دووەم بانگی حەمبالی کرد و برنج و گۆشتێکی زۆری بۆ ناردنەوە. چووە لای کۆسەی سێیەم و بەهەمان حاڵ گوتی دوای عیشا وەرە. کۆسەس سێیەمیش مەبلەغێ پارەی باشی بە ژنەکەدا.

بەم شێوەیە هەرسێکیانی بەتەما کرد کە ئەو شەوە بێن. خۆی هاتەوە بۆ ماڵ بە پیاوەکەی گوت و تەکبیری بۆ پیاوەکەی کرد. گوتی کە سێجار لەقاپی درا چوارەم جار وەرە ئەم بارانەم لەگەڵ دابگرە. وا لە ئاسیاو هاتوومەتەوە. ئاشی لێنا گۆشت و برنج. مەغریب داهات کۆسەی ئەوەلی هاتە ژوورەوە و دەستێکی نایە بان شان و ملی و ژنەکە گوتی ئەوە چی دەکەی؟ بەقوربانت بم. عەباکەی لەسەر شان کردەوە و کردیە قەڵەمەکەیا پێلاوەکانی لەپا کردەوە و تەکاندی و لە تاقەکەی دانا و گوتی با دانیشین و تێر نان بخۆین و دوایی تێر هەتا بەیانی کەیف و سەیفی خۆمان دەکەین. هەتا ئەوەندەیان کرد تەقە لە قاپی حەوشەوەیان هات و کۆسە گوتی ئەمە چییە؟ ئەمە پیاوەکەمە لە ئاش هاتۆتەوە.کۆسە گوتی ئەی چی بکەم؟ ژنەکە گوتی زۆر ئاسانە خۆت ڕووت

بکـەوە کردیـە بـن خەلاجەکـە و گـوتی کۆلـە سـار گۆلکەکـەی لێیـە بیکـە ملـت و پیاوەکـەم زۆر هیلاکـە و هەسـتی پـێ ناکـات. هـەتا ئەوەنـدەیان کـرد کۆسـەی دووەم هاتـە ژوورەوە چـووە لای ژنەکـە و دەسـتی هەنـدێ لـە شـان و ملـی داو ژنەکە گوتی ئـەوە چی دەکـەی؟ وا نـانم حـازر کردووە بـا نـان بخۆین و دوایـی هـەتا بـەیانی بۆخۆمـان کـەیف و سـەیف دەکـەین.کۆسـەی دووەم قنگـی نایـە عـەرد و نەنایـە عـەرد کۆسـەی سـێیەم تەقـەی لـە دەرگـاوە هێنـا. کۆسـەی دووەمـی بـە هـەمان شـێوە ڕووت کـردەوە و کردیـە نـاو کەنـدووی ناوەڕاسـتەوە. وەخـتی کـە هـات کۆسـەی ئـاخری بـوو ئـەویش کـە دەسـتی لـە دەسـتی نـەدا و دانیشـت دانەنیشـت وەخـتی پیاوەکـە لـە تەندورخانـە هاتـە دەرەوە و هۆشـی لەکـەر کـرد و کـابرای کۆسـەی سـێیەم گـوتی ئەمـە چییە؟ ژنەکـە گـوتی هـیچ نییـە مەترسـێ ئـەوە پیاوەکەمـە لـە بـاراش هاتۆتـەوە. کۆسـە گـوتی تـەکبیرمان چییە؟ ژنەکـە گـوتی: زۆر ئاسـانە... خـۆت ڕووت بکـەوە و بچـۆ نـاو لانکەکـەوە ئـەویش وا دەزانـێ منـداڵمان بـووە. کـە ئـەو خـەوت کـەیف و سـەیفی خۆمـان دەکـەین. وەخـتێ کـابرا هاتـە ژوورەوە ژنەکـە خـۆی کـردە بـن جێگـاوە پیاوەکـە گـوتی ژنەکـە مـن هـیلاکم و برسیمە چی بخـۆم؟ ژنەکـە گـوتی وەڵـلاّ چـی وامـان نییـە هەنـدێ ئـاش وا لـەناو ئـەو مەنجەڵەیـە بۆخـۆت بیخـۆ. کـە پیاوەکـە چـوو سـەری مەنجـەڵی هەڵدایـەوە سـەیری کـرد دەنکـە برنجـی قـولانجی درێـژە و گۆشـتی گۆلـك لەگەڵیـدا وا کـولاّوە و سوورەوە بووە وەك دەندوکی کەو.

کـابرا تێـر بـرنج و گۆشـتی خـوارد و هاتـە گیـان ژنـە کـە داوای لێکـرد. ژنەکـە گـوتی: ئەیـەڕۆ پیاوەکـە مـن تـازە منـداڵم بـووە چـۆن وا دێـی دوایـی کـوێر دەبـی. پیاوەکـە گـوتی: وەڵـلاّ ژنەکـە ئەیـدەی بیـدە ئەگـەر نـا کونـدەی ناوەڕاسـت دەشـکێنم. ژنەکـە گـوتی: دەیشـکێنی نایشـکێنی کـەیفی خۆتـە مـن تـازە منـداڵم بـووە. بـەخوا نـات دەمـێ. پیاوەکـە دەسـتی دایـە کوتـوکێکی چـاك و چـووە گیـان ئـەو کوندەیـەی کۆسـەی دووەمـی تێـدا بـوو وورد و هەڕاشـی کـرد و کۆسـە ڕای کـرد دەرپـەڕی هـەتا کۆسـە لـەماڵ دەرچـوو سـێ چـوار کوتـەکی پیـادا. کـابرا هاتـەوە گیـان ژنەکـەی. ژنەکـەی دیسـان ڕازی نـەبوو کبـار گـوتی ڕازی دەبـی باشـە ئەگـەرنا دەچـمە گیـان گۆلکەکـەت. کـابرا هـوردە هـوردە چـوو بـۆ لای گۆلکەکـە و دەسـتی دەسـتی بـۆ دۆخینەکـەی بـرد و کۆسـە گـوتی بـەڵێ بـەخوا لـەباتی ژنەکـە دێتـە گیـان مـن کـە خـۆی ڕاپسـاند و سـنگ و پەتەکـەی هەڵقەنـد و ڕای کـرد بـۆ دەرەوە. ئەویشـی لەماڵ دەرکردە دەرەوە.

هاتـەوە گـوتی ئـەریٚ ژنەکـە تـۆ هـەر دەڵێـی منـداڵمان بـووە بـا بـزانم ئـەو منداڵـە چۆنە؟ ژنەکە گوتی ئـەریٚ پیاوەکـە منـداڵیٚ تەمـەنی یـەك رۆژ بـیٚ دەبـیٚ چۆن بـیٚ؟ پیاوەکـە نەیسـەلماند سـەری منداڵەکـەی هەڵدایـەوە غێـر منداڵەکـە کۆسـەیە لـەناو لانکەکەیـە. دای بـەبان چـەناگەی منداڵەکـەیا (کۆسـە) گرژایـەوە کابـار گـوتی: ئـەی ژنەکـە سـەر و باوانـت لـە قـوڕ بنـریٚ. ئـەم منداڵـە سـەرەخۆرەیە ئەمـە دگـانی قـولانجیٚ ریٚـژە. سبەی پاشا بزانیٚ عیـدامەمان دەکـات. بـڕۆ گازەکـە بێنـە بـا دگـانی بکێشـم ژنـە بـەنار و نـرك چـوو گـاز بـێنیٚ. پیاوەکـەی هـاواری لـیٚ بـەرز بـوو ئـەوە قاچیشـی ئەوەنـدە درێـژە. مشـارەکەش بێنـە بـا قاچـی ببڕینـەوە. کۆسـە کـە گـوێی لـەم قسـانە بـوو گـوتی: بـەخوا هـەم دگـانم دەکێشـن و هـەم قاچیشـم دەبڕنـەوە. هەرسـتاو بـە لانـگ و دەزرازەوە ڕای کـرد و ڕۆیشـتە دەرەوە. ژنەکـە بـە پیاوەکـەی گـوت: کورەیـەك سـەرگینم بـۆ بکـە و هەرسـیٚ شیشـە داخمەدارەکـەی کـردە نـاو کورەکـەوە و قاپییـەکیان زۆر بەچـاکی گـرت. هەرسـیٚ کۆسـەش لـە دەرەوە کـە گەیشتنە یـەك بـە ڕووتـی یـەکیان دی و بەحسـی خۆشـیان بـۆ یـەکتری کـرد.گوتیـان ئەمـە ئێمـەی ئـەتك کـرد. بـا بگەڕێینـەوە هـەردووکیان کـەرت و پـەرت بکـەین و بیـان کـوژین. کـە هـاتن هەرچـەندیان کـرد قاپییەکـەیان بـۆ نەکرایـەوە بچـنە چـوورەوە و بیـان کـوژن. پاشـان گوتیـان بـا بچینە بـان خـانی و خانیەکـەیان کـون دەکـەین و ب گۆلـە سـارەکەو هـەردوو دەزرازەکـە دەچـینە خـوارەوە و دەیـان کـوژین. کۆسـەکەی کـە لـەناو کەندووەکـە بـوو زۆر داغ لـە دڵ بـوو گـوتی لـە پێشـیا مـن شـۆڕ بکەنـەوە. دەزرازەکـەیان لـەناو قـەدی بەسـتاو شـۆڕیان کـردەوە. هـەتا ئـەمان ئەوەنـدەیان کـرد شیشـەکان سـوورەوە بـوون. کۆسـەی نـاو کەندووەکـەیان شـۆڕەوە کـرد. تەکـەو کـابرا شیشـێکی داغمـەدار سـوورەوە بـوو بـوو وەکـدەنووکی کـەو نایـان بـەلا قنگییـەوە هـاواری لـیٚ بـەرز بـوو گـوتی هـەڵم بکێشـن هـەڵیان کێشـا گوتیـان تـۆ بەتـەما نـەبووی بیـان کـوژی بۆچـی هـاوار هـاوارت لـیٚ بـەرز بـوو ئـەویش بـۆ ئـەوەی ئـەوانیش بچـنە خـوارەوە گـوتی: وەڵـلا بڵـێم چـی هەنـدەی مێشـوولە هـەبوو قـنگ پیـاو دەدڕیٚ. ئـەو کۆسـەیەی کـە گۆلـە سـارەکەی هینـا بـوو گـوتی هـەی عـەمرت نـەمینیٚ هـەر بـۆ پێشـوولە. مـن شـۆڕ بکەنـەوە مـن دەیـان کـوژم.کـە ئەویشـیان شـۆڕەوە کـرد کەوتـە هـاوار هـاوار کـە هـەڵیان کێشـایەوە گـوتی بـەخوا ڕاسـت دەکـات پیـاوم دەویٚ لەبـەر پێشـوولە خـۆی ڕاگـریٚ لـە خـوارەوە. ئـەم قسەیەی هەر بۆ ئەوە بوو کە کۆسەی سێیەمیش بکەنە خوارەوە.

کۆسـەی نـاو لانکەکـەش وتـی هـەی عـەمرتان نـەمێنێ لـە ئیسـتەکەش هـەروان هـەر دەبێ من حەیوانەکـە لـە کـابرا بکڕم و ئێـوە شـەریك بکـەم ئـەمجا مـن شـۆڕ بکەنـەوە بـزانن مـن چـی دەکـەم. کـە شـۆڕیان کـردەوە هێشـتا نەگەیشـت بـووە شـوێنی ئـەوانی تـر کـە شیشـەکەیان لێدا شیشـی داخمـەداری حکومـەت. هـاواری کـرد هـەڵم کێشن، هـەڵم کێشن. کـە هـەڵیان کێشـا گـوتی هـەی سـەگبابینە مێشـی چـی ئـەوە یەکـەو شیشـی داخمـەدار وا بـە قنگتانـەوە نـراوە دەڵـێن مـێش! هـەتا ئەمەنـدەیان کـرد شـەو بـەرەو بـەیان چـوو لـە ترسـی ئـەوەی خـەڵك پێیـان بزانـێ هـەر بـە ڕووتـی ڕۆیشـتن و ماڵەکـەو جلـەکان و پـارە و بـرنج و گۆشـتەکەیان بـۆ ماڵەکـە بـەجێ هێشـت. بۆیـە دەڵـێن ژن هەیـەو ژنۆکـەش هەیـە، هـەی دایکـم بـەقوربانی ژنـی ئەوهابێ.[*]

حیکایـەت خـوێن: عبـدالله حوسـێن معـروف. (حـاجی عبـدالله) تەمـەنی نزیکـەی (٦٥–٧٠) سـاڵ دەبێـت. لـە گونـدی (پەڵکانـە)ی دەڤـەری (شـێخ بـزێنی) ناحیـەی (شوان) لە (کەرکوك) لەدایك بووە.

وە لەسـاڵی (١٩٨٨) بـەدواوە کـە گوندەکـەیان کەوتـە بـەر هێرشـی ئـەنفال لـە ئۆردوگـای زۆرەملێـی (بنەسـلاوە) نیشـتەجێ بـووە. (قـەزای هـەولێر) لـە شـەوی ٦– ٥ –٢٠٠٧ یەکشـەمە کاتـژمێر ( ١٠– ١٢,٥) بـەکاتی هاوینـە. ئـەم حەکایەتـەم لێ وەرگرتووە.

**= حیکایـەتی بـارە پوشـکە، ئـەوەی گرنگـە کـە بـرای بچـوك ڕیشـی سـپی بـووە، هۆکـەی ئەوەیـە کـە ژیـانی ناخۆشـی بینیـوە و کەوتووەتـە تەنگانـەی و بووەتـە هۆی ئەوەی کە هەرچـەندە بـرا بچوکەکە کەچـی لـە بـرا گەورەکـەی زیـاتر سـەر و ڕیشی سپیی ببێ.**

**= حەکایـەتی کۆسـان، زۆر جـۆری هەیـە لـەنێو حەکایـەتی کـوردەواری و لـە هەمووشـیان، کۆسـە و کەچـەڵ و ژنـی مـەکرباز و زیـرەك، یـەك دەگرنـەوە. ئەمـە شـێوەی حەکایـەتی فۆلکلـۆری و تـەنزئامێزە، کـە بەشـێکی گرنگـە لـەنێو حەکایەتەکاندا، هێشتا گرنگی پێ نەدراوە. کە زۆر هەڵدەگرێ.**

---

[*] چەند جارێ ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە لە میانـەی حیکایەتەکـە (هـەی دایکـم بـەقوربانی ژنـی وها....).

# مەلاژن

**کۆکردنەوەی: کوێستان زاهیر**

لە گوندا رێزی مەلا و مەلاژن زۆر دەگیرا. رۆژێکیان کچانی گوند لەسەر کانی دەبن مەلاژنیش لەم لاوە دێت. چونکە ژنی مەلای بوو رێزیان گرتوو کچەکان چوون بە پیرییەوە گۆزەکەیان لێ وەرگرت بۆیان پڕ ئاویان کرد، زۆر رێزیان گرت کە رۆیشت ژنی مام حەسەنی لەوێ دەبێت کە چاوی بەو رووداوە دەکەوێ بۆ مێردەکەی دەگەرێتەوە دەرێت: پیاوەکە دەبێت ئێستا ببیە مەلا تا منیش ببمە مەلاژن. مام حەسەنیش دەرێت: کچێ ژنێ ئەوە تۆ شێت بوویی بەو پیریە کو دەتانم ببمە مەلا.

پیرەژن دەرێ بەخوای دەبییە مەلا ببێ ئەگەرنا تەراقم دە مێرد بە مەلایەکی دەکەم. مام حەسەن ناچار دەبی دەرێت باشە ژنەکە هەندەك مەرو بزنمان هەیە دەیان بەمە شاری دەیان فرۆشم تاکو جلکی مەلایەتی و مەلاژنی بۆ خۆم و خۆت بکرم.

مام حەسەن دەچێتە شاری کەوا و سەڵتەی مەلایەتی و قۆندەرەکی مەلایانە و مەندیلێك بۆ خۆی دەکرێت بۆ پیرەژنیش کراس و کەوا دەکرێت و دێتەوە هەندەك لێف و جاجمیان مابوو دەیخاتە سەر پشتی کەرێ کە خەڵکی ئاوایی چاویان پێ دەکەوێ دێنە کنی دەرێن کورە مام حەسەن ئەوە چ دەکەی لۆ دەرۆی کەس دڵی شکاندی هیچ بووە؟ مام حەسەنیش دەرێت: ناوەڵلاّ بەس ژیانم لێرە ناگوزەرێ لۆخۆم دەچمە لای بادینان هەرچۆنێك بێت بەرێ دەکەون بۆ بادینان دەگەنە گوندەکی لەبن دیوارێکی مارەکی بارەکەیان دەخەن، ساحێب مارەکە دێت دەرێت مامۆستا ئەوە لێرە چ دەکەی مام حەسەنیش دەرێت وەڵلاّ تازە هاتیمە کەس ناناسم. کابرا دوو سێ کچی دەبێت ژووری وولاغان بۆ مامۆستا خاوێن دەکاتەوە دەرێت ماری خۆتە تا جێگایەکی باشتر دەدۆزییەوە. دەنگ بڵاّو دەبێتەوە مەلایەکی زۆر باش و ردێن سپی هاتۆتە گوندەکەیان خەڵکی گوندی بەخۆو شتەوە دەچنە خزمەتی مامۆستا جا هەر شتێك بایە دەیان برد (مریشك و کەڵەباب و گەنم و جۆ و برنجی کوردی و کونجی) هەر چییەك بوایە بۆیان دەبرد، خەبەر دەگاتە مەلای گوندی کە کورێکی گەنجە مەلای گوندی کە ئەو خەبەرە دەبیستێ دەرێت

بـەخوا باشـە مـن چـەند لەمێـژە سـووتایمە لـۆ دوو قسـەی خـۆش لەگـەڕ مەلایـەکی بەخۆی و چەند کەسێك دێنە خزمەتی مامۆستا.

مـام حەسـەن بـەخێرهاتنیان دەکـات و دەرێـت ژنەکـە قاوەکمـان بـۆ بینـە ژنەکـەش لـە ژیـانی قـاوەی نەدیتییـە هەرچـەند دێ و دەچـێ نـازانی چ بکـا ! لـە دوایـی دەرێـت مـەلا وەڵـلا قاوەمـان نەمایـە مـەلاش دەرێـت چـایەکی سـەفەریمان بدەیـە ئـەو پیرەمێردانـەی لەگـەڵ مەلانـە دەرێـن وەخـتی نوێژییـە ماۆستا، دەچـنە مزگـەوتێ چـونکە مـام حەسـەن پیرتـرە مـەلای گونـدی دەرێـت فـەرموو مامۆسـتا پـێش نوێـژی بکـە. مـام حەسـەنیش دەچـێت دەرێـت ئـەی خوایـە نـازانم نیـەتی بینـم وەڵـلا هـەر دەرێ نیـەتم نیـەتم نـازانێ لـەپڕ دەردەپەڕێتـە دەرێ وەڵـلا هـەموو بـەدوای دەکـەون کـە ئـەو دەگاتـە دەرێـی مزگـەوت دەرووخـێ! ئەوانـەی بـەدوای کـەوتن هیچـیان لـێ نایـە و هەنـدەك برینـدار دەبـن خـەرکی گونـدی دەرێـن بزانـە چ مەلایەکـە یـەکو کـو زانـی مزگـەوت دەڕوخـێ. مـام حەسـەن دەچـێتەوە مـارێ بـە پـیرەژن دەرێـت زۆر باشـە مـەلا، مـەلا هـەتا مزگـەوتی چـاك دەکەنـەوە چـەند مـانگی پـێ دەچـێ هـەتا ئـەو کـات خـوا کەریمـە. لـەو وەختـەش پاشـای ئـەو ناوچـەیە قاسـەی دەبڕدرێـت قاسـەکەی دەدزن خەبـەر دەگاتـە پاشـای کـە مەلایـەکی زۆر بـاش هەیـە دەتـوانی لـۆت ببینێتـەوە. پاشـا بـانگی مـەلای دەکـات دەرێـت کـێ قاسـەی مـنی دزییـە مـەلاش دەرێ بـابی بـابم خـۆ ئـەمن فاڵچـی و قـاوەگرەوە نـیم تـا بـزانم. پاشـا دەرێ هـیچ مـەجالی نییـە دەبێـت لـۆم ببینیـەوە مـەلاش دەرێـت باشـە سـێ جـەرگ و هـەناوی باشـم لـۆ بکـڕە لـۆت دەبینمـەوە، پاشـا سـێ جـەرگ و هـەناوی چـاکی لـۆ دەکـڕی دەیباتـەوە دەرێتـە مـەلاژنی یـەکی لـێنێ ئـەمڕۆ. سـوتفە دزەکـان سـێ دز دەبـن ئـەوی شـەوی یـەکیان دەچـێت بزانـێ مـەلا چـی دەوێ مـەلا لـەپا نـانخواردنی دەرێـت ئەلحەمـدولیلا ژنەکـە یـەك هـات مـادووان. دزەکـە تـەنگاو دەبێـت و دەچـێتەوە دەرێتـە ئـەوانی تـر مـەلا زانـی دەرێـن کـو دەبێـت گـۆتی: یـەك هـات مـادووان. ئـەوانیش دەرێـن باشـە ئـەو شـەوە دوان دەچـین بـزانین چ دەرێـت مـەلا لـەپاش نـان خـواردن دەرێـت ئەلحەمـدولیلا ژنەکـە دوان هـات مـا یـەك. دزەکـان زۆر دەترسـێن دەرێـن ئـەو شـەوە هەرسـێکمان دەچـین ئەگـەر زانـی ئـەوە خۆمـان ئاشـکرا دەکـەین دزی بمـان داتـە دەسـت پاشـای پاشـا یەکسـەر دەمـان کـوژێ وەلا شـەوێ هەرسـێکیان دێنـە کـن دەرکـەی، مـەلا نـانی تـەواو دەکـات ئـەوجارە دەرێـت سـوپاس بـۆ خـوا ژنەکـە ئـەوە هەرسـێك هـات. دزەکـان ڕاسـت دەچـنە ژوورێ و خـۆی بەسـەر دەسـت و پێـی دادەدەن دەرێـن بکـە لـەڕای خـوای بـە پاشـای مـەرێ مـەلاش دەرێ باشـە بـە پاشـای نـارێم بـاش تەماشـایان دەکـات دەرێـت بـە مەرجـەکی بـە پاشـای نـارێم قاسـەکەتان لـەکێ

شاردیته‌وه؟ پێم بڕۆن ئه‌وانیش ده‌ڕۆن باشه. مه‌لا ده‌ڕێ به‌یانی ده‌چینه کن پاشای هه‌رسێکتان له‌ ته‌نیشتم بڕۆن کاتی گه‌یشتینه جێی قاسه‌که قونپانیتان داگرن له‌ شوێنه‌که‌ی دوای ئه‌من ده‌ڕێمه‌ پاشای خه‌رکه‌که‌ی بنێرته‌وه به‌س ئه‌نگۆ له‌وێ بمێننه‌وه ده‌ڕێم پاشا با ئه‌و فه‌قیرانه بمێننه‌وه لۆ به‌یانی مه‌لا ده‌ڕێته پاشای که‌نزه‌که‌م لۆ دیتیه‌وه ده‌ڕێ هه‌موو خه‌رکی خرکه‌نه‌وه بچیه جێیه‌که‌ی هه‌موو ده‌ڕۆن لۆ جێیه‌که‌ی مه‌لا سێ پیاوه دزه‌که‌ی له‌ ته‌نیشت خۆی داده‌نێ ده‌ڕۆن که‌ ده‌که‌ونه جێیه‌که‌ی دزه‌کان قونپانیان له‌عه‌رد داده‌نێن له‌و کاته‌ش مه‌لا ده‌ڕێ پاشا هه‌موو خه‌رکه‌که بنێره‌وه به‌س ئه‌و سێ زه‌لامه فه‌قیره نه‌بی با شوێنه‌که‌ی قۆر بکه‌ن که قۆر ده‌که‌ن زێڕ و زیوی پاشای هه‌موو له‌وێیه زێڕه‌که‌ی ده‌به‌نه‌وه مه‌لاش ده‌ڕێ هه‌ندەك حه‌ق ده‌ست بده‌نه ئه‌و پیاوانه ئه‌وجا ناوبانگی مه‌لای گه‌وره‌تر ده‌بێ تا ده‌گاته قازی موسرێ ده‌ڕێن مه‌لایه‌کی زۆر باش په‌یدابووه قازیش ده‌ڕێ ده‌بێ ئه‌و مه‌لایه‌ی ببینم. قازی دێته خزمه‌تی مه‌لا به‌لام بارانێکی زۆر ده‌باری قازی ناتانی بپه‌ڕته‌وه له‌ زێی هه‌ردووکیان له‌سه‌ر زێی یه‌ك له‌وبه‌ر یه‌ك له‌وبه‌ر به‌ ئیشاره‌ت قسه‌ ده‌که‌ن قازی په‌نجه‌ی شه‌هاده‌ی برند ده‌کا مه‌لاش وا ده‌زانی جوونی ده‌دا هه‌ردوو په‌نجه‌ی برند ده‌کا ده‌ڕێ به‌و دوو په‌نجه‌ی هه‌ردوو چاوت ده‌ردێنم. قازی ده‌ڕێ دۆڕام ئه‌من گۆتم یه‌ك (خوا) هه‌یه ئه‌و گۆتی (خوا و پێغه‌مبه‌ر) هه‌یه قازی یه‌ك ده‌ستی وه‌ك که‌وان لێ ده‌کات مه‌لا وا ده‌زانی جونی ده‌دا ده‌ڕێ ده‌تخنکێنم به‌یه‌ك ده‌ستی، مه‌لاش ده‌ڕێت ناوه‌للا ده‌تخنکێنم به‌ دوو ده‌ستی. قازی ده‌ڕێ دیسان دۆڕاندم. ده‌ڕێت بۆ قازی ده‌ڕێت من گۆتم مانگ به‌ ئاسمانه‌و حه‌و شه‌وه‌یه ئه‌و گۆتی مانگی چوارده شه‌ویش هه‌یه. ئه‌وجاره قازی هێلکه‌یه‌کی ده‌ردێنی مه‌لاش وا ده‌زانێ هێلکه خۆشه ئه‌ویش پیازێك ده‌ردێنی ده‌ڕێت هێلکه پیازی له‌گه‌ڵ نه‌بێ هه‌ر ناخورێ. قازی ده‌ڕێ ئه‌ویشم دۆڕاند ده‌ڕێت بۆ قازی ئه‌ویش ده‌ڕێت من گۆتم دنیا وه‌ك هێلکه خڕه ئه‌و گۆتی وه‌کی پیازی قات قاته. ته‌واو مه‌لایه‌کی زۆر زیره‌که.

- ئه‌م حیکایه‌ته ئه‌فسانه نییه! له‌و ڕووداوانه‌یه که ده‌کرێ له‌ ژیان ڕوو بده‌ن، زۆر مه‌لای زانا هه‌بووه له‌برسان مردوون، که‌چی که‌سێك به‌زۆر ده‌کرێته مه‌لا به‌لام، به‌سه‌ریدا ده‌بارێ.

# گیانبەخشی پاڵەوان

**کۆکردنەوەی: کوێستان محمد محمد**

گێڕانەوەی: حەمەلاو ئەحمەد هۆمەر، تەمەن ٨٠ ساڵ خەڵکی گوندی (ئیسێوەی)ناوچەی قەڵادزێیە، نەخوێندەوارە.

جارێکیان مەجلیسێك پاڵەوان دانیشتبوون، ڕۆستەم هەستا شەڕابی گێڕا، لە مەجلیسەکە هیچ کەس لێی وەرنەگرت لە کوڕەکەی خۆی نەبێ کە ناوی (گیانبەخش) بوو، ڕۆستەم تێکچوو، دوایی کە کوڕەکەی ڕۆیشتەوە بۆماڵێ بە دایکی گوت: دایە ئەوڕۆ ڕۆستەمی بابم سێ جار شەڕابی گێڕاوە لە مەجلیسی پاڵەوانان کەس نەیخواردۆتەوە من نەبێت دوایش ڕۆستەمی بابم تێکچووە و نازانم بۆچی؟دایکی گیانبەخش پێی گوت: ڕۆڵە کارێکی خراپت کردووە لەبەر ئەوەی هەر کەس ئەو پیاڵە شەڕابە بخواتەوە دەبێت بچێت سەری (پۆلا دەوەن)ی بهێنێت، کە (پۆلا دەوەن پاڵەوانێکی ناوداری ئەو سەردەمە بوو)، گیانبەخش بە دایکی گوت: دایە دەچم سەری (پۆلا دەوەن)ی دێنم، دایکی گوتی: ڕۆڵە تۆ ئێستا منداڵی شیری خاوت لە بنی دانان دایە سەری پۆلا دەوەنی بەتۆ نایەت، بەڵام گیانبەخش زیاتر توڕە بوو گوتی: سەرێکە و هاتۆتە سەر دەبێ هەر بچم، دایکی پێی گوت: مادام تۆ هەر دەڵێی دەبی بچم لە کارەکەت پەشیمان نابیتەوە گورزێکمان هەیە ڕەنگە بەکەڵك بێ بیبە لەگەڵ خۆت، گورزەکە زۆر قورس بوو کەم پاڵەوان دەیان توانی هەڵی بگرن، گورزەکەی هەلاویت و گرتیەوە و گوتی: بۆ ئەو کوێرە دەعبایەی دەبێت. گوتی ئەی ئەسپم؟ دایکی پێی گوت: ئەو ئەسپەمان بۆ تۆ داناوە بۆ سواری، بەڵام ئەسپەکە زۆر هار بوو! لە کونی پەنجەرەکەوە ئاو و ئالیکیان دەدایێ، بەڵام (گیانبەخش) دەرگاکەی کردەوە ئەسپەکە گوێی لە چەرمەوە برد بەڵام گیابەخش دەستێکی لە ناوچەوان داو هێنایە دەرەوە و زینی کرد و لێی سوار بوو بۆ مەنتیقەی پۆلا دەوەن، پۆلا دەوەنی تەبلیغ کرد و هات بۆ لای (گیانبەخش) پێی گوت: پۆلا دەوەن هاتووم بۆ جەنگی تۆ! لە مەنتیقەی پۆلا دەوەن داب و نەریتیان وابوو کە نانی هەر ڕێبوار و بێگانە و پاڵەوان لە ماڵی ئەوان حازر بکرێ، نانیان بۆ گیانبەخش لە ماڵی پۆلا دەوەن حازر کرد و بۆ گیانبەخشیان برد.

پـۆلاً دەوەنــیش بۆیــە پێیــان دەگـوت پــۆلاً دەوەن چــونکە پــۆلای دەکرۆشــت و دەیخـوارد بـۆ ئــەوەی دوژمــن لێــی بترســێ، بــەلاّم گیانبــەخش گـوتی ئــەو پــۆلاً کرۆشتنە لای مـن هـیچ قیمـەتێکی نییـە، بۆیـە کەوتنـە پاڵـەوان بـازی پێکـەوە. ئـەو ڕۆژە تـا ئێـوارە یـەکتریان هێنـا و بـرد بـەلاّم هیچیان زەفـەریان بـە ئـەوی تـر نـەبرد، بـەلاّم بـۆ بـەیانی دووبـارە کەوتنـەوە پاڵـەوان بـازی، بـەلاّم ئـەمجارە بـە کەمەنـد، گیانبــەخش نــاوی خــوای هێنــا و پــۆلاً دەوەنــی ڕاکێشــا بــەدوای خۆیــدا ویســتی بیباتــە ســەری مەیــدان ئینجــا ســەری بــبڕێ، بــەلاّم پــۆلاً دەوەن عــەیاری هــەبوون دزیانــەوە لــە گیانبــەخش، گیانبــەخش کــە ئــاوڕی دایــەوە پــۆلاً دەوەنــی پــێ نــەما بـوو، زۆر خەفـەتی خـوارد و شـەکەت و مانـدوو بـوو ڕووی کـردە بـاخ و باخاتێـك کـە لەناویـدا قەلاّینچـەیەکی لـێ بـوو لـە ناویـدا کچـێکی لـێ هاتـە دەرێ و گیانبـەخش داوای ئـاوی لـێ کـرد، پرسـیاری کـرد کچـەکە لـە گیانبـەخش بۆچـی هاتوویتـە ئـەو نـاوە ؟ گوتی مـن پاڵـەوانم هـاتووم سـەری پـۆلاً دەوەنـی ببڕم، کچـەکەش یـاری پـۆلاً دەوەنـی بـوو بۆیـە زۆر ڕقـی لـە گیانبـەخش هەسـتا و دەرمـانی خسـتە نـاو ئاوەکـەی و دەرمـان داوی کـرد، گیانبـەخش بێهـۆش بـوو، کچـەکە گیانبەخشـی هێنـا و سـەری شـکاند و دەسـتی بەسـتن و لـە پشـتی ولاّغەکـەی بەسـتن و بـە دیـاری بـردی بـۆ پـۆلاً دەوەنـی، کچـەکە بـە پـۆلاً دەوەنـی گـوت: هـا تـۆ چـەند ڕۆژە دەرقـەتی نـەهاتی بـەلاّم مـن بەیـەك دەقـە بەسـەری شـکا و دەسـتی بەسـتراو بـۆم هێنـای، پـۆلاً دەوەن بـە کچـەکەی گـوت: بـڕۆ مـن تـازە حاشـا لـەتۆ دەکـەم، مـن تـازە تـەرکی هـەموو شـتێکی تـۆ دەکـەم، بۆچـی ئـەو کـارە نابەجێیـەت ئەنجامـدا؟ چـونکە مـن نەمویسـت بـە دەرمـان لـەناوی بـەرم ئەگـەر بمویسـتبایە بـە دەرمـانی لـەناوی بـەرم ئـەوا خـۆم لـەناوم دەبـرد کـە نـانی لـە مـاڵی مـن بـۆ حـازر کـراوە، پـۆلاً دەوەن یەکسـەر هەسـتا مــەجلیس و پیــاوانی خــۆی کــۆکردەوە و گــوتی: چ لــە گیانبــەخش بکــەین؟ خــۆ ئەگـەر ڕۆسـتەم بزانـێ گشـتمان دەکـوژێ، یـەکێك لـە وەزیرەکـانی گـوتی: لـە پشـتی ولاّغەکـەی نەکەینــەوە ڕەوانــەی مەنتیقــەی (عەبـدوڵلاّ پاشـا)ی کـەن، کـە ولاّتێکـی تـر بـوو، دەسـت بـەجێ بـە قسـەیان کـرد و ڕەوانـەی ئـەو ولاّتـەیان کـرد، کـە ولاّغەکـە لـەو ناوچــەیەدا خــۆی کــرد بــەناو قەلاّبنچــەیەکەوە کــە قەلاّبنچــەکە لەناوچــەیەکی چـۆڵدا بـوو، قەلاّبنچـەکە هـی کچـی (عەبـدوڵلاّ پاشـا) بـوو کـە بەتـەنها لەناویـدا دەژیـا، کــە بــابی دەیویســت بــە تــۆبزی و نابــەدڵی بیــدات بــە کــوڕی (قــەلاّلی فــەرەنگ) ئــەویش بــەوە ڕازی نــەبوو بۆیــە جیــا بــۆوە لێیــان، کچـەکە نـاوی گـوڵ (خەنـدەران) بـوو، کچـەکە واتـا (گـوڵ خەنـدەران) کـە سـەیری کـرد کوڕێـك لەسـەر

ولاغێکـە دەسـت و قاچـی بەسـتراوەتەوە و مـردووە، بۆیـە یەکـەمجار کچـەکە حەپەسـا و سـەیری کـرد دواتـر بـە تـیری عەشـق گرفتـار بـوو و بۆیـە لەسـەر ئەسـپەکەی هێنایـە خـوارەوە بـۆ سـۆی بـەبن کـونی لوتـدا کـرد بۆیـە بـەهۆش خـۆدا هاتـەوە و گـوتی: کـوا دوژمـنم؟ ئـەویش گـوتی: دوژمـنی چـی؟ تـۆ کێـی و لـە کـوێ هـاتووی؟ گـوتی مـن نـاوم (گیانبەخشـە) ڕووداوەکـەی ژیـانی بـۆ گێڕایـەوە، (گیانبـەخش) گـوتی: ئـەی تـۆ بـە تـەنها چـی دەکـەی لـەناو ئـە قەلاّبنچـەدا؟ گـوتی مـن لـە ترسـی بـە شـودانی بـەزۆر هـاتووم بـۆ ئێـرە بـاوکم ویسـتی بمـدات بـە کـوڕی (قـەلاّی فـەڕەنگ) بۆیـە مـن بـە تـەنها کەوتمـە دوژمنکـاری ئـەوان و لەگـەڵ سـوپای ئـەوان شـەڕ دەکـەم، (گیانبـەخش) عاشـقی (گـوڵ خەنـدەران) بـوو ئـەویش تـیری عەشـق لێیـدا بۆیـە بڕیاریانـدا کـە بـبن بـە ژن و مێـردی یـەکترو (گیانبـەخش) بـە (گـوڵ خەنـدەران)ی گـوت: خـەمت نـەبێ سـبەینێ تـۆ وەرە سـەربانی قەلاّبەنچـەکە و سـەیری دەسـت و قەڵـەمی مـن کـە، بـەلاّم پێـی گـوت: تـۆ مانـدووی مـن بەتـەنها خـۆم بەرهەڵسـتیان دەکـەم. بـەلاّم گیانبـەخش بـە قسـەی نـەکرد و بـەیانی هاتـە مەیـدان و لەشـکری قـەلاّی فـەڕەنگی تێـك شـکاند، ئـەو خەبـەرە گەیشـتە (عەبـدوللاّ پاشـا) کـە پاڵـەوانێك پەیـدا بـووە و لەشـکری قـەلاّی فـەڕەنگی تێـك شـکاندووە، دەسـت بـەجێ (عەبـدوللاّ پاشـا) هـات بـۆ قەلاّبنچـەکە و داوای لێبـوردنی لـە کچـەکەی کـرد و گـوتی: دەتـدەم بـەم پاڵەوانـە کچـەکەش گـوتی: خۆشمـان بڕیارمـان داوە گـەر بـبین بـە هاوسـەری یـەکتر بۆیـە بەشـەرعی خـۆلی لـە گیانبەخشـی مـارە کـرد، ماوەیـەکی زۆر لـەناو قەلاّبنچـەکە ژیانیـان بەسـەر دەبـرد کـار و پیشـەی گیانبـەخش ڕاو بـوو، کـوڕی قـەلاّی فـەڕەنگ کـە لاواز و سـیس و نـەخۆش بـوو کـە بـەتیری عەشـقی گـوڵ خەنـدەران گرفتـار بـوو بـوو، بۆیـە (قـەڕاری فـەڕەنگ) دەیگـوت هەرکـەس ئـەو کیـژەم بـۆ کوڕەکەکـەم بهـێنێ حـەوت جـار بـە زێـڕ و حـەوت جـار بـە زیـو هـەڵی دەکێشـم، کـەس نـەیتوانی بـەلاّم پیرەژنێـك گـوتی: مـن ئـەو کـارە دەکـەم حـەوت جـار بـە پەتکـە گـوریس هـەڵم کێشـن، پـیرەژن داوای چـەرخ و فەلـەکێکی لـە قـەڕاری فـەڕەنگ کـرد ئـەویش بـۆی ئامـادە کـرد و سـواری بـوو هـەڵی سـوڕاند و هـەتا گەیشـتە مەنتیقـەی (عەبـدوللاّ پاشـا) نزیـك قەلابنچـەکە و لـەوێ چـەرخ و فەلەکەکـەی شـارەوە و لـەوێ ڕووی کـردە قەلاّکـە و بـۆ لای گـوڵ خەنـدەران و ئـەویش پێـی گـوت: پیرەدایـی مـن میـوان ڕانـاگرم، پـیرەژن وتـی: ڕۆڵـە مـن لەبـەر خـاتری تـۆ دەمێنمـەوە بـە تـەنهای، بـەلاّم ڕێگـای پـێ نـەدا و دەری کـردە دەرێ، پـیرەژن لـە گەڕانـەوەدا چـاوی بـە گیانبـەخش کـەوت، گیانبـەخش گـوتی: پـیرە دایـی بـۆ کـوێ دەچـی؟ گـوتی لـەو قەلاّبنچـە بـووم بـەلاّم ئافرەتەکـە ڕای نـەگرتم، گـوتی بگـەڕێوە مـاڵ مـاڵی خۆتـە، لـە دوا

خـۆی سـواری کـرد لـە مـاڵیّ گـوڵ خەنـدەران زۆر پێـی نـاخۆش بـوو بـەڵام (گیانبـەخش) گـوتی ئـەو پیرەژنـە بـیّ دەسـەڵاتە چـی لـە دەسـت دیّ زۆر هـەژار و لـیّ قـەوماوە بـا ئـەو شـەو رایگـرین، پیرەژنـە مـەکر بازەکـە شـەو زۆر خـۆی خۆشەویسـت کـرد بـەیانی گـوتی: دەرۆم ئـەوانیش زۆر لـە لایـان خۆشەویسـت بـوو نـەیان هێشـت بـڕوا گوتیـان داپـیرە تـۆ ماڵەکـەت ئـاوەدان کـردووە بۆیـە پـیرەژن مایـەوە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ ڕۆژێـك بـە گـوڵ خەنـدەرانی گـوت: بـا بچـین شـیو و کـوڵ بکـەین لەسـەر چـۆم و خـۆت ئـارایش و جـوان بکـە، چـونە سـەر چـۆم و ئیشـەکەیان تـەواو کـرد و دوای چـەرخ و فەلـەکی هێنایـە دەریّ گـوتی: بـا سـواری چـەرخ و فەلـەق بـین بـۆ مـاڵیّ زوو دەمانگەیـەنیّ (گـوڵ خەنـدەران) نـەیزانی فێڵـی لـیّ دەکـات بەیەکـەوە سـوار بـوون، گـوتی: پـیرەدای ئـەوە چـم لـیّ دەکـەی؟ گـوتی: دەتبـەم بـۆ کـوڕی قـەڕاڕی فـەڕەنگ، گـوڵ خەنـدەران دەسـتی بـە گریـان کـرد و گـوتی: تخـوا لەگـەڵ گیانبـەخش لـە یـەکمان مەکـە، ئـەو کـارە مەکـە، کەچـی پـیرەژن بـە گـوێی نـەکرد و بـردی بـۆ شـاری قـەڵاڵی فـەڕەنگ، کـە گەیشـتنە ئـەویّ گـوڵ خەنـدەران هـاواری کـرد! گـوتی نـابیّ هـیچ کـەس بـۆ لای مـن بـیّ مـن خـۆم دەکوژم بۆیە لە ژوورێکیان کرد و حەرەسیان بۆ دانا.

ئینجـا پـیرەژن گـوتی: دەچـم گیانبەخشـیش دێـنم بـەڵام دەبـیّ چـل پاڵـەوان حـازر بـیّ بـۆ ئـەوەی ٤٠ گـورزی لـیّ بـدەن چـونکە ئەگـەر بێـت و بـە دەسـت بـیّ ئـەوا هـەموو شـاری قـەڵاڵی فـەڕەنگ ئیبـادە دەکـات، پـیرەژن گەڕایـەوە قەڵابنچـەکە بـەڵام گیانبـەخش نەگـەڕابۆوە لـە ڕاو کـە گەڕایـەوە گـوتی: پـیرەدای ئـەی گـوڵ خەنـدەران لـە کوێیـە؟ گـوتی کـوڕی خـۆم چـووین بـۆ سـەر چـەم بـۆ شـیو شـتما لەبیرچـوو گەڕایـەوە بـۆ شـتەکان بۆیـە پیرەژنـە زۆرزانەکـە گیانبەخشـیش بـە سـەهو دەبـات و سـواری چـەرخ و فەلـەقی دەکـات، گیـان بـەخش دەڵـیّ ئـەوە چـم لـیّ دەکـەی؟ گـوتی گـوڵ خەنـدەرانم بـرد بـۆ کـوڕی قـەڵاڵی فـەڕەنگ تـۆش دەبـەم بـۆ سـەر بـڕین مژدەت لـیّ بـیّ، گـوتی ئـای پـیرەدای! خـوا بتگـریّ نـەت هێشـت ژیـان بەیەکـەوە بەرینـە سـەر، بـردی بـۆ شـاری قـەڵاڵی فـەڕەنگ چـل پاڵـەوان ئامـادە بـوون لەگـەڵ دابـەزی چـل گـورزی لـیّ بـدەن، بـەڵام گـوڵ خەنـدەران تـەکلیفی کـرد، گـوتی: تـا چـل شـەوی کـە مـەیکوژن بۆیـە نـەیان کوشـت، بـەڵام هـەڵیان دایـە مغێریەکـەوە بەرداشـێکیان لـە دەرگاکـەی دانـا و چـل پاڵەوانیان کردە حەرەس.

بێینـەوە سـەروکاری بـاوکی گیانبـەخش کـەناوی ڕۆسـتەم بـوو، شـەویّ خـەونی بـینی پێـی وابـوو گـڕ لـە زاری دێتـە دەر، دایکـی گیانبـەخش گـوڵی بـۆ کردبـوون هـەر کـاتیّ گوڵـەکان سـیس بـوون ئـەوا حـاڵی گیانبـەخش خراپـە بۆیـە گوڵـەکان سـیس ببـوون و

خەریك بوو هەڵدەوەرین، بۆیە ڕۆستەم بەیانی چوو بۆ لای باوکی کە ناوی (زاڵ) بوو گوتی بابە خەونێکی ناوایم بینیوە، گوتی ڕۆڵەکەم کورت بە دەرەوە نییە؟ وتی گیانبەخش چووە سەری پۆلا دەوەنی بهێنێ بەڵام نەگەڕاوەتەوە، گوتی: ڕۆڵەکەم برۆ بە دوایدا تاکو ئێستا ماوە بەڵام گیانی لە خەتەردایە، ڕۆستەم هاتەوەماڵەوە و بیریان کردەوە کە بە تیجارەت بچین بە دوای، بۆیە چەندین کەلوپەلی گرانبەها و وەزن سوکیان بارکرد و ڕۆیشتن بەرە و مەنتیقەی پۆلا دەوەن لەسەر کانی و ئاوێك خستیان بەیانی سۆفیەك هات بۆ نوێژ بۆ سەر ئاوەکە، ڕۆستەم گوتی: دەچم بۆ لای سۆفیەکە داخوا خەبەرێك وەرناگرم، ڕیشی سۆفی گرت و پێی گوت: ئەو گیانبەخشەی هات بۆ ئێرە سەری پۆلا دەوەنی بهێنێ چی لێ هات؟ ئەویش گوتی ڕدێنم شل کە با قسەت لۆ بکەم من ئەوەندە دەزانم کە بە مردوویی ڕەوانەی ناوچەی عەبدوڵلا پاشا کراوە هیچی تری لێ نازانم، گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی و گوتی ئەمن ئەوەندە زانیاریم وەرگرتووە، دایکی گیانبەخش هەندێ زێڕ و زیوی هەلگرت و گەیشتە ئەو قەڵایەی کە کچەکە (گیانبەخش)ی دەرمان داو کرد، کە چووە قەڵاکە گوتی بە کچەکە تۆ زێڕ ناکڕی ئەویش گوتی من زێڕم بۆچییە خۆشەویستەکەم لێم عاجزە، ئەویش گۆتی بۆ عاجزە؟ گوتی پاڵەوانێك هەبوو ناوی گیانبەخش بوو چەند ڕۆژێك مەیدان بازی کرد لەگەڵ پۆلا دەوەن کە پۆلا دەوەن خۆشەویستم بوو بەڵام من ئەو پاڵەوانەم لەبەر خاتری پۆلا دەوەن دەرمان داو کرد و بردم بۆ پۆلا دەوەن پۆلا دەوەن زۆر پێی ناخۆش بوو لەسەر ئەوە لێم تورە بوو، کە پاڵەوانەکە ناوی گیانبەخش بوو. پۆلا دەوەنیش بەڕێی کرد بۆ شاری عەبدوڵلا پاشا، دایکی کە گوێی لەو قسانە بوو یەکسەر کچەکەی گرت و لاقی لەسەر لاقی لێکی هەڵقەلاشت.

دوایی یەکتریان گرتەوە و ڕۆیشتن بۆ مەنتیقەی (عەبدوڵلا پاشا) لەوێ (عەبدوڵلا پاشا) مەسەلەکەی بۆ گێڕانەوە کە چی بووە و چی نەبووە. عەبدوڵلا پاشا پێی گوتن چەند لەشکر و پاڵەوانتان دەوێ بۆتان ئامادە دەکەم ئەوانیش گوتیان نا ئێمە بە شێوەی تجارەت دەچین چونکە ئەگەر بەو شێوە نەچین لەناوی دەبەن، بۆیە لەوێ کەوتنە ڕێ بەرەو شاری قەڵای فەرەنگ، بەڵام ڕۆستەم ئامۆزایەکی هەبوو کە بە ڕۆستەمی یەك دەست ناسرا بوو کە ماڵی لەو ناوچەیە بوو کە دایك و باوکی گیانبەخش پیایدا تێدەپەڕین، ڕۆستەمی یەك دەست کە ڕۆستەم بە منداڵی دەستێکی شکاند بوو گاڵتەیان کرد بوو بەیەکەوە، بۆیە دەترسا کە لەگەڵی بەشەڕ بێت، ڕۆیشتن بە مەنتیقەکەی ڕۆستەمی یەك دەست و ڕۆستەم گوتی بڕۆن گیا

بێنن بۆ ئەسپەکان، چون بۆ ناو باخەکە ئەو بخەکە هی ڕۆستەمی یەك دەست بوو، ڕۆستەمی یەك دەست گوتی ئێوە پیاوی کێن؟ گوتیان پیاوی (ڕۆستەمی مازندەرانین) ناردوونی بۆ گیا بۆ ئەسپەکان بۆ خزمەت جەنابیشت و داوای لێبووردنی لێ کردوی بەرامبەر بەوەی کە دەستی شکاندووی، ئەویش گیایەکی زۆری کۆکردەوە و بۆی برد و ئاشت بوونەوە، ڕۆستەم بەسەرهاتی کوڕەکەی بۆ ڕۆستەمی یەك دەست گێڕایەوە، بۆیە ڕۆستەمی یەك دەستیان لەگەڵ کەوت ڕۆیشتن بۆ شاری قەڵای فەرەنگ، لەناو باخ و باخاتێك بارگەیان خست و دایکی گیانبەخش گوتی: من دەچم بۆ ناو شار داخوا خەبەرێك وەردەگرم یان نا هەندێك بازن و گوستیلەی خستە سەر سینی و بەناو شاردا بەو شوێنەیدا گوزەر کرد کە (گوڵخەندەران) تیایدا سجنە، ویستی بچێ بۆ لای بەڵام حەرەسەکان گێڕایانەوە (گوڵخەندەران) داوای لە حەرەسەکان کرد کە ڕێگای پێ بدەن بۆیە ڕێگایان پێدا (دایکی گیانبەش) لەبن پەنجەرەکە گوستیلەو بازنی بۆ ڕاگرت گوتی ناکڕی؟ ئەویش ئاخێکی بۆ هەڵکێشا و فرمێسك لەچاوی دەباری وەك بارانی بەهار (دایکی گیانبەخش) گوتی بۆ ئاخ؟ ئەویش گوتی من خۆشەویستم خەریکە لەناو دەچێ بۆچیمە ئەو شتانە. گوتی خۆشەویستت کێیە؟ گوتی گیانبەخشە. گوتی گیانبەخش کوڕی منە هاتووین ڕزگارتان بکەین.

(گوڵخەندەران) ویستی فێڵ لە حەرەسەکان بکات، گوتی: ئێوە بخەون با ئیسراحەت بکەن بۆ کوشتنی (گیانبەخش) و منیش بەرن بۆ کوڕی (قەڵای فەرەنگ) منیش چاك بوومەوە، بەڵام با ئەو پیرەژنە هاتوچۆی لای من بکات ئەوانیش بەقسەیان کرد.

دایکی گەڕایەوە بۆ لای ئەوانی کەو بەسەرهاتەکەی (گوڵخەندەران)ی بۆ گێڕانەوە، ڕۆستەمی یەك دەست گوتی: منیش هەردەچم بۆ ناو شار و هەواڵێك وەردەگرم، ڕۆستەمی یەك دەست بەو شوێنەدا گوزەری کرد کە گیانبەشی تیادا حەشار دراوە، ڕۆستەمی یەك دەستیش بۆ ئەوەی هیچ گومانی لێ نەکەن تەپڵی لەگەڵ خۆی برد و بۆ ئەوەی خەڵکەکە دەوری مغریەکەی گیانبەخشی تیادا بوو گوتیان وەرە تەپڵن بۆ لێدە، ئەویش گوتی نا بەدوای کاری خۆمدا دەگەڕێم، ئەوانیش گوتیان وەرە هەقی خۆت دەدەینێ، ئەویش گوتی: بەو مەرجەی کە ئاوم گێڕا هەمووتان بیخۆنەوە، گوتیان باشە، خوێیەکی زۆری بۆ لە چێشتەکەیان کرد بۆ ئەوەی زۆر تینو ببن، دەرمانی بۆ کردنە ئاوەکەوە ئاوی گێڕا هەموویان ئاویان خواردەوە زۆر تینو بوو بوون چێشتەکە زۆر سوێر بوو، هەموویان بێهۆش کەوتن و مردن هەر چلی

سەر بڕین، دوایی چوو بەردە گەورەکەی سەر بیرەکە لابیات ئەوەی گیانبەخشی تیادا بوو بەڵام چونکە دەستێکی هەبوو بۆی لانەچوو، ناچار گەڕایەوە بۆ لای ئەوانی کەو گوتیەک کارێکی وام کردووە بەڵام بەرداشەکەی سەر میغیورەکەم بۆ لا نەچووەو دوایی ئەوانیکە هاتن و باوکی گیانبەخش بەردەکەی لابرد و کەمەندیان بۆ گیانبەخش هاوشتە خوارێ، گوتیان وەرە سەرێ، گوتی نایەم بۆ ئەوەی بمکوژن ڕۆستەم گوتی: کوڕە شیرینەکەم من بابی تۆم، ئەویش گوتی من لەشم زنجیر کراوە ڕۆستەم گوتی: ئەگەر کوڕی باوکی خۆت بی زنجیرەکان دەپسێنیو زنجیرەکانی پساند و هاتە سەرێ و بەیەك شادبوونەوە وەك سێ پاڵەوان دەرکەوتن و دەستیان گرت بەسەر شاری قەڵای فەرەنگ و خەڵکە تاوان کەرەکەیان لەناو برد و ڕۆستەمی یەك دەستیان کرد بە پاشای شارەکە و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ منتیقەی پۆلا دەوەن گوتی: من هاتووم بۆ سەری پۆلا دەوەن هەردەبێ سەری ببڕم، بۆیە (دایك و باوکی گوڵخەندەرانی خێزانی) کە هاتە دەر لە سجنەکە داوای کرد کە واز لەو کارە بهێنێ بەڵام بە گوێی نەکردن بۆیە بەرامبەر بە پۆلا دەوەن تاوڵی هەڵدا و دیسان بۆ چەند ڕۆژێك پاڵەوان بازی دەستی پێ کردەوە، سەرەنجام پۆلا دەوەن کەوت و گیانبەخش سەری بڕی و بە بەردەم بابیدا ڕای کێشا و لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی گەڕایەوە شاری خۆیان و سەری پۆلا دەوەنی بڕی.

**= بەسەرهاتی ڕۆستەمی زاڵ ڕیشەیەکی کۆن و مێژوویی هەیە، ئەم گێڕانەوەیە، جیایە لەگەڵ زۆر دەقی تر کە هەر باس لە ڕۆستەم دەکات و لەگەڵ (شاهنامەی فیردەوسی)یش وەکو ئەو نییە، ڕەگەزی نوێی و ئیسلامی تێکەڵ کراوە، بەوەی کە (عەبدوڵڵا پاشا)یەك دێتە نێو کەسایەتیەکان و = باسی نوێژ =ی ئیسلام دەکات، کە بەسەرهاتی ڕۆستەم زۆر پێش هاتنی ئاینی ئیسلامە، هەرچەندە بەسەرهاتی ڕۆسەم زۆرتر ڕەگەزی ئازایەتی و پاڵەوانی تێدایە، بەڵام، ئەم دەقەش ڕەگەزی ئەفسانەی تێدایە. بۆ نموونە بوونی چەرخ و فەلەك.... .**

# حەسەنی بەسیر

کۆکردنەوەی: محەمەد مەحموود حوسێن
هەڵکەوت عەبدالرحمن سەعید
گێڕانەوەی: محەمەد مەحموود حوسەین قادر
مەوالید ٣٢، خوێندەواری نییە  دانیشتووی خۆشناوەتییە (بێتواتە)

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، کەس لە شەیتان ڕوو ڕەشتر نەبوو، کۆسە مرد کفنی نەبوو، هەڵیان گرت جێگەی نەبوو، دایان گرت ڕێگەی نەبوو، خستیانە تاق چاوی بوو بە زاق، خستیانە بنمیچ ڕانی چووە بەریچ....

حەسەن کوڕێك بوو تەمەنی (١٤)ساڵان بوو لەگەڵ دایکێکی پیر ئەژیا، ئیشی حەسەن ڕۆژانە ئەچوو بۆ چیا و کێوەکان داری ئەهێنا کۆڵە پشت ئەی فرۆشت جا بە قرانێ بوایە یان دوو قران... جوولەکەیەك لە ئاواییەیان بوو (زێڕینگر) بووە بە ناوی (أفرایم) بە حەسەنی وت: بۆ نایێی لەگەڵ من کار بکەی واز لەم ئیشە بهێنە ڕۆژانە (٣) قرانت دەدەمێ، حەسەن وتی: با پرسێك بە دایکم بکەم (أفرایم) وتی: باشە، دایکیشی بە حەسەنی وت ئارەزووی خۆتە کوڕم، حەسەن بڕیاریدا کار لەگەڵ (أفرایم) بکات، هەفتەیەك لای (أفرایم) مایەوە ڕۆژانە (٣) قرانی وەرئەگرت، ئینجا (أفرایم) بە حەسەنی وت دەبێ بەڕێ کەوین چونکە هەوێنی زێڕمان نەماوە واتا دەرمانی زێڕ حەسەن بە (أفرایم)ی وت لەکوێ هەوێنی زێڕ بێنین (أفرایم) وتی تۆ حەقت نەبێ، بڕۆ هەندێ خواردن و کەرەستەکان ئامادە بکە با بڕۆین، ئیدی بە بەیانی زوو حەسەن و (أفرایم)ی جوولەکە ملی ڕێگایان گرت بەروو هەتا گەیشتنە شوێنی مەبەست کە ئەویش بەحرێك بوو لە ناوەڕاستدا شاخێکی تێدا بوو (أفرایم) بە حەسەنی وت ئەم کەرەستانە بێنە یەك لە کەرەستەکان پیستێکی گیانداران بوو (أفرایم) بە حەسەنی وت خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی بچیتە سەر ئەم شاخە... حەسەن خۆی ئامادە کرد (أفرایم) بە حەسەنی وت: بچۆ بۆ ناو پێستەکە، بە حەسەنی وت چاوت بنوقێنە سحرێکت پێ دەکەم بە کاتێکی کەم دەچیتە سەر ئەم شاخە، بەڵێ ئەوەی (أفرایم) وتی هەروا بوو حەسەن گەیشتە سەر شاخەکە، حەسەن خۆی لە پێستەکە دەرهینا واتا بە چەقۆیەك لەبەر خۆیدا دڕی... . حەسەن بانگی (أفرایم)ی وەستای کرد وتی: چی بکەم؟ (أفرایم) وتی: جارێ

بگەڕێ بزانە چی لێیە؟... حەسەن زۆر گەڕا تاکو هیلاك بوو، بە (أفرایم) ڕاگەیاند هەدێ ئێسقان و کەللەی سەری مرۆڤ و گیاه لەگەڵ ئەوەی مەبەست بوو واتا (هەوێن)ی زێڕی، حەسەن هەوێنی زێڕی بۆ (أفرایم)ی فڕێدا، دوای تەواو بوونی کارەکەیان حەسەن بە (أفرایم)ی وت: من چی بکەم چۆن بێمە خوارێ؟ (أفرایم) بە حەسەنی وت تۆ (١٠١) سەدو یەکەمین کەسی کە لە شوێنی تۆدا بووە ئەم هێناوەتە خوارەوە، حەسەن زۆر داوای لە (أفرایم)ی جوولەکە کرد بم هێنە خوارێ کوڕە پیاوی چاك بە من شاگردی تۆم گەر بەزەیشت بەمن نایێ بەزەیت بەو داکە پیرەم کەسێ شك نابا لەمن زیاتر، ئیدی حەسەن زۆر تکای کرد (أفرایم) گوێی پێ نەدا... وتی چونکە ئێمە جوولەکەین ئێوە مسوڵمانن ئێمە دوژمنی ئێوەین. ئەمە بوو جوولەکەکە حەسەنی بە داماوی بەجێ هێشت... حەسەن زۆر برسی بوو نەیزانی چی بکا... دوایی لە برسا کەوتە گیا خواردن تاکو (٤) (٥) ڕۆژ لەوێ مایەوە... ئیتر حەسەن جامی سەر لێوان لێو بوو، وتی: ناتوانم لێرە بمێنمەوە حەسەن بڕیاریدا خۆی فڕێداتە ناو دەریاکە وتی: هەر نەبێ ماسییەك بمخوا نەبادا لە برسا بمرم، کاتێ حەسەن خۆی فڕێدا ناو دەریاکە لە هەمان کاتدا ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵی کرد لەگەڵ شەپۆلەکان حەسەنی فڕێدا بۆ سەر وشکانی دوای ئەوەی حەسەن بە ماندوویی هەڵسا ملی ڕێگای نادیاری گرت، حەسەن کاتێ بینی خانویەکی سپی لێوە دەرکەوت بەرەبەرە بە ماندوویی لە خانووەکە نزیك بۆوە بزانێ کەسی لێیە، کە بینی ئافرەتێکی لێیە، ئافرەتەکە هاتە لای و گوتی: تۆ چی دەکەی لێرە لەم چۆڵەوانیە؟ حەسەنیش وتی: جارێ زۆرم برسییە پێخۆرێکم بۆ حازرکە ئەوکات هەموو شتێکت بۆ ئەگێڕمەوە... ئافرەتەکە خواردنی بۆ حەسەن هێنا بە حەسەنی وت کەم بخۆ چونکە زۆر دەمێکە خواردنت نەخواردیە، ئینجا حەسەن ئیسراحەتێکی وەرگرت دوایی هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ ئافرەتەکە گێڕایەوە، دوایی حەسەن پرسیاری کرد ئەی ئێوە چی دەکەن لێرە ئەویش وتی: ئێمە کچی پاشاین (٢) خوشك و برایەکین، من کە ناوم نووره (سەنایە) وە خوشکەکەی ترم نووره (هودە) برایەکەشمان سەفەری کردووە بە ناوی (مەشەد) دوای ئەوەی کە مەشەدی برایان گەڕایەوە.... هەرسێکیان بڕیاریاندا کە حەسەن لێرە بمێنێتەوە وە وتیان غەریبەیە و ئێمەش کاتی سەفەرمان هاتووەو چونکە هەموو ساڵ سەفەریان دەکرد، بە حەسەنیشیان وت تۆ لێرە بمێنەوە، حەسەن لەوێ مایەوە بە تەنها، وە دایك و باوکی ئەم دوو خوشك و

برایه له جەزیره بوون، بەر لەوەی بڕۆن کلیلی هەموو دەرگاکایان بە حەسەن دا تەنها هی دەرگایەك نەبێ، بەلأم حەسەن ئینکاری کرد وتی: دەبێ هی ئەو دەرگایەش بدەن بە من، وتیان حەسەن ئەم دەرگایە خەتەرە خراپە وتیان بە مەرجێ کلیلی ئەم دەرگایەت دەدەینێ نەیکەیتەوە، وتی: باشە، واتا ئەم دەرگایە هەموو خواردن و پێداویستیەکانی تیادایە، کاتێ حەسەنیان بەجێ هێشت حەسەن ماوەیەك زۆر بێتاقەت بوو، نوقمی خەیالأت بوو، وتی باشە ئەو دەرگایە چی بوو باسیان دەکرد خراپە، بەلأم حەسەن قسەکانی ئەوانی پشت گوێ خست و دەرگاکەی کردەوە سەیری کرد(٣) ئافرەت باڵدار لە دەرگاکە هاتنە دەرەوە، هەرسێکیان خوشك بوون، باڵەکانیان دانا و خۆیان فرێدایە ناو رووبارەکە واتە (حەوزێك) مەلەیان دەکرد، حەسەن کە بۆی ڕوانین ئاشقی خوشکە بچوکەکەیان بوو واتا باڵدارەکان، کاتی نووره (سەنا) و نووره (هودە) و براکەیان گەڕانەوە، حەسەن زۆر بیتاقەت بوو واتا گڕی عەشقی تێبر ببوو (نووره هودە) خوشکی بچوکیان بوو وتی هەبێ و نەبێ دەرگاکەی ئاخیری کردۆتەوە، بەڵێ حەسەن بەسەرهاتی دەرگاکەی بۆ گێڕانەوە، حەسەن داوای لێ کردن ئەبێ کارێکی بۆ بکەن، ئەوانیش وتیان بە حەسەن ئەوان باڵدارن ئێمە هیچمان بۆ ناکرێ، حەسەن زۆر ناڕەحەت بوو چوو بۆ سەربان کاتێ (أفرایع)ی جوولەکەی بینی پیاوێکی بەدوای خۆی داوە تاکو بەهەمان دەردی بەرێ، حەسەن خێرا هاتە خوارێ پەشۆکا بوو پێی وتن چ ئامێرێکتان هەیە ڕم، تیر، شیر، شیرێکیان هەبوو حەسەن بردی بۆ ئەوەی جوولەکەکە بکوژێ کاتێ لە (أفرایع) نزیك بۆوە، (أفرایع) وتی: ها حەسەن چۆنی باشی ها من ئەو پیاوەم بۆ تۆ هێناوە تاکو ڕزگارت بکەم، حەسەن گوێی بە (أفرایع)ی نەدا بەو شیرە (أفرایع)ی کوشت بەم پیاوەشی گوت بەشوێنی خۆتدا بگەڕێوە بەسەرهاتی بۆ ئەو پیاوە گێڕایەوە وتی: بگەڕێوە بۆ ئاواییەکەی خۆت... بەڵێ کەتبووە داوی عەشق زۆر تەئسیری لێ کردبوو، نووره هودە وتی: کارێکم بۆ کردووە ئەو کارەشی بۆ دەکەم، نووره هودە بە حەسەنی وت وەرە گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم، ئەم باڵدارانە سێشەممان دێن، تۆ خۆت لەم چاڵەدا مات کە منیش خۆم لەم دەرگایە دەشارمەوە کاتێ هاتن جلەکانیان دانا واتا باڵەکان واتا بۆ مەلەوانی هاتبوون یەکسەر حەسەن لەسەر جلەکانی ئەو کچە دانیشت کە مەبەستی ئەو بوو کاری حەسەن بەم شێوەیە ڕێ بەجێ بوو، خوشکەکانی تری هەلأتن (نووره هودە) هاتن جلێکی تریان لەبەر (خۆشەویستەکەی حەسەن)

کـرد هێنایانــە ســەر دەســتووری خۆیــان، دوای ماوەیــەك حەســەن (٢) منــداڵی لــێ بــوو... لــە پــاش ئــەوە حەســەن و خێزانەکــەی و منداڵــەکانی گەڕانــەوە بــۆ لای دایکــە پیرەکــەی، کــاتێ حەســەن لــە دەرگــای دا وتــی دایکــە دەرگــا بکــەوە مــن حەســەنم، کــاتێ دایکــی گــوێی لــە دەنگــی حەســەن بــوو دایکــی بــاوەڕی نــەکرد کــە چــاوی بــە حەســەن کــەوت خــەریك بــوو بــاڵ بگــرێ، هــەموویان بەیەکــەوە دەســتیان لە ملی یەکتر کرد و شاد بوون بە یەکتری.

- لــەم ئەفســانەیە و زۆر حەکایــەت و ئەفســانەی کــوردی و جیهــانی حەکایــەت لەسەر تــەماع و زێــڕ پەرســتی جــوو دامــەزراوە و جووەکــەش هــەموو ئامرازێك بـۆ زێــڕ بەدەســت هێنــان بــەکاردێنێ و هــەموو کــارێکیش دەکــات. لــە جادوگەرییــەوە تــا مــرۆڤ کوشــتن. کــە بەڕاســتی ئەمــە جێگــای ســەرنجە و شایســتەی بــەدوا داچــوونە، رەگــەزی ئەفســانە لــەم ئەفســانەیە زۆرە، بــەکارهێنانی ســحر و کچــی باڵدار و... .

# ژن

**کۆکردنەوەی: ئومێد ئەحمەد صالح**

**پێشەکی:.**

کاتێك خوای گەورە بڕیاری دروست بوونی ژیانیدا لەسەر زەوی دوو مرۆڤ لە دوو ڕەگەزی جیا دروست کرد و خستنیە سەر زەوی، من ئەمەویَ لێرەدا تەرکیز بخەنە سەر ڕەگەزی میَ کە خوا هیچ نیعمەتێکی لە نێر کەمتر نەداوەتیَ ڕەگەزی میَ هەر لە کۆنەوە لە سەرەتای ژیانەوە بەردەوام بوون و بەخێوکردنی کەوتۆتە ئەستۆ، بەلاَم هەندێك لە ئەندامانی ئەو ڕەگەزە بەجۆرێك دەژین کە ژیانی خۆیان و مێرد و بگرە تایفەیەکیش دەکەن بە دۆزەخ ئەویش بەهۆی زمان و هەلَس و کەوتەوە، من لەم بابەتەدا دوو چیرۆکی فۆلکلۆری ئەفسانەیی ناو خەلَکم بیست کە لە کۆنەوە دەگێڕنەوە و بەشێوازی جیا تەعبیری لیَ دەکرێت حەزم کرد لەم ڕاپۆرتەدا بیانخەمە ڕوو.

ڕاپۆرتەکەی من لە دووچیرۆکی ئەفسانەیی کۆنی کوردی پێکهاتووە کە لە باو و باپیرانەوە دەماودەم بیستراوە و منیش لە برای بەڕێزو خۆشەویستم کاك (بەختیار ئەحمەد) بۆی گێڕامەوە.

چیرۆکی یەکەم چیرۆکێکی ئەفسانەییە زیاتر خەون و میتافیزیکیا زالَە بەسەریدا، باس لە خراپ بوونی ژنێك دەکات لە ڕووی کۆمەلاَیەتییەوە بەهۆی زمانەوە کە مێردەکەی هەولَی لەناوبردنی دەدات.

چیرۆکی دووەم باس لە جیاوازی خێزان دەکات لە ڕووی بەختەوەرییەوە و ڕێزگرتن لە مێرد، ئەمەش فێرمان دەکات بۆ چۆنییەتی هەلَسوکەوت کردن لەناو خێزاندا.

ئەم دوو چیرۆکە ئامۆژگارییەکە بۆ ئەو ژنانەی کە لەگەلَ دەوروبەریان خراپن، وە لە ئەنجامی سەرنجدانی باو و باپیرانمان ئەم دوو چیرۆکە هاتۆتە بەرهەم.

## ئەژدیهای لە ژن ترساو!

ژن و پیاوێـك بەیەكـەوە سـالآنێكی زۆر دەژیـن لـەماوەی ئـەم چـەند سـاڵەدا ژنەكـە كارێـك دەكـات پیاوەكـە بكەوێتــە بیركردنــەوەی لــەناوبردنی ئــەویش بــەهۆی زماندرێــژی ژنەكــە، چـونكە پیاوەكـە پێـی وایـە كـە چارەسـەر بـۆ زماندرێـژی تـەنها لەناوبردنـە، ئـەنجامی ئـەم بیركردنـەوە وای لێدەكات كـە لـە باخەكـەی باوكیـدا لـەناوی بـەرێت تـا كـەس پێـی نـەزانێت، ڕۆژێــك پیاوەكــە بــە ژنەكــەی دەڵێــت وەخــتی بــەهارە و كــاتێكی خۆشــە بــۆ نەچــین سـەردانێكی بـاخی بـاوكم بكـەین و لـەوێش سـەیرانێكی خـۆش دەكـەین، ژنـەش ڕازیـدەبێت كە بچێت لەگەڵیدا.

بۆ بـەیانی دەچـن بـۆ باخەكـەی بـاوكی پیاوەكـە و لـە باخەكـەدا بیرێكـی لێیـە پیاوەكـە بـیر دەكاتـەوە كـە ژنەكـە بخاتـە نـاو ئـەم بـیرەوە تـا كـەس بـە تەرمەكـەی نـەزانێت و نـەیبینێت و ئاشـكرا بێـت، ژنـە بـانگ دەكـات بـۆ لای بیرەكـە بـۆ ئـەوەی یارمـەتی بـدات بـۆ هەڵكێشـانی سـەتڵێك ئـاو كاتێـك ژنــە نزیـك دەبێتــەوە لــە بیرەكـە پیاوەكـە پــاڵێكی پێـوە دەنێـت و دەیخاتـە نـاو بیرەكـە و كارەكـەی سـەر دەگرێـت. دوای سـێ ڕۆژ پیاوەكـە دەڵێـت بـۆ ئـەم ژنـەم كوشـت بـەزەیی پیایـا دێتــەوە بـیر دەكاتــەوە كـە بچـێت هـیچ نـەبێت مەیتەكـەی بێنێتـە دەرەوە بـەخاكی بسـپێرێ حـەبلێك دەبـات لـە پێشـدا حەبلەكـە دەخاتـە بیرەكـەوە و دەڵێـت ئەگـەر مابێـت دەسـت دەگرێـت بـەم حەبلـەوە حەبلەكـە شـۆڕ دەكاتـەوە بـۆ نـاو بیرەكــە و حەبلەكــە قــورس دەبێــت پیاوەكــەش بەرەبــەرە ڕای دەكێشــێت كاتێــك دەیهێنێتـە سـەرەوە سـەیر دەكـات كـە ئەژدیهایـەكی گـەورەی پێوەیـە لەوایـە فڕیداتـەوە بـۆ نـاو بیرەكـە ئەژدیهاكـە هـاواری لـێ بەرزدەبێتـەوە و دەڵێـت بـەس فـڕێم مـەدەوە نـاو ئـەم بیرە نەجاتم بـدە لـەم ژنـە بـێ حەیایـە چیت لـە دنیـا بـوێ بـۆت دەكـەم، پیاوەكەش دەڵێت تـۆ چـیت لەدەسـت دێـت؟ مارەكـەش دەڵێـت: مـن ئـەتوانم بتكـەم بـە میراتگـری پاشـا، دەچـم دەئـاڵێم لـە ملـی كچـی پاشـا بـە هـیچ شـێوەیەك لاناچـم، ئەوكاتـەش پاشـا بـڵاوی دەكاتـەوە كـە ئـەوەی ئـەم كچـەم بـۆ ڕزگـار بكـات دیـاری گـەورەی دەدەمـێ، تـۆش كـە ئەمـەت بیسـت وەرە بـۆ كۆشـكی پاشـای لەگـەڵ هاتیـە ئـەو ژوورەی كـە مـنی لێیـە مـن لـە ملــی دەبمــەوە بەمــەش تــۆ دیــاری گــەورە وەردەگــری، پیاوەكــەش ڕازی دەبــێ و نایخاتەوە ناو بیرەكە.

ڕۆژ دێ و دەچـێ، ڕۆژێـك قـاو كەوتـە شـارەوە كـە مارێـك لـە ملـی كچـی پاشـا ئـاڵاوە بـەهیچ شـێوەیەك لێـی نابێتـەوە پاشـا گوتوویـەتی ئـەوەی ئەمكچـەم بـۆ ڕزگـار بكـات كچـەكەمی پێشــكەش دەكــەم و دەیكــەم بــە میراتگــری خــۆم، پیاوەكــەش كــە ئەمــە دەبیســتێت دەچـێت بـۆ لای پاشـا دەڵێـت مـن دەتـوانم ئـەم كچـەت بـۆ ڕزگـار بكـەم. پاشـا دەڵێـت:

ئەگەر ئەم کچەت ڕزگار کرد کچەکەت پێشکەش دەکەم و دەتکەم بە میراتگری خۆم. پیاوەکە بەرەو ژووری کچە ومارە دەکەوێتە ڕێ وژوورەکەی پێ نیشاندەدەن هەر لەگەڵ دەرگا دەکاتەوە و دەچێتە ژوورەوە مارەکە لە کچەکە دەبێتەوە و دێتە خوارەوە بە پیاوەکە دەڵێت: من وەعدی خۆم بردە سەر بەلاّم جارێکی کە ئەم داوایەم لێ نەکەی چونکە وەعدی یەکجارم داوە، ئەگەر جارێکی کە هەواڵێکی وات پێگەیشت نەیەیت ئەمکارە دووبارە بکەیتەوە چونکە من و تۆ لێرە بەدواوە یەك ناناسین پیاوەکەش دەڵێت باشە و کچی پاشا دەبات بۆ خۆی و دەبێت بە میراتگری پاشا و لە کۆشکی پاشا دادەنیشێت و ژیانی دەکەوێتە خۆشییەوە و هەم ژنێکی تەڕ و تازە و هەم ماڵ و ملکی بەدەست هێناو لەگەڵ ئەوانەشدا نەجاتی بوو لە ژنە بێ حەیاکە، بەم شێوەیە ژیانی بەخۆشی و شادی بەردەوام دەبێت ڕۆژگار ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێنێت تا ڕۆژێك هەمان مار دەچێتە ملی کچە پاشایەکی ترەوە هەرچی دەکەن لە ملی نابێتەوە هەرچی ساحیر و جادوگەر و پاڵەوانە دەچێت مارەکە پێوەی دەدات و دەی کوژێت تا پەنا دەبەنە بەر ئەو پیاوەی کە کچی پاشایەکەی بەم شێوەیە ڕزگار کردووە، پیاوەکەش زۆریان پێ دەڵێ: کە ناتوانێت ئەم کارە بکات بەلاّم وازی لێ ناهێنن و دەیبەن بۆ کۆشکی پاشایەتی بۆ ڕزگار کردنی ئەم کچەش لە ڕێدا فێڵێی بۆ دەدۆزێتەوە کاتێك ئەو ژوورەی پیشان دەدەن کە کچە و مارەکەی لێیە دەچێتە ژوورەوە و مارەکە پیاوەکە دەبینێت پێی دەڵێ: من و تۆ هیچ پەیمانێکمان لەنێواندا نییە بۆیە بڕۆ و دوور بکەوە لێم، پیاوەکەش دەڵێت نەهاتووم لە ملی کچەکەت بکەمەوە هاتووم هەواڵێکی ناخۆشت بدەمێ، مارەش دەڵێ: چییە؟ پیاوەکە دەڵێ ژنە کۆنەکەم لە بیرەکە هاتۆتە دەر و کەس نازانێت لە کوێیە، منیش هاتووم پێت بڵێم ئاگات لە خۆت بێت، کە مارەکە گوێی لەم قسەیە بوو زۆر زوو لە ملی کچە دەبێتەوە و خۆی ون دەکات لەترسی ژنە بێ حەیاکە، بەم شێوەیە پیاوەکە ئەم کچەی تریش ڕزگار دەکات.

## ژنی باش!

دوو خێزان دەبن پەیوەندییان بەیەکەوە خۆش دەبێت خێزانی یەکەم ژنەکەی زۆر چاك دەبێت لەگەڵ پیاوەکەی. بەلاّم، خێزانی دووەم ژنەکەی بێ حەیایە و زۆر خراپ دەبێت لەگەڵ پیاوەکەی، ئەم دوو پیاوە لەهەر جێیەك کە یەك دەبینن و دادەنیشن بەیەکەوە، ئەم دەڵێت: ژنی من باشترە! ئەویش دەڵێت ژنی من باشترە! پیاوی یەکەم بۆ ئەوەی دەری بخات کە ژنی ئەم باشترە ڕۆژێك خێزانی دووەم دەعوەت دەکات بۆ ماڵەوە، ئێوارە کاتێك هەردوو پیاو دەچنەوە بۆ ماڵی پیاوی یەکەم لە ڕێدا بە پیاوی ساحێب ماڵ دەڵێت با شوتییەك بکڕم و بیهێنم. یەك شوتی دەکڕێت و

دەیهێنێت، بەیەکەوە دەچنەوە ئێوارە هەردوو خێزان نان دەخۆن و بۆ شەوچەرە پیاوەکە داوا لە ژنەکەی دەکات کە شوتییەکە لەت کات و بیهێنێت ژنەکە شوتییەکە لەت دەکات و سەیر دەکات سپیە واتە نەگەیشتووە. جوان قاشی دەکات و دەیخاتە سەر سینی و دەیهێنێت بۆ میوانەکان و دایدەنێت پیاوەکەی سەیری دەکا و دەڵێت ژنەکە ئەم شوتیە جوان نەگەیشتووە لایبەو شوتیەکەی تر لەت بکە، ژنەکەش بیێ ئەوەی بڵێت تۆ یەك شوتیت هێناوە ئەویش سپی بووە ئیتر شوتی چی لەت کەم، دەچێت لە ژووری تر هەمان سینییە شوتی بەشێوەیەکی تر دایدەنێتەوە و ئامادەی دەکاتو دەیباتەوە دایدەنێت پیاوەکە لێی دەخوات و دەڵێت ئەمیش باش نییە شوتی سپیەمیان لەت بکە دووبارە ژنەکە بەهەمان شێوەی جاری یەکەم دەیباتەوە و بەجۆرێکی کە ئامادەی دەکات و دەیهێنێت بۆ میوانەکان پیاوەکە لێی دەخوا و بۆ چوارەم جار پێی لا دەبا و ژنەکەش هەر ئەو شوتیەیە دەیرازێنێتەوە و لە سینیەکی تر دایدەنێتەوە پاشان پیاوەکە دەیخۆن شەو دەبەنە سەر و میوانداری تەواو دەبێت دوو پیاوەکە دیسان دەکەونە قسەکردن لەسەر ژنەکانیان ئەم دەڵێ ژنی من باشە ئەو دەڵێ ژنی من باشە، پیاوی خێزانی یەکەم بۆ ئەوەی بۆی دەرخات ژنی ئەم چەند باشە پێی دەڵێ ئێمە کاتێك ڕۆیشینەوە بۆ ماڵی خۆمان چەند شوتیم کڕی پیاوەکە دەڵێت یەك، پیاوی خێزانی یەکەم دەڵێت ئەی شەو چەند شوتی لەت کرا پیاوەکە دەڵێت چوار، پیاوی خێزانی یەکەم دەڵێت نەخێر یەك شوتی لەت کرا من بەو ژنەی خۆمم دەگوت ئەم شوتیە باش نییە شوتیەکەی تر بێنە هەر یەك شوتی بوو نەی دەگوت شوتیمان نییە و هەر ئەمەیە. دەیبرد بەشێوەیەکی تر دایدەنا و دەیهێنایەوە بۆ ئەوەی میوانەکەی هەست نەکات کە هەمان شوتیە. ئەگەر ژنی تۆ بوایە وای دەکرد پیاوەکە دەڵێت ئەگەر ئەوەی تۆ کردت ئەو شەوە من بیکەم قاش قاش دەیدا بەسەرما. بۆیە دەڵێم بەڕاستی ژنی تۆ ژنە ژنی من ژانە.

– **چیرۆکی یەکەم (ئەژدیهای لە ژن ترساو!) ڕەگێکی ئەفسانەی تێدایە، ئەویش (ئەژدیها)یە. ئەم ئەفسانەیە بە زۆر شێوەی تر لە نێو خەڵکدا دەگێڕدرێتەوە. لێرە ئەوە بەدەر دەکەوێ کە هەڵسوکەوتی نالەبار، نەك مرۆڤ گیانلەبەر و ئەژدیهاش بێزار دەکات.**

– **حەکایەتی (ژنی باش) حەکایەتێکی ئاساییە و ناوەرۆکی ئامۆژگاری تێدایە و دەیسەلمێنێ ژنی باش چۆن ڕێزی پیاوی خۆی دەگرێ و هێمنی ماڵ دەپارێزێ.**

# خەوێك گیانی پاشایەك لە مردن رزگار ئەكا

**کۆکردنەوەی :– بەناز رەفیق**

**گێڕانەوەی:– موعتەبەر ئەحمەد حەسەن**

دەگێڕنەوە لە زەمانی کۆن دا پادشایەك هەبووە لەنیازیدا بووە بچێت بۆ گەشت، ئەم پادشایە بۆ مەبەستی ئاسودەی ژیانی چەند حەرەسێکی بە شەوان لەماڵەکەی دا هەبووە تا ئاگاداری بکەن ئەو شەوەی کە پادشا بەنیازە بۆ بەیانی بچێت بۆ گەشتەکەی یەکێك لە حەرەسەکانی خەوێك دەبینێ تێدا ئەو تەیارەی کەپادشا بەنیازە بۆ بەیانی سەفەری پێ بکات ئاگری تێبەر دەبێ و خەڵکی ناویشی زۆربەی مردووە و بریندار بوون. کە بەیانی هەڵدەستێت ئەم خەوە بۆ پادشا دەگێڕیتەوە داوا لە پادشا دەکات کە سەفەر نەکات و دوای بخات پادشاش، داواکەی قبوڵ دەکات و ئەو ڕۆژە سەفەر ناکات پاش چەند سەعاتێك خەبەر دەهێنن بۆ پادشا کە ئەو تەیارەی ئەو بەنیازی سەفەر پێکردن بوو ئاگری تێ بەر بووە. خەڵکەکەی ناویشی زوربەیان مردوون، پادشا زۆر سوپاسی حەرەسەکە دەکات کەلە ڕێگەی ئەم خەوەی کە بینیوی گیانی پادشای ڕزگار کرد لە بری ئەوەدا خەڵاتێکی زۆری حەرەسەکە دەکات و پادشاش پێ دەڵێ: تۆ بۆ کاری حەرەسی ناشێی چونکە خەوتبوی و ئاگاداری منت نەکرد بوو لەبەر ئەوە دەبێت ئەم کارە نەکەیت و وازی لێ بهێنی بەمجۆرە حەرەسەکە دەستی لەکارەکەی دەکێشێتەوە وە پاشاش کاریکی تری پی دەسپێرێ کە لەگەڵ زەوقی حەرەسەکە بگونجی. زۆر جار ئەم کورتە چیرۆکە بە شیوەی مەتەڵ لەناو کۆمەڵی کوردەواری ئێمەش وتراوە بەم شێوەیە: دوای گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە دەوترێ : بۆچی پادشا حەرەسەکەی دەرکرد خۆ گیانی لە مردن ڕزگار کرد؟

وەڵامەکەی : چونکە ( خەوت بوو ).

### تاوان تا سەر نا چێتەسەرو پەردەی لەسەر هەڵدە ماڵریێ :

خێزانێـك پێـك هــاتبوون لــە ژن ومێردێـك و منــاڵێكی بچـوكی تــازە بــو ئــەم پیــاوە دۆسـتێكی دەبێـت و ئــەو دۆستەشـی لــەو كاتانــەی كــە ژنـی پیـاوە كـە لــەماڵ نــەبێت دەچێتە لای پیاوەكـە ( دەچـیتە مالێـان ) ڕۆژێـك ئـەم ژنـە داوا لـە پیاوەكـەی دەكـات كــە بــە ئوتومبێلەكــەی بیگەیەنێتــە مــاڵی بــاوكی كاتێـك كــە پیاوەكــە ئــەم هەواڵــە دەبیسـتێ زۆر دڵخـۆش دەبـێ ژن و مناڵەكــەی دەباتــە مــاڵی خــەزوری لــەو ســەریش كەدەگەڕیتــەوە دۆســتەكەی لەگــەڵ خــۆی دەباتــەوە بــۆ مــاڵی خۆیــان ئافرەتەكــە لــە مــاڵی بــاوكی دەبێـت و مناڵكــەی فێـری نــاو بێشـكە (لانـك) دەبێـت وهــەر دەگرییێـت و ئـۆقرەی نـابێ ژنەكـەش لانكـی دەسـت ناكـەویت ناچـار دەبێـت دەچێتەوە مـاڵی خۆیـان و تـا لانكەكـەی بۆمنداڵەكـەی بێنـێ، كـاتێ كـە لـە دەرگـا دەدا پیاوەكـەی و دۆسـتەكەی دەشـپرزێن و پیاوەكـە داوا لــە دوسـتەكەی دەكـات خـوی بخاتـە نـاو كەنتۆرەكـەیان وە دەرگـای لـە سـەر كلیـل دەدا پـاش ئـەوەی دەرگـا دەكاتـەوە دەبێنـێ ژنەكەیـەتی ولێـی دەپرسـێ كـە بۆچـی گەرایــەوە ئــەویش بـۆی بـاس دەكـات وپێـی دەڵـێ لەگــەڵم وەرە ئــەم لانكــە بگەیەنــە مــاڵی بــاوكم ئــەویش داواكــەی قبــوڵ دەكـات لەوســەر كــە دەیــەوێ بگەرێتــەوە لــەرێگا توشــی حادیســەی ســەیارە دەبێـت وپیاوێـك دەكوژێــت لــەو كاتــە پـــولیس دەگاتـــە لایـــان و پیاوەكـــە دەگرێـــت ئـــەوش لـــە زینـــدانا هەرلـــە خـــەمی دۆســـتەكەیەتی كەلــەناو كــەنتۆرە دەرگــای لەســـەر داخــراوە، بویــە پارەیــەكی چــاك دەداتــە پاســەوانی زیندانەكــەو ناونیشــانی ماڵێــان پــێ دەڵــێ وكلیلەكــەی دەداتــی تــا دەرگــا بــۆ ئافرەتەكــە بكاتــەوە پاســەوانەكش دوای تــەواو بــوونی كارەكــەی دەچـێتە ماڵەكـەیان و دەرگـای كـەنتۆرە كـە لـە ژنەكـەی دەكاتـەوە، كـە دەبینـێ ئـەوە ژنەكـەی خۆیــەتی یەكســەر دەیباتــە مەحكەمــە پــاش یــەك لاكردنــەوەی تاوانەكــە حەرەســەكە ژنەكەی خۆی تەلاق دەدات چونكە خیانەتی لێ كردبوو.

بــەم جــۆرە پیاوەكــە لــە رێگــەی ئــەم حادیســەوە تاوانەكــەی لێ ئاشــكرا دەبێــت و سزاكەشـە تونـدتر دەبـێ چـونكە بـە تۆمـەتی دوو تـاوان، تاوانبـار دەكرێـت (پیـاو كـوژی و سوك كردنی شەرەف) .

بـەم جـورە خـودا نهێنـی تاوانبـاران بـە درەنـگ بـێ یـان زوو ئاشـكرا دەكـات جـا بەهــەر هۆیەك بێت وسزاكەشی یان لە دنیا یان لە ژیانی دوای دا بۆ ئامادە دەكات .

### ئەجەل بەچی بێ هەر بەوە دەمری:-

ژنێك كورێكی بەند كراوی دەبێ ئەم ژنەش خەریكی كاری جوتیاری و كشتوكاڵ دەبێت.

رۆژێكیان بۆ مەبەستی سەر لێدانی كورەكەی خۆی ئامادە دەكات و دەروات لەناو سەیارەكە هەر پشتی دەخورێ و هەست دەكات كەشتێك لە ناو پشتی دەجولێتەوە ناتانی دەری بهێنی لە پاشان كە دەگاتە زیندان و كورەكەی دەبینێ پێی دەڵێ كەوا شتێك لە ناو پشتی دەجولێتەوە كورەكەی دەست دەكاتە ناو پشتی ژنەكە یەكسەر گیانی لە دەست ئەدا كەژنەكە ئەمە ئەبینێ زۆر ئەگرێ خۆی ئەتەكێنێ ئەبینێ دوپشكە كە لە گوندەكەی خۆیان چوو بووە پشتیەوە بەمەش كورەكەی دەمرێت. لێرەدا بۆمان دەرئەكەوێ كەئەجەلی مرۆڤ بە هەرشتێك بێت ئەبێ پێی بمرێت ئەگەر رۆژی تەواو بوبێ.

### لابردنی مەترسیەك بەهۆی هۆكاریكی چاوەروان نەكراو :-

لەشاری سلێمانی دوو ئافرەت كەژنی شوبرای یەكتر دەبن و لە یەك خانوودا لەگەڵ خەسویان ژیان دەبەنە سەر بە رۆژ هەردو برایەكە واتە مێردی ژنەكان دەچنە سەركاری خۆیان وتا ئێوارەی درەنگ نایەنەوە.

رۆژێك ئەم دوژنە بریار ئەدەن كە ئەم پیریژەی خەسویان بەهەر هۆكاریك بێت لە ناو ببەن بۆ ئەم مەبەستە تەكبیر دەكەن و دەگەنە ئەو ئەنجامەی كە ژەهری بۆ بكەنە خواردنەوە یەكێك لە ئافرەتەكان دەچێت ژەهرەكە دەكری و ئەویتریان چێشتەكە ئامادە دەكات وبوی تێ دەكەن پاشان هەردو ژنەكە بە خەسویان دەڵێن ئەوە چێشت ئامادەیە و ئێمە ئەرۆینەوە ماڵی باوكمان. ژنەكەش ( خەسوەكە ) دەڵێت من جاری برسیم نیە با هەندێ نویژ بكەم لە پاشان نان دەخۆم پاش ئەوەی ژنەكان دەچنەوە ماڵی باوكیان و خەسوەكە بە تەنیا دەمێنیتەوە لەوكاتەدا سواڵكەرێك لە دەرگا دەدات وداوای لە ژنەكەدەكات خواردنی پێ بدات پیرێژنەكەش دەڕێت قاپێك چێشتی بۆ دەهینی تا دەچێت ئەمجارە ئاوی بۆ ببا دەبینێ پیاوە سواڵكەرەكە رەنگی تێك چوەو خەریكە ئەمرێ ئەویش داوا لە هاوسێكانیان دەكات كە یارمەتی بدەن و بیگەیەننە نەخۆشخانە ئەوانیش بەدەم هاواریەوە دێن و دەیگەیەننە نەخۆشخانە و دەمرێت دوای پشكنین دەردەكەوەی كەئەو خواردنەی كە خواردویەتی زەهی تێ كراوە، پێرژەكەش روداوەكەیان بۆ باس دەكات

وەدەڵـی مـن ئـەم چیشـتـەم نـەکردووە پـاش ئـەوەی بـانگی هـەردوو بوکەکـەی دەکـەن و لـە ژێـر منشـارێکی زۆر. بەسـەر هاتەکـە ئاشـکرا دەکـەن وئینجـا هەردووژنەکـە دەسـت بەسـەر دەکـرێن و پیرێژنەکـە ئـازاد دەکـەن، کـاتی کـەپیاوەکانیان بـەم کـارەی ژنـەکانیان دەزانـن هـەردوکیان تـەڵاق دەدەن لـە بـری خـوێنی پیـاوە سـواڵکەرەکەش هـەموو زێرەکـانی ئافرەتـەکان لەلایـەن حکومەتـەوە دەدرێتـە کـەس و کـاری سـواڵکەرەکە. بـەم جـورە ئـەم ئافرەتـە پـیرە گیـانی لـە مەترسـی مـردن رزگـار دەبـێ و خـوا سـزی نیازپیسـانی هـەڵماڵی و بـە سـزای خۆیـان گەیشـتن وە لـە بـەر ئـەم پیـاوە سـوالکەرە ئەجـەلی هـاتبوو ژنەکـەی ئەجـەلی نـە هـاتبوو خـوا ئـەم کـارەی بـەم شـیوە لـۆ کردو بەخێرو و خۆشی بۆ ژنەکە گەرایەوە .

((نەنە ڕەحمەو زیرەکی و وریاییەکەی)):-

لـە زەمـانی کـۆن بـۆ مەبەسـتی پاراسـتنی سـامانی خۆیـان هەرچـی پـارەو لـیرەو زێـر هەبوایـە دەیـان کـردە نـاو گۆزەیـەك و لـە دیـواری قورەکـانی ئـەو سـەر دەمـەیان دەگـرت و پاشـان بـە قـوڕ دایـان دەپوشـی تـا دزەکـان پـەی پـێ نەبـەن و گیانیـان لەمەترسـی رزگاری ببوایە.

لێـرەدا ئافروتیـك کەبـەر رەچـەڵەك ئێرانـی بـوە و پـاش ئـەوەی لـە رێگـەی ژن وژن خوازیـەو گیشـتوتە کوردسـتان ولێـرە دا ژیـانی بەسـەر بـردووە دوای تەمـەنیکی زۆر کەسـی نـامینی وهـەر خـۆی بەتـەنیا دەبـی ئـەم ئافرەتـە پـارەی و لیرەیـەکی زۆری دەبـێ هەنـدیکی لـە نـاو بـالیف دادەنـی وە هەنـدیکی تـری لـەناو گوزەیـەکی لـە قـوری دەگـرێ جـا دزەکـان هەسـتی پـێ دەکـەن و دەزانـن کـە ئـەم ئافرەتـە زۆر دەولەمەنـدە بریـار دەدەن کـە شـەو بچـن مالـە کـەی ببرن وزێـرو و سامانەکەی بەشـکەن شـەوێك رێـك دەکـەون کـە بچـن بـۆ مـاڵی نەنـە رەحمـە کـە ئافرەتـە دەوڵەمەندەکـە ئـەم نەنـە رەحمـەش زۆر وریـا ئـازا دەبـی زوو زو هەسـتی بـە ڕوداوەکـان دەوروبـەری دەکـات هـەر لەگـەڵ هاسـتی دزەکـان دەسـت دەکـات بـە سـور کردنـەوەی مقـاش کـە زۆر جـار نـانی پـی دەردە هینـدریت کـە چـی ئـەم پشـکۆی سـورەکراوی پـێ گرتـوە و ئامـادەی کـردووە هـەر کـە دزەکـان لـە کـونی دەرگـا تەختـە کـانی ئـەو سـەردەمە کـە کـونی گـەورەی تێـدابوو سـەیری ژورەکـەی نەنـە رەحمـەیان دەکـەن یەکسـەر نەنـە رەحمـە ئـەم پشـکۆ سـورەوەکراوە دەنـی بـەدەم و چـاوی لـە ئـەنجام ئـەم دزە لـوتی دەسـوتی ئـیتر دزەکـانی تـر رادەکـەن وبریـار ئـەدەن کـە بـە هـیچ شێوەیەك دزی لـە نەنـە رەحمـە نەکـەن بـۆ بـەیانی کەنەنـە رەحمـە لـە خـەو هەلدەسـتی دەبینـی ماڵەکـەی هاوسێـیان باریـان کـردووە چونکە پیاوەکـەیان لـە شـەودا بـە مەقاشـەکەی نەنەرەحمـە لـوتی سـوتا

بـو جالەترسـی ئـەوەی دەسـت نیشـانی نـەکات وە بـە پـولس بـەگرتنی نـەدا هـەر بەیانیەکەی زوو ئەم شارەی بەجی هێشتبوو.

**(( روداویك لە شاری سلێمانی دوای هەواڵی جەنگ ))**

لـەدوای ئـەوەی هـەواڵی شـەری عـیراق ئـە مـەریکا راگەیەنـدرا ترسـی زۆر لـەدڵی خـەڵکی ناوچـەکە دروسـت بـو چـونکە هـەروەك پیشـبینی دەکـرا رژیمـی بـەعس خـەڵکی کوردسـتان کیمیـا بـاران بکـات ئـەم کـارەش چـەوەروان دەکـرا کـە لـە کەسـیکی سـتەمکار و خـوین مـژی وەك سـەدام زۆربـەی رودەکەنـە دیهـات و حەشـارگەرەکانی کوردسـتان کاتیـك کـە دزەکـان بـەم کـارە دەزانـن دەسـتی خۆیـان دەوەشـێنن و تـاڵاَ نیەکە ئەنجام ئەدەن پاشان لە سەر دیواری ماڵەکە دەنوسن:-

**(هەر سەر سە لامەت بە ماڵی دنیا هیچ نیە).**

**بەخشین مردنی کورێك دوادەخات**

چـوَلەکەیەك هیلاَنـەی خـوَی لـە کـوە دیوارێـك دەکـات و چـەندین بیچـوی جـوانی تیـدا هەڵـدەهینی هـەموو روَژیـك بەدەنوکـەکانی خـوَراك ئامـادە دەکـات و دەهینیتـەوە بـوَ بیچـوەکانی وپیـان دەدات روژیـك مـیرد منـداڵیك بـەلای داتـی دەپـەریَ هەرکـە دەزانـی هیلانـەی چـوَلەکەیە بیچـویەك دەردەهینـی دەمـری هـەموو روژیـك کـە مـیرد منداڵکـە دەچـی بـو کـار ئـەم رەفتـارە دزیـوە ی دوبـارە دەکاتـەوە ئـەم چـو لەکەیـەش زوَر پـیَ خـەفتبار دەبـیَ وهـەر جریـوە جریـوەی دەبـی زوَر لەبـەر خـودا دەپاریتـەوە کـە ئـەم کـورە جـاریکی تـر نەیەتـەوە بـەلای هیلانەکـەی دا خـوداش پـەیمانی دەداتـی کـە ئـیتر ئەم کورە نایەتەوە بەلای هیلانەو بیچوەکانی .

بـو روژی دوای جولەکەکـە زور دڵ خـوش دەبـی کەچـی دوبـارە مـیرد منالکـە دەچـیتەوە بـو هـەمان شـوین و کارەکـەی دوبـارە دەکاتـەوە چـولە کـەش رودەکاتـەوە خـواو کـە پـی دەڵی خوتـو بریـارت دامـی کـە ئـیتر ئـەم کـورە نەگەریتـەوە کەچـی دوبـارە بیچوەکانی کوشت .

خـودای گـەورەش وەلامـی دەداتـەوە وە دەڵـیَ ئـەم کـورە دوینـی کـە گەرایـەوە زوَر یارمـەتی هـەژاریکی داو پـارەی پـی بەخشـی منـیش روحـیم نەکیشـاو و نـەم ویسـت بمـری چـونکە ئەگـەر بمردبایـە قـەرزاری بـاری دەکردمـەوە دەیـوت ئەگـەر تومنـت نـەمرا ندبا یە هەموو روژیك چاکەم دەکرد.

# حەکایەت

**کۆکردنەوەی: شنۆ فەرهاد کاکە**
**گێڕانەوەی: بێجان برهان علی**
**ساڵی لەدایك بوونی: ١٩٨٦**
**ئاستی خوێندن: قوتابی زانکۆ**

**زەینەبە زەرد**

پیاوێـك دوو کچـی دەبێـت یـەکێك لەکچـەکانی نـاوی زەینـەب بـوو لەخۆشەویسـتیان پێیـان دەگـوت زەینەبـە زەرد. پیاوەکـە بڕیاریـدا بچـێت بـۆ حـەجی مـاڵی خـودا لەوکاتـەش پـارە و پـوڵی نـەبوو. بـەڵام، لـە ڕێگـادا جانتایـەك پـارەی دۆزییـەوە چـوو بـۆ حـەج و تـەواوی کـرد. لـەکاتی گەڕانـەوەی بـۆ هەریـەك لـە کچـەکانی دیـاری کـڕی، بـۆ زەینـەب ملوانکەیـەکی زێـڕی لـەبۆ کـڕی لەکاتی گەڕانـەوەی بـۆ مـاڵ لەسـەر ڕێگـا چـووە سـەر (کـانی دێـو) بـۆ ئـەوەی ماندوویـەتی بحەسـێتەوە، بـەڵام کاتێـك ملوانکەکـەی لەسـەر کانییەکـە لـەبیر کـرد کـە بـۆ زەینـەبی کـڕی بـوو. کاتێـك بـاوکی گەڕایـەوە بـۆ مـاڵ دیارییـەکانی دابـەش کـرد بەسـەر کچـەکانی بـەڵام دیـاری زەینـەب دیـار نـەبوو. زەینـەب پرسـیاری لـە بـاوکی کـرد؟ باوکـە بـۆ دیاریـت بـۆ مـن نـەهێناوە ! باوکیشـی وتـی: ملوانکەیـەکم بـۆت هێنـاوە بـەڵام، لەسـەر کـانی دێـو) لـەبیرم کـردووە بـەیانی دەچـم بـۆت دەهێنمـەوە کاتێـك بـەیانی داهـات بـاوکی بەڕێکـەوت بـۆ سـەر کـانی دێوەکـە لەکاتێکـدا کـە بـاوکی گەیشـتە کانییەکـە دیـتی ملوانکەکـەی بەدەسـتی دێوەکەوەیـە بـاوکی وتـی: ئـەم ملوانکەیـە هـی کچـەکەمە دەبێـت بـۆی ببەمـەوە دێوەکـە گـوتی: ناتدەمـەوە هـەتا کچـەکەی خـۆتم نـەدەیتێ، باوکیشـی گـوتی چـۆن کچـی خۆمـت بـدەمێ دێوەکـە گـوتی: ئەمشـەو بـە زەینـەب بڵـێ بـڕۆ جامێـك ئـاوم لـۆ بینـە ئـەمنیش دێـم دەیبـەم باوکیشـی بـە پێشـنیازەکەی ڕازی بوو.

ئینجـا بـاوکی بـەخۆی و بـە ملوانکەکەیـەوە گەڕایـەوە مـاڵ کاتێـك ملوانکەکـەی دایـە زەینـەب، زەینـەبیش زۆر دڵخـۆش بـوو، سـەعاتێك تێپـەڕی بـوو شـەو هـات بـاوکی زەینـەب گـوتی: زەینـەب کچـەکەم بـڕۆ جامێـك ئـاوم لـەدەرەوە بـۆ بێنـە. زەینـەب گوتیـك باشـە باوکـە گیـان زەینـەب چـووە دەرێ ئـەوەی ئـاو لـەبۆ بـابی بهێنێـت

دێوەکـە هـات و بـردی بـۆ ئەشـکەوتەکەی دێوەکـە زۆر گـەورە بـوو وە دەرگاکـەی بـەردێکی گـەورەی پێـوە بـوو. لـەناو ئەشـکەوتەکە کۆمـەڵێك ژوور هـەبوو. دەرگـای هــەموو ژوورەکــان داخــرا بــوون. کاتێــك دێوەکــە دەچــووە دەرەوە دەرگــای ئەشـکەوتەکەی بەبـەرد دادەخسـت،ڕۆژێك زەینـەب داوای لـە دێوەکـە کـرد دەرگـای ژوورەکـانی ئەشـکەوتەکەی بـۆ بکاتــەوە کاتێـك زەینـەب چـووە ژوورەکـان دیـتی لەهــەر ژورێــك کۆمــەڵێك شـت هــەبوون بـەلام ئـەوەی سـەرەنجی زەینـەبی ڕاکێشـا ئــەوەبوو لــە ژوورێکیــان هــەمووی زێــڕ و ئــەڵماس بــوو، زەینــەب لــە زێڕەکــان ئەنگوسـتیلەیەکی پـێ جـوان بـوو ئەنگوسـتیلەکەی لەپەنجـەی خـۆی کـرد، بـەلام بـۆ ئـەوەی دێوەکـە هەسـتی پـێ نـەکات پەنجـەی خـۆی بەسـتایەوە بـەلام دێوەکـە لێـی پرسـی لەبەرچـی پەنجـەت بەسـتراوەتەوە؟ زەینـەب گـوتی: بـڕیتم بەچـەقۆ. بـەلام، دێوەکـە زۆری لێکـرد و پەنجـە بەسـتراوەکەی پـێ کـردەوە کاتێـك ئەنگوسـتیلەی زێـڕی لەپەنجـەی کـردەوە دێوەکـە زەینـەبی بـردە ژوورەکـەی زێـڕ و ئەڵماسـەکان چـەند پارچـەیەکی زیـاتری لـە زێڕەکـە پێـدا ڕۆژێـك دێوەکـە دەچـێت دەرەوە لـەبیری دەچـێت دەرگـا بەردینەکـەی ئەشـکەوتەکە دابخـات ئەمـەش هـەلێکی بـاش بـوو بـۆ ڕاکـردن لەدەسـتی دێوەکـە بۆیـە هاتـە دەرەوە و دیـتی سـندوقێکی دار هـەبووو سـندوقەکەی بـردە سـەر شـاخێك چـووە نـاو سـندوقەکەو خـۆی بەردایـەوە بــەرەو خــوارەوە تــا گەیشــتە دەشــتاییەکی تەنیشــت شــاخەکە پیاوێــك بــەو جێگایـەدا دەڕوات چـاوی بـە سـندوقەکە دەکـەوێتز هـەڵی گـرت و بردیـەوە بـۆ مـاڵێ کاتێـك سـندوقەکەی شـکاند لـەماڵێ دیتیـان کچـێکی زۆر جـوانی تێدایـە پیاوەکـە کچـەکەی کـە زەینـەب لـەکوڕی خـۆی مـارە کـرد و ئاهـەنگێکی خۆشـیان بـۆ سـاز کرد.

= ئـەم ئەفسـانەیە بـە تـەواوی نەگێڕدراوەتـەوە، شـێوەی ڕێکـتری هەیـە. ڕەگـی ئەفسانەییش بوونی (دێو)ە لەم حیکایەتەدا.

# لبادۆکه

**گێڕانەوەی: مهاباد اسماعیل**

**ساڵی لەدایك بوونی: ١٩٦٢**

**ئاستی خوێندەواری: نەخوێندەوارە**

هەبوو نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، باوکەك و کیژەك هەبوون کیژەکە هەندە جوان بوو باوکەکە تەماعی تێکرد بوو عەشقی ببوو، کیژەکە گوتی بابە کو دەبی ئەمن کچی تۆم، کچەکە هەستا بەدزی بابی ڕۆیی، گەڕا گەڕا تاکو کارگەچی دیتەوە گۆتی: دەبێ لبادێکم لۆ دروست بکەی هەر لە تۆقی سەرم تاکو بنی پێم ئیللا چاوم تێدا دیار بێت، کارگەچی لبادی لۆ دروست کرد لبادەکەی هیناوە لەبەرە خۆی کرد و ڕۆیی ناوی لەخۆی نا لبادۆکە، ڕۆیی گەیشتە شارێك و پرسیاری کرد دەبێ کەس ئیش و کارێك نەبێ وە ئیش گرانم پێ ناکرێ گۆتیان: ماریێ پاشا قازەوانیان ڕۆیشتیە لبادۆکە گوتی: ماریێ پاشا لە کوێیە؟ گۆتیان ئەوە ماریێ پاشایە وا لەسەر گردیە، ئەویش چووە ماریێ پاشا و چووە ژووریێ سەلامی کرد و سەلامیان لێ وەرگرتەوە گوتیان: چ ئیشت هەیە؟ گۆتی ئەگەر ئیشێکتان هەیە چ ئیشم پێناکرێ، پاشا گوتی: ببە بە قازەوانی من، ماوەیەکی پێچوو ماریێ پاشا چوونە کۆریێ کۆریان دانا لبادۆکە چووە کنیان گۆتی: وەکی لە کۆریێ بوونەوە هەندێك ئاوم لۆ بێلنەوە گەلێك پیسم خۆم دەشۆم لەپاشەنگۆ، ئەوان لەکۆریێ بوونەوە ئاوەکەیان لۆ بەجێ هێشت، پاشا لەولاوە هات چووە سەر داریێ بزانێ ئەو لبادۆکە چییە! وەکی تەماشای کرد لبادی لەبەر کردەوە ئەو کچە چ بکەی و چ بخۆی تەماشای ئەو کچە بکەی هەندە جوان بوو، لەسەر داریێ هاتە خواریێ گەڕایەوە ماریێ گۆتی: دایە قازێکی شەلەمان هەیە دەبێ ئێواریێ بیکوژینەوە شیوی لێنێت دەبی لبادۆکە شیوم لۆ لێبنێت دایکیشی گوتی: کو دەبی لبادۆکەی پیس و چەپەر شیوت لۆ لێبنێت؟ گوتی: ئیلا دەبێ لبادۆکە شیوم لۆ لێبنێت ئەنگۆ هەقتان دەبی، وەڵلا ئێواریێ شیویان لێناو شیویان تێ کرد وەڵلا لبادۆکە دوو سێ قاندرمەی ڕۆیی شیوەکەی بەرداوە لبادۆکە گۆتی: ناڕێم ئەمن بەکەلکی ئیش کردن نایێم ئیشم پێ ناکرێ کو شیوم پێ دەچی بۆ کوڕی پاشا! کوڕە پاشا گۆتی: ئەگەر هیچ شیو نەمینێ لە مەنجەڵێ ئیلا لبادۆکە شیوم لۆ بینی دیسان شیوی برد، دوو قاندرمەی بڕی شیوی بەگۆڕیێ وەرکرد، گۆتی دەبی ئەوجارەش لۆم بینیتەوە شیوەکەیان لۆ تێکرد بردی دوو قاندرمەی مابوو کوڕی پاشا توند گرتی شیوەکەی لێ وەرگرت و

لبادەکەی لەبەردا دڕی گاسی دایکی کرد گۆتی: وەرن تەماشای ئەو کچە جوانە بکەن، وەڵڵا دایکی هاتە سەریێ تەماشای کچەکەی کرد هەندە جوان بوو گاسی پاشایان کرد و کوڕە گۆتی: بابە دەبی ئەو کچە بدەنە من چوون مەلایان هێنا و مارەیان کرد و ماوەیەکی پێچوو کچە دوو کوڕی بوو، ڕۆژێك بابی کچەکە کە کچەکەی لێ بزر ببوو دەگەڕا گوند بەگوند و شار بەشار لەدوی کچەکەی دەگەڕا ڕۆژێك بابی کچەکە بەسوتفە چووە ماریێ پاشا کچەکە بابی خۆی ناسیەوە و گۆتی نابی ئەو پیاوە لەماریێ داکەن پاشا بەقسەی زانی گۆتی: دەبی دایکەن چونکە ئەو غەریبەیە، شەوی پێچوو هەموویان نووستن بابی کچەکە هەستا سەری هەردوو کوڕەکانی بڕی کە منداڵی کچەکە بوون، کچەکە گۆتی نەمگوت دای مەکەن ئەوە بابی منە. ماریێ پاشا بەتەما بوو بابی کچەکە هەستاوە سەر پێی و گۆتی: تەکبیرتان لۆ بکەم چەقۆی بەخێن لەبەرکی کێ بوو ئەو سەری منداڵەکانی بڕیە لەبەرکی هەموویان گەڕان دەبینن چەقۆی بەخێن لەبەرکی دایکی منداڵەکان بوو، کوڕە پاشاش هەستا ژنەکەی خۆی دەرکرد ژنەکەی گۆتی مادام هەر دەرم دەکەن هەردوو سەلکەکەم و لاشەکە و هەندێ ئاو و هەندێ نانم بدەنێ ژنەکە ڕۆی بەڕێدا ڕۆیی هەر لەبەرخۆیدا دەپاڕایەوە خوایە یەکیان بڕێ ئاو یەکیان بڕێ نان کەمێکی تر ڕۆیی گۆتی دایە نان کەمێکی تر ڕۆیی ئەویتریان گۆتی: دایە ئاو، وەڵڵا ڕۆیشتن چوونە ئەشکەوتێك بەینێکی پێچوو کوڕەکانی گەورە بوون کوڕەکانی دەچوونە ڕاویێ ڕۆژێکیان کوڕەکانی هاتنەوە لۆ دایکیان گێڕایەوە گۆتیان دایە پیاوێکی لەو ڕەنگە و لەو حاڵە دێتە ڕاویێ هەندە درمان لۆی دەچی بابمان بێ، ڕۆژێك لە ڕۆژان دایکی گۆتیە کوڕەکانی برێنە ئەو پیاوەی سبەینێ بێتە ماریێ من شیوی بۆ دەکەم، وەڵڵا سبەینێ گۆتیانە پیاوەکە دەبێ بێیە ماریێ مە دایکی شیوی لۆ کردن و پیاوەکەشی گۆتی وا دێم پیاوەکە هات و شیویان بۆ دانا و خواردی و دایکی کوڕەکان پیاوەکەی خۆی ناسییەوە گۆتی: ئەمن ژنی تومە پیاوەکەش گۆتی ئەمن ژنم نییە و دەرم کردیە ژنەکە گۆتی: تەماشای ملی ئەو دوو منداڵانە بکە ئەگەر خەتی سوری پێدا هاتبوو ئەوا منداڵەکان منداڵی توونە ئەمنیش ژنی توومە، وەڵڵا پیاوەکە وەکی تەماشای دوو کوڕەکەی کرد و دەبینی هەردووکیان خەتی سوریان بەملی داهاتیە، وەڵڵا پیاوەکە دەستی لەملی منداڵەکانی کرد و ناسییەوە ماچی کردن و پێك شاد بوونەوە ڕۆیشتنەوە ماڵی خۆیان.

**- ئەم حیکایەتە تەنیا چاك بوونەوەی منداڵە سەربڕاوەکان وەك کارێکی ئەفسانەیی دەژمێردرێ. ئەم لبانۆکەیەش شێوەی گێڕانەوەکەی تەواو نییە و دەقی بڵاوکراوەی تر هەیە.**

## بەسەرهاتی پاشایەك لەسەردەمی کۆندا

**کۆکردنەوەی: سەیران محسن کانبی، هەژار محسن کانبی**

**گێڕانەوەی: تەمەن: ٦٠ساڵ**

**ناوچەی: خوێندەواریك نییە**

ساڵ و زەمانەکی پاشایەك هەبوو ژنی نەدەهینا، ڕۆژەکی ڕۆیشت لۆ دەو زێ سێ کچ هاتن بۆ سەر زێ یەکێکیان گوتی: مێرد بکەم دەبێ مێرد بە گەورە ماڵ بکەم مافور دروست بکەمو ئەویتر گوتی: مێرد بکەم دەبی پەشتەماری گورینگ بکەم، ئەویتر هیچ قسەی نەکرد، پاشا هەر سێ کچی هێنا ژنی سێیەم کە زگی بوو ئەوجا گوتی: دەبێ کچەکی قاقۆل زێڕم دەبی لەگەڵ کوڕەکی قاقۆل زیوم دەبی پاشان پاشا لە ژنی یەکەمی پرسی خوریمان زۆرە مافوری بکە ژنەکە گوتی: ئەمن ژنە پاشام بەکرێ دەدەم و لە ژنی دووەمی پرسی پەشتەمارم هینایە لۆم گورینگ کە ئەویش گوتی: من ژنە پاشام خۆم نایکەم بەکرێی دەدەم ئەوی سێیەم زگی هەبوو قسەی لەگەڵ نەکرد ئەو کاتەی ژنەکە منداڵی دەبی پاشا (١٣) سواری میوان بوو، ئەو کاتی ژنەکە منداڵی دەبوو چووە لای، وتی: ڕاوەستن تەکبیری دەکەم هەوێکەی چوو دوو گوجیلە سەی هێنا لەبەر مەمکی ژنی دانا ژنەکەش دوو منداڵی بوو یەکێکیان کوڕ ئەویتریان کچ بوو کچەکە پرچی زێڕ بوو کوڕەکەش پرچی زیو بوو، هەوێیەکان ناردیانە دیوەخان بڵێنە پاشا بێتەوە پاشا ووتی: میوانم هەیە پێم ناکرێ بێم، ئەوجارە دیسان ناردیان بێتەوە ژنەکە دوو گوجیلە سەی بووە، پاشا سارد بوو چما ئەمن سەمە، سەی بۆ من هینایە، ئەوجارە گوتیان هەستن ژنەکەی لەبن گوفەك نێن منداڵەکانیشی لەناو سندوق کرد و فڕێیاندایە ناو زێ تۆڕەوانێك منداڵەکانی گرتەوە ئەوانیش دەریان هینا و منداڵەکانیان بەخێو کرد و کردیانە منداڵی خۆیان ناوی یەکێکیان نا فاتمە ئەوی تریشیان ئەحمەد کاتێ کە منداڵەکان گەورە بوون پیرەژنێك گوتیە کەوڕەکەی دەبرۆ داخوا کوری چ بیژییەکی کە کوڕەکە هاتەوە گوتیە خوشکەکەی هەر دەڕۆم ئێمە داك و بابمان نییەخوشکەکەی دڵی دایەوەو ئەوجارە چوو بۆ دەرێ کەسێکی تر پێی دەڵێ دیسان هاتەوە گوتی: دەڕۆم، ڕۆیی ماوەیەك ڕۆیی خوشکەکەی لەگەڵی نەچوو پاشان لەگەڵی چوو ڕەشماڵەکی گوشیان پێ بوو لەو دیوی گوندی ماڵی بابیان بوو ئەوانیش لەدووری گوندی خۆیان هەڵیان دا هیچیان نەبوو بیخۆن خوشکەکەشی گوتی: ئەحمەد

هیچمان نییە بیخۆین ها پرچم ببڕە دەچم بەنان و شتی دەدەم ئەحمەدیش گوتی: نەخێر تۆ کچی پرچت جوانە بۆ خۆت، ئینجا ئەحمەد هەموو ڕۆژێ دەچوو نان و شتی دەهێنا ئەو گوفەکە بەلای گوندەکەی وان بوو هەموو ڕۆژێ هەندەك نان و حەلوای دەدا داکی خۆی ئینجا ئەحمەد پرچی خۆی بڕی نەیهێشت خوشکەکەی ببڕی ئەوجارە دیسان خوشکەکەی گوتی: وەرە پرچم ببڕە لۆچمە بڕۆ بە خانی بدە ئینجا پرچی بڕی بە قەسریان دا کاتێ قەسرەکەیان کڕی کوڕەکە دەرێی بەزێو سپی کرد خوشکەکەشی ژوورێی بەزێڕ سپی کرد هەردوو هەوێیەکە زانیان منداڵەکان گەورە بوونە ناسیانەوە ئەو هەوێیەی کە داکی منداڵەکانی وەلێ کردبوو، ئینجا بەیانی ئەحمەد لۆ ڕاوێ ڕۆیشت ئەو هەوێیەی کە جاری یەکەم داکی منداڵەکانی فەوتاند خۆی کردە پیرەژنێك هاتە بەردەرگا لەدەرگای داو گوتی: فەقیرم فاتمەش دەرگای لێ نەکردەوە هەتا کاتی مەغریب براکەی هاتەوە گوتیە فاگمە چ خێر بوو بۆ دەرگات لەم فەقیرەنەکردەوە فاتمەش گوتی: دەمان فەوتێنی کوڕەکە دەرگای لێ کردەوە ژنەکەی هێنا ژوورەوە لە ماڵی وان ماوە تا کاتی بەیانی براکەت دەڕوا ئەتو بەتەنیا عێدز دەبی با تەلەفزیۆنت بۆ بکڕی براکەی گەڕاوە ماڵەوە دیتی فاگمە عێدزە گوتی: فاگمە بۆ وای ئەویش گوتی: تەشتە مەزرینکم لۆ بینە ئەحمەدیش کە نانی خوارد ڕۆیی لەڕێ پیاوێکی توش بوو گوتی: ئەحمەد بۆ کوێ دەچی ئەویش گوتی: مادام دەزانی دەشزانی بۆ کوێ دەچمو گوتی: لۆ فەوتان دەچی ئەحمەدیش گوتی: خوشکەکەم داوای لێ کردییم هەر دەچم پیاوەکە پێی گوت کە گەیشتیە ئەوێ دوو کانی لێیە ئەویش گوتی: مستێکی لە یەکێکیان کە ئاوی کەوسەرە مستێکی تر لەوی تر کە ئاوی حەیاتە پاشان ڕۆیی دەگاتە کانییەك هەموو دەوری دڕك بوو پاشان لەوێ ڕۆیی گەیشتە تاژییەك، تاژییەکە جۆی لەپێش بوو پاشان دیسان ڕۆیشت ئەوجارە گەیشتە ماینەك پڕ پێشی ئێسك بوو، ئێسکەکەی بردە پێش تاژیەکە و جۆیەکەشی بردە پێش ماینەکە دیسان ڕۆیشت گەیشتە دەرکەکی واری بوو دوو حەسیری لەناو بوودا داخرابوو ئەحمەد دەرکەکەی پێوەدا کاتێ کە گەیشتە دەرکەکەی تر ئەو پێوە درابوو دوو حەسیری تێدا بوو حەسیرەکانی ڕایەخست و دەرکەکەی واری کرد ئەوجارە کە گەیشتە نۆ دێو نوست بوون لە دەوری تەشتە مەزرینگ کە دەستی دابێ زرینگەی لێوە دەهات هەمووی زێڕ و گەوهەر گوتی: دەرگا بیگرە گوتی: کو بیگرم ئەوە چەند ساڵە سجنیان کردیم ئەو ئەمنی کردیتەوە لێرەدا گوتی: حەسیرەکە بیگرە گوتی: کو دەیگرم ئەمنی لوول دایە هەرای لێ دامە ئەوجارە دەرکەکەی تر گوتی: بیگرە گوتی: کو دەیگرم ئەوە چەند ساڵە تۆز و خۆڵم لێ

نیشتووه پێوەی دامە ئەوه منی کردیتەوه ئەویش نایگری ئەوجاره دەگاتە ماین و تاژییەك دەڵێ تاژی بیگره دەڵێ تۆ چەند ساڵە جۆت دایمێ ئەمنت کوشتیه لەبرسان کو دەیگرم تێر ئێسکی کردم. ئەمجاره دەگاتە ماینەکە دەڵێ بیگره. دەڵێ کو دەیگرم چەند ساڵە منت کوشتووه لەبرسان ئەو تێر جۆی کردم ئەوجاره دەڵێ درك بیگره. دەڵێ کو دەیگرم؟ ئەو دەڵێ ئەمن پەمووی نەرمم تۆ پێم دەڵێ درك ئەوجاره دەڵێتە کانیەکە دەڵێ بیگره. دەڵێ کو دەیگرم ئەتۆ پێم دەڵێ ئەو پێم دەڵێ ئاوی کەوسەره ئەوجاره دەڵێ کانیە خینە تۆ بیگره دەڵێ چۆن دەیگرم ئەو پێم دەڵێ ئاوی حەیاتی پاشان ڕزگاری بوو هێنای بۆ خوشکەکەی دیسان بانگی کرد ئەحمەد تەشتێ مەزرینگت هێنا، هاتەوه دیسان براکەی ڕۆیی لۆ ڕاوێ جارێکی تر پیرەژنەکە هاتەوه بەردەرگا گوتی: دەرگام لێ بکەوه. گوتی: دەرگات لێ ناکەمەوه دەمان فەوتێنی! پیرەژن هەتا ئێواری نەڕۆیشت براکەی هاتەوه دەرگای لێ کردەوه بەیانی دیسان غەمبار بوو ئەوجاره گوتی: بۆ وای ئەویش گوتی: چاوڕەشی مەسرەف ڕەشم لۆ بینە. ئەویش بۆت دێنم ئەوجاره دیسان ڕۆیی پیره مێردێك هاتە سەر ڕێ گوتی: ئەحمەد بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: مادام ناوم دەزانی دەشزانی بۆ کوێ دەچم گوتی: بگەڕێوه ئەوجاره وەکی جارەکەی تر نییە جارەکەی تر دەرچووی بەڵام ئەمجاره ڕێی ناچێت هەرچی هەبووه بوویتە بەرد کە چووه سەر بیرەکە هەرچی هەبوو بویتە بەرد گوتی: بڕۆ ئەگەر دەچیه ناو بیرەکە هەرچی هەبووه بویتە بەرد چووه سەر بیرەکە گوتی: چاوڕەشی مەسرەف خۆش ئەو وای گوت. نیوەی بووه! بەرد پاشان هەمووی بووه بەرد. دوو سێ ڕۆژی پێچوو ئەحمەد نەگەڕایەوه فاتمە بەدوای براکەی دا ڕۆیشت! پیره مێردەکە تووشی بوو گوتی: کێوه دەچی؟ گوتی: هەر دەچم گوتی: مادام هەردەچی بەو ڕێگایە بڕۆ کە هەمووی بویتە بەرد. چەند ساڵە خەوی لێ کەوتووه بەخەبەر نایێ براکەشت بوویتە بەرد خوشکەکەشی چووه سەر بیرەکە سەری لەناو بیرەکە شۆڕ کردەوه بانگی کرد چاوڕەشی مەسرەف خۆش نیوەی بووه بەرد ئەوجارەش سەری شۆڕ کردەوه گریا فرمێسکی بەسەر ڕوومەتی چاوڕەشی مەسرەف خۆش ئەوجارەش بانگی کرد چاوڕەشی مەسرەف خۆش لۆ جواب نادەیەوه گیانە ئەوجاره کە گوتی: گیانە بەکاری خوا خەڵکەکە هەموویان زینوو بوونەوه. گوتی: کێ بوو بانگی کردم گوتی: بەس لۆ ئەم گوتی: حەفت عەبا حەفت کندر کە کچەکە گریێدا شۆڕی کردەوه ئەوجاره دەریان هێنا کە چاوڕەش مەسرەف خۆش بوو هەر خەڵکی قسەیەکی دەکرد یەکێ دەیگوت سەد ساڵە یەك دەیگوت دوو مانگە گوتی: بڕۆن من تەنیا بۆ فاتمەمە بەکاری خودا باڵدار بوو گوتییە ئەحمەد و فاگمە وەرنە

سـەر بـاڵم ئـەوانیش سـواری باڵەکـەی بـوون گـوتی: بەقەسرێکی زیـوویی دەچـی لـەوێ بنیشـە ئـەوجا کـە نیشـت چـوونە خـوارێ بـەیانی بـەدەراری گوندەکـەی هێخسـت گـوتی: ئەحمـەد چـەلەبی هاتـەوە چاوڕەشـی مەسـرەف خۆشـی هینـا وە گـوتی: ئەحمـەد بـڕۆ گوندەکـەی هـەموو بـانگ بکـە مەولوودیدەکـەم کـەس بـەجێ مەهێڵـە هـەمووی بێنـە دوو هەوێکـە و پیرەژنەکـە و پاشـایەکەش مـابوون ئەوانیشـی هێنـا شـیوی بـۆ ئـەو هـەموو خەڵکـە دانـا و قاپـە ئێسـکەکی سـۆر کـردەوە لـەناو ڕۆن بـۆ پاشـا دانـا و پێـی بڵـێن چاوڕەشـی مەسـرەف خۆشـە داینـاوە پاشـا سـەری سـوڕما گـوتی: جێـی ئـەو ئێسـکەم لـۆ بکـەوە واتـە (شـی بکـەوە) چ مانایـەکی هەیـە گـوتی: ئـەوی پاشـا وەرە ئـەوەم لـۆ شـی بکـەوە ئـەو ژنـەت لەبەرچـی لـەبن گوفـەکی دانـاوە گـوتی: ئـەوە سـوالفەی زۆرە ئـەویش گـۆتی ئەمـەش سـوالفەی زۆرە هـەتا نـەیلێی پێـت نـاڵێم ڕووی لـە چاوڕەشـی مەسـرەف خـۆش کـرد دەڵـێ ژنەکـە گـوتی: دوو منـداڵم دەبـێ کچـەکە پـرچ زێـڕ و زیـو دوایـی دوو گوجیلـە سـەی بـوو گـوتی: ئـەوە پرچـە زێڕەکەتـە ئـەوەش کـوڕە پـرچ زیوەکەتـە کـاتی خـۆی ئـەو دوو ژنـەت ئـەو منداڵانـەی لـەناو سـندووقیان نـان و فڕێیـان دایـە نـاو زێ گوجیلـە سـەگیان دایـە بـەر مـەمکی ژنەکـەت پاشـا هەسـتا چاوڕەشـی مەسـرەف خـۆش و کوڕەکـە و کچـەکەی مـاچ کـرد و دوو هەوێکـە و پیرەژنەکـەی هاوێشـتە نـاو زێـی دوو ژنەکەشـی کوشـت و داکـی ئەحمـەد و فاتیمـەی لـەبن گوفـەك دەرهێنـا خاوێنیـان کـردەوە شوشـتیان و جلکیـان لەبـەر کـرد ئینجـا لـۆ پاشـایان بردەوە.

**- ئـەم حیکایەتـە پـڕە لـە ڕەگـەزی ئەفسـانەیی و زۆر شـێوە گێڕانـەوەی تـری هەیـە، هەرچەندە لێرە هەنـدێ شـتی تازەمـان هـەن کـە لـە ئەفسـانەکانی تـر نـین، بـۆ نموونـە (چاو ڕەشی مەسرەف خۆش).**

**بەسەرهاتی جووەك لەگەڵ کچەکەی**

جـووەك ژنـەکی موسـڵمانی هـەبوو کاتێـك ژنەکـەی مـرد کچـەکی هـەبوو زۆر جـوان بـوو گـوتی: بـەمێردت نـادەم لـەخۆمت مارەدەکـەم ئـەویش گـوتی: نـابێ بابـە هەرچـی دەڵێـی بـۆت دەکـەم ڕۆژبـەڕۆژ بـاوکی بـەم قسـانە هەڵدەخەڵتانـد تـاکو هـەڵی بـەلام بـاوکی ڕازی نـەبوو گـوتی: باشـە باوکـە کـەبینێ کاتێـك بـاران بـوو گـوتی: بابـە وا دەچـم بەرمیلـە ئـاوەکی دەیـنم سـەری خـۆم دەشـۆم ئێـوارێ مـارەم کـە ئـەوجا کنـدرەکی لەدەسـتی هێخسـت ئـەوجا بـەجێی هێشـت، چـووە سـەر کەنـدێ و بەرمیلەکـە پـڕ قـوڕاو

کـرد و لـە قـوڕێی چـەقی کچـەکە بـەخۆی ڕۆیـی، زۆری پێچـوو کندرەکـەی ڕاکێشـا کچـەکەی نەدیتـەوە، کچـەکەش گەیشـتە شـوانەك داوای قاپوتەکـەی کـرد لێـی کـڕی لـەخۆی لولـدا و پێچـای پاشـان چـووە مـاڵ ئاغایـەکی ووتـی: فـەقیرم لێـرەبم ڕۆژەك لـە ڕۆژان کچـەکان مـاڵێ ئاغاکـەی ووتـی: چـوونە سـەر کـانی کـۆری بکـەن وداوایـان لـە کچـەکە کـرد لەگـەڵیان بچـێتە کـۆرێ بەلاَمکچـەکە پرسـی نـاوت چـییە گـوتی: نـاوم (لبـادە) پاشـان کچـەکە بـەیانی بـوو هەسـتاو چـووە کـۆرێ ڕۆیـی کـوڕە پاشـا بەدوایـدا چـوو بـزانم چ دەکـا ئـەویش چـوو جێگایـەك لبادەکـەی لاداو کـوڕە پاشـا لاشـەی کچەکەی دیـت کـە هـەموو زێـڕ بـوو کـوڕە پاشـا خـۆی شـاردەوە هـەتا ئـەو کـۆری کـرد ڕۆیشـتەوە ئینجـا ئـەویش بەدوایـدا ڕۆیشـتەوە ماڵـەوە چـەند سـاڵە ئـەو کـوڕە هـەوڵی لەگـەڵ دەدەن ژنـی نـاینی بـۆ بـەیانی گـوتی: ئێسـتا ژنم دەوێ گوتیـان کێـت دەوێ؟ ئـەویش گـوتی: لبـادی مـاڵی خۆمـانم دەوێ، ئـەو نـەبی کەسـم نـاوێ. ئـەوانیش گۆتیـان نـابێ کـوڕە پاشـان چـەند پیاوێـك خڕبوونـەوە ووتیـان بـۆی بینـە بـەیانی ئێـوارێ لێیـان مـارە کـرد، چـاوەڕێی بـووك و زاوایـان بـوون کـە هاتنـە دەرەوە پاشـا کـە کچـەکەی دیت شـتی وا جـوان نـەبوو ئینجـا حـەوت شـەوت حـەوت ڕۆژ دۆڵ و زوڕنایـان بـۆ گێـڕا. کچـەکە خەناوکـەی بـەجێ مـابوو لـەکن باوکـە جووەکـەی کـاتێ کچـەکەی زگـی بـوو کـوڕەکی بـوو باوکـە جووەکـەی خـۆی کـردە دێـوەرە و گونـد بـە گونـد دەگـەڕا و پێـدا هـات ئـەویش خەناوکەکـەی بەقـەدی گـوێ درێژەکەیـەوە کردبـوو، خەڵکەکـە گوتیانـە ژنـە پاشـا وەرە ئەوخەناوکـە بـە تـوو نـەبی بەکەسـی تـر نـاکڕێ، بەقالەکـەیان هێنایـە بـەردەرگا هـەردووکیان یـەکتریان ناسـی کچـەکە گـۆتی نـایکڕم کـەڵکی نییـە باوکـە جووەکـەی ڕۆیـی کـە بەقالەکـە بـوو پاشـان ئێـوارێ گەڕایـەوە مـاڵی ئـەوان و گـوتی: دێمـە مـاڵێ ئێـوە کەچـی کچـەکە پێـی نـاخۆش بـوو بـەلاَم پاشـا ووتـی: میـوان ئـەزیزی خوایـە هێنایـە هێنایـە ماڵـەوە کـاتێ کـە شـەو هـات خـەویان لـێ کـەوت بـوو چـووە سـەری منداڵەکـەی بـڕی و قـەڵم بڕەکـەی بەخوێنـەوە لـەناو بـەرکی دایکـی دانـا بـەیانی هەسـتان سـەیری منداڵەکـەیان کـرد سـەری بڕایـە کێیـە جووەکـە گـوتی: دایکیـەتی پاشـا ووتـی: ڕاسـتە کۆرەکـەن مـەمکی ڕاستەشـی بـبڕن بـڕۆن لـە حـەوت چـیایان ئاوایکـەن پاشـان کارەکـەیان جـێ بـەجێ کـرد وگەڕانـەوە ماڵـەوە منداڵەکـەیان لەگـەڵ دایکـی فڕێـدا. بـەلاَم، ژنەکـە هـەر دەگریـا بەئـەمری خـوا سـێ تـەیر هـاتن تـەیری یەکـەم دەرمانەکـەی دایـە ژنەکـە ووتـی: بـەملی منداڵەکـەی داکـە تـەیری دووەم ووتـی: بـڕۆن بەچـاوی خـۆت داکـە تـەیری سـێیەم گـوتی: بـڕۆ بـە مکـتی داکـە بەئـەمری خـودا چـابوون سـەیری کـرد ئەشـکەوتێك هـەبوو لەوشـوێنە هـەموو پێداویسـتییەك و شـتێکی تێـدا بـوو کـە خـواردن و خواردنـەوە دا بـە منداڵەکـەت گـەورە بـوو تەمـەنی گەیشـتە حـەوت سـاڵان پەلـە

قەمیشـەك سـواری دەبـوو دەچـووە چـەلق و فەلـەق بـە ئـەمری خـوا لـەو چـیایە دەگـەڕا، ڕۆژەك گەیشـتە سـوارەکی کەچـی دوانـزە سـواری تـری لەگـەڵ دابـوو سـواری پێشـەوە هـەر تەماشـای دەکـرد ئێـواریٚ هاتـەوە بـۆ دایکیگێڕایـەوە ووتـی: ئـەمن بـاوکم هەیـە ئـەویش ووتـی: بـەڵێ ووتـی: سـواری پێشـەوە وتتیـە مـن وەرە بچـینە مـاڵی مـە پاشـان بـەیانی داهـات دایکـی ووتـی: ئەگـەر هـاتن ووتیـان وەرە بچێنە مـاڵی ئێمـە ئـەتوش بڵـێ ئێـوە وەرنـە مـاڵی ئێمـە دایکـم دەعوەتتـان دەکـا ووتـی: دایکـت لەکوێیـە؟ ووتـی: دایکـم لـەو ئەشـکەوتەیە بـەلاّم ئەگـەر هـاتن ئـەتوو لەپێشـەوە وەرەوە بـەیانی لەهـەمان شـوێن گەیشـتەوە سـوارەکان ووتـی: لەگـەڵ مـن وەرن دایکـم دەعوەتتـان دەکـات وەرنـە دوام لـەدووی چـوون ئـەو لەپێشـەوە گەیشـتەوە ماڵـەوە دایکـی ووتـی: ئـەوان دانیشـن لەسـەر نـانی تـۆش بـەپێوە ڕاوەسـتە ئەگـەر پاشـا وتـی: بـۆ نـانی نـاخۆی بڵـێ ئـەمن نـانی نـاخۆم هـەتا قەمیشـەکەم نـانی نـەخوا پاشـا وتـی: بـۆ نـان نـاخۆی وتـی: گـویٚ درێـژ پەلـە قـەمیش چـۆن نـان دەخـوات منداڵەکـەش وتـی: ئـەتو گـویٚ درێـژی ئـەدی دایـك کـو منداڵەکـەی خـۆی دەکـوژی! ژنەکـەش هـەموو سـەربردەکەی بـۆ پاشـا گێڕایـەوە ئینجـا پاشـا وتـی: دەمـەویٚ بچـن جووەکـەم بـۆ بێـنن. کوڕەکـە و هەنـدێك لـە سـوارەکان هەسـتان لەگـەڵ یـەکتر گونـد بەگونـد دەگـەڕان ئێوارەیـەك لـە دیوەخانێـك مانـەوە جووەکـەش هاتـە ئـەویٚ خەڵکەکـە وتیـان کـیٚ هەیـە سـەر و سـەربردەیەك بزانـیٚ جووەکـە وتـی: ئـەمن وەخـتی خـۆی ژنـەکم هـەبوو موسـڵمان بـوو ژنەکـەم مـرد، کچـەکی جـوانی هـەبوو کچەکەشـم موسـڵمان بـوو داوام لـە کچـەکە کـرد مێـردم پـیٚ بکـات کچـەکەم هـەلاّت گونـد بەگونـد لـەدوای گـەڕام وەختـەك دیتمـەوە کـوڕەکی هـەبوو شـەویٚ چـووم سـەری کوڕەکـەم بـڕی بـە چـەقۆ چەقۆیەکەشـم لـەناو بـەرکی دایکـی دانـا بـەیانی چـاوی ڕاسـتەیان کـۆرە کـرد، مـەمکی ڕاسـتەیان بڕیـەوە لەحـەوت چـیایان ئـاوا کـرد کوڕەکـە هەسـتاوە هـەر لـەویٚ جووەکـەی کوشـت هاتـەوە لای بـاوکی هـەمووی بـۆ گێڕایەوە دوایی هەموویان لەگەڵ یەکتری ئاشت بوونەوە.

= ئـەوەی لـەم حیکایەتـە تازەیـە، کـە پیـاوێکی جـوو ژنێکـی موسـڵمانی هەیـە ژنـی دەمـریٚ دەیـەویٚ کچـەکەی خـۆی مـارە بکـات. کـە لـە حیکایـەتان زۆرتـر ژنـە جـووە و پیـاوە موسـڵمانە. لێـرە سـواری قـەمیش بـوون یەکێکـە لـە ڕەگـەزەکانی ئەفسـانە لـەنێو ڕەگەزە زۆرەکاندا.

**ڕووداوێکـــی سەرســـوڕمانی نێـــوان جووتیـــار و ئەجنـــدەکان ((ڕووداوی ڕاستەقینەیە))**

پیـاوێکی هــەژار و کاسـب هەبولـە گونـدێك دەژیـا لـەنزیك قـەزای مـەخموور بـووە تـەنیا کشـتوکاڵ و دەغڵـودانی دەکـرد وە هـەروەها مـەڕ ومـاڵاتی هـەبوو بـەخێوی دەکرد، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان کـە خێزانەکـەی نـان خـواردنی ئامـادە کـرد لـەکاتی ئێـوارە بـوو کــە خواردنەکــەی دانـا لەگــەڵ منداڵــەکان هــەتا نــان بخــۆن پیاوەکــە لــە دەرەوەی مــاڵ بــوو کــە هاتــەوە بــۆ نــان خــواردن پیــاوە هەژارەکــە بیــبنی پشـیلەیەکی ڕەش هـاتبووە سـەر نانەکەکـەمێکی لـەو نانـە خواردبـوو پیاوەکـە لەگــەڵ خێزانەکــەی بــووە هارەهار،پیاوەکــە ناچــار بــوو دەســتیدا دارەکــی بــۆ ئــەوەی پشـیلە ڕەشـەکە بکـوژێ، لـە ئـەنجام پشـیلەکەی کوشـت بـەدار، ئینجـا هێنایــە دەرەوەی ماڵەکــە دووری خســتەوە، پــاش کوشــتنی پشــیلەکە چــوونەوە ســەر نــان خواردنەکــە لەگــەڵ خێــزان و منداڵــەکانی، پاشــان چــایان خــواردەوە، پــاش مــەغریب بــوو تاریـك بـوو بـوو کۆمەڵـە پیاوێـك لـە دەرگایـان دا لـەم کـات و ساتانەدا منـداڵکان زۆر دەترسـان لەبـەر ئـەوەی ماڵەکـەیان دوور بـوو لـە ئـاوەدانی واتــە بەتــەنیا بــوون، پیــاوە هەژارەکــە چــوودەرگای کــردەوە دیــتی کۆمەڵــە پیاوێــك لەبــەر دەرگایــە، کۆمەڵــە پیاوەکــە وتیــان: وەرە دەرەوە کــەمێك کارمــان پێتــە، ئەویشـی وتـی: چـییە؟ ئـەوانیش وتیـان بـەم ئێوارەیـە کەسـێکت کوشـتووە لـەکاتی نـان خـواردن پیـاوە. هەژارەکـە وتـی: کەسـم نەکوشـتووە، بـەڵام مـن پشـیلەیەکی ڕەشـم کوشـتووە، کۆمەڵـە پیاوەکـەش وتیـان تـۆ پیاوەکـت کوشـتووە بابچـین بـۆ ئـەو جێگایـەی کـە پشـیلەکەت فـڕێ داوە، کاتێـك گەیشـتنە جێگـای مەبەسـت وتیـان ئـەم پیـاوەت کوشـتووە یـان پشـیلە لـەپێش چـاوی پیـاوە هەژارەکـە پیاوێـك کـوژرا بـوو نـەك پشـیلە ئینجـا وتیـان: چ دەڵێـی؟ ئینجـا هەژارەکـە چـەند جـارەی دووبـارە دەکـردەوە مـن پیـاوم نەکوشـتووە، لـە ئـەنجام ئـەم کۆمەڵـە پیـاوە وتیـان: وەرە بـڕۆین لەگـەڵمان کـە جێگـەی ئەجندەکانـە ئـەو جێگەیـەش نـاوی ((مەنتیقـەی دۆرە فریــزان)) پیاوەکــەش لەگــەڵیان چــوو بەشــەو بــوو ئینجــا ڕۆیشــتن بــۆ جێگــەی ئەجنــدەکان ئەکەوێتــە لای چــیای قەرەچــووغ. کۆمەڵــە پیاوەکــە ((ئەجنــدەکان بــوون)) پیاوەکوژراوەکــەیان هــەڵگرتبوو وهــەروەها پیــاوە هەژارەکــەیان لەگــەڵ دابـوو، لـەو کۆمەڵـە پیـاوە ژنێکیـان لەگـەڵ بـووە پیـاوە کوژراوەکـە هاوسـەری بـوو

زۆر جـار لـه ڕێگـه ژنەکـه دەیویسـت پیـاوە هەژارەکـه بکـوژێ تۆڵـەی خـۆی بکاتـەوە. بـەڵام، پیاوەکـان نـەیان دەهێشـت لەبـەر ئـەوەی مـافی خۆمـان هەیـه تـا گەیشـته جێگـەی مەبەسـتی خۆیـان (دۆڕە فریـزان) ئەجنـدەکان گوتیانـه پیـاوە هەژارەکـه ئەگـەر ژنـه ئەجندەکـه مارەبکـەی منداڵـەکانی بـەخێو بکـەی تـۆ نـاکوژین، ئینجـا پیـاوە هەژارەکـه لەگـەڵی چـوو بـۆ مـاڵێ ژنەکـه هـەر لـه ڕێگـەدا ئەجنـدەکی موسـڵمان پیـاوە هەژارەکـەی جیـا کـردەوە و وتـی: گـوێ بگـرە وە چـیت پـێ دەڵـێم وابکـه. نـەوەك بەهەڵـەدا دەچـی گـومرا دەبـی بـەهیچ شـێوەیەك لەگـەڵ ژنەکـه ناخـەوی ئینجـا چـوونه مـاڵی ژنەکـه لای بـەردێکی گـەورە بـوو، منداڵـەکانی نووسـتن و ژنەکـه هـات بـۆ لای پیـاوە هەژارەکـه پێکـەو بخـەون، پیـاوە هەژارەکـه ڕازی نـەبووە زۆر غـەمبار بـوو لـەم کاتـه زۆر تـووڕە بـوو وتـی: تـۆ پیـاوی منـت کوشـت و هـــەروەها گاڵتـــه بـــەمن ومنداڵـــەکان دەکـــەی! لـــەم کاتـــەدا ژنەکـــه ئاگـــاداری کەسـوکاری ئەجنـدەکانی خـۆی کـردەوە ئەمـه پیـاوێکی خـراپ و ناتـەواوە دەبێـت بچـم بـۆ لای حـاکمی ئەجنـدەکان خەبەریـدا لـەم پیـاوە هـەژار و موسـڵمانه کـه پیـاوێکی بـاش نییـه لەگـەڵی وە هـەروەها پیاوەکەشـی کوشـتووە، ئینجـا چـوون بـۆ لای حـاکم، بریـاری حـاکم لـه سـێدارەدانی پیـاوە هـەژارە موسـڵمانەکه بـوو پیـاوە هەژارەکـه گوتیـەحاکم مـن زۆر کـارم هەیـه وە هـەروەها قـەردم هەیـه لەگـەڵ خـەڵکی ڕێگـەم بـدە بچـم بـۆ ماڵـەوە ئینجـا لـه سـێدارەم بـدە. وتـی: کـەفیلم دەوێ لـه جێگـەی تـۆ تـا بـڕۆی وتـی: پیـاوە هەژارەکـه ڕۆیشـت، چـوو بـۆ مـاڵی خـۆی هەنـدێك پـارەی هـەڵگرت چـووبۆ سـوڵتان عەبـدوڵلا کـه نزیـك ناحیـەی گـەیارە لەسـەر ڕووبارەکـه لەسـەر ئـەو ئـاوە ئـاژەڵێکی کوشـتەوە بەسـەر خەڵکیـدا دابەشـی کـرد هـەر بـەخێرایی وەچـووە نـاو مەرقـەدی سـوڵتان عەبـدوڵلا دوعـای کـرد لەبـەر دەسـتی ئـەو کۆمەڵـه ئەجنـدە ڕزگـاری بێـت وە قورئـانی پـیرۆزی هـەڵگرت ئینجـا هاتـەوە جێگـەی ئەجنـدەکان (مەنتیقـەی دۆڕە فریـزان) ئینجـا دەبێـت حـەو جـار بـانگ بـدات بـەدەنگێکی بـەرز جـەنابی حـاکمی ئەجنـدان گـەر دەتـەوێ لەسـێدارەم بدەی مـن ئامـادەم لـۆ لەسـێدارەدان حـەوت جـار بـانگی کـرد لەبـەر خـاتری قورئـانی پـیرۆز ئەجنـدەکان دەترسـان بێنـه پـێش هەڵـدەهاتن ئینجـا ئەجنـدە ئیسـلامەکه لـه کـەفیلاتی ئـەم پیـاوە هـەژارە کـەوت بـه نەخۆشـییەکی کوشـندە ئـەوجا قسـەی بـۆ خـەڵکی دەکـرد ئێـواران نـاویخوای گـەورە بهێـنن ((بسـم الله الـرحمن الـرحیم)) بڵـێن لـەکاتی نـان خـواردن هـەتا توشـی ئـەم ڕەوشـته خراپـه نـەبیت سـوپاس بـۆ خـوای گـەورە کـه ڕزگـارم بـوو لـه ئەجنـدەکان پاشـان بـاری تەندروسـتی زۆر خـراپ بـوو،

ڕووی کـــردە دکتۆرەکـــانی موســـڵ و بەغـــدا هـــیچ جێگەیـــەکی نەهێشـــت بـــۆ چارەســـەری نـــەبوو لەبـــەر ئـــەوە هـــیچ دارایـــی وســـامانی نـــەبوو کاریشـــی نـــەمابوو، ئینجـا زۆر جـار چـووە لای پیـاوە گـەورە شـێخەکان هـیچ چـارەی نـەبوو خـەرجی زۆری دا وای لێهـات هیچـی نـەما بـوو لەماڵـەوە منداڵـەکانی بیخـۆن، کـە هـەموو کەلوپـەلی ناومـاڵی فرۆشـت بـۆ خـەرجی ماڵـەوە بـۆ ئـەوەی ژیـان بەسـەر بـەرن تـا وای لێهـات کەلوپـەلی ماڵـەوەش نـەما، ئینجـا پـاش ماوەیـەك پیـاوە هەژارەکـە لەسـەر جێگـا کـەوت خێزانەکـەی زۆر خزمـەتی دەکـرد دەیویسـت ئـارام بێتـەوە تـا دەچـێتەوە پاشـان خزمـەکانی پـارەو پولیـان بـۆ دەبـرد پـاش ماوەیـەکی تـر پیـاوە هەژارە موسڵمانەکە مرد بۆ گۆڕستانێکیان برد ناوی بازرگە بوو.

= هـەر لـە سـەردەمی کۆنـەوە، لـە سـەردەمی سـۆمەرییەکان، خـەڵك بڕوایـان بـە ئەجنـدە هـەبووە و وایـان بـاس کـردووە کـە ئەجنـدە کەسـانێکن لەگـەڵ مـرۆڤ تێکـەڵیان هەیـە، بەشـێوەی جۆراوجـۆر. هـەتا لەسـەر ئـەو بـاوەڕە بـوون کـە ئەجنـدە شـەیتانە دەچـێتە نێـو لەشـی مـرۆڤ، بۆیـە کەسـانێك هـەبوون وەك حـەکیم، پێیـان دەگـوتن ((شـەیتان تـەرێن)) هـەروەها لـەنێو هـەموو میللـەتان ئـەم بـاوەڕی بـوونی ئەجنـدە هەیـە و پڕیشـە لـە چـیرۆکی جۆراوجـۆر، لـەنێو کـوردەواریش، بـاوەڕێکی ئـاوا هەیـە، کـە ئەجنـدە = لەمەچـێتر = جنۆکـە = خـەڵکانێکن لـەنێو ئێمـەدا دەژیـن، بـەڵام، ئێمـە نایـان بیـنین. بـەڵام، هەنـدێ جار دەردەکەون. لەم جۆرە چیرۆکانەش یەکجار زۆرن لەنێو خەڵك.

# سێ کوڕەکەی پاشا

**کۆکردنەوەی: هاوڕێ عبداللە محەمەد، هێمن جلال الدین**

**گێڕانەوەی: عزەدین مەولود ئیسماعیل**

**لەدایك بووی: ١٩٥٦ گوندی مۆریلان**

پاشایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو کوڕی گەورە ناوی ئەحمەد بوو، ئەوەی ناونجی ناوی محەمەدە، ئەوەی گچکە ناوی میرزا مەحموود بوو. ئەو پاشایە زۆر باش نەبوو غەدر و غدوری زۆری لە عالەم دەکرد عەیام هات و عەیام چوو ئەو پاشایە ئەمری خوای کرد، وەکی ئەو پاشایە ئەمری خوای کرد. شەوێ کوڕەکان هەستان گوتیان وا چاکە کە بڕۆین لەبەر خراپەکانی باوکیان هەریەکەو ئەسپیان هێنا و زین و مەعرەگەیان لێکرد و هەرچی زێڕ وماڵیان هەبوو هەموویان لە هەگبەی خۆیان کرد بردیان. هەستان ڕۆیشتن داخل بە بازێڕێك بوون لەو بازێڕە چوونە فندقێ لەو بازێڕە مانەوە، ساڵێك یان دوو ساڵ برای گەورە (ئەحمەد) ئەوی زێڕ و زەبەنی هەبوو تەواوی کرد هەتا ئەسپەکەشی فرۆشت، ئەو لێرێ چووە کن کابرایەك لە مەتعەمەکەی سەر و پێچك و ڕیخۆڵەی دەشوشتەوە بەنان و زگ، ئەو هەردوو برایەکەی دیکەی چوونە شارێکی تر عەیام هات و عەیام چوو ئەویش بەهەمان شێوەی (ئەحمەد)ی برای سەروەت و سامانی نەما بەئەسپەکەشییەوە، ئەویش لێرێ بەنان و زگ بووە شۆلکەری ماڵێك ڕیخی فڕێ دەدا و تەویلەی خاوێن دەکردەوە. برای گچکە (میرزا مەحموود) ئەویش لێیدا و ڕۆیشت چووە شارێکی دیکە هەستا ولاغەکەی خۆی بردە خانیەك وبەخۆشی غورفەی بۆ خۆی گرت. میرزا مەحموود چەند عەیامەك ماوە و ئەویش سەروەتو سامانەکەی نەما و بێ کار ما، ڕۆژێك لەناو بازاڕ دەگەڕا چووە بەر دوکانی پیاوێکی حاجی کە دوکانی (قوماش)ی هەبوو، چووە ئەوێ دانیشت ئەوحاجییە چەند ساڵ بوو دوکانی هەبوو هیچ بازاڕی نەبوو کە ئەو کوڕە دانیشتبوو لەوێ ئەو عالەمە بەرێ خۆی دایێ و قوماشیان دەکڕی لەو دوکانە، لەبەر ئەوەی کوڕەکە جاحێڵێکی زۆر جوان بوو خەڵکەکە ڕوویان تێدەکرد و لە سبەینێ هەتا ئێوارە هیچ قوماشی لە دوکان نەما و خڕ سەرف بوو کەوەختێ قوماشەکە تەواو بوو ئێوارە حاجی دوکانی داخست. کە تەماشای کرد ودیتی گەنجێك لەکن دوکانی دانیشتییە زۆر کوڕێکی جاحێڵی جوان بوو حاجی لێی پرسی تۆ چ کەسی ئەویش گوتی

پیـاوێکی فـەقیرم دەسـتی خسـتە بـەرکی خـۆی یـەك دوو دینـاری دایـە کوڕەکـە وگـۆتی ئـەو خێـرە، چـونکە ئـەورۆ قوماشـم زۆر فرۆشـت، مـیرزا مـەحمود بـەو پارەیـە یـەك دوو ڕۆژی قەتانـدو حـاجی هەسـتا بـەو یـەك دوو ڕۆژەقوماشـی کـڕی وخسـتیە نـاو دوکانەکـەی و حـاجی سـبەینێ هەسـتا هاتـەوە دوکـانی گـۆتی یـارەبی دەبـێ ئـەوکوڕە بێتـەوە بـەر دوکـانی هـەتا عالـەم بێنـەوە قوماشـەکەم لـێ بکـڕن.دیـتی ئـەو کـوڕە جاحێڵـە هاتـەوە کـن دوکانەکـەی دانیشـت، دیـتی دیسـان عالەمەکـە ڕوویـان لـە حـاجی کـرد و قوماشـیان لـە حـاجی کـڕی. هـەر لـە سـبەینێ هـەتا ئێـوارێ حـاجی هـیچ قوماشـی لـە دوکـان نـەما و خـڕی فرۆشـت، حـاجی دیسـان دوکـانی داخسـت و دیسـان چـاوی بـە کـوڕە جاحێڵەکـە کـەوت و دەسـتی خسـتە بـەرکی خـۆی و یـەك دوو دینـاری دایـە کـوڕە جاحێڵەکـە کـوڕە جاحێڵەکـە هاتـەوە بـۆ جێـی خـۆی و حـاجی چـووەوە مـاڵێ خـۆی، حـاجی کـە هاتـەوە مـارێ زۆر کـەیف خـۆش و خولـق خـۆش و گـۆتی کـوە حـاجی ئـەوە دوو جـارە کـەیف خـۆش و خولـق خـۆش دیـاری؟ حـاجی گـۆتی چـت لـێ بشـارمەوە ئـەوە دوو جـارە کـوڕە جاحێڵـیك دێتـە بـەر دوکـانی مـن لەبـەر ئـەو کـوڕە حاحێڵـە زۆر جـوان قشـتە عالەمەکـە ڕوو دەکەنـە دوکاتنەکـەم، ژنەکـەی گـۆتی حـاجی مـادام وەتۆیـە ئـەو جـارە لەگـەڵ خـۆت بیهێنـەوە ئەگـەر هاتـەوە دەیکەینـە کـوڕی خۆمـان. حـاجی هـەم دیسـان چـووە دوکـانی خـۆی، دیـتی وەختـەکی کـوڕە جاحێڵەکـە هاتـەوە جێـی خـۆی دانیشـت. دیسـان ئـەو عالەمـە ڕووی کـردەوە دوکانکـە و ئـەوی قومـاش بێـت نـەیان هێشـت، ئێـوارێ دوکانەکـەی داخسـت دیسـان دیـتی کـوڕە جاحێڵەکـە لـەجێی خـۆی دانیشـتیە دەسـتی هاوێشـتە بـەرکی خـۆی پـارەی دایـە کوڕەکـە هـات بـڕوات حـاجی قـۆڵی کوڕەکـەی گـرت و گـۆتی ئـەورۆ میـوانی مـنی، هاتنـەوە بوونـە میـوانی مـاڵی حـاجی ئێوارێکـە هـەر خواردنـەك چـاککرا بووخواردیـان پێکـەوە شـەولەگەڵ یـەك دانیشـتن حـاجی پرسـیاری لـە کوڕەکـە کـرد و گـۆتی چ کەسـی و لـەکێ دێـی و لـەکێ دەچـی؟ کوڕەکـە گـۆتی ئـەمن فـەقیرەکم بـێ کـەس بـێ دایـك و بـابم حـاجی گـۆتی باشـە مـادام ئـەتوو کەسـت نییـە ئێمـە منداڵمان نییـە ببـە کـوڕی مـە ئەمـەش دایـك و بـابتین. کـوڕە گـۆتی ئەگـەر ئـەنگۆ قـەبیل بکـەن ئـەمن قەبیلمـە کوڕەکـە واتـە (مـیرزا مـەحمود) گـۆتی ئـەمن ئەسـپەکم هەیـە لەوخانیەیـە دەمـەوێ بینمـە کنـە خـۆم بـەخێوی بکـەم. حـاجی گـۆتی: قەیناکـە ئەسـپەکەبینە کنـە خـۆتز ئـەوجا کـوڕە گـۆتی بابـە ئـەمن دەچـمە بـەر دوکـانێ لـەجیاتی تـوو، ئـەو کـوڕە دەچـووە بـەر دوکـانێ کەسـابەتی لـۆ بـابی دەکـرد. پاڵەوانـەك بـەو بـازێڕەی فێـر ببـوو لازمـە خـڕ ڕۆژەکـی واتـە هـەموو ڕۆژێـك نەفـەرەك بچـووبایە مەیـدانێ لـە بەرامبـەری

ڕابوەستایە بۆ شەڕ کردن لەگەڵی. ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو سڕ (نۆرە) گەیشتە حاجی قوماش فرۆش. گوتیان: سەبی نۆرەی تۆیە بچیە شەڕێ لەگەڵ دێوەی بکەی، ئێواریێ کوڕەکە هاتەوە تەماشای کرد بابی زۆر عێدزە. کوڕە گۆتی: بابە لۆ عێدزی؟ گۆتی کوڕم لۆ وەی عێدزم سبەی نۆبەتی مەیە بچمە شەڕێ لەگەڵ دێوەی بکەم، کوڕە گۆتی مادام وایە بابە ئەمن سبەی دەچمە مەیدانی شەڕی دێوەی. بابی گۆتی کوڕم ڕازی نیمە ئەتوو بچی چونکە هێشتا منداڵی ئەمن بەخۆم دەچم. کوڕەکە گۆتی: بابە قەبیل ناکەم ئیلانە بەخۆم دەچم، خەبەر بدە پاشای بڵێ کوڕەکم هەیە ئەو دەرێ دەچم، حاجی گۆتی: بچم بڵێم دەرێ ئەتوو کا کوڕت هەبوو، کورشە گۆتی گۆتی ئەگەر وەیگۆت ئەتوو بڕێ کوڕەکەم لە مەدرەسە لەشارێکی دیکە دەیخوێند. پاشاش گۆتی مادام وایە بەیانی هەڕووە مەیدانێ دێوەی. کوڕەکە ئێوارێکە ئەسپی خۆی تێر ئالیك کرد و ئامادەی کرد، سبەینێ زوو هەستا نوێژی خۆی کرد و بەرگی شەڕی لەبەر کرد و شیر و مەتاڵی خۆی لەبەر کرد و سواری ئەسپی خۆی بوو چووە مەیدانێ لە مەیدانێ ڕاوەستا بوو دێوەکە هات، دێوە چاوی بەم سوارە کەوت گۆتی ها سوارە ئەتوو هاتیە مەیدانم گۆتی بەڵێ ئەز هاتیمە مەیدانت. ئەو عالەمەش ڕاوەستایە لە ساحەی تەماشا دەکات. (میرزا مەحمود) گۆتی کافر داکەوە مەیدانێ هەر لە سبەینێ هەتا نیوڕانێ کەوتنە سوار سوارانێ بەشیر و مەتاڵی کەتنە مەیدانێ کەس پشتی کەسی نەشکاند. میرزا گۆتی کافر ئەوە نیوڕانە نوێژی خۆمان دەکەین و نانی خۆمان دەخۆین و دەکەوینەوە مەیدانێ، ئەوجارە کەوتنە وەبەر یەکتری بە ملە زۆرانە هەتا نوێژی عەسرێ میرزا مەحمود گۆتی یاڕەب خودایە ئەگەر ئەجەلی من بەدەستی وی هاتیە با لەکۆڵم کاتەوە، ئەگەر هەجەلی وی بەدەستی من هاتیە با لەکۆڵی کەمەوە. میرزا مەحمود دێوەی لە عەردی دا، هەریکێشایە شیری خۆی لەسەر ملی دێوەی دانا، دێوە دەستی هاوێشتە دەستی میرزا مەحمود و گرتی و گوتی مەمکوژە میرزا مەحمود گۆتی کافر لۆ دەپاڕێیەوە ئەگەر ئەتوو ئەمنت لە عەردی بدایە ئەمنت دەکوشت. دێوە بەرچێڵی والآ کرد دیتی ژنە. تاکە خڕخاڵەك لەپێی بوو میرزا مەحمود لەپێی کردەوە دێوە بووە کۆترەك و فڕی کەس نەیزانی بووە چەپڵە کوتان و خۆشی میرزا مەحمود ئەو دێوەی لەکۆڵ ئەو بازێڕە کردەوە. خەبەر پاشا گۆتیان کوڕی حاجی دێوەی کوشت و ڕۆیشت پاشا جوابی ڕەوان کرد گۆتی لازمە حاجی و کوڕەکەی بێنە ئێرە، وەختێ چوونە کن پاشای پاشا گۆتی ئەوە کوڕی تۆیە: حاجی گۆتی: بەڵێ. پاشا گۆتیە کوڕەکە ناوت چییە؟

گۆتی میرزا مەحمود گۆتی ئەتوو دێوەت کوشت؟ گۆتی بەڵێ پاشا گۆتی مادام ئەتوو دێوەت کوشت ئەمن کچی خۆمت پێشکەش دەکەم، گازی قازی و مەلای کرد و لێیان مارە کرد و قەسرو قسورێکی بۆیان دروست کرد و گواستیوە چەند مانگەك لەکنی بوو ڕۆژەك میرزا هەستاوە لەبەر جێیەکەی خۆی ئەو تاکە خڕخاڵەی لە بەرکی بوو بەربووەوە سەر جێگەکەی لە فکری چوو هەڵیگرێت کچەکەی پاشا سبەینێ جێی هەڵگرت تەماشای کرد تاکە خڕخاڵەك لەسەر جێیەکە کەوتووە، هەڵیگرت کچەکە چووە کن بابی گۆتیە بابە ئەو خڕخاڵەم لەسەر جێی خۆم و میرزا هەڵگرتیە دیارە میرزا بەمن ڕازی نییە دیارە حەزداری دەکاتن، وەختێ کچە ئەوەی گۆت پاشا لە دووی میرزای ڕەوان کرد، وەختێ میرزا چووە کن پاشا، پاشا گۆتی میرزا ئەو تاکە خڕخاڵەت لەکوێ هێناوە میرزا گۆتی پاشام ئەم تاکە خڕخاڵە هی ئەو دێوە بوو کە من کوشتم پاشا گۆتی دەبی هەواڵی ئەو تاکە خڕخاڵەم بۆ بینی، میرزا گۆتی مۆڵەتی مانگەکم بدەیێ تا بچم لەدووی. وەختی میرزا گەڕایەوە ماڵ زۆر عێدز بوو دایك و باوکی گۆتیان کوڕم لۆ عادز بووی گۆتی وەڵڵاهی چتان لێ بشارمەوە پاشا داوای هەواڵی ئەو تاکە خڕخاڵەی لێم کردیە ئەوجا دەبێ سبەینێکە ئەمنبچم. میرزا سبەینێ سواری ئەسپی خۆی بوو ڕۆیشت. وەختێ کە ڕۆیشت گەیشتە چڵ سواری، چڵ سوار لە لایەك بوون یەك سواریش بەتاقی تەنێ لەلایەك بوو میرزا گۆتی یاڕەبی خودایە ئەمن بە لای چڵ سوارەکە بچم و سەلامیان لێ بکەم دەڵێن لە چلەکەی ترسا لە یەکەکەی نەترسا هەستا بەبەینی هەردوولایان ڕۆیشت سەد مەتر لێیان دوور کەوتەوە گۆتی وەڵڵاهی دەگەڕێمەوە پرسیار دەکەم کا بزانم مانای چییە؟ چڵ لەلایەکن، یەك لەلایەکە. وەکی گەڕایەوە سەلامی لە هەردوو لایان کرد گۆتی مانای چییە؟ چڵ لەلایەکن، یەکێك لەلایەکی ترە. هەر چڵ جوابی میرزایان داوە گۆتیان ئەوە دێوە زوڵم و زەواری لەسەر ئێمە دەکاتن هەموو ساڵێك زێڕ و سەرانەمان لێ دەستێنی وەختێ وەیان گۆت میرزا گۆتی کافر داکەوە مەیدانێ دیسان ملیان لەبەر ملێ یەکتر نا هەتا نوێژی نیوەڕانێ نانی خۆیان خوارد و نوێژی خۆیان کرد دیسان دەستیان بە زۆرانێ کرد تا نوێژی عەسرێ میرزا گۆتی یاڕەبی خودایە ئەگەر ئەجەلی من بەدەستی ئەو هاتیە بمکوژێ، ئەگەر ئەجەلی وی بەدەستی من هاتیە بیکوژم تا نوێژی عەسرم نەچێ قوەتی دایێ و لەعەردیدا هەڵی کێشایە شیری لەبەر ملی دێوەی دانا. دێوە پاڕاوە و گریا و گۆتی کافر لۆ دەگرییێ ئەگەر ئەتو ئەمنت لە عەردی بدایە منت دەکوشتز ئەوجا تەماشای کرد ئەنگوستیلەی لە پەنجەی دابوو دیتی

کچە ئەنگوستیلەکەی لەدەستی کردەوە ئەویش چووە ئاسمان و بزر بووو هەر چلەکە گۆتیان ها... چمان لێ دەکەی میرزا گۆتی هەر چلتان بڕۆنەوە ماڵێ خوا حافیزی لێ کرد و لێیدا ڕۆیشت چووە سەر زێیەك چەند کەڵەکەوان لەسەر زێ بوون میرزا گۆتییە کەڵەکەوانکەی وەرە دەربازم کە بمپەڕێنەوە. کەڵەکەوانەکە گۆتی: نازانم لەناوەندی زێ دەستەك دێتن کەڵەکەکەی وەردەگێڕێت نازانم چییە؟ گۆتی من خەمی خۆم نییە خەمی توومە جاحێڵێکی جوانی نەکو بخنکێی من مەلەوانم. میرزا گۆتی قەیدی ناکا وەرە دەربازم کە، وەختێ سواری کەڵەکەکە بوو هەڵی کێشایە شیری لەبەر کەلەکەکە ڕاوەستا و تەماشای کرد تا بزانی ئەوە چییە ئەو کەلەکەی وەردەگێڕێ؟ وەختێ گەیشتنە ناوەندی زێ دیتی دەستەك هات کەلەکەکەی وەرگێڕێ شیرەکەی لە دەستەکەداو بڕی ئەو زێیە بووە خوێن و خوێناو، وەختێ ئەو کەلەکە دەرباز بوو ئەوانی ئەوبریش چاویان پێکەوتن دەرباز بوون هیچ نەبوو ئەوانیش هاتن و دەرباز بوون لەناو زێیەکەدا، میرزا هەقی کەڵەکوانی داو ڕۆیشت. کە ڕۆیشت داخلی بازێڕەکی بوو جڵەوی ئەسپی خۆی بەرداو گۆتی بچیتە هەر مارەکی ئەمن میوانی ئەو مارەم چوو لەبەر دەرگەی مارێ پیرەژنەکی وەستا لە دەرگەی مارەکەیداو پیرەژنەکە هاتە دەرێ. چاوی پێکەوت دیتی سوارەك لەپێش دەرگەی ڕاوەستایە، گۆتی ها کورم چت دەوێت؟ گۆتی وەڵلا داپیرە میوانی توومە پیرەژن بەهەر حاڵەکی جێی کردەوە میرزا دەستی هاوێشتە بەرکی خۆی زێڕەکی دەرهێنا و دایە پیرەژن خواردنی لۆ بکڕێ پیرەژن چووە بازاڕی هەندەك خواردنی هێناو هێنایەوە مارێ و ئێواری خواردیان. میرزا گۆتی داپیرە جێی پەرییان نازانیف پیرەژن گۆتی کورم بنوو تا سبەینێ سبەینێ پێت دەڵێم. پیرەژن سبەینێ زوو هەستا خواردنی حازر کرد و نانی خۆیان خوارد چوونە سەربانی گۆتی کورم بەرێ خۆیدە ئەو سەحرایەی ئەو قەسرە سپییە یە قەسری پەرییانە. میرزا لێیدا و ڕۆیشت چووە کن قەسرەکەی. لەکن قەسرەکە هاتە خوارێ چووە ناو قەسرەکە دەبینی سێ تەخت دانرایە سێ کونیش لە قەسرەکە لە ڕاستی تەختەکان هەیە. میرزا خۆی لەبن تەختەکی شاردەوە دیتی سێ کۆتر هەر یەکێ لە کونەکی هاتنە ناو قەسرەکەوە. دووانیان گۆتیان بۆن دێ بۆنی بەنی ئادەم دێ. ئەوی گەورە گۆتی هەریەکە بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە بزانی چی بەسەر هاتییە؟ دووانەکەی تر گۆتیان ئەتوو لەهەردووکمان گەورەتری بگێڕێەوە. ئەوەی گەورە گۆتی وەختی خۆی ئەمن پاڵەوانەك بووم زوڵمم لە بازێڕەکی دەکرد هەموو ڕۆژێك دەبوایە یەکێك بهاتبایە

مەیـدانی دەمکوشــت و دەمخــوارد ڕۆژەك چــوومە مەیـدانێ دیـتم کـوڕە جاحێڵێـك هاتـە مەیـدانێ گـۆتی کـافر داکـەوە مەیـدانێ شـەڕمان کـرد ئـەمنی لـە عـەردی داو هەڵیکێشـایە شـیری و کـەمن بکـوژی لەبـەری پاڕامـەوە تاکـە خرخاڵـەکم لـەپێم بـوو بردی و ڕۆیشت ئەگەر برواش ناکەن ئەوەتا تاکە خرخاڵەکەی ترە لەکنمە.

وەخـتێ مـیرزا گـوێی لێبـوو گـۆتی ئـەوە یـەکێکیانم دیتـەوە، ئـەویتریان گـۆتی وەخـتی خـۆی دێـوەك بـووم زوڵـم و زۆرداریـم لەسـەر چـل کەسـان دەکـرد، دیـتم سـوارەك بـەلامان داهـات بەبـەینی هـەردوو لامـان داهـات هـیچ سـەلامی نـەکرد لێمانـدوور کەوتـەوە جـارەکی تـر گـەڕاوە سـەلامی لـە هـەردوولامان کـرد. پرسـیاری کـرد لەبـەر چ ئـەنگۆ چـل لەلایـەك و یـەك لەلایـەکی ڕاوەسـتاینە هـەر چلەکە گۆتیـان ئـەو زاڵمـە هـەموو سـاڵێك غـەدرمان لێـدەکات و زێـڕو سـەرانەمان لـێ دەسـتێنێ. ئـەو سـوارە گـۆتی کـافر داکـەوە مەیـدانێ کەوتینـە بـەر یـەك بـە ملـە زۆرانـێ ئـەمن لـە عـــەردی دا هەڵیکێشـــایە شـــیری کـــە بمکـــوژی و ئـــەمن لەبـــەری پاڕامـــەوە و ئەنگوسـتیلەیەك لـە دەسـتمدا بـوو لـە دەسـتمی کـردەوە و بـردی ئەگـەر پـێم بـڕوا ناکـەن ئـەوە جێـی ئەنگوسـتیلەکەیە. ئـەوەی سـێیەم گـۆتی ئـەمنیش پاڵەوانـەك بـووم لەبـەحرێ هـەر کەڵـەکوانێك دەهـات قڵـپم دەکـردەوە و غـەرقم دەکـرد، ڕۆژەك کەڵەکـەوانێك هـات دەسـتی خـۆم درێـژ کـرد شـیرەك هـات لـە دەسـتمی داو دەسـتمی بـڕی ئەگـەر باوەڕێشـم پـێ ناکـەن هێشـتا دەسـتم هـەر برینـە. ئـەوەی گـەورە گـۆتی مـــیرزا وەرە دەرێ ئـــەوجا مـــیرزا هاتـــە دەرێ دەســـتیان بەدانیشـــتن و کـــەیف و خۆشــی کــردو مـیرزا دەڵێــت ئــەمن هاتیمــە لــەدوو ئــەو تاکــە خرخاڵــە هەرســێ پەرییەکـە دەڵـێن ئـەو شـەو بـا بنـوین بـەیانی مەوعـدمان بەرامبـەری بازێڕیـە، بـەیانی مەلایــەکان و ســۆفییەکان چــوونە مزگــەوتێ تەماشــایان کــرد قەســر و قســورێك لەبەرامبـەری بـازێڕ دیـارە، مـەلا و سـۆفییەکان چـوونە لای پاشـا گۆتیـان پاشـامان خـۆش بـی دوێـنێ ئـەو قەسـرە لێـرە نـەبوو، ئـەوڕۆ ئـەو قەسـرە دروسـت کرایـە پاشـا وەکـی تەماشـای کـرد گـۆتی ڕاسـتە گـازی دوو پۆلیسـی کـرد بـڕۆن تەماشـا بکـەن بـزانن چ قەسـرە؟ وەکـی تەماشـایان کـرد بینیـان مـیرزا و سـێ ژن نوسـتینە یـەك لـە یـەکی جـوانتر نووسـتیە، مـیرزا سـبەینێ هەسـتا گـۆتی پاشـا لەسـەر یـەك تاکـە خرخـاڵ ڕەخنــەی لــێم گــرت بزانــێ ســێ ژنم لەگەڵــە دەمکــوژێ. گـۆتی وا باشــە ئەسـپەکەم ببـەم و بچـم پاشـای بکـوژم لـەجێی ئـەو ببمـە پاشـا سـواری ئەسـپەکەی بـوو چـوو پاشـای کوشـت بـووە پاشـا، مـیرزا گۆتیـە خەڵکەکـە و دار و دەسـتەکەی ئـەوەی پێـی ناخۆشـە بـا دەنـگ بکـات خەڵکەکـە گوتیـان مـادام پاشـا چـوو تـۆ لــەجێی پاشــای مـیرزا خەزنەکــەی پاشــای شــکاند، خانوبەرەیــەکی قەشــەنگی

دروست کرد وەکو هی بابی مەتعەمەکی گەورەی دروست کرد سێ جەمە خەڵك خواردنیان دەخوارد بەبەلاش لە بەر ئەوەی بوو براکانی دیکە بێنە ئەو شارە بێنە لای میرزا مەحمودو ڕۆژێك پیاوێك بەپاڵ بازێڕێکدا چوو بینی پیاوێك ڕیخەڵۆك دەشواتەوە و پرسیاری لێ کرد ئەوە چ دەکەیڤ گوتی ئەوە کارمەو گۆتی ڕۆژانەت چەندە؟ گۆتی نان و زگە. پیاوەکە گۆتی مادام برۆ فلانە بازێڕ پاشایەك هەیە نانی دەداتە خەڵك بەبەلاش، کابرا گۆتی لەوانەیە بچم پارەم لێ وەربگرنو بەڵام پارەم نییەز پیاوەکە گۆتی پێکەوە هەردووکمان دەچینە ئەو بازێچڕە، کە هاتنە بازێڕەکە جەمی نیوڕان بوو خواردن دانرا و خەڵکەکە نانیان خوارد پیاوەکە بە کابرای برای میرزای گۆت برۆ نان بخۆ ئەویش نانی خوارد پاشاکە ڕیز ڕیز دەگەڕا تەماشایانی ەکرد بینی براکەی وا لەگەڵ خەڵکە نان دەخوات پاشایەکە گەڕایەوە جێی خۆی، دوو پۆلیسی نارد گۆتی ئەو کابرایەم لۆ بینن پۆلیس قۆڵی کابرایان گرت و گۆتیان پاشا گازت دەکات. کابراکە گۆتی: پارەم پێ نییە گوتیان بۆ پارەمان نییە، پاشا کاری پێتە وەختێ هاتە کن پاشایەکە سەلامی کرد. پاشا گۆتی: کوڕم چ کاردەکەی؟ کابرا گۆتی: وەڵڵاهی من فەقیرم بە نان و زگ کار دەکەم پاشا گۆتی وەرە بۆ من کار بکە ڕۆژێ زێڕەکت دەدەمێ و لەگەڵ خواردنز هەروەها برای دووەمیش بەهەمان شێوەی براکەی تری ڕۆژێکیان کابرایەك دەچێتە ئەو بازێڕەی کە برای دووەمی لێیە دەبینی کابرایەك قەرتاڵەی ڕشیخی لەسەر ملی بوو دەیڕژاند ئەویش پرسیاری لێ کرد چ کار دەکەی؟ گۆتی ئەوە کاری منە گۆتی ڕۆژانەکەت چەندەڤ گۆتی نان و زگە، پیاوەکە گۆتی هەی قوڕ بەسەر برۆ فلانە بازێڕ نان بەلاشە کابرا گۆتی دەترسم پارەم لێوەربگرن پارەم پێ نییە، پیاوەکە گۆتی وەرە لەگەڵ من ئەگەر پارەیان لێ وەرگرتی من پارەکە دەدەم پێکەوە هاتن بۆ بازێڕەکە وەختی جەم هات تێکڕا عالەمەکە چوونە نان خواردن هەم دیسان پاشایەکە هات تەماشای کرد برایەکەی دیکەی وا نان دەخوات بە هەمان شێوەی برای پێشووی دوو پۆلیسی ڕەوانە کرد بیهێنن بۆ لای پاشا. بردیان بۆ لای پاشا هەمدیسان پرسیاری لێ کرد چ کار دەکەی؟ کابرا گۆتی بەنان و زگ کار دەکەم پاشا گۆتی وەرە ڕۆژێ زێڕەکت دەدەمێ لەگەڵ نان خواردن کارم بۆ بکە، هەردوو برایەکە پێکەوە لەلای پاشا کاریان دەکرد یەکتریان نەدەناسی و بەڵام پاشا دەیانی ناسی ئێوارەیەك هەردووکیان چوونە خانی نووستن هەر یەکە لەلایەکەوە خۆیان درێژ کردبوو بۆ نووستنو برای گەورە تەماشای کرد گۆتی: ئەو خانوو بەرەیە وەك خانوو بەرەی باوکم وایەو براکەی دیکەش

بەهەمان شێوەی برا گەورەکەی وای گۆتو برا گەورەکەی گۆتی: دیارە لاسایی من دەکەیەە هەردووکیان بەشەڕ هاتن. پاشاش لە کونێکەوە چاودێرییانی دەکرد، دوای هەردووکیان لێك بوونەوە پاشان هەردووکیان قسەیان لەگەڵ یەك کرد و بەسەرهاتی خۆیان بۆ یەکتر گێڕاوە دەرکەوت هەردووکیان برای یەکترن، سبیانێ پاشا بانگی هەردووکیانی کردو هاتنە حزور پاشا، پاشا پرسیاری کرد گۆتی: ئەو شەو بۆچی بەشەرش هاتن؟ گۆتیان پاشام بەشەڕ نەهاتینە. پاشا گۆتی: ئاگام لە هەموو شتێك بوو ڕاست بلێن بەلێ پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی یەکتر دەرکەوت هەردووکمان براین. پاشا گۆتی باشە برای ترتان نییە؟ ئەوان گۆتیان برایەکی ترمان هەبوو خوێڕی بوو نازانین چی بەسەر هاتووەز پاشا گۆتی ئێستا ببینن ناینناسنەوە؟ گۆتیان بەلێ دەیناسینەوە، پاشا گۆتی ئەگەر باوەڕ بکەن ئەمن میرزا مەحمودم ئەوان گۆتیان (أستغفر ألله) تۆ ئەو نیت! میرزا مەحمود لەسەرەتا تا بووەنە پاشای بەسەرهاتی خۆی بۆیان گێڕاوە ئەوان بڕوایان کرد کە میرزا مەحمود برایانە. میرزا مەحمود بانگی حەمام چی کرد گۆتی بیانبەنە حەمام پاك بیانشۆن دوو پۆلیسی ڕەوانە کرد جلوبەرگی جوانیان بۆ بهێنن برایەکیانی کردە دەستە ڕاستی خۆی ئەوی دیشی کردە دەستە چەپی خۆی، هەریەکە پەرییەکیان مارە کرد. بەمجۆرە کۆتایی بە چیرۆکەکەمان هات بەشاد بوونەوەی هەرسێ براکە.

= ئەمجۆرە ئەفسانانە زۆرتر باسی کوڕە پاشا دەکەن و بەزۆریش کوڕە پاشا (٣) کوڕن و لەو سێیە یەکێکیان بەزۆریش ئەوی گچکە لێهاتووە. ئەوان کە سەروەت و سامانی بابیان تەواو دەبێ، خۆیان بۆ بەخێو ناکرێ، بەلاّم برای گچکە نەك هەر لێهاتووە، بەڵکە دەبێتە پاشا. ئەم ئەفسانەیەش پێمان دەڵێ: سەروەت و سامان و باوك و پاشا و بنەچە لەنێو دەچێ، بەلاّم لێهاتوویی دەمێنێ و سەرمایەی ڕاستەقینە تاکە ڕەگەزی ئەفسانە لەم حیکایەتە زۆرە، دواجار براکان پەریان مارە دەکەن.

# پیاوێکی هەژار

**گێڕانەوەی: عوسمان محەمەد ئەمین.**

هەبوو نەبوو پیاوێکی هەژار هەبوو لەگوندێك دەژیا، پیاوە هەژارەکە چێڵێکی هەبوو زۆر باش بووو هەندێ خەڵك لە گوندەکە کەیفیان بەو پیاوە هەژارە نەدەهات حەزیان دەکرد لە گوندەکەیان نەمێنێت. ڕۆژێکیان هەستان بەدانانی پلانێك بۆ ئەوەی پیاوە هەژارەکە چێڵەکەی سەربڕێ و هیچی نەمێنێت، کۆمەڵێك لە خەڵکی گوندەکە هاتنە لای پیاوە هەژارەکە ووتیان دنیا هەندەی ناهینی هەموومان هەر دەمرین وەرن با خەڵکی گوندی هەموو چێرەکانی خۆمان سەربڕین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەر ڕۆژێ یەکێك چێڵەکەی خۆی سەربڕێ و بیکەن بەشیو خەڵکەکە بیخۆن.

خەڵکەکە گوتیان دەبێ کێ سەربڕێ و کێ سەرنەبڕێ وتیان پیاوە هەژارەکە یەکەمجار چێڵەکەی خۆی سەربڕێ، پیاوە هەژارەکە کەم زان بوو هەستا چێڵەکەی خۆی سەربڕی و کردیانە چێشت و خەڵکەکە خواردیان پاش ئەوەی کە خواردنەکەیان خوارد هەرکەسە چوونە ماڵی خۆیان گوتیان پلانەکەمان سەری گرت، شەو هات و بەیان هات لەبۆ سبەینێ پیاوە هەژارەکە چووە لایان ووتی: جەماعەت ئەمڕۆ سرەی کێیە چێڵەکەی سەر بڕی؟ ئەوانیش دایانە قاقای پێکەنین و پێیان گوت: کابرا ئەتوو شێت بووی! چت بەسەر هاتیە کێ چێڵی خۆی سەردەبڕێ پیاوە هەژارەکە بەدڵ ساردی گەڕایەوە لای خێزانەکەی پاشان لەبۆ بەیانی هەستا پێستە چێڵەکەی لەناو تورەگەیەك کرد و بەرەو شار بەڕێکەوت وتی هەر پێستەکە بفرۆشم شتێك بێتەوە جێی لە ڕێگادا ڕۆیشت تا شەوی بەسەردا هات، شەوێ تووشی هەندێ بازرگان بوو کە سێ سوار بوون قوماشی جۆراوجۆریان پێبوو دوای ئەوە گەیشتە ئەوان سڵاوی لێیان کرد و ئەوانیش وەڵامی سڵاوەکەیان داوە و وتیان: فەرموو دانیشە، ئەویش چوو لەدووری ئەوان دانیشت ئەوانیش وتیان کابرا بۆ نایەی لای ئێمە دانیشی؟ کابرای هەژار گوتی: بارەکەی ئێوە قوماشە لەبەر ئەوە نایەم لای ئێوە دابنیشم ئەوانیش گوتیان: ئەی باری تۆ چییە؟ پیاوە هەژارەکە گوتی: باری من ڕوح تۆتیای تێدایە، لەبەر ئەوە ناوێرم لەلاتان دانیشم ئەوانیش هەستان بەدانانی پلانێك وتیان با فێڵێك لەم کابرایە بکەین ئەم پارەی لێ بسەنین و بیبەین

پاشـان پیـاوە هەژارەکـە زانـی فێڵـی لـێ دەکـەن خـۆی لەخـەوێ خسـت هـەتا ئـەوان فێڵەکـەی خۆیـان ئـەنجام بـدەن (سـێ بازرگانەکـە) نیـوەی شـەو هەسـتان بـەبێ ئـەوەی سـەیری بـاری پیـاوە هەژارەکـە بکـەن قوماشـەکانی خۆیـان بـەجێ هێشـت و تورەگـەی پیـاوە هەژارەکـەیان ڕفانـد و ڕایـان کـرد. کاتێـك ئـەوان بـزر بـوون پیاوەکـە قوماشـی بازرگانـەکانی هـەموو کـۆکردەوە بـە پێچـەوانەی ئاراسـتەی ئـەوان کەوتـە ڕێ و ڕۆیشـت بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێـژ تـا بەتـەواوی لـە مەترسـی بازرگانـەکان دوور کەوتـەوە لایدایـە جێگایـەك ئـەو شـەوەی بەسـەر بـرد، کـە بـەیان بـووە و بـەرەو شـار کەوتـە ڕێ کـە گەیشـتە شـار قوماشـەکانی هـەموو فرۆشـت بـە پارەیـەکی بـاش، دەسـتێ جلـی جـوانی کـڕی و بـەرەو گوندەکـەی خـۆی گەڕایـەوە کـە گەیشـتەوە گوندەکـە خەڵکەکـە سـەریان سـوڕما گوتیـان: ئـەو جـل و بەرگـە جوانـەت لـەکێ پەیدا کردیـە خـۆ ئـەتو هیچـت نـەبوو؟ پیـاوە هەژارەکـە گـوتی: ئێـوە چـێڵەکەتان بـەمن سـەر بـڕی فێڵتـان لـەمن کـرد منـیش پێسـتەکەم بەشـانم داداو چـوومە شـار پێسـتەکەم فرۆشـت و ئـەو جلانـەم پـێچ کـڕی و کۆمەڵـە پارەیـەکم بـۆ مایـەوە پارەکـەی دەرهێنـا و پیشـانی خەڵکەکـەی دا. خەڵکەکـەش بڕوایـان پـێ کـرد هـەموو چـوونە ماڵـەوە چـێڵەکانی خۆیـان سـەربڕی بـۆ بـەیانی پێسـتەکانیان لەناو تورەگـەی کـرد و بـەرەو شـار چـوون، لـەناو شـار گـەڕان و سـوڕان هاریـان کـرد یـەڵڵا پێسـتە، یـەڵڵا پێسـتە کـەس ئـاوڕی لێیـان نەدایـەوە. دوای ئـەوەی زۆر هـیلاك بـوون لەگـەڕان و سـووڕانەوە بـەدڵێکی توونـد بـەڕق و کینەیـەکی زۆرەوە بـەرەو گوندەکـەیان گەڕانـەوە، پیـاوە هەژارەکـەش لـە گونـدی دەیزانـی هـەموویان هۆرتـە هۆرتـە دەگەڕێنـەوە خـۆی ئامـادە کـرد بـوو لـەبۆ هـەڵاتن خەڵکەکـە کـە چـاویان پێکـەوت پـەلاماریان دا ئـەویش زوو هـەڵات و خـۆی لـە چـنگیان ڕزگـار کـرد ڕۆیشـت هـەتا گەیشـتە گونـدێك لـەو گونـدە تووشـی مەلایـەك بـوو پـاش ئـەوەی چـاك و چـۆنی لەگـەڵ مـەلا کـرد، باسـی ژیـانی خـۆی کـرد بـۆ مـەلا، مـەلاش گـوتی: بـڕۆ ماڵـەوە فـەردە گـەنمێك ببـە. دوای ئـەوەی چـووە مـاڵی مـەلا دیـتی مـەلاژن لەگـەڵ پیاوێـك دەسـتی تێکـەڵاو کـردووە. ئـەویش بەتونـدی لـە دەرگـای مـاڵی مـەلای دا مـەلاژن بـەخێرایی پیاوەکـەی شـاردەوە ئـەوجا هـات دەرگـای کـردەوە بـەخێرهاتنی پیـاوە هەژارەکـەی کـرد، ئـەویش گوتیـە: مـەلاژن مـەلا گوتوویـەتی: هەنـدێك گـەنم بـدەیێ ئـەویش بـەخێرایی گەنمەکـەی بـۆ تێکـرد بـۆ ئـەوەی زوو بـەڕێ بکـەوێت پـێش ئـەوەی مـەلا بێتـەوە، پیـاوە هەژارەکـە فێڵـی کـرد ئـەویش بـە ڕژانـدنی فـەردە گەنمەکـە لـەناو حەوشـەی مـاڵی مـەلادا پاشـان کەوتـە خڕکردنـەوەی مـەلا ژنـیش

گـۆتی: واز لـەو گەنمـەی بینـە گـەنمی دیکـەت بـۆ تێدەکـەم ئـەویش گـوتی: مـن گـەنمی خـۆم خـڕ دەکەمـەوە هـەتا ئـەو هـێن و مێنـەی کـرد مـەلاش هاتـەوە پێکـەوە دانیشـتن پیـاوە هەژارەکـە کـەرێکی پـێ بـوو بەقەسـت ئالیـك و ئـاوی نـەدایێ لەبـەر هەنـدێ کەرەکـە دەسـتی بـە زەڕەزەڕ کـرد ئـەویش چـووە لای کەرەکـە و دایـە بـەر داران گـوتی خـۆ مـاڵی خۆمـان نییـە شـتم لـێ ئاشـکراکەی، هاتـەوە دانیشـت دیسـان کەرەکــە بەهــەمان جــاری پێشــوو دەســتی بــە زەڕە زەڕ کــردەوە، ئــەوجارە پیاوەکـە چـوو هەنـدێ قسـەی لەگـەڵ کەرەکـەی کـرد مـەلاش گـۆتی دەبێـت پـێم بڵێـی ئـەو کـەرە بـاس لـە چ دەکـات؟ ئـەویش گـوتی ئـەو کـەرەم دەڵـێ مەنجـەرێك ئـاو بکـوڵێنن و بەسـەر ئـەو قەسـەڵەی دابکـەن، قەسـەڵەکەش دۆسـتی مـەلاژنی لـەبن بـوو، پاشـان مـەلا گۆتیـە مـەلاژن بـڕۆ مەنجـەڵێك ئـاو گـەرم بکـە مـەلاژنیش زۆر ڕەجـایی لـە مـەلا کـرد و گـوتی پیاوەکـە بـەگوێی ئـەو پیـاوە مەکـە کـەر کـەی قسـە دەکـات؟ مـەلاش سـوور بـوو لەسـەر کارەکـەی بۆیـە مـەلاژن بەناچـاری ئاوەکـەی کوڵانـد و بەسـەر قەسـەڵەکەی داکـرد و کـابراش لـەبن قەسـەڵەکەی سـووتا و مـرد. پاشـی مـەلا چـووە سـەر کارەکـەی کـابرای هـەژار لـەماڵ مایـەوە خـۆی ئامـادە دەکـرد بـڕوا. مـەلاژن گـوتی: چـۆن ئـەم کەتنـەت پـێ کردمـو ئـەوهاش دەبـێ لاشەکەشـیم لەگـەڵ فـڕێ بـدەی پیـاوە هەژارەکـە هەسـتا کەرەکـەی خـۆی هێنـا و لەسـەر پشـتی کەرەکـە لاشـەکەی بـارکرد و بـەجۆرێك داینـاو بەسـتایەوە هـەروەك پیـاوەك سـواری کـەرێ بوایـە وا بـوو پـاش ئـەوەی لـە گونـدێ چـووە دەرێ ڕۆیشـت تـا گەیشـتە گونـدێکی تـر لـە نزیـك گوندەکـە کەرەکـەی بـەڕەڵڵای سـەر جۆخینـان کـرد بەخۆشـی خـۆی شـاردەوە پاشـان کەرەکـە گەیشـتە سـەر جـۆخینی جۆیەکـە و دەسـتی بـەخواردنی جـۆ کـرد خـەڵکی گونەکـەش گـازی کابرایـان کـردو کـابرا ئـەوە چـاوت نـابینی ئـەو کـەرەت بەردایتـە نـاو جۆخینـان چـەندی هاواریـان کـرد کابراکـە مـردووە و گـوێی لـێ نییـە ئـەوانیش غاریـان دایـێ و وەرگـەڕانێ بـە خاکـەناس کـابرا بـەر بـووەوە سـەر زەوی پاشـان پیاوەکـە کـەخۆی لەپـەنا شـاردبۆوە هاتـە دەرەوە بـەغار چـوو هـاواری کـرد ئـەی هـاوار لەسـەر مسـتەك جـۆ براکـەمیان کوشـت پاشـان خەڵکەکـە گوتیـان بابـە براکـەت دیـارە ئەجـەلی هـاتووە ئەگـەر نـا بـەو خاکەناسـە چـۆن دەمـرد؟ وەرە بـا سـوڵحت لەگـەڵ بکـەین پـارە و گەنمـەکی باشـیان دایـێ و چـووەوە گونـدی کـە دیتیـان خەڵکەکـە بـەدوای کـەوتن هـەتا گەیشـتە دەشـتاییەك لـەوێ تووشـی شـوانێك بـوو شـوانەکە پێـی گـوت بـۆ وا ڕادەکـەیت ئـەویش گـۆتی: ئـە خەڵکـە وازم لـێ نـاهێنن دەڵـێن دەبـێ بـبی بـەکوێخای گونـد شـوانەکەش دەڵـێ

باشە من ئەم کارە لەجیاتی تۆ دەکەم. جلوبەرگی یەکتری دەگۆڕنەوە کابرا هەژارەکە دەچێتە لای مەڕەکان کابرای شوانە بەپیر خەڵکەکەوە دەچێت و دەڵێت ئەمن دەیکەم دەبم بەکوێخا پاشان دیارە ئاوێک لەو ناوچەیە نزیکە ئەوانیش یەکسەر شوانەکە دەخەنە ناو ئاوەکەوە شوانەکە دەخنکێت دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک کابرا هەژارەکە بەخۆی و مێگەلە مەڕێکەوە دێتەوە گوندیز خەڵکەکە کە چاویان پێ دەکەوێت دەڵێن کوڕە ئێمە ئەتۆمان نەخنکاند تۆ لەکوێ پەیدا بوویەوە؟ پیاوە هەژارەکە ووتی چەندم گازی ئێوە کرد و هاوارم دەکرد کەس وەلامی نەدامەوە بن ئاوەکە گەلێکی مەڕ لێبوو هەر ئەوەندەم پێهات بەشی خۆم هێنا خەڵکەکەش باوەڕیان پێکرد ڕوویان کردە ئاوەکە و گوتیان چۆن بزانین مەڕی لێیە یان نا؟ ئەویش گۆتی یەکتان بچنە ناو ئاوەکەوە ئەگەر ئاوەکە دوو سێ بڵقە بلقی کرد ئەوە بزانە گازتان دەکات، یەکێکیان خۆی فرێدایە ناو ئاوەکەو ئاوەکە دوو سێ بڵقەی کرد و کەوتە سەر ئاوەکە دەخنکێ، پیاوە هەژارەکە دەڵێت ئەوە گازتان دەکات دیارە زۆری لێیە پاشان خەڵکەکە هەموویان خۆیان دەخەنە ناو ئاوەکەوە هەموویان یەک لەدوای یەک دەخنکێن. پاشان پیاوە هەژارەکە گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی بەخۆشی و شادی ژیانی بەسەر دەبرد.

**- ئەم چیرۆکە دەری دەخات کە کۆمەڵگا چەند دەوری هەیە لەوەی کە تاک هانبدا بۆ تاوان. کابرای هەژار کە خەڵکی گوندی هەمووی فێڵی لێ دەکەن ئەویش بۆ تۆڵە کردنەوە بە جارێك و دوو واز ناهێنێ.**

**سەرچاوە:**

- چیرۆکی یەکەم (سێ کوڕەکەی پاشا)م لەزاری مام (عزالدین مولود اسماعیل) لەساڵی ١٩٥٦ لە گوندی (مۆریلان) لەدایك بووە وەرم گرتووە.
- چیرۆکی دووەم (پیاوێکی هەژار)م لەزاری (م. عوسمان محمد ئەمین) وەرگرتووە و نووسینە لە یالّی ١٩٧١ لەدایك بووە لە هەولێر.

بەبێ گۆڕانی زمانەوانی وەکو خۆی نووسیومەتەوە.

# هەمزە پاڵەوان

**کۆکردنەوەی: دڵخواز هەیاس حەسەن**

**گێڕانەوەی: دایکی سارا**

دەگێڕنەوە دەڕێن پیاوێك هەبوو ناوی (هەمزە پاڵەوان) بوو، ئەو پیاوە پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو. هەمزە پاڵەوان ژنێك و دوو منداری هەبوو، ژنەکەی هەمزە پاڵەوان حەزی لە دێوێك دەکرد لۆیە هەر لەفکری ئەوەدابوو کە هەمزە پاڵەوان لەناو ببات و دێوەکە بکات بە هاوسەری خۆی. ڕۆژەکیان ژنی هەمزە پاڵەوان پرسیاری لێکردوو پێی گۆت: ئەتو ئەوەندە ئازای بەچی پەل بەست دەبی؟ ئەویش پێی گۆت: لۆ ئەو پرسیارەم لیَ دەکەی؟ ژنەکە گۆتی: هەر حەزم لێیە بیزانم. هەمزە پاڵەوانیش پێی گۆت: بە مووی پرچی تـوو. ژنەکەی هەمزە پاڵەوان لەگەر دێوەکە فکریان لەوە کردەوە کە چۆن هەمزە پاڵەوان لەناو ببەن. ڕۆژەکیان دێوەکە لەگەر ژنەکەی هەمزە پاڵەوان ڕێك کەوتن لۆ ئەوەی هەمزە پاڵەوان بکوژن. ژنەکە دێوەکەی لەماری خۆیاندا شاردەوە لۆ ئەوەی بەفێرەك هەمزە پاڵەوان لەناو ببەن. ژنی هەمزە پاڵەوان بەمێردەکەی خۆی گۆت: وەرە با تاقیت بکەمەوە بزانم ئەتوو پەل بەست دەبی یان نا ژنەکە کەزی خۆی بڕی و هەردوو دەستی هەمزە پاڵەوانی پێی بەستەوەو دوایە بانگی دێوەکەی کردوو بەهەردووکیان هەمزە پاڵەوانیان خستە ناو پێستێکەوە بەسێرمە دووریان و بردیان لەسەر ڕووبارێك کردیانە پرد لۆ پەڕینەوە. ئەوجا ژنەکە دێوەکەی هێنایە سەر ماریَ و لۆ ماوەکی پێکەوە ژیان لەگەر دێوەکە و کچ و کوڕەکەی خۆی. ڕۆژەکیان ژنی هەمزە پاڵەوان چوو بۆ سەر ڕووبار لۆ ئەوەی جل و بەرگی مندارەکان بشوات بەسەر پردەکەدا هاتووچۆیان دەکرد هەمزە پاڵەوانیش لەناو پێستەکەدا بەزیندوویی مابوو. ژنەکە فافۆنی ئاوی لەبیر کردبوو بە مندارەکان دەریَ بڕۆن فافۆنم لەماریَ لۆ بینن ئەوانیش دەچن کچەکە بەسەر پشتی بابی دەکەویَ بەس کوڕەکە بەسەر پردەکەدا ناپەڕێتەوە بەناو ئاودا دەڕوات لەکاتی هاتنەوەیان کچەکە دەچێتە لای دایکی و کوڕەکەش لەلێواری ڕووبارەکە مایەوە هەمزە پاڵەوانیش بانگی کوڕەکەی دەکات و پێی دەریَ کوڕم بڕۆ ماریَ شیرەکەم لۆ بینە لەسەقفی خانییەکەم هەرواسییە کوڕەکەش گۆتی برندە دەستم ناگاتیَ بابیشی پێی گۆت بڕۆ سەر شتەکی بیهێنە خواریَ و لۆم بینە کوڕەکەش بەگێی بابی کرد و چووە ماریَ و شیرەکەی لۆ بابی هینا و بابیشی پێی گۆت شیرەکە لە کالانەکە بینە دەریَ کوڕەکەش گۆتی ناتوانم ئەو کارە بکەم هەمزە پاڵەوانیش پێی گۆت دەسکی شیرەکە بخە ناو دەمی من و ئەتوش کالانەکە لۆخۆت ڕشاکێشە

کارەکەی کرد و بابی پێی گوت بەدمکی شیرەکە پێستەکە بدڕێنە کورشەکەش پێستەکەی دڕاند و بابی هێنایە دەرێ، هەمزە پاڵەوان لەناو پێستەکە هاتە دەرێ و پردەکەی وەکی خۆی چاکردەوە لۆ ئەوەی ژنەکەی هەستی پێ نەکات، پاشان کوڕەکە چووەوە لای دایکی.
هەمزە پاڵەوانیش چووە مارێ خۆی و خۆی شاردەوە لۆ ئەوەی دێوەکە بێتەوە و بیکوژێ.
کاتەك دێوەکە دێتەوە مارێ لەگەر ژنەکە دادەنیشن دەست دەکەن بەقسەکردن لەناکاو هەمزە پاڵەوان بەدیار دەکەوی و شیرەکەی دەردەهێنێ یەکەم جار دەچێتە لای دێوەکە و سەری پەل دەدات پاشان ژنەکەی خۆشی دەکوژێ و ڕوو دەکاتە کچەکە و کچەکەش دەکوژێ، کوڕەکە بەتەنیا مایەوە و ترسا گۆتی: بابە ئەمنیش دەکوژی ئەویش پێی گۆت: کوڕم ئەتو ئەمنت ڕزگار کرد نات کوژم.

**= ئەم چیرۆکە بەشێوەی تر دەگێڕدرێتەوە، هەندێ جار پاڵەوان ئیمامی عەلییە و هەندێ جار ئیمامی هەمزە. ڕەگەزی ئەفسانەیی تەنیا بوونی (دێو)ە.**

## مریشك و ڕێوی

هەبوو نەبوو مارێکی ڕەوەند هەبوو کویستان و گەرمیانیان دەکرد، ئەو مارە لە ئاقاری نزیك گوندەك دەژیان لە گەرمیان کۆمەرەك مەڕ و مارات و مریشك و ئاژەڵی تریان بەخێو دەکرد، کاتی ئەوە هاتبوو ئەو مارە بەرەو کوێستان بچن لۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان ئەو مارە لەکاتی ڕۆیشتنیان یەکەك لە مریشکەکانی خۆیان لۆ لەوەڕ ئەوانیش لەبیریان کرد لەگەر خۆیاندا بیبەن، کاتەك مریشکەکە گەڕاوە مارێ دیتی مارەکە ڕۆیشتینە و ئەویان بەتەنێ بەجێ هێشتووە، پاش ماوەیەك ئەو مریشکە هێلکەی دەکات و لەسەر هێلکەکان کورك دەبێ و دوای ماوەیەك جووجکەی هەرهێنا.

ڕۆژەك ڕێویەکی فێرباز چاوی بەو مریش ك و جووکانە دەکەوێ فکر لەوە دەکاتەوە کە بیانکات بە پارووەکی چەور، بەڵام دەرێ جارێ ئەوانە بەکەڵکی خواردن نایەن لۆیە دەرێ با گەورە بن ئەوجا دەیان خۆم. ماوەیەکی پێچوو ڕێویەکە هاتەوە دیتی کە جووجکەکان گەورە بوون کاتی ئەوەیە کە بیان خوات ڕۆژەك هاتە لای مریشك و پێی گۆت هاتیمە لۆ ئەوەی ئەتوو جووجکەکان بخۆم مریشکەکەش کەسی نەبوو یارمەتی بدات پێی گۆت: کو دەبی ئەوها و ئاخر دەبی سەبرت هەبی، پاشان ڕێویەکە ڕۆیی و مریشکەکە فکری کردەوە کە کو خۆیی و جووجکەکان ڕزگار بکات لەدەستی ئەو ڕێویە فێربازە.

گونـدێك هـەبوو لـەنزیك مـاری مریشـكەكە لـەو گونـدە كابرایـەك هـەبوو ڕاوچـی بـوو بـەكاری ڕاوچـییەوە خـەریك بـوو، ئـەو پیـاوە نـاوی (مـام حەیـدەر) بـووو مریشـكەكە فكـری كـردەوە كـە بچـێتە لای ئـەو پیـاوە تـاكو یارمـەتی بـدات، لەبـەر ئـەوە مریشـكەكە چـووە لای مـام حەیـدەر و پێـی گـۆت هاتیمـە لـۆ ئـەوەی یارمـەتیم بـدەی لـۆ ئـەوەی ڕزگـاریم لەدەسـتی ئـەو ڕێویـە كـە دەیـەوێ خـۆم و جووجكـەكانم بخـوات. مـام حەیـدەریش گـۆتی: باشـە مریشـك و مـام حەیـدەر پێـك هـاتن لەسـەر ئـەوەی كـە مریشـك لـەباتی ئـەو یارمـەتی دانـە هەنـدێ لـە جووجكـەكانی خـۆی بـدات بـەمام حەیـدەر. مریشـك و مـام حەیـدەر پلانـەكیان دانـا لـۆ لـەناوبردنی ڕێویەكـە مـام حەیـدەر هەسـتا قۆرتـەكی گـەورەی هەڵكەنـد و خـۆی و تـاژی و تولـەكانی هاوێشـتە نـاو قۆرتەكـە و پووش و پەراشی بەسەردا داو لۆ ئەوەی ڕێوی هەستی پێ نەكات.

لـۆ سـبەینێ ڕێـوی هاتـە لای مریشـك و پێـی گـۆت هـاتووم لـۆ ئـەوەی بتـان خـۆم مریشـكەكەش پێـی گـۆت ڕاوەسـتە مـادام هـەر دەمـان خـۆی بـا لۆخۆمـان تـۆزەك شـایی بكـەین ئـەوجا بمـانخۆ ڕێویەكـەش گـۆتی دەی باشـە كـوی دەرێـی بـاوابی ((ئـەم گفتوگۆیـە هـەر لـەو شـوێنە بـوو كـە قۆرتەكـەیان لێـدابوو مریشـك و مـام حەیـدەر)) ئـەوجا مریشـك و ڕێـوی دەسـتی یـەكیان گـرت مریشـك بـەڕێوی گـۆت ئـەتو گـۆرانی بـرێ ڕێویش گۆتی نا ئەتو برێ لەسەر ئەوە پێكهاتن كە ڕێوی گۆرانی برێ. ڕێوی گۆتی

**مریشكە مریشكەی لانێ**

**سینگت خۆم سیقڵدانێ**

**جووجەڵەت بێتە سەیرانێ**

ڕێویەكە گۆتی ئەمن گۆرانی خۆم گوت نۆرەی تۆیە مریشكەكەش گۆتی:

**مام حەیدەری شاووری**

**جووجەڵەت لەبەر مری**

**بگرە ڕێوی غازری**

لەگـەر گـۆتنی ئـەم گۆرانییـەی مریشـك مـام حەیـدەر خـۆی و تـاژی و تولـەكانی لـەناو قۆرتەكـە هاتنـە دەرەوە و ڕێویەكـەیان كوشـت پارچـە پارچـەیان كـرد مریشـكەكە ڕزگـاری بـوو لـە دەسـتی ڕێویەكـە، لەكۆتاییـدا مریشـكەكە سوپاسـی مـام حەیـدەری كرد بۆ ئەم هاوكاری كردنە.

**- ئەمە چیرۆكی گیاندرانە لەگەڵ مرۆڤ.**

# زەمانێك واى لىَ دێت!!

**کۆکردنەوەی: نیان کیخسرە الله ئەکرەم**

**گێڕانەوەی: کیخسرەو الله ئەکرەم**

**دانیشتووی: سلێمانی تەمەن: ١٩٣٨**

دەگێڕنەوە دەڵێن لە زەمای قەدیم کابرایەك ڕێبوار دەبێت لادێ بەلادێ دەگەڕا، ڕۆژێك لە ڕێدا ڕۆیی دیتی کۆترێك لەسەر دار هەنارێکە، دوو هەناری پێوەیە یەکیان بۆگەنە و یەکیان ساغە، دیتی کۆترەکە هەنارە بۆگەنەکە دەخوات ساغەکە ناخوات، زۆر تەعەجووب دەبێت بەو شتە، دەڕوا دەڕوا ئەمجارەیان دیتی وا سەگێك بەرشتە بەچکەکەی ناو زگی دەدڕێت، کە هێشتا ناو زگیەتیو واقی وڕ ئەمێنیَ، دەڵێت خوایە دەبێت چی بێت، ئەم دەڕوا دەڕوا دیتی حەزیایەك زێیەك بەگەورەیی خۆی دەچێتە ناو دەمی ئەو حەزیایە کە پشت کلك حەزیایەکە وشکە و هیچ ئاوی لیَ نییە، ئەمانە ئەبینیَ سەری سوڕ دەمێنیَ، بۆیە قەرار ئەدات بگەڕێت بە دوای یەکێکی زانا ئەم شتانەی بۆ شی بکاتەوە، دەگەڕیَ شار بەشار، لادیَ بەلادیَ هەتا ناوبانگی شێخی گەورە دەبیستیَ کە چەند موریدی هەبووە، دەڕواتە لای شێخ، بۆ نیوەڕۆ نان و مان لەگەڵ شێخ دەخۆن و دوای نان خواردن شێخەکە دەڵێت: تۆ بۆ شتێك هاتووی؟ کابرای ڕێبوار دەڵێت ئەریَ وەڵڵا من سیَ شتی زۆر عەجایبم بینیوە چەنێکە دەگەڕێم بۆ ئەوەی مەعناکەی بزانم، شێخە دەڵێت: ئەمرکە، کابرای ڕێبوار دەڵێت: یەکەم شت دیتم. کۆترێك لەسەر دار هەنارێك بوو، دوو هوناری پێوە بوویەکێکیان بۆگەنی بوو یەکێکیان ساغ بوو، کۆترەکە ساغەکەی نەدەخوارد بۆگەنەکەی دەخوارد. شێخیش دەڵێت: ئەوە زەمانێك دادێت خەڵك بەشکڵ جوانن، بەس ناخیان بۆگەنە، ئەو کەسانە خۆشەویست دەبن لای خەڵك کەس ئاوڕ لەکەس باشەکە ناداتەوە. شێخەش دەڵێت هی دووەم چی بوو؟ کابرا دەڵێت: سەگێك بەچکەکەی ناو زگی دەوەڕی کە هێشتا لەدایك نەببوو، شێخە دەڵێت: ئەوە زەمانێك دێت گەورە و گچکایەتی نامێنیَ کەس حیساب بۆ دایك و باوك ناکات. کابرای ڕێبوار دەڵێت: شێیەمیش ئەوە بوو کە حەزیایەك زێیەك ئاو دەچووە ناو دەمی پاشەوەی وشك بوو، شێخەکە دەڵێت: ئەوە زەمانێك دێت کەس بەبەش خۆی ڕازی نابێت و بەهیچ شتێك تێر نابێت، هەرچی بکات هەر دەڵیَ کەمە. کابرای ڕێبوار دەڵێت: بەڕاستی ئەمە زۆر مهیمە، زۆر مەمنوون مامە شێخ ئێستا تێگەیشتم. کابرای ڕێبوار خودا حافیزی کرد و ڕۆیشت منیش کلاشم دڕاو هیچم پیَ نەبڕایەوە.

**- چیرۆکێکی پڕ حیکمەت و پەروەردەییە، مرۆڤ هان دەدات بگەڕێنەوە لای ڕاستی و پاکی.**

## دەنكە هەنارە و حەوت براكەی

دەبێت نابێت شایەكدەبێت لە مەملەكەتێك، كچێكی دەبێت، بەس دایكی كچەكە دەمرێت، زڕدایكی دەبێت زڕدایكەكە زۆر ڕقی لە كچەكە ئەبێتەوە، چونكە كچەكە لەگەڵ مانگا شەڕی دەكرد، ڕۆژێك چووە بەر ئاوێنە گوتی: من چەند جوانم كەس نییە وەك من جوان بێت. ئاوێنەكە دێتە قسە و دەڵێت: نا تۆ جوان نیت، دەنكە هەنارە جوانە، ژنەكە ڕقی ئەبێتەوە و بۆ كچەكە هەڵ ئەبەستێ و باوك و كچەكە دوو لە پاسەوانەكانی دەنێرێ كەكچەكەی بكوژن لەدەشت، پاسەوانەكانی دەیبەن، دەنكە هەنارە هەموو شتێكیان بۆ دەگێڕێتەوە، پاسەوانەكان دەچنەوەو دەڵێن: پاشا كوشتمان. بەس نەیان كوشت بەزەییان پێیا هاتەوە. دەنكە هەنارە دەڕوا دەڕوا دەبینێ وا خانییەك لەدوورەوە دیارە، دەڕوا هەتا ئەگاتە خانییەكە. دەبینێ خانییەكی ئەوەندە پیس و ناخۆش، ئەویش دەچێت هەمووی پاك ئەكاتەوە ئاشیان بۆ لێ ئەنێ و خۆی ئەشارێتەوە، كاتێ بینی حەوت برا هاتنەوە، حەوت براكە دیتیان ماڵ پاك كراوەتەوە ئاشیان لێناوە، گوتیان دەبێت كێ بێت؟ وەختێ بەیانیش هاتنەوە عەینەن ئەوها بوو، بۆیە تەكبیریان كرد برا گەورە لەماڵ بمینێ بزانێ كێیە، كاتێ برا گەورە خەوی لێكەوت ئاگای لێنەما، دەنكە هەنارە هات و ئیش و كارەكانی كرد و خۆی شاردەوە، هەتا حەوتەمین برا هەر خەویان لێدەكەوت حەوتەمین برا كە لە هەموویان جوانتر بوو، لەوێ مایەوە و هەستا پەنجەی خۆی بڕی خوێی پێدا كرد بۆ ئەوەی خەوی لێنەكەوێت لەپەنایەك خۆی شاردەوە هەتا دەنكە هەنارە هات، یەكسەر دەنكە هەنارەی گرت و گوتی تۆ چیتە؟ گوتی من دەنكە هەنارەم، حاڵ و مەسەلەی من ئەوهایە. كاتێ ئێوارە براكان هاتنەوە دەنكە هەنارەیان بینی، ئیتر هەموو ڕۆژێ ئەوان دەچوونە ڕاو دەنكە هەنارە ئیش و كاری بۆیان دەكرد. ڕۆژێك گورگێك هاتە لای دەنكە هەنارە گوتی: یان دەتخۆم یان دەبێت پەنجە تووتەت بمژم، ئیتر هەتا عەیاتی ئەو گورگە پەنجە تووتەی دەمژی، هەتا دەنكە هەنارە وای لێهات لاواز بوو، حەوت براكە هەستیان پێ كرد گێڕایەوە، ئەوانیش بیرێكیان لێدا و دووشەكیان كردە بانی و گوتیان ئەگەر هات پێی بڵێ وەرە سەر ئەو دۆشەكە دانیشە. بۆ بەیانی گورگە هات و دەنكە هەنارە گوتی: بڕۆ سەر ئەو دۆشەكە دانیشە، كاتێ گورگەكە چووە سەر دۆشەكەكە یەكسەر بەربۆوە ناو بیرەكە، گورگەكە هاواری كرد و گوتی دەنكە هەنارە دوای چەندساڵێ تر ئەم بیرەتان پڕ كردەوە پیاز شین ئەبێت ئاگادار بن نەیخۆن دوایی دەبن بە نیوەی مەڕ و نیوە بەشەر. ئێوارە براكان هاتنەوە و بیرەكەیان پڕ كردەوە دوای چەند ساڵێ تەرەپیازی جوان شین بوو، براكان گوتیان دە

هەندێ لەو تەرەپیازە جوان شین بووە، با بیخۆین، دەنکە هەنارەش هەلا لەبیری نەما بوو، کاتێ تەرە پیازەکەی بۆیان هێنا و خواردیان هەر حەوت براکە بوونەنیوە مەڕ و نیوە بەشەر، هەموو ڕۆژێ دەنکە هەنارە دەیبردن و دەی لەوەڕاندن، ڕۆژێ چووە سەر دارێ دەستی کردە گریان و مەلایەك لەبندارەکە قورئانی دەخوێند دیت فرمێسك بەربۆوە بان قورئانەکە، سەری بلند کرد دیتی وا کچێك لەسەر دارەکە دەگری، بانگیکرد و هاتە خوارەوە، گوتی ناوت چییە؟ گوتی: ناوم دەنکە هەنارەیە، گوتی: ئەی لۆ دەگرییەی؟ دەنکە هەنارەش حاڵ و مەسەلەی بۆ مەلا گێڕایەوە، مەلاش گوتی باشە ئەم دارە بگرە هەر یەکەو حەوت داریان لێدە بەس زگت پێیان نەسوتێ و بلێی ئۆفو دوایی هەر دەبنە مەڕ بەتەواوی. دەنکە هەنارەش دارەکەی برد و لێیانی دا هەمووی چاك بوونەوە، بەس چونکە برا گچکەکەیان لە هەموویان جوانتر بوو گوتی ئۆف، یەکسەر بوو بەبەرخێکی تەواو، ئیتر براکانی چاك بوونەوە و دەڕۆیشتن بۆ ڕاو، دەنکە هەنارەش لەگەڵ بەرخەکە دەمانەوە و دەیبردە دەشت، ڕۆژێ براکان گوتیان لۆ ئەو بەرخە سەر نەبڕین و بیخۆین، کاتێ دەنکە هەنارە بەمەی زانی زۆری پێیان گۆت فایدەی نەدا. دەنکە هەنارە ڕای کردە دەشت دەگریا کاتێ مەلا لەبن دار قورئانی دەخوێند گوێی لە دەنگی گریان بووو کاتێ دیتی دەنکە هەنارەیە، چووە لای و گوتی چی بوو، ئەمجارەیان ئەویش هەمووی بۆ گێڕایەوە و بەجوانی، گوتی بڕۆ خوێنب بەرخەکە بکە بەشوێن گورگەکە چاکئەبێتەوە، دەنکە هەنارە بەدڵخۆشی ڕایکرد و ڕۆیشتن و خوێنەکەی کردە سەر جێی گورگەکە. یەکسەر را گچکەکە چاکبووەوە. براکانی دڵیان خۆش بەم بەچاکبوونی براکەیان بۆیە بەدەنکە هەنارەیان گوت لە هەمووماں گچکە تری و هەندی برا گچکەکەی بۆ شوی پێ ناکەی؟ گوتی: باشە شوی پێ دەکەم، دەنکە هەنارە شوی بەبرا گچکەکە کرد و هەموویان پێکەوە دەژیان و ڕایان دەبوارد بەخۆشی، منیش کلاشم دڕا و هیچم پێ نەمایەوە.

- ئەم ئەفسانەیە دوو ئەفسانەیە تێکەڵ بووە و شێوە گێڕانەوەی تری هەیە، بەگشتی باس لە زەمانێك دەکات، کە مرۆڤ و ئاژەڵ زۆر بە سادەیی و لە سەرەتا پێکەوە لە سروشت دەژیان.

## ژنێکی بەسەبر

ماڵێك دەبن ڕەوەند دەبن، لەبەر ئەوەی خەڵکی بەتایبەتی ئەوانەی کە مەڕو ماڵاتیان بەخێو دەکرد ڕەوەند بوون، گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، چەند ڕۆژێك بوو ژنێك پیاوەکەی لەکاروان دەبێت، شار زۆر دوور دەبێت لێیانەوەو پیاوەکەش وتی من ئەو ڕۆژە و فلانە ڕۆژ دێمەوە، هەندێکدۆست و ئەحباب لەگەڵ خۆما دێنم ژنەکە تۆش کاوڕی سەربڕە و لێی بنێ، ئەو ڕۆژە هات ژنەکەش هەر لەبەیانییەوە کاوڕی سەربڕی کاوڕی ووردکرد و لێی ناو خەریکی چێشت لێنان بوو بۆ میوانەکان، جارنا جارێك تەماشای ڕێی ئەکرد بزانێ بەدیار نەکەوتن، دەمە و دەم نیوەڕۆ نان حازر بوو نان دانرا کاتێ ژنەکە دیتی وا کاروانێ بەلای ڕەشماڵ و خنجەکەی ئەوان نێزیك ئەبنەوە. دەی، دەی نزیکبوونەوە تا گەیشتە لای ڕەشماڵی ژنەکە ژنەکەش تەماشای کرد پیاوۆی دیار نییە، چاوی گێڕا، گێڕا نەیبینی کاروانەکە سەلامیان کرد و دانیشتن، ئەویش پرسی و وتی:کا پیاوەکەم، چی لێهاتووە؟ کاروانەکە وتیان وەڵلا چیت لێ بشارینەوە لەڕێ دیارە عومرەکەی تەواو بووە ئیزرائیل ناوی خوێندەوە ئەو دەرچوو، عەمری خوای بەجێ گەیاند ئێمەش هەر لەوێ کفن و دفنمان کرد ونێشتمان ژنەکەش وتی چۆن ئینسان دێتە ئەم دونیایە دەبێت ڕۆژێك هەر بەجێی بهێڵێ،چەنێ پێمان خۆشە لەدایك بێت، دەبێ ئاوا پێمان خۆش بێت کە دەمرێ نان و مانی بۆ میوانەکان دانا بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن کە ئەمە کارەساتێ ئەوها گەورەی بەسەردا هاتووە، دوای نان خواردن ژنەکە گوتی کامتان قورئان خوێنن؟ یەکێك لە کاروانەکان وتی من، وتی سورەتێ بخوێنە با دڵمان فێنك بێتەوە، کاروانچییەکەش دەستی کردبە قورئان خوێندن هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ (ان الله مع الصابرين) ژنەکە وتی: توخوا لەبەر من وا ئەڵێ یان لە قورئان ئاوها نوسراوە، کاروانچییەکەش وتی: چۆن من هەر لەخۆمەوە دەتوانم شت زیاد بکەم لە قورئان بۆیەئەم سورەتەم خوێند لەبەر سەبر و خۆڕاگری ژنێکی وەك تۆ، کە ئەو کارەساتە گەورەی بەسەرا هات بەڕاستی ژنێکی نەوعت نییە لەم دونیایە، بریا هەموو ژنێك وەك تۆ بووایە،کاروانەکان فاتیحەیان هەدیە کرد و خوا حافیزیان کرد و ڕۆیشتن.

تێبینی: ئەمە باوکم گێڕایەوە وتی: ئەم ڕووداوە ڕووداوێکی حەقیقییە و ڕاستە بەس نازانم لە چ ناوچەیەك ڕووی داوە گرنگ ئەوەیە ڕاستییە.

- لەم کاتانەیە و لە بەرامبەر ئەمجۆرە ژنانەیە کە لە کوردەواری دەڵێن: ((شێر لە لانی بێتە دەرێ، چ نێر! چ مێ!)).

# ئەژدیهایەك و جۆلا

**کۆکردنەوەی: سیلوان ئەمین**

لەکۆنەوە دەگێڕنەوە، کابرایەکی جۆلا هەبووە، ژنێکی جوانی هەبوو، ژنەکەی لەبەر جوانی خۆی ئەیویست مێردەکەی حاشای لێ بکات و تەلاقی بدات، بەلأم مێردەکەی ژنەکەی خۆشدەویست و تەلاقی نەدەدا، لەوکاتەشدا حاکمی ئەو شارە خەوێکی دی بوو، جارچی جارێدا کە پاشا خەونێکی دیوە بۆ کەسی ناگێڕێتەوە، جا هەر کەسێ بێت و بلێت پاشا تۆ ئەو خەوەت دیوە و تەعبیریشی بۆ لێك بداتەوە، ئەوا پاشا خەلأتی دەکا، کاتێك ژنەکە ئەمەی بیست بەهەلی زانی، لە دلّی خۆیدا وتی خەبەری لێ ئەدەم کە لەخەو ئەزانێ هیچیشی لێ نازانێ سەرەنجام پاشا مێردەکەی ئەکوژێ. چووە لای پاشا و وتی: پاشام خۆشبێ مێردەکەی من زۆر باش لەخەون ئەزانێ، خەلّکی لە ولأتانی تر سەردانی ئەکەن، بەلأم تکایە کارێکی وا مەکە کە ئەو بزانێ من خەبەرم لێ داوە.

پاشا دەست بەجێ بەدوای جۆلأی نارد و وتی: جۆلا خەوم دیوە خێرا پێم بلّێ چیم دیوە؟ تەعبیریشی چییە؟ کابرا وتی: قوربان ئەمە ئیشی من نییە ئیشی عالم و مشایخانە.هەرچەند جۆلا هەولّی دا سودی نەبوو، ئاخیری پاشا ئەمری کرد جۆلأیان دارکاری کرد هەتا لەزمان کەوت پاشان کەبەزمان هاتەوە وتی: پاشا ڕۆژێکم مۆلّەت بدە ئەگەر نەمزانی بمکوژە، پاشا ڕازی بوو، جۆلا چووە بەردەم ئەشکەوتێك دەستی بەگریان کرد، پاشماوەیەك ئەژدیهایەك لە ئەشکەوتەکە هاتە دەر وتی: بۆچی دەگری؟ جۆلا بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە ! ئەژدیها وتی: خەمت نەبێت من پێت ئەلّێم، بەلأم لەو سامانەی کە وەری ئەگری نیوەی بدە بەمن. جۆلا وتی بەسەر چاو. ئەژدیها وتی: دەهەستە برۆ بە پاشا بلّێ.. لە خەوتا لەجیاتی باران مەیمون ئەبارێ و حەوشەکەی مالّەکەت پڕ ئەبێ لە مەیمون. وە ماناکەشی بەوە بۆ لێك بدەوە ئەمسالّ خێر و بەرەکەت زۆر ئەبێ و خەزێنەت پڕ ئەبێت لەپارە.

جۆلأش چوو بەپاشای وت، پاشاش خەلأتی کرد، جۆلا بیری کردەوە ئەگەر مارەکە بکوژێت ئەوا هەموو سامانەکەی بۆ خۆیەتی. ڕۆیشت دەستی دایە تیروکەوانێك و چووە بەردەم ئەشکەوت تیرێکی گرتە ئەژدیها. بەری نەکەوت. ئەژدیهاکە چووە ژوورەوە. پاشان دوای دوو مانگی تر پاشا دیسان خەونی دیت. بەدوای کابرای نارد. کابرا وتی: پاشا بەخوا نازانم، پاشا وتی: من ئەمانە نازانم ئەتکوژم. بەکورتی دیسان مۆلّەتی وەرگرت چووە بەردەم ئەشکەوتەکە گریا و پاڕایەوە وتی: ئەژدیها من کردم تۆ مەیکە ئەمجارەش فریام کەوە. ئەژدیها وتی: تۆ پیاوێکی خراپی بەشم نادەی ئەتەوێ بمکوژی. جۆلا وتی: ناماقولّیم کرد

بمبەخشە. ئەژدیها وتی: بە پاشا بڵێ لەخەوتا دووربینت بەدەستەوە بوو تەماشای دونیات دەکرد، تەعبیریشی ئەوەیە کە چەند ولاتێك ئەگری و ئەیخەیتە ژێر دەسەلاتی خۆتەوە، پاش گێڕانەوەی دیسان پاشا خەلاتی کرد لەدڵی خۆیدا وتی بۆچی بەشی ئەژدیها بدەم بەخوا نایدەم!

بۆ جاری سێیەم پاشا خەونی دیت بەدوای جۆلای نارد. جۆلا مۆڵەتی وەرگرت چووە بەردەم ئەشکەوت ئەژدیها سەری دەرهێنا و وتی: جۆلا ئەمجارە چیت ئەوێ؟ جۆلا بۆی گێڕایەوە ئەژدیها وتی: برۆ بەپەشا بڵێ لەخەوتا سواری گوێ درێژ بووی گوریست بەدەستەوە بوو.. تەعبیرەکەشی ئەوەیە حوکمەکەت زۆر بەهێز ئەبێت. جۆلا بەپاشای وت.دیسان پاشا لەهەردوو جارەکەی تر زیاتر خەلاتی کرد، جۆلا گەڕایەوە لەدڵی خۆیدا وتی من زۆر بێوەفام چووە لای ئەشکەوتەکە و هەموو ئالتوونەکانی جاری سێیەمی بۆ ئەژدیها برد، ئەژدیها وتی: من ئەژدیهام ئالتوونم بۆچییە؟ هەر هیچیشت لێوەرناگرم چونکە ڕۆژگار وایە جارێك زەمان وابوو چاکەت لەگەڵ هەرکەسێ بکردایە بەخراپە وەلامی دەدایتەوە جاری دووەم زەمان وابوو چاکەت لەگەڵ هەرکەسێك بکردایە نە بەخراپە نە بەچاکە وەلامی دەدایتەوە. جاری سێیەم زەمان وابوو چاکەت لەگەڵ هەرکەسێ بکردایە بەچاکە وەلامی دەدایتەوە.

**ئەنجام**

لەکاتی گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەدا گەیشتمە چەند ئەنجامێك:

١- ئەم گێڕانەوەیە زیاتر بۆ مەبەستی پەند وەرگرتن و ئامۆژگارییە ئەمەش بەسود وەرگرتن لە ئەفسانەی ئەژدیهایەك.

٢- لەم چیرۆکە سێ جۆر خەڵك دەبینرێت کە لەکۆنەوە تا ئێستا ئەو جۆرە کەسانە هەر هەن لەوانە:

کەسانێك ئەگەر چاکەت لەگەڵ کردن بەخراپە وەلامت دەدەنەوە کەسانێکیش ئەگەر چاکەت لەگەڵ کردن نە بەچاك نە بەخراپ وەلامت نادەنەوە جۆری سێیەمیش کەسانێکن ئەگەر چاکەت لەگەڵ کردن هەوڵ دەدەن بەچاکە وەلامت بدەنەوە.

**= لەم ئەفسانەیە ژنە دەیەوێ مێردەکەی بفەوتێنێ، پاشا خەون دەبینێ، هەرکەسێ خەونەکەی بزانێ، خەلاتی دەکا و هەرکەسێ نەیزانێ لەسەری دەدات. خەون و مانای خەونیش لای ئەژدیهایە، لە دوو بواردا، کە مرۆڤ تێیدا کارایە، جۆلا دەخەنە بەردەم لەنێو چوون، بەلام، ئەژدیها هەم یارمەتی دەدات، خەونی پێ دەڵێ و بۆشی لێك دەداتەوە و لە هەڵەکانیشی خۆش دەبێ و لە بەشە حەقی خۆشی خۆش دەبێ.**

# تتيله و ببيله

**ئامادەکردنی: ئاشنا عەزیز عەباس**
**ئەم چیرۆکەم لە داپیری خۆشەویستم وەرگرتووە**
**ناو: حەمدیە حەمید محەمەد**
**تەمەن: ٨٥ ساڵە. شوێنی نیشتەجێ بوون: کەلار**

ئـەویٚ و نـاویٚ ئـەیگێرنۆ مـەڕ و بزنێـك ئـەویٚ، هـەر لەتـەك یـەکتر گـوزەران ئەکـەن، ڕۆژێـك بزنەکـە وە مەڕەکـە ئێـژیٚ بـا خانییـەك دروسـت کـەین بچـینە نـاوی، مەڕەکـە ڕازی نـاویٚ ئێـژیٚ مـن خـوریم زۆرە نەیگـەرەك خـانی بکـەم، ئـیتر بۆخـۆی بزنەکـە ئـەو ڕۆژە هـەر خـەریك خـانی ئـەویٚ تـا تـەواوی ئـەکا ئـیتر ئەچـێتە نـاو خانییەکـە، خانیەکـەی بـەس وەقـەدەر خـۆی کـردێتی تـەنیا جێـی خـۆی تیـا ئـەوێتۆ، ئـەوتیٚ بـاو بارانێکـە چـاو چـاو نـاوینیٚ ئـیتر مەڕەکـە تـیٚ بـۆ لای بزنەکـە لـە بزنەکـە ئـەپاڕێتۆ جێـی بکـاتۆ! بزنەکـەش پێـی ئێـژیٚ مـن ئەوەنـە وتم پێـت بـا خانیـە بـۆ هـەردووکمان دروست کـەین تـۆ وتـت مـن خـوریم زۆرە سـەرمام نـاویٚ. ئیـە هاتیـە بـۆ لای مـن جێـت بکـەمۆ باشـە مـن خانییەکـەم وەقـەدەر خـۆم دروسـم کـردە، تـەنیا جێـی سـەرت ئـەتوانم بکـەمۆ ئـیتر مەڕەکـە لەبـەر گیـان خـۆی ڕازی ئـەویٚ بـۆ ئـەوەی هـەر نـەویٚ سەریشی گەرم بێت باشترە.

ئـیتر تـا درەنگـی شـەو دەمەتـەقیٚ ئەکـەن خـەویان لـیٚ ئەکـەویٚ تـا بـەیانی، بـەیانی بزنەکـە تێتـە خـەوەر هەرچـەن بـانگ مەڕەکـە ئـەکا نلیەتـە خـەوەر هـەر بـانگی ئـەکا هـۆ مـەڕ هەڵسـە تێـر خـەو نەبویتـە، ئـیتر بزنەکـە ئێـژیٚ ئـەو تێـر خـەو نـاویٚ بـا مـن بچـم بـۆ دەشـت ئـەو گـژوگیا نـە تـۆزیٚ بخـۆم وەخـتیٚ بزنەکـە تێتـە دەشـت سـەیر ئـەکا مـەڕ چـی! ؟ مـەڕ کاشـەی خوریـاوە وتـەنیا سـەری مـاوە ئـیتر بزنەکـە زۆر خەفـەت ئـەخواو ئێـژیٚ خۆزگـە جـێم بکردایـەتۆ تـاوای لـیٚ نەهاتایـە، بزنەکـە بـیر ئـەکاتۆ ئێژێنـەویٚ مـن خانیەکـە باشـترو چـاکتر بکـەم بـۆ ئـەوەی نـەوەك حەیوانـە درنـدەکان بمخـۆن ئەچـیٚ هـەر چـوار پـای مەڕەکـە ئـەکوتیٚ و لەتـەك خورییەکـەی ئەیداتـە بـانی و گـژوگیای ئـەو ناوچـە کـۆ ئـەکاتۆ خانیـەکی چـاك و جـوانی لـیٚ دروسـت ئـەکاو ئـیتر ڕۆژ تێـوڕۆژ ئـەڕوا بزنەکـە هـەر وەتـەنیا لـەو خانییەیـە بزنەکـە ئەئاوسـیٚ و سـکی ئـەوێت ئـیتر ڕۆژ وەڕۆژ مـانگ وەمـانگ بـزن هـەر خـەریك

چـاکردنی خانییەکەیـەتی بـۆ ئـەوەی چـاکی کـا تـا بـەیانی دوو بەچـکەی ئـەویٚ تـا کـەس نـەیخوا یـەکیٚ لـە حەیوانـەکان ئـیتر تـا ئـەو کـات بـزن دوو بەچـکەی ئەویٚ دوو بەچکە ناویان ئەنیٚ تتیلە و ببیلە.

تتیلـە و ببیلـە ڕۆژوەڕۆژ دایکیـان وەخێویـان ئـەکا و شـیریان ئـەداتێو گـەورەیان ئـەکا ڕۆژێـك گورگێـك لـەو شـوێنە ئـەڕوا سـەیر ئـەکا دەنـگ و بـۆی خـۆش تێگـویٚ ئـەگریٚ سـەیر ئـەکا ئەمـە بزنێکـە و دوو بەچـکەی هەیـە، لـەو ڕۆژەوە گـورگ هـەر خـەریك چـاویان لـیٚ ئـەکا بـۆ ئـەوەی بیـان خـوات، گـورگ دەرچـون بزنەکـە ئـەزانیٚ هـەموو ڕۆژیٚ بزنەکـە ئەچـیٚ لـەو دەشـت و دەرە گیـای زۆر ئـەخواو گیـا تێرێتـۆ بـۆ بەچـکەکانی گیـای زۆر ئـەخوا بـۆ ئـەوەی شـیری زۆر بـیٚ، بزنەکـە بـەدوو بەچـکەکە ئێـژیٚ تتیلـە و ببیلـە قـاپی لەکـەس نەکـەنۆ هـەتا مـن لـە قـاپیم دا ئێـوەش ئێـژن ئـەوە کێیـە منـیش ئێـژم تتیلـە و ببیلـە قـاپیم بـۆ بکـەنۆ گـوانم تـەقی ئـەوەیزانن مـنم گـورگیش هـەموو ڕۆژیٚ گوێیـان لـیٚ ئـەگریٚ تاوەفێـلیٚ ئـەزانیٚ، ڕۆژیٚ بزنەکـە ئـەڕوا بـۆ خـۆی لەوشـوێنە کـاتیٚ گیـای لـیٚ ئـەخوا تـۆزیٚ گیـای ئـەمێنیٚ گیاکـە ئـەخوا ئەچـیٚ بـۆ شـوێن تـرو لـەو شـوێنە بۆخـۆی گـورگ ئـەزانیٚ بزنەکـە دواکـەوت و ئـەڕوا ئـەدا لـە قـاپی و تتیلـە و ببیلـە ئێـژن کێیـە ئـەوە گـورگیش وەدەنگـیٚ نـاخۆش وناسـاز ئێـژیٚ تتیلـە و ببیلـە گـوانم تـەقی قـاپیم بـۆ بکـەنۆ تتیلـە و ببیلـە دایـە ئـەوە بۆچـی دەنگـت گۆڕیـاوە ئێـژن گـورگیش وە دەنگـە ناخۆشـەکەی ئێـژیٚ تتیلـە ببیلـە دایکتـانکوێر بێـت ئەوەنـە گریـام بۆگیـا بۆتـان زۆر سـەرمام بـوو ئـیتر قـوڕیم ژان ئـەکات نـاتوانم دەنگـم وەکـو خـۆی لـیٚ بکـەمۆی، بۆخـۆی گـورگ وەو فێڵـەی خـۆی تتیلـە و ببیلـە ئەخـەڵتێنیٚ تتیلـە و ببیلـە ڕائەکـەن ئێـژن دایـە دایکـم هـاتۆ قـاپی ئەکـەنۆ سـەیر ئەکـەن شـتیٚ ناشـرین لەبـەردەم قاپیەکـەیان وێسـاوە ئێـژن تـۆ کێـی؟ تـۆ دایکمـان نیـت. گورگەکـەش وە دەنگـە ناخۆشـەکەی ئێـژیٚ هاهـا مـن دایکتـان نیم ئیسە.

سـوپاس و پێـزانین: زۆر سوپاسـی داپـیرەی خۆشەویسـتم ئەکـەم (حەمدیـە حەمیـد محەمەد).

**-لەوە دەچیٚ ئەم چیرۆکە تەواو نەبوو بیٚ!**

# زڕ داك!

**کۆکردنەوەی: ئیڤان عەلی ڕەسول.**

هەبوو نەبوو کچێك هەبوو داکی مرد بوو بابی ژنی هێنابۆوە، ئەو کچە لەبن دەستی زڕداکی مات و مەلوور و ڕووت و قوت و برسی بوو منداڵانی گەڕەك گەمەیان پێ دەکرد. ڕۆژەکیان زڕداکەکەی ڕەوانەی بەر چێرانی دەکا و تەسی دایە دەستی تا بیرێسی، بە ئیرادەی خوا بایەك هات و بووە گەردەلوولە و تۆز و بایەك چاو چاوی نەدەدیت کچە لەو وەختەی تەشی لەدەست دەڕوا و ئەویش لەترسی زڕ دایکی هەر لەدوو تەشییەکەی غار دەدا و دەڕوا و لەکاتەکی کونە ئەشکەفتەکی دیت کچەکە چوو دیتی دێوەك هەندەی کەرتە چیایەکی زلی گەورەی پیری بۆن پیسی لێیە دێوە لە کچەکەی چووە پێش و پێی گۆت وەرە بزانم: ئەوەی پێت دەرێم دەبی بیکەی کیژە گوتی باش خارە. دێوە گۆتی: سەرم بنۆڕە جوان ئەگەر نەشی نۆڕی دەتکوژم.

کچە گۆتی: بەرێ خارە گیان وا دێم سەرت دەنۆڕم. کچە سەری دێوەکەی نۆڕی دیتی سەری دێوە پڕە لە حەزیا و مار و دوپشك و جۆرەها زیندەوەر.

دێوە پرسی: کیژێ سەرم کوە؟

کیژەش دەرێ: سەرت وەك ئاوی کانی و ڕووبار ڕوون و پاکە لەوەش دیار بووە کە کیژەکە ئاقڵ و ڕێکوپێك بووە.

دێوە گۆتی: کیژێ باشە بەران ئەوەی پێت دەرێم بەگوێم بکە.

کیژەکەش گوتی: بەرێ باش.

دێوە گۆتی: ئەگەر ئاوەکی ڕەش هات گازم مەکە بەران ئەگەر ئاوەکی سپی هات گازم بکە. ئاوە سپیەکە هات کیژە دەستی کردە گازە گاز و گۆتی خارە هەستە ئاوە سپییەکە هات دێوە بەئاگا هات و کیژەی خستە ناو ئاوە سپیەکە کچە سەراپای بەژن و بارای بوو بەزێڕ و چۆوە ماڕێ. کاتێ زڕ داکەکەی دیتی ئەو ئەوەندە جوان و بێ وێنە بووە گۆتی کو وەها جوان بووی دەبێ کیژی منیش ببەی هەمان ئەو جێیەی بەخۆت چوویێ ئەگەر نەشی بەی ئەوە دەتکوژم.

کیـژەش لـە ترسـان بەسـەرهاتی خـۆی لـۆ زڕ داکەکـەی گێڕایـەوە و پێـی گـۆت. زڕ داکـی بـەدکار هـەمان شـێوە کیـژی خـۆی ڕەوانـەی جێیەکـەی کـردەوە و دیسـان بـەئیرادەی خـوا بایـەکی تونـد هـات و تەشـی زڕ خوشـکەکەی بـرد کچـە بـەدوای تەشییەکە غاریـدا تـا گەیشـتە ئەشـکەفتەکە دیـتی دێوەکی بەقـەد کەرتـە چیایەکی گـەورەی لـێ بـوو. دێـوە هـەمان قسـەکانی خوشـکەکەی دووبـارە کـردەوە و کچـی زڕ داکەکـە هەردەسـتی تەماشـای سـەری دێـوە دەکـات و دەڵێ خـارە ئـەوە چییە سـەرت پـڕ لـە حـەزیا و مـار و دووپشـك و ئەسـپێ و پیسـییە. دێـوە دەڵێ باشـە بەس هـەر قسـەیەکی دیـم کـرد بـەگێم بکـە ئـەویش دەڵێ بـاش دێوە دەڵێ ئـاوەکی سپی هـات گـازم مەکـە بـەران ئەگـەر ئـاوەکی ڕەش هـات گـازم کـە. کـە کچـە لەسـەر قسـەی دێـوەی ئـاوەکی سـپی هـات گـازی نـەکرد ئـاوەکی ڕەش هـات گـازی کـرد دێوەش کیـژی زڕ داکەکـەی تـێ هەردایـە نـاو ئـاوە ڕەشـەکە و کچـە سـەراپای لەشـی بـوو بـە گـو ناشـیرینییەکی وای بەسـەر هـات کـە بچـووبایە هـەر شـوێنێك خـەرك گاڵتـەی پـێ دەکـرد و بێـزی خـۆی لـێ دەکـردەوە کیـژە بـەگریان چـووە مـاڵێ وەختـەکی داکـی دیـتی کچـەکەی وای بەسـەر هـاتووە بـۆی دەرکـەوت پەنجـەی پەشـیمانی گەسـت و زانـی کـە ئـەوەی وای بەسـەر کچـەکەی ئـەودا هێنـاوە حەسـوودی و دڵڕەقـی و خراپـی ئـەوە لۆیـە لـە قەدیمـەوە دەڵێـن چ بچێنی ئـەوە دەدوورییەوە.

- تۆڵـە کردنـەوەی منـداڵی هـەتیو لـە زڕدایـك و کچـەکەی لـە نێـو حەکایـەت زۆر بەرچاوە لەم ئەفسانە.

**بەسەرهاتی کچێك**

هـەبوو نـەبوو کیـژەك دەبـی لـەبن دەسـتی مـام و مـۆژنی دەبـی، ڕۆژەکـی مـامۆژنی نیوەشـەو دەبـی سـینییەکی لـۆ پـڕ گۆشـت دەکـا و دەڵێ دەبـی ببیەیـە سـەر زێ و بیشـۆیەوە دەنـا دەتکـوژم کیـژە زۆر لـە مامۆژنەکـەی دەپاڕێتـەوە و داوای تۆزێـك ڕەحـم و بـەزەیی لـێ دەکـا بـەڵام بـۆ دڵـی ڕەق هـیچ سـوودێك نییـە! کیـژە ناچـار بـەڕێ کـەوت و بەچـاوی پـڕ گریـان و بـەڕەنگی زەردی هـەتیوی بـەم شـەوە تاریکـە بـەڕێ کـەوت و هـەر ڕۆیـی هـەر ڕۆیـی لـەناکاو گەیشـتە سـەحرایەکی کەسـی تێـدا نـەبوو جگـە لـەخۆی نـەبێ دیـتی قەسـرێکی گـەورەی سـپی جـوان کـە لـەژیانی خۆیـدا نەیـدی بـوو لـە دەرگـای قەسـرەکەیدا و دیـتی بەتـەنیا تاکـە کـوڕەکی قـۆزی ڕێـك و

پێك و خانەدان لە قەسرەکەی بوو و دەرگای لێ کردەوە و کورەش بەگەرمی پێشوازی لێ کرد و گۆتی فەرموو وەرە ژوورێ دانیشە، کیژە لەسەر قسەی کوڕەی دەچی و کوڕە پرسیاری لێ دەکا و دەرێ دەی با بزانم لۆ لە دەرگات دا و تۆ چی و لەکێ هاتی؟ کیژە بەووردی بەسەرهاتی ژیانی خۆی لۆ کوڕەی دەگێڕیتەوە کوڕەش بەسەرهاتی خۆی لۆ دەگێڕیتەوە و پێی دەرێ تازە ئەمن برا ئەتو خوشك وەرە با پێکەوە لەو قەسرەی بژین بەو نەوعەی حەفت سار کیژە و کوڕە پێکەوە بوون پاشان کوڕە ڕۆژەکیان دەرێ کیژێ ئەوە سونەتی خوا و پێغەمبەرانە کە دەبی هەموو کیژەك مێردی بکا و هەموو کوڕێکیش ژنی بینی ئەوجا لۆ نایێ مێردم پێ بکەی کیژەش چاکەی کوڕەی لەپێش چاو دەبی و ڕازی دەبێ کوڕەش زێڕ و مارەکی باشی لۆ دەکا و بەو نەوعەی ژیانەکی خۆش دەگوزەرێنن پێکەوە. ڕۆژەکیان کوڕەکە گۆتی ژنێ ئەمن دەڕۆم ئەتووش دەرکەی لەکەس مەکەوە ژنە گۆتی باش. ڕۆژەکیان یەکێك لەدەرگای داو ژنە لە کونی دەرکەی تەماشای دەکا و دەبینی ژنە دۆمێکە لە دەرگای دەدا و ئەویش قسەی مێردەکەی بەبیر دێتەوە و یەکەم جار دەرکەی ناکاتەوە پێی دەرێ (چیت دەوێ لە دونیا دەتدەمێ دۆمێ بەران بەشەرتەکی دەرکەت لێ ناکەمەوە) پاشان بەهەر حارەکی ژنە دۆمەکە ژنی کابرای ڕازی کرد دەرکەی پێ کردەو. ژنە دۆمەکە گۆتی بینە قیچێ ئەو زێڕانەی تۆ لەبەر دەکەم دوایی گوتی شمەکەکانیشتم بدێ با لەبەرکەم ئەوجا ژنە دۆم لێی بەخۆ کەوت پێی گۆت یەڵلا ئەو جلکە خزمەتکاریانە لەبەرکە و تۆ بووی بە خزمەتکار و من بووم بە خاوەن مار.

گۆتی پیاوەکەی هاتەوە دیتی ژنەکەی زۆر ناشرین بووە پێی گۆت ژنێ لۆ لچت ئەوەندە ئەستوور بووە لۆ ەها ناشرین بووی ژنە دەرێ چ بکەم پیاوەکە لەغەمی دووری تۆ هەر گریاوم غەمم خواردووە لۆیە ناشرین بوویمە. ژنەی غەریبیش هەر دەگریا و لە تەنیایی و بێکەسی و لەترسی ژنە دۆمەکەی ڕۆژەکیان پیاوەکە دووبارە دەرێ ژنێ دەڕۆم ژنە دۆمەکەش دەرێ باشە پیاوەکە دەرێ بابچم لۆ کن خزمەتکارەکەی ژنەکی گەلە فەقیر و باش پێ دەچی وەڵلا پیاوە دەچی و دەرێ خوشك ئەمن دەڕۆمە شارەکی دی ئەگەر هاتمەوە چت لۆ بینم ژنە جوانەکە کە ژنی خۆی بوو پێی دەرێ: ناوی خۆت

لەبیر مەکە بووکە جێچێکم لۆ بینە. پیاوە دەچێتە شاری پێشی هەموو شتەکی دەچی بووکەکەی بکڕی لەو جێیەی کە دەیەوێ بووکەکەی لۆ بکڕی پێی دەرێن کاکە حیکمەتەك لە کڕینی ئەو بووکە دایە ئەمە نیشانەی سەرسوڕمانە کاتێ ئەگەر بووکەکەت لۆ بردەوە لە شوێنێکی بەدزی تەماشای بکە بزانە ئەو ژنە چ دەرێ، ئەگەر ئەو بووکە لەناوەندی کەرت بوو ئەوا قسەی ژنەکە ڕاستە ئەگەر کەرتیش نەبوو ئەوا ژنەکە درۆی دەکا. ژنەش دەچێ بەسەرهاتی ژیانی خۆی لۆ بووکە جێچەکەی دەگێڕێتەوە بەران بەچاوی پڕ لە گریان و دەرەکی بەغەم و بەداخ و کەسەرەکی زۆر بووکەکە لەناوەندی کەرت دەبی و پیاوەکە لێی دەچێتە ژوورێ و هەردووکیان لەخۆشییان تێر تێر پێدەکەنن سەر بەیەکەوە دەنێن. کابرا لۆی دەرکەت ئەوە ژنە دۆمە و بەدکارە و لۆیە بڕیار دەدا دوو هێستر بکڕێ پاش کڕینی هێسترەکان یەکێکیان سێ ڕۆژ ئاوی نەدایێ ئەوی دی سێ ڕۆژ جۆی نەدایێ هەستا هەر لینگەکی ژنە دۆمەکەی لە هێسترەکی بەستەوە ڕاست هێسترەکان یەکیان لۆ لای ئاوەکە چوو ئەوی تریان لۆ لای جۆیەکەی بەمجۆرە ژنە دۆمەکە لەناو دەچی و ئەمەش ئەنجامی مرۆڤی بەدکار.
خلاسو براو هیچم پێ نەبراوە.

= ئەم حیکایەتە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، شێوەی گێڕانەوەی دروستی خۆی هەیە، ئەویش سەرەتا، مام دەروێش نێوچەوانی کچە دەخوێنێتەوە و دەڵێ: تۆ حەوت ساڵ سەری مردوویەکی لەسەر ڕانی خۆت دادەنێی، حەکایەت لێرە دەست پێ دەکات و کۆتاییەکەی وەك ئێرەیە، هەرچەندە سزای دۆمە بەم شێوەیەش نەبێ.

# جۆگەی عاشقان

**کۆکردنەوەی: نیهایەت یوسف ئەحمەد**

**گێڕانەوەی: عەلی عومەر حەمەد**

**تەمەن : ٧٠ ساڵ**

دەگێڕنـەوە لـە زەمـانی پاشـا (سـەنحاریب)دا. ئـەو پاشـایە خـەڵکی هـەولێر بـوو کچێکی زۆر جـوانی هـەبوو ئـەو پاشـایە شـەرتێکی کـرد کـە ئـەوەی ئـاوم لـە زێـی بادینـان بـۆ بگەیەنێتـە هـەولێر ئـەوا کچـەکەی خـۆمی پێشـکەش دەکـەم ئینجـا دوو پاڵـەوان هـاتن یـەکیان مسـوڵمان بـوو ئـەوی تریـان مەسـیحی بـوو هەسـتان بـە ئەنجامـدانی ئـەو کـارە هـەر یەکـەیان لەلایەکـەوە دەسـتی پێکـرد. بـەلام هـەردووکیان دژایـەتی یـەکتریان دەکـرد بـۆ ئـەوەی زووتـر کارەکـەیان تـەواو بکـەن. موسـڵمانەکە لـە (قـولیلان) لـە نزیـك بەسـتوورە ئـاوی بـەژێر زەویـدا هێنـا تـا گەیاندیـە نزیـك هـەولێر. بـەلام ئـەوی تریـان لـە زێـی بادینانـەوە دەسـتی پێکـرد بـەلام کـە زانـی پیـاوە موسـڵمانەکە زۆری نـەماوە کارەکـە تـەواو بکـا پیـاوە مەسـیحییەکە هەسـتا بـە ئەنجامـدانی فێڵێـك بـۆ ئەمـەش پیاوێکیـان لـەنێوان بـوو تـا بزانـی کامـەیان زووتـر کارەکـەیان تـەواو دەکـەن پیـاوە مەسیحییەکە هەنـدێ پارچـە قوماشـی تـولی هێنـا هـەر لـە زێـی بادینانـەوە ڕایخسـت تـا بـەدەوری قـەلای سـوڕاندەوە، ئینجـا هەنـدێك پـارە و زێـڕی دا بـە پیاوەکـەی نێوانیـان تـا بچـێت بـە پیـاوە موسـڵمانەکە ڕابگەیـەنی کـە پیـاوە مەسـیحییەکە ئـاوی گەیاندۆتـە قـەلا. ئینجـا پیاوەکـە چـووە لای و پێـی گـوت، کـە پیـاوە موسـڵمانەکە ئەمـەی بیسـت هاتــە دەرەوە تەماشــای کــرد کــەوا تولەکــە ســپی دەچــۆوە وایزانــی کــە ئــاوە بۆیــە یەکســەر قازمەکــەی کــە جۆگــەی پــێ هەڵدەکەنــد لەســەری خۆیــدا و خــۆی کوشــت. تــا ئێستاش شوێنەواری ئەم ڕوداوە ماوە لە ئاقاری بەحرکەیە.

- سـەیرکە، مێـژووی ڕاسـتەقینە چـۆن بووەتـە ئەفسـانە و حەکایـەت. هـەولێر و ئـاو هێنـان و سـەنحاریب ڕاسـتە، بـەلام، کچـە و وەسـتای موسـڵمان و مەسـیحی تێکهەڵکێشە، چونکە ئەو دەم نە مەسیحی هەبوو نە موسڵمان.

## جۆخینی دوو برایان

هەموومان دەزانین ژیانی دێهات و گوندەکان بە کشتوکاڵ و مەڕداری و کاری هەرەوەزی خەڵکەکەی خەریك دەبن خەڵکی گوند پەیوەندی پتەویان لەگەڵ یەکتری هەیە پەیوەندی خۆشەویستی و هاوکاری... هتد. ئەمەش وای کردووە زۆر رووداو روو بدات لەوانە لە باوك و باپیرانمان دەگێڕنەوە: کە لە زەمانی قەدیمەوە دوو برا هەبوون ئەو دوو برایە پێکەوە دەژیان فەلاحەتییان بەیەکەوە دەکرد. براکە برا گەورەکە ژنی هەبوو بەڵام برا بچووکەکە ژنی نەبوو. هەموو ساڵێك بەیەکەوە گەنمیان دەچاند و دەیان دوورییەوە و دەیان کرد بە جۆخین. ساڵێکیان هەروەکو پێشو گەنمیان چاند و دوورییانەوە و بە جەنجەڕی بەیەکەوە شەنەبایان کرد و خاوێنیان کردەوە و کردیان بەدوو بەش یان دوو جۆخین. ئینجا ماڵی خۆیان جودا کردەوە. برایەکان زۆر لەگەڵ یەکتر تەبا بوون. برا بچووکەکە کە شەو دادەهات دەچوو بەدزییەوە لە بەشەکەی خۆی دەیخستە سەر بەشی برا گەورەی دەیگوت برام ساحێب ماڵ و منداڵە با بۆ ئەو بێ. برا گەورەکەش هەروەکو برا بچووکەکەی بەدزییەوە دەچوو لە بەشی خۆی دەیخستە سەر بەشی برا بچووکەکەی دەیگوت برام بێ ژنە و بە تەنهایە با بەشەکەی منیش منیش بۆ ئەو بێ چونکە ئەو ژنی نییە. بۆ ئەوەی ماڵێك دروست بکات. شەوێکیان خوا بەرەکەتی خستە ناو گەنمەکە. لەبەر ئەوەی ئەو دوو برایە زۆر دەست پاك و دڵ پاك بوون لەگەڵ یەکتری. ئینجا گەنمەکە بوو بە یەك پارچە. کەبینیان بەیەکەوە دەستیان کرد بە کێشانەوەی گەنمەکە بۆ ماڵی خۆیان. لەکاتی کێشانەوەی پیرێژنێکی حەسوودیان بینی و گوتی: بەڕاستی گەنمێکی زۆرە، ئەوە چ بوو تەواو نەبوو. کاتێ دوو برایەکە بینیان گەنمەکە هەمووی بوو بە خۆڵ.

ئەو چیرۆکە ڕاستەقینەیە. بۆ ڕاستی ئەم مەسەلەیە شوێنەواری ئەم ڕووداوە لە نزیك گوندی (قەلاموتك)ە سەر بە ناحیەی (بەحرکە). کە ئێستاش شوێنەوارەکەی ماوە.

= دڵسۆزی و پاکی لەگەڵ یەك، بەرەکەت و دەوڵەمەندییە! برایەتییەکەیان زۆر نموونەیی بووە!
بەڵام، پیرەژن دواجار تێکی داوە.

**لاسـاییْ!**

دەگێڕنــەوە لــە زەمــانی پێشــان ئاغایــەك هــەبوو ئاشــی ئــاوی هــەبوو. ئەوكاتــە ئاشــی كارەبـا نــەبوو. هــەر ئاشــەوانێكی دەگــرت كــە شــەو لــە ئــاش دەمایــەوە بــۆ بــەیانی دەمـرد. پیـاوێكی هـەژار و لێقـەوماو هـەبوو كـە زۆر دەسـت كـورت بـوو. خـاوەن مـاڵ و منـداڵ بـوو چـوو بـۆ لای ئاغـا ووتـی: مـن دەمـەوێ ببـم بـە ئاشـەوان. ئەگـەر رازی ببی و قبـوڵم بكـەی. ئاغا گـوتی: منـیش حـەز دەكـەم بچیت لـە ئاشـەكەی مـن كـار بكـەی بـەڵام هەر كەس دەچێت كار لەم ئاشە بكات بۆ بەیانی دەمرێت.

بـەڵام پیـاوە هەژارەكـە لەسـەر قسـەی خـۆی سـوور بـوو. كـە كـار لـەم ئاشـە بكـات و ببێـت بـە ئاشـەوان. ئاغـاش وتـی بـڕۆ بـەڵام هـەر شـتێك ڕوو بـدات لەسـەر حیسـابی خــۆت. پیـاوە هەژارەكـە چـوو بـۆ ئاشـەكە كـە شـەو لـە ئاشـەكە مایـەوە بـینی گیانلەبـەرێكی دڕنـدە دێـت بـۆ ئاشـەكە ئـەویش بـیری كـردەوە كـە هـەر ئـەو گیانلەبـەرە دڕندەیـە كـە ئاشـەوانەكانی پێشـوی كوشـتووە. ئـەو ئاشـەوانە هـەر كـارێكی بكردبایـە ئـەو گیانلەبـەرە لاسـایی دەكـردەوە كـە ئاشـەوانەكە ئـاوی دەخـواردەوە ئـەویش ئـاوی دەخـواردەوە كـە هاتووچـۆی دەكـرد دووبـارەی دەكـردەوە. ئـەم شـەوە تـا بـەیانی بـیری كـردەوە كـە چۆن ئـەم گیانلەبـەرە دڕندەیـە بكـوژێ ئـەو شـەوە ڕۆیشـت بـۆ بـەیانی گەڕایـەوە بـۆ ئـاش. لـەو زەمانـەدا گـۆزە هـەبوو. بۆیـە دوو گـۆزەی هێنـا یـەكیانی پـڕ كـرد لـە ئـاو و ئـەویتریانی پـڕ كـرد لـە نـەوت. كـە شـەو داهـات بینی گیانلەبـەرە دڕندەكـە بـــەرە و ئاشـــەكە دێـــت. ئاشـــەوانكە گـــۆزە ئاوەكـــەی بەخۆیـــدا كـــرد گیانلەبـــەرە دڕندەكــەش گــۆزە نەوتەكــەی بەخۆیــدا كــرد. ئــەمجارە ئاشــەوانەكە شــقارتەیەكی دا لـــەخۆی گیانلەبـــەرە دڕندەكـــەش لاســـایی ئاشـــەوانەكەی كـــردەوە ئـــەویش دەنكـــە شــقارتەیەكی دا لـــەخۆی. بـــەڵام ئاشـــەوانەكە نەســـووتا چـــونكە ئـــاو بـــوو كەچـــی گیانلەبــەرە دڕندەكــە ســووتا چــونكە نــەوت بــوو. بۆیــە گیانلەبەرەكــە ڕای كــردە دەرەوە و لــە دوورەوە دەنگێــك هــات و ووتیــان خۆكودیــان دەرمــانی نییــە بــەخۆت خۆت سوتاندیە لەدواییدا ئاشەوانەكە دەستی كرد بە كارەكانی خۆی.

**- چـیرۆكی گیانلەبـەر و مـرۆڤ زۆرە و ڕووداوی سـەیری تێدایـە، بـەڵام، ئـەم گینلەبـەرە دەبـــێ چ گیانلەبـــەرێك بـــووبێ، هێنـــدە جـــوان لاســـایی كـــابرای كردووەتـــەوە؟ هەرچـەندە ئاشـەوان سـەركەوتووە لـەوەی خـۆی لـە مـردن ڕزگـار بكـات! بـەڵام، زۆر دڵڕەقانەیە.**

# حەمەدۆك و ئەنگوستیلە

**کۆکردنەوەی: ئەڤین عەلی حوسێن**

هەبوو نەبوو کوڕێك و دایكێك هەبوو بەتەنیا ئەژیان کوڕەکە ئیشی (قەسەر)ی هەبوو ڕۆژی یەك دوو عانەیان پەیدا دەکرد ڕۆژێك لە گەڕەکەکەیان منداڵان پشیلەیەکیان تەنگاو کرد بوو و ئەیانویست بیکوژن، کوڕەکە پێی وتن: مەیکوژن ها ئەو (عانە)تان بدەمێ. ئیتر پشیلەکەی هێنایەوە ماڵەوە. بەهەمان شێوە ڕۆژێکی تر منداڵان لە گەڕەك (گوجیلە)یەکیان تەنگاو کردبوو دیسان کوڕەکە پێی وتن: مەیکوژن ها ئەو عانەتان بدەمێ. ئیتر گوجیلەکەی هێناوە ماڵەوە وتی ها دایە لەماڵەوەی دانێ کوڕەکە زۆر بە بەزەیی بوو جارێکی تر منداڵان تیرەمارێکیان تەنگاو کردبوو دیسان پێی وتن مەیکوژن ها ئەو عتنەتان بدەمێ ئەویشی دووبارە هێنایەوە بۆ ماڵەوە، ئەمجارە پیرەژنی دایکی توڕە بوو وتی کوڕم چییە ئەم شتە سەیرانە ئەی هێنیەوە؟ کوڕەکە وتی: دایە قەیناکە ماوەیەك بەخێویان ئەکەین. ڕۆژێك تیرە مارەکە بەجواب هات و وتی: من کیژی شای مارانم دەبێ بم بەیتەوە، کوڕەکە پێی وت: باشە. ڕۆیشتن لەڕێگا تیرە مارەکە بە حەمەدۆکی وت: توشی مارێکی زۆر دەبین لەبن پێت دەخزێن مەترسە ئەوانە دەچن خەبەری دایك و باوکم دەدەن. ئینجا کە منت گەیاندە ماڵەوە، لە ماڵەوە پێت دەڵێن بخوازە ماڵی دنیایێ تۆش پێیان بڵێ هیچم ناوێ خۆشییەگی ئێوەم دەوێ بەس پێیان بڵێ (ئەنگوستیلە)ی گەروی تۆم دەوێ. ئەویش کە تیرە مارەکەی گەیاندە ماڵەوە دایك و باوکی تیرە مارەکە پێیان وت (حەمەدۆك) چت دەوێ؟ ئەویش وتی هیچم ناوێ خۆشییەکی ئێوەم دەوێ، بەڵام ئەنگوستیلەی گەروی تۆم دەوێ ئیتر ئەنگوستیلەکەی گەروی دایێ و حەمەدۆك ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە لە ڕێگا زۆری برسی بوو وتی: باشە من ئەمەم بۆچی بوو من برسیمە! هێندەی پێ نەچوو هەموو جۆرە خواردنێکی زۆری بۆ ئامادە بوو. کە ئەنگوستیلەکە بۆی هێنان ئیتر لەگەڵ (پشیلە) و (گوجیلە) تێرییان خوارد و بۆ ماڵەوە گەڕانەوە ئینجا حەمەدۆك بە دایکی وت: دەبێ بچی کچی پاشام بۆ بخوازی. دایکی وتی: من چۆن بچم! هەرچۆنێك بوو دایکی چووە خوازبێنی کچی پاشا دایکی حەمەدۆك دوو ڕۆژ لەماڵی پاشا لەناو پێڵاوان دادەنیشت پاشا بە پیاوەکانی وت بزانن ئەم پیرەژنە

چـی دەویٚ بیـدەنیٚ. ئـیتر خورامکارەکـان پێیـان وت چـت دەویٚ پـیرەژن؟ بەترسـەوە وتـی هـاتووم کچـی پاشـام بـدەنیٚ بـۆ کوڕەکـەم. ئـیتر خورامکارەکـان بەپاشایان وت. پاشـا زۆر تـوڕە بـوو وتـی: بـڕۆن بیکـوژن! ئـیتر خورامکارەکـان خـڕ بوونـەوە بـە پاشـایان وت مـەیکوژە بـەس بـارەکی ئـەوها گرانـی لەسـەر کوڕەکـەی دانـێن ئەگـەر پێـی نـەکرا ئـەوا لـە ملـی دەن. پاشـا وتـی باشـە ئەگـەر کوڕەکـەت کچەکەی مـن بخـوازیٚ دەبـیٚ حـەوت ئـاش بگـەڕیٚ هـەتا سـبەینیٚ کەڵـەبابێکی (زێـڕ) و یـەکێکی (زیـو) لەسـەر ئاشـەکان بقـوقێنیٚ، ئـەوە بـوو دایکـی هاتـەوە بـۆ ماڵـەوە هـەموو قسـەکانی بـە حەمـەدکی وت. پاشـان کوڕەکـەی وتـی: ئەمـە ئاسـانە فـەرمانی بـە ئەنگوسـتیلە سـحرییەکەدا هـەمووی بـۆی جـیٚ بـەجیٚ کـرد و بـەیانی بینیـان وا حـەوت ئـاش دەگـەڕیٚ و کەڵـەبابێکی زێـڕ و یـەکێکی زیـو لەسـەر ئاشـەکان دەخـوێنن ئینجـا پاشـا کچـەکەی لـە حەمـەدۆك مـارە کـرد و کچـی پاشـای خورامکـارێکی پیـاوی لەگەڵـدا بـوو نـاوی (قـولی) بـوو. لـە قەسـریٚ بـوون دوایـی حەمـەدۆك ڕۆژێـك دەچـنە ڕاویٚ لـەویٚ تەماشـای کـرد ئەنگوسـتیلە سـحرییەکەی پـیٚ نییـە لـە ماڵـەوە لـەبیری کـردووە. بـەڵام ژنەکـەی بـە ئەنگوسـتیلەکەی وت لـەتۆم دەویٚ بەقەسـرەوە بچـین بـۆ ئـەم بـەری زێیەکـە. بـۆی جـیٚ بـەجیٚ کـرد کـە حەمـەدۆك گەڕایـەوە بـینی نـە ژن مـاوە نـە قەسـر و خانووەکـەی. ئـیتر بـە غـەمباری دانیشـت (گوجیلـە و پشـیلەکەی) هاوڕێیـان پێیـان وت غـەم مـەخۆ حەمـەدۆك ئەچـین ئەنگوسـتیلەکەت بـۆ دێنینـەوە، بەڕێکـەوت گوجیلـە وتـی ئـەمن مەلـەوانێکی باشـم وەرە سـەر پشـتی مـن لـە زێیەکـە دەپەڕینـەوە ئـیتر هـەردووکیان پشـیلە و گوجیلەکـە پەڕینـەوە و چـونە ئەوبـەری زێیەکـە و چـوونە نـاو قەسـرەکە ژنـی حەمـەدۆك هـەردووکیانی بـینی وتـی ئـای ئەمـە! گوجیلـە و پشـیلەکەی حەمـەدۆکن چـی ئەکـەن لێـرە! ئـیتر ژنەکـەی هەنـدیٚ شـتی فـڕیٚ دایـە بـەردەم پشـیلەکە و بـە گوجیلەکـەی وت تـۆ ئـاوە گـری! (قـولی) خزمـەتکاری لاقێکـی هەرزڕانـد و ئەنگوسـتیلەکەی لـەناو نـابوو پێـی دووری بـۆوە وە جێگاکـەی کێمـی کـرد بـوو (قـولی) بـەتاوان و لـەئازار پـاڵی دابـۆوە پشـیلەکە یەکسـەر چـوو زمـان پێـدا هێنـا تـا (قـولی) خـەوی لـیٚ کـەوت. ئینجـا پشـیلەکە ئەنگوسـتیلەکەی لـە قاچـی دەرهێنـا لـە ڕێگـا گوجیلەکـە بـە پشـیلەکەی وت ئەگـەر ئەنگوسـتیلەکە نـەدەی بـەمن لـە زێیەکـە نـات پەڕێنمـەوە! پشـیلەکە پێـی وت ئـاخر دوایـی لـە زێیەکـە ماسـی گـەزەت لـیٚ دەدا تـۆش بحـەپی ئەنگوسـتیلەکەت لـیٚ دەکەوێتـە نـاو ئاوەکـە دەبـیٚ هـەر لای مـن بـیٚ ئەنگوسـتیلەکە. ناچـار پشـیلەکە ئەنگوسـتیلەکەی دایـیٚ و چـونکە پشـیلەکە

مەلـەی نـەدەزانی بـە ڕێکـەوت لـە پەڕینـەوەی نـاو زێیەکـەدا پوختـە و نـازدار ماسـیـیەکی گـەورە گـەزێکی لـە گوجیلەکـەی داو گوجیلەکـە حـەپی و ئەنگوسـتیلەکەی لـێ کەوتـە نـاو ئاوەکـە و کەوتـە نـاو دەوی ماسـییەکی گـەورە. بـەلآم هـەردووکیان بینییـان ماسـییەکە کەوتـە نـاو تـۆڕی ماسـی گرێـك کـە تۆڕەکـەی کـردەوە پێیـان وت: ئـەو ماسـییە پیسـە نەتـەوێ ئـیتر ماسـی گرەکـە ماسـییەکەی فڕێـداو یەکسـەر هـەردووکیان ماسـییەکەیان هەلگرتـەوە و ئەنگوسـتیلەکەیان لـەناو دەوی دەرهێنـا و هاتنـەوە بـۆ لای حەمـەدۆك کـە بینییـان زۆر غـەمبارە وا دانیشـتووە بـینی وا ئەنگوسـتیلەکەیان بـۆ هێناوەتـەوە زۆر پێـی خـۆش بـوو. حەمـەدۆك فـەرمانی بـە ئەنگوسـتیلەی سـحریدا پێـی وت لـەتۆم دەوێ (فـاتم و قـولێ) خـەویان لـێ بکـەوێ و قەسرەکەشـم بێتـەوە جێگـەی خـۆی ئینجـا بـارە دارێکیـان هێنـا و ئاگریـان لـە فـاتم و قـولێ بـەرداو ئاگریـان تـێ بـەربوو هـەردووکیان سـووتان. بـەم شـێوەیە حەمـەدۆك بـە ئـاواتی دڵـی خـۆی گەیشـت ئـیتر منـیش کراسـم دڕا و هیچم پێ نەبڕا.

**- لـەم ئەفسـانەیە، ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، کـە هـەر زینـدەوەرێك، هـەتا ئەگەر بچوك و بێ تواناش بێـت، دەکـرێ بـەجۆرێك لـە جۆرەکـان سـود بـە مـرۆڤ بگەیـەنێ. بۆیـە وا چـاکە لـە هـیچ زینـدەوەر و گیانلەبـەرێك بـێ هیـوا نـەبین و زۆرجار کاری مەزن لە زیندەوەری بچوك بینراوە.**

## گورگ و ئێستر

دەڵـێن جارێـك گورگێـك وتـی: تۆبـەی دەکـەم و ئـیتر بەسـە ئـەم دڕەندەیـە و ئـازار گەیاندنـە بـە خـەڵك، بـا ڕێگـای حـەج بگرمـە بـەر و پـاش حەجەکـە لـە گۆشـەیەك بۆخـۆم دانیشـم خـەریکی خـوا پەرسـتی بم تـا خـوا ئـەم ئەماناتـەم لـێ وەردەگرێتـەوە! لێیـدا و وردە وردە بـەڕێ کـەوت و ڕۆیشـت برسـییەتی ڕۆژ بـەڕۆژ بێهێـزی دەکـرد و دەینالآنـدن لـە برسـییەتیدا. ڕۆژێـك لـە دوورەوە ئێسـترێکی لاتـی بەرچـاو کـەوت کـە بـەڕەلا کرابـوو گـورگ گـوتی خـوا لـە وەخـتی تـەنگ و چـەڵەمەدا حـەرامی حـەلاڵ کـردووە مـن ئـەوەتا لـە برسـان وەختـە بمـرم بـا تۆبەشـم کردبـێ و بـۆ حـەجیش بچـم بـۆم حەلاڵـە بچـم ئـەو ئێسـترە لاتـە بخـۆم چـونکە ئەگـەر نـەیخۆم

دەمرم و پەکی خوا پەرستییەکەم ئەکەوێ! چووە لای ئێسترەکە و مرخی خۆی لێ خۆش کرد. ئێستر پێی وت: باشە مام گورگ ئەوە ئۆغر بێت وا لەم دەشتەدا وردە وردە دەڕیت و هاتووی بەلای منەوە؟ مام گورگ وتی: ئۆغرمان خێر بێت، دەمەویت بچم بۆ حەج بەلام زۆرم برسی بوو، بە شەرع بۆم حەلاڵە تۆ بخۆم، هاتووم بتخۆم وە پاشان بڕۆم! ئێستر وتی یاخوا بەخێر بێیت بەڕاستی منیش لەم ژیانە بێزار و وەڕز بووم دەمەویت ڕزگارم بێت، بەلام مام گورگ خۆت دەزانی گەلێك حەدیس و ئایەت لەسەر ئەوە هەیە کە ئەگەر گیانداریك سەربڕا دەبێت بەجۆریك سەر ببڕێ کە زوو گیانی دەرچێ ئێستا منیش وەختی خۆی کە ناڵ کرام بزماریك لە وەختی ناڵەکەدا چووە بە گۆشتەکەمدا زۆر ئازارم دەدات. تۆ لەولاوە بمخۆیت و ئەمیش لەم لاوە ئازارم بدات ئەمە پێچەوانەی خوا ناسییە کە تۆ گرتووتە بەر. ئەگەر بە زەحمەتی نازانی لە پێشدا ئەو بزمارە دەربێنیت و پاشان بەشێنەیی بمخۆیت خێرت دەگاتێ! مام گورگ: وتی ڕاست ئەکەیت کامەیە تا بۆت دەربێنم؟ ئێستر قاچی بەرز کردەوە و پیشانی دا. مام گورگ بە وەستایی لموزی بۆ درێژ کرد کە بزمارەکە دەربێنێت. لەو کاتەدا ئێسترەکە لەقەیەکی توندی لە دەم و لموزی گورگەکەداو هەموو دانەکانی خستە ناو دەمییەوە لەوێ بێهۆش کەوت و ئێسترەکەش لێی داو ڕۆیی! پاشان کە گورگەکە هاتەوە هۆش خۆی و سەیری حاڵ و باڵی خۆی کرد و ڕووی کردە خۆی و بوخۆی وت (ئاخر خوا بتگرێ گورگ تۆ باوکت ناڵبەند بوو، باپیرت ناڵبەند بوو، تۆ لەکوێ ناڵبەندی) دە بیخۆ ئەوە دەردت بێ.

**= لەم حیکایەتی گیانداران، ئەوە بەدەردەکەوێ کە گیانلەبەرەکان کە بە سروشتێك گەورە بووین و ڕاهاتوون، بە ئاسانی ناتوانن ئەو سروشتەی خۆیان بگۆڕن، گورگ پاش تۆبەکردن و لە ڕێگای حەجیش وەختێ برسیەتی زۆری بۆ دێنێ، تۆبە دەشکێنی و مەیلی خواردنی ئێستری لات دایدەگرێ.**

# خوشکی حەوت برایان

**کۆکردنەوەی: کوردستان نەبی مستەفا**

**گێڕانەوەی: دایە گەورەم**

هـەبوو نـەبوو کـەس لـەخوای گـەورەتر نـەبوو کـەس لـە شـەیتان درۆزنـتر نـەبوو، ژنێـك هـەبوو حـەوت کـوڕ و کچـێکی هـەبوو هـەر حـەوت کـوڕی چـوبونە ڕاوێ نەگەڕابوونـەوە. ژنـە ووتـی: ڕۆڵـە هەسـتە بـڕۆ نـاو منـدالآن کچـە چـووە نـاو منـدالآن لـەوەختی گەمـە کـردن شـتێکیان لـێ بـزر بـوو، منداڵـەکانیان وتیـان کـێ بـردیتی کـێ بـردیتی کـەس جـوابی نـەداوە. هـەموویان وتیـان ئـەتو بردیتـە کچـە دەسـتی بـەگریان کـردو وتـی: ئـەمن نەمبردیـە. وتیـان: بڵـێ بەسـەری براکـانم وتـی: منـیش نـەمزانی نـاوی براکـانم چـییە، دایکـی وتـی کچـەکەم ئـەتوش بـڕۆ نـاو منـدالآن بـڕێ بەسـەری حـەوت براکـەم ئـەمنیش نـەبووم، ژنـە وتـی ڕۆڵـە هەسـتە بـڕۆ جلـەکانم بشـۆ کچـە هەستا تەشت و سابون و شەی برد چووە کانی ژنان.

قەلەڕەشێك هـات سـابوونی لـێ بـرد کچـە وتـی: بمـدەوە. قەلـەڕەش وتـی: لێـرە نـا تـا زارکـی ئەشـکەوت دینـا. فاتیمـە سـەیری ئەشـکەوتی کـرد ئەشـکەوتێکی خـۆش بـەلآم زۆر پـیس بـوو پشـیلەیەکی لـە ڕۆخـی دابـوو پشـیلە دەسـتی بـە میاوانـدن کـرد فاتیمـە دەسـتی بـەخاوێن کردنـەوەی مـاڵ کـرد و دەسـتی کـرد بـە نـان کـردن و شـیو لێنـان لـە وەخـتی گەڕانـەوەی براکـانی فاتیمـە چـووە پشـت نوینـەکان براکـانی تەماشـایان کـرد خانووەکـەیان خـاوێن بوویتـەوە براکـانی ئـەڵێن: کـێ ئێـرەی خـاوێن کردیتـەوە تـا خـەنی بکـەین بـە مـاڵی دونیـا، چـەند جـار دووبارەیـان کـردەوە. فاتیمـە هاتـە دەرێ و وتـی: ئـەمن خـاوێنم کردیتـەوە براکـانی لێیـان پرسـی ئـەتوو کێی و لۆ هاتیە ئێرە؟

فاتیمـەش دەسـتی کـرد بەگێڕانـەوەی کـە لەسـەر کـانی شـەیان لـێ بـردم ئـەمنیش بـەدوای داهـاتم لـۆ بردنـەوەی وتـی دایکـت نـاوی چـییە؟ فاتیمـەش نـاوی دایکـی پـێ وتـن و وتـی حـەوت بـرام هەیـە چـووینە ڕاوێ نەگەڕاینـەوە براکـانی هـەموویان چـەکیان دانـاو یەکەیەکـە دەسـتیان کـرد بـە مـاچ کردنـی خوشـکیان وتیـان ئـەتوو لـە لامـان بـەو نـان و شـیومان لـۆ حـازر بکـە خـەنیت دەکـەین هـەر وەختێکیـش غـەریبی دایکت کرد دەتبەینەوە لای.

وەختــەكیش فاتیمــە خــەریكی دروســت كردنــی نــان بــوو پشــیلەش لــە ڕۆخــی تەندوورەكــە دانیشــت بــوو كەرتــە نانێــك بــەربۆوە فاتیمــەش خــواردی پشــیلەش دەســتی كــرد بــە نــوزە نــوز وتــی: پاچــە نانەكــەم بــدەوە پشــیلە ئاگرەكــەی لــێ كوژانــدەوە، فاتیمــەش وتــی خوایــە ئێســتا ئــەمن نــانی كــو حــازر بكــەم لــۆ براكــانم ئێســتا دەگەڕێنــەوە! فاتیمــە بەناچــاری هەســتا ڕۆیشــت تــا لــە دوورەوە بریســكایی ئــاگری دیــت چــوو لــۆ ئــەوەی هەنــدێك پــەنگری لــێ وەربگــرێ، كــە چــووە پــێش دیــتی دێــوەكی گــەورە لــە تەنیشــت ئاگرەكــە درێــژ بــووە خــەڵك وتیــان: فاتیمــە مەچــوو بەڵام فاتمە وتــی: ئــەبێ هــەر بچــم تــا لــۆ براكــانم خــواردن حــازر بكــەم تــا نەگەڕاینــەوە فاتیمــە بــە دزی دێوەكــە هەنــدێك پــەنگری بــرد لــە وەخــتی گەڕانــەوەی هــەرمووش لــە داری ئــاڵا تــا گەیشــە جێــی خــۆی نــاو ئەشــكەوتەكە وەختــەك دێوەكــە بەخەبــەر دێــت هەســت بــە بۆنێــك دەكــات دێوەكــە وتــی: بــۆن دێ بــۆنی بێگانــان دێ لــە حــەوز و میســكان دێــت. بــۆن دێ بــۆنی بێگانــان دێ لــە حــەوز و میســكان دێ. گوتیــان: نییــە. ووتــی: هەیــە دێــو بــەدوای گەلــە هــەرموش دا چــوو. دێــو لــە زاركــی ئەشــكەوت بــانگی كــرد وتــی: هــا فاتیمــە هــەر حــەوت بــرات بكــوژم یــان دەســتە قەجیلــەت بمــژم؟ فاتیمــە وتــی: نــا براكــانم مــەكوژە گوســتی خەجیلــەم بمــژە تــا مانــدوو دەبــوو هــەموو ڕۆژێ بــەردەوام دەهــات براكــانی تەماشــایان كــرد فاتیمــە زۆر عــادز و سســتە وتیــان فاتیمــە لــۆ وا عــادزی ئەگــەر بــیری دایكــت دەكــەی دەتبەینــەوە؟ فاتیمــە دەســتی كــرد بــە گێڕانــەوەی بەســەرهاتی خــۆی وتــی هــەموو بــەیانیان دێــت. براكــانی وتیــان: باشــە ئــەوجارە هــەر حــەوتمان چــەكمان ســوار دەكــەین خۆمــان دەشــارینەوە ئەگــەر هات ئــەتو وەكــو جــاران خــۆی كــەلی بكــە حــەقت نــەبی دیســان دێــو دێتــەوە ئــەڵێ هــا فاتیمــە هــەر حــەوت بــرات بكــوژم یــان گوســتی خەجیلــەت بمــژم؟ فاتیمــە ئــەڵێ: نــا براكــانم مــەكوژە گوســتی قەجیلــەم بمــژە، براكــانی لــە دێوەكــە دەدەن و دەیكــوژن، دیچــویان لــەناو تــەلیس نــاو داریــان كــۆكردەوە و ســوتاندیان وتیــان: فاتیمــە ئــەوا كوشــتمان بــەڵام نەچــییە ســەری. ڕۆژ دەڕواو دێ فاتیمــە دەچــی زبــڵ فــڕێ بــدات دەبــینی پیــازی زۆر جــوان ڕوایــە فاتمــە دەڵــێ بــەخوای پیــازی زۆر جوانــە بــا هەنــدێكی لــۆ براكــانم ببەمــەوە، براكــانی لــە پیازەكــە دەخــۆن لــە پشــتێنی بــەرەو ژێــر دەبــن بــە دێــو فاتیمــە ئــەڵێ خوایــە چ بكــەم؟ دكتــۆر و حــەكیم نــەما نەكــەم براكــان چــاك نابنــەوە پیاوێــك نــاوی ئەحمــەد بــوو ئــەڵێ: فاتیمــە ئــەو برایانــەت لــۆ چــاك دەكەمــەوە بــەڵام ئــەبێ مێــردم پــێ بكــەی و خۆشــتم لــێ مــارە بكــەی فاتیمــە وتــی باشە بەس براكانم چاك بكەوە.

ئەحمەد ئەڵێ برۆ شوارکە هەنارم لۆ بینە حەوت شوارکە هەناری لۆ دێنی ئەحمەد بە هەر حەوت شوارکەکە لێیان دەدات براکانی چاك دەبنەوە و ئەحمەد فاتیمەی لەخۆی مارە دەکات. ئەحمەد فاتیمەی برد و بەلاّم ژنەکی دیشی هەبوو ژنەکەی یەکی سووری چاو شین بوو فاتیمە لە قاتی سەرەوە بوو ژنەکەی تر لە قاتی خواریێ ژنەکەی دیکە قاپی دەشوشت ژنەکە زۆر لەخۆی رازی بوو وتی: جا وەرە ئەمن شۆقم دایتە ئەم دنیا قاپم پێ دەشۆن قاپەکان دەشکێنێ فاتیمە لێی بەجواب هات و وتی ها ئاگات لەخۆت بی ئەو شۆقە شۆقی منە هی توو نییە. وەختەکی ژنە سوورەکە مەگیرانی دەکا و ئەڵێ هەژنە هەژنە گۆشتی کۆترم لۆ دەرمانە فاتیمە وەکی کۆتری دێ و دەچێ فاتیمەی لۆی دەکوژن و پشکە خوێنی فاتیمە دەرژێتە عاردی ژنە سووری بەرە بەرە ئاگری تێ بەردەدات ئەو پشکە خوێنە ئەبێتە کۆتر و ئەڕوا.

ئەحمەد دەچێتە سەر کاری خۆی و جووتیار دەبێ فاتیمەش لەبەردەمی جووتیار هەڵدەپەڕی و تەماشای ئەحمەد دەکات پاشان کۆتر وەکی جاران دەبێتەوە فاتیمە، فاتیمە دەچێتە لای پیرەژنەك بەسەرهاتی خۆی لۆ دەگێڕێتەوە پیرەژنیش لەلای خۆی دایدەنێ ئەحمەد بەوە دەزانی دەچیتە لای پیرەژن و ئەڵێ فاتیمەم بدەوە پیرەژنیش ئەڵێ بەو مەرجەی هەر لێرە تا ماڵی ئێوە مافووری سۆر رابیخەی چونکە فاتیمە نابی بەپێ بڕوا حەیفە ئەحمەدیش ئەڵێ بەسەر چاو دەچێ مافوور رادەخا تا ماڵی خۆیان دووبارە لەگەڵ فاتیمە دەبنەوە بە هاوسەری یەکتری.

حیکایەتم تەواوە هیچم پێ نەماوە.

**= حەکایەتی فاتیمە و حەوت براکە، دەقی زۆری لێ بلاّو کراوەتەوە، ئەم دەقەیان لە کۆتاییەکەی لە وانی تر جیایە و وەك دەقەکانی تر نییە ! لە دەقەکانی تر کچە شوو بە دێو دەکات. لەم دەقە شوو بە کابرایەك — حەکیمەك — دەکات. کە براکانی چاك دەکاتەوە.**

## ڕێوی کلك بە زەنگۆڵ

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو کەس لە شەیتان درۆزنتر نەبوو پیرەژنێك دەبێ هەموو بەیانیان مەڕەکانی دەدۆشێ و ماستی هەوێن دەکات ڕێوییەك هەمووڕۆژێ دێ ماستەکەی نیوە لێ دەخواو نیوەی دەڕێژێت پیرەژن بەوە زۆر تورە دەبێت ئەڵێ ئەوجارە بزانم کێ ئەو ماستەم لێ دەڕێژێت. پیرەژن وەکو جاران ماست هەوێن دەکات خۆی دەشارێتەوەو دارێکی لەدەست دەگری دەبینی ڕێوییەك بەدزییەوە لۆ بادیە ماستەکە دێت پیرەژن داسێك لە کلکی دەدات و کلکی دەبڕی ڕێوی دەچێتە ناو هاوڕێکانی دەست دەکەن بە گاڵتە پێ کردن ئەڵێن ڕێوی ڕێوی قەرەجۆ قەرەجۆ شەرمم بەتۆ.

ڕێوی زۆر غەمبار دەبێ و دەچێتە لای پیرەژن دەست بە نوزە نوز دەکات ئەڵێ پیرەژن بەقوربانت بم کلکەکەم بدەوە هەرچی دەتەوێ لۆت جێبەجێ دەکەم بەس کلکەکەم بدەرەوە. پیرەژنیش ئەڵێ بڕۆ سەر جۆخینی هەندەك جۆم لۆ بینە ڕێویش هەر بەغار دەچێتەر سەر جۆخینی ڕێوی ئەڵێ جۆخین هەندێك جۆم بدەرێ تا پیرەژن کلکم بداتێ جۆخین دەڵێ بڕۆ هەندێك ئاوم لۆ بینە تا منیش جۆت بدەمێ، ڕێوی دەچیتە سەر کانی ئەڵێ کانی هەندێك ئاوم بدەیە تا بیبەمە سەر جۆخین تا جۆخین جۆم بداتێ جۆی بدەمە پیرەژن پیرەژنیش کلکم بداتەوە. کانیش ئەڵێ بڕۆ هەندەك خۆڵم لۆ بینە تا منیش ئاوت بدەمێ ڕێوی ئەچێتە سەر چیا ئەڵێ چیا هەندەك خۆڵم بدەیە تا بیبەم لۆ کانی تا کانی هەندەك ئاوم بداتێ ئاویش ببەم لۆ جۆخینی جۆخین هەندەك گەنمم بداتێ گەنمیش ببەم لۆ پیرەژنی تا پیرەژن کلکم بداتێ. چیا هەندەك خۆڵی دەداتێ ئەویش خۆڵی دەبات لۆ کانی کانی ئاوی دەداتێ ئاوی دەبات لۆ جۆخینی جۆخینیش هەندەك جۆی دەداتێ ئەویش جۆی دەبات لۆ پیرەژنی پیرەژنیش کلکی دەداتەوە ڕێوی بەلام زەنگوڵەکی لۆی پێوە دەکات لەکاتی ڕۆیشتنی دەنگی زۆر خۆشی لێوە دێت. ڕێویش ئەوجارە بە خۆ بەزل زانینەوە و لەخۆ بایی بوونەوە دەچێتە ناو هاوڕێیەکانی ڕێوییەکانی تر بانگی دەکەن ڕێوی ڕێوی قەرەجۆ قەرەجۆ شەرمم بەتۆ ئەو زەنگوڵت لەکێ بوو؟ ڕێوش بیر دەکاتەوە لەبیری خۆیدا دەڵێ کاتی ئەوە هاتووە تۆڵەی خۆمیان لێ بکەمەوە ئەڵێ ئەو ڕووبارەتان دیتیە ئەوانیش ئەڵێن بەڵێ ئەڵێ: خۆتان فڕێدەنە ناوی وەکو منتان لێ دێت.

سەرکردەی ڕێوییەکان ئەڵێ من لە پێشدا دەچم. سەرکردەی ڕێوییەکان خۆی فڕێ دەداتە ناو ڕووبارەکەوە بڵقە بڵقی لێوە هەڵدەستێ ئەوانیش ئەڵێن ڕێوی ئەو دەنگە چییە ئەویش ئەڵێ ئەو دەنگی زەنگوڵەیە ئەوانیش هەر هەموویان خۆیان فڕێ دەدەنە ناو ڕووبارەکەی هەر هەموویان دەخنکێن ڕێویش سەیریان دەکات و زۆر دڵی خۆش دەبێ ئەڵێ ئەوا حەقی خۆم لێیان کردەوە.

حەکایەتم تەواو منیش گەڕامەوە.

**- ئەم حیکایەتە حیکایەتی گیاندارانە، ئەوەی جێگای سەرنجە، لەم دەقە زنجیرەی داواکاریەکان گۆڕاون و وەك دەقەکانی تر نییە! کە پیرەژن داوای شیر دەکات و ڕێوی ڕوو لە بزن دەنێ و بزن داوای گیا دەکات و تا کۆتایی، کەچی لێرە، پیرەژن سەرەتا داوای جۆ دەکات. ئەم حیکایەتەش بە هەموو گێڕانەوەکانی ڕیشەیەکی کۆنی هەیە و لەوە دەچێ لەسەرەتای دروست کردنی گوندەوە سەری هەڵدابێ.**

**نەمدی نەمخوارد نەمرێشت**

هەبوو نەبوو خوشکێك و برایەك هەبوو ئەو کچ و کوڕە زڕداکیان هەبوو هەموو ڕۆژێ دەبوایە ئە کچ و ئەو کوڕە چووبانە ڕێواسی ڕۆژێك تورەگەی کچەکە کون دەبێ تا دەگەنەوە ماڵێ دەبینی هیچی تێدا نەماوە ئەوانیش کە دەبینن زۆر دەگرین و دەچنەوە ماڵێ زڕدایکی دەڵێ ها لۆ هیچت نەهێناوە ئەویش بەسەرهاتی خۆی لۆ دەگێڕێتەوە بەلاّم هیچ سودی نییە هەڵدەستێ بەداران لێیان دەدات ئەوانیش زۆر دەگرین دەڕۆن لەڕێگادا دەبنە کۆتر و هەموو کاتێك ئەم دوو کۆترە دەیان ووتەوە کوو کوو کوو نەمدی نەمخوارد نەمرێشت کوو کوو کوو نەمدی نەمخوارد نەمرێشت.

حیکایەتم تەواو منیش گەڕامەوە

**گۆڕینەوە!**

هەبوو نەبوو پیرەژنێک دەبێ لەگەڵ منداڵێك، پیرەژن ئەڵێتە کوڕەکەی کوڕم بڕۆ هەندێك ئاوم لۆ بینە کوڕەکەش لەکاتی گەڕانەوەی دڕکی لەپێ ڕادەچێ زۆر دەگری پیرەژن ئەڵێ کوڕم لۆ ئەگریەی ئەویش ئەڵێ دڕکەکم لەپێدایە ئەویش ئەڵێ بینە لۆت دەربهێنم پیرەژن دڕکەکەی لۆ دەردێنی دەیخاتە ناو تەندووری کوڕەکەش ئەڵێ هی...هی... نوزە نوز دەکات ئەڵێ یان دڕکی خۆم دەوێت یان ناسکەکەم ئەوێ پیرەژنیش ئەڵێ کوڕم دڕکەکە سوتا لۆچتە بەڵام ئەو ئەڵێ یان دڕك یان ناسك.

پیرەژنیش ناسکەکی دەداتێ کوڕە دەڕوا تا دەبینی شوانێك لە دوورەوە دانیشتووە لەدیار مەڕەکانی ئەڵێ شوانە وەرە ئەمن ناسکم پێیە با بەیەکەوە بیخۆین شوانەکەش ئەڵێ باشە کاتەکی نانەکەی خوارد و تەواو بوو کوڕە منداڵەکە دەست دەکات بە نوزە نوز دەڵێ یان ناسکەکەم دەوێ یان مەڕ شوانەکە ئەڵێ ئەتو بەخۆت بانگت کردم منداڵەکە ئەڵێ نا یان ناسك یان مەڕ.

شوانەکە بەناچاری مەڕی دەداتێ کوڕە منداڵەکە دەڕوا دەڕوا تا دەگاتە شوێنێکی دەبینی بووکە ئەویش ئەڵێ ها ئەو مەڕەی سەربڕین کاتێك مەڕەکەیان سەربڕی خواردیان منداڵەکە دەست دەکاتەوە بە نوزە نوز ئەڵێ یان مەڕ یان بووك ئەوانیش ئەڵێن ئاخر نابی چۆن ئەبێ ئەڵێ نا ئیلا یان مەڕ یان بووك ئەوانیش بەناچاری بووکی دەدەنێ منداڵەکە دەڵێ ئەستێرم دا بەناسك ناسکم دا بەمەڕ مەڕیشم دا بەبووك.

حیکایەتم تەواو بوو

– ئەم حیکایەتە کە ئاوا تەماشای دەکەی سادە و بێ مانادێتە بەر چاو، بەڵام، لە ڕاستیدا بەشێوەیەکی گاڵتە جاڕی باس لەو ئالوگۆڕیە زۆر و ئاڵۆزە دەکات کە مرۆڤ لە ژیانیدا دەیکات، تا دەگاتە ئەو مەبەست و ئەو شتەی کە دەیەوێ.

# کیژە پاشـــایەك

**کۆکردنەوەی: ڕەنگین وەلی عومەر**

**گێڕانەوەی: حاجی کریم**

**تەمەن: ٦٠–٧٠ساڵ**

**خوێندەواری نییە**

جـارەکی پاشـایەك هـەبوو کچـەك و کـوڕەکی هـەبوو، پاشـا مەلایـەکی لـۆ ئـەو کچـەی خـۆی گـرت بـوو دەرسـی پـیێ ئـەگوت وەخـتی حـەج داهـات پاشـا گـۆتی: ئەچـمە حـەجیێ، بـەخۆو ژنـی و کـوڕی کـوڕیش ئەبـەم لـۆ ئـەوەی خزمـەتن بکـات بـەرام نـزانم کچـیێ لـەکن کـیێ بـەجیێ بێـرم! مـەلا وەیگـۆ فـەرقی مـن و تـو چـییە دەرسـیێ پێـرێم هـەتا ئـەتوو دێیـۆ. ئـەوان ڕۆیشـتن مـەلاش وەگـەریان کـەت هـەتا بەغـدایێ، لـەویێ مـەلا گـەڕاوە، ئـەوانیش ڕۆیشـتن لـۆ حـەجیێ مـەلاش هاتـەوە لـە بەغدایێ، وەی گۆتـە کچـەکەی دەبـی کـاری خـراپم لەگـەڵ بکـەی! کچـیێ گـۆتی: نـابی نـاکریێ کـو دەبـی وام لەگـەڵ بکـەی گوناحـە و ئـەتو مامۆسـتای مـنی ئـەو کچـەی ناچـار کـرد. کچـیێ گـۆتی: دە مـادام بـاب چـم خـۆم بشـۆم ئـەتوش سـەری خـۆت بشـۆ ئـەوجا کارەکـە دەکـەین کیـژ چـووە کورخـانیێ مەنجـەری ئـاوی کوڕانـد و بـانگی مـەلای کـرد وەیگـۆ وەرە سـەرت بشـۆم هەنـدیێ ئـاوی سـارد و گـەرم کـرد هەنـدەکی بەسـەری مـەلای داکـرد و گـۆتی: ئـەو ئـاوە زۆر باشـە هەنـدەك سـابوونی دەدەموچـاوی مدلایـدا دەم و چـاوی مـەلای پـڕ کـەف سـابوون کـرد مـەلا گـۆتی: هەنـدەك ئـاوم لـۆ پێداکـە کـۆرە بـووم کچـەش مەنجـەری ئـاوی کـوری پـڕ بەسـەری مـەلای داکـرد پێلەقـەکی لـە کورسـی داو وەری گێـڕا لاقـی مـەلای گـرت و بردیـە سـەر گوفـەکی فڕەیـدا پـاش هـەنگینیێ جلـی مـەلای بـرد و بەسـەری دادا پاشـانیش هاتـەوە مـاریێ دەرکـەی قـەیم کـرد و بـە خشـتان تونـد قـایمی کـرد، تـا وای لێهـات حـەجاج هاتنـەوە لـە حـەجیێ گەیشـتنە بەغـدایێ مـەلاش لـە خەسـتەخانەی بـوو چـابووەوە مـەلا گـۆتی: بـا بچـمە بەغـدایێ خـۆم بگەیەنمـە پاشـای تـا ئـەو کچـە بەکوشـتنی نەدایمـە مـەلا چـووە لای پاشـا و زیـارەتی کـرد و پاشـا گـۆتی: کچـەکەم کـا مـەلا گـۆتی: کیـژت خـوێڕی دەرهاتیـە وەگـەر تۆرییـان کەتیـە شـەویێ ئەچـیتە دەریێ پاشـا گۆتیـە کوڕەکـەی گـۆتی: کـوڕم بـڕۆ خوشـکتم لـۆ بکـوژە و جلکـل بـە خـوینم لـۆ بینـەوە شـەرمیێ کـەم بێمـەوە عەیبـە کـو وابـی بـرا هاتـەوە لـە بەغـدایێ هـەر چـاردەوری خـانی نـۆڕی دەرگاکـانی هـەموو قـەیم کردبـوو گـوتی خوشـکم خوشـکم بـانگی کـرد تـا جـوابی

داوه گـۆتی: ئـەتو کێـی گـۆتی: ئـەمن بـرای تومـە کچـە دەرکـەی لـێ کـردەوە بـرا چـووە ژووریێ کـن خوشـکی گـۆتی: بـرا زۆر بـەخێر بێیـەوە. ئـەدی لـۆ بـاب و داکـم نەهاتینـەوە بـرا گـۆتی: ئـەمن هاتیمـەوە لـۆ ئـەوەی ئـەتو بکـوژم جلکـی بـە خـوێن ببـەم لـۆ بـابی گـۆتی: بـرام ئـەمن بکـوژە گـەردەنت ئـازابی مـادام بـابم نێتـەوە لەبـەر مـن بـەلام ئـەمن لـە ئـاویێ حـەیاتیێ خـاوێن تـرم برایەکـەی کـە گـوێی لـە قسـەی خوشـکیێ خـۆ بـوو زگـی بـە خوشـکیێ خـۆ سـووتا و گـۆتی: خوشـکم نـانی ڕانوشـتە ئەچـم لـە دووری شـارت ئـەکوژم خوشـك و برایەکـە هەسـتان و نانەکـەیان بـرد و توولـەکیان هـەبوو بـردی لەگـەرە خـۆ هەسـتان ڕۆیشـتن چـوونە سـەر حـدود لـەویێ ئـاوەکی لـێ بـوو هـەمووی دری و دار بـوو بنـە تـووەك لەسـەر ئاوەکـە بـوو برایەکـە گـوتی خوشـکم جلکـان لەبـەر کـە جلکـی لەبـەر کـردن و توولەکـەی کوشـت و جلکـی خوشـکێی بـە خـوێن کـرد و دوو سـێ خەنجـەری لـە جلکـی خوشـکیێ داو دوای گـەڕاوە کیژەکـە بـە ڕووتـی مـاوە کیژەکـە دوای پرچـیێ خـۆی کـردەوە و بەسـەر قـالبی خـۆی داهێنـا و چـووە بـن درییەکـەی و شـەویش ئەچـووە سـەر بنـە تووەکـەی کچـەکە دوو سـێ ڕۆژان لـەویێ مـاوە، حەسـەن ئاغایـەك هـەبوو لـەویێ ئاغـا بـوو ڕۆژەك گۆتیـە پیـاوانی خـۆی وراغـان زیـن بکـەن و بـا بچینە ڕاویێ حەسـەن ئاغـا بـە خـۆی و پیـاوانی خـۆی چـوونە ڕاویێ لـەویێ ڕاویـان بـراو کـرد و حەسـەن ئاغـا کەتـە لای کانییەکـە تاژییـەکانی حەسـەن ئاغـای هجـوومی دریەکـەی کـرد حەسـەن ئاغـا غاریـدا کـن دریەکـەی وای زانـی دەعبایـەك لـەبن دریەکـەی تاژییـەکان نـاوێرن بچنە پـێش حەسـەن ئاغا هاتـە خـواریێ لـە ئەسپی تـا چـاو لـەبن دریەکـە بکـات. کیژەکـە گـۆتی: بـرام چـاوم لـێ مەکـە مـن حورمەمـە بـە تەنێمـە حەسـەن ئاغـا کـە زانـی حورمەیـە عـەبای خـۆی لەبـەر کـرد دایـە کیژەکـەی بـەخۆی دادا. کیژەکـە هاتـە دەریێ و حەسـەن ئاغـای گـۆتی: وەرە پـاش پشـتم سـوار بـە ئـەو کیـژە لـەپاش پشـتی حەسـەن ئاغـا سـوار بـوو، حەسـەن ئاغـا بـانگی کـرد گـۆتی: ڕاو بـەتارە کیژەکـەی بـردەوە مـاریێ گـۆتی: ئـەوەی ببەنـە حـەمامیێ خـاوێن بشـۆن دەستە جلکـەکی خـاوێنی پوختـەی لەبەرکـەن ئـەو کیـژە دوو سـاران لـەویێ مـاوە هـەنگیێ حەسـەن ئاغـای گـۆتی: چ مرازێکـت هەیـە لـۆت بـەدوودا بچـم کیـژەش گـۆتی: وەڵـلا حەسـەن ئاغـا ئـەمن تـەمام بەکـەس نـەبووە گفـتم بەکـەس نەدایـە وە چ مـرازم نییـە حەسـەن ئاغـا گـۆتی: دایـە بـا یـەکێك هەڵبـژێریێ بـەدری خـۆی کیـژەش گـۆتی: وەڵـلا حەسەن ئاغـا مێـردی دنیایـە لـەمن حـەرام بـی ئەگـەر ئـەتو مـارەم کـەی چـاوت وەمـن کەتیـە حەسـەن ئاغـا هەسـتا مـارەی کـرد. هەسـتا جلـك و خشـر و زێـڕ و هـەموو

شتی لێ کرد هەنگێ هەستا لەشکری خڕ کردەوە ژنەکەی لە شاری بردە دەرێ و دوای هێنایەوە مارێ خۆ ئەو ژنە بەخۆ و حەسەن ئاغای ئەچۆ ڕاوێ دوای دەهاتەوە مارێ نانی حازر ئەکرد و دوای دەستشۆری ئەبرد لۆ کن ئەو پیاوە دەستی ئەشووشت و دوایی وراغی ئەبەستەوە و دوایی نانی ئەدا حەسەن ئاغا. ئەو ژمە ئەگەر سارەك یان دوو سار لەلای حەسەن ئاغا دوو کوڕی لە حەسەن ئاغا بوو ڕۆژەکی مندارەکانی سەری وەسەر ڕانی داکەکەی کرد بوو هەستا فرمێسکی بەردانەوە حەسەن ئاغای وەبیر نەمابوو کە دێتەوە لە ڕاوێ حەسەن ئاغا هاتەوە و سەرکەوتەوە کە دیتی فرمێسکی بەرئەدانەوە، حەسەن ئاغا گۆتی: ئەمن ئەتوم بەتۆبزی مارە کردیە گۆتی: ناوەڵا ئەمن تا مردنێ مەمنوونی توومە وە ژنە گۆتی: تەمام بەکەس نەبووە وە هەتا مردنێ لەلای توومە وە حەسەن ئاغا گۆتی: ئەدی چ مرازێکت هەبووە و ژنە گۆتی: ئەمنیش داك و بابی خۆم هەبووە و وەفکرم هاتنەوە ئەتووم لە فکر چووە حەسەن ئاغا گۆتی: پێت خۆشە ئەمن ئەتوو بگەیەنمەوە کن داك و بابان. گۆتی: ئەرێ وەڵڵا پێم خۆشە حەسەن ئاغا هەستا پەنجا سواری ڕێکخست و قولیش لە بەنی ئادەمە بە پارەی گرتبوو وەگەری هێخست ئەو شەوی وەڕێ کەوتن و چوون لۆ مارە بابی کچێ شەو بەسەردا هات و کەژاوەیان داو لە دەوری خێمەیان هەرداو قولیش لەگەڵ ئەو ژنەی دابوو قولی شەوێ دەسەر ئەو ژنەی کرد گۆتی: کاری خراپم لەگەڵ بکەی ئەو ژنە هەندی لەگەڵ کرد قولی ئیقناع نەبوو. گۆتی: گەر کاری خراپم لەگەڵ نەکەی کوڕی گەورەت ئەکوژمەوە هەستا قولی کوڕە گەورەی کوشت و قۆرتی لێداو دەناوی نا. ڕۆژ داهات باریان کرد ژنەکە هیچ دەنگی نەکرد و شەو دیسان بەسەردا هات و قولی دیسان گۆتیە ژنەکەی دەبی کاری خراپم لەگەر بکەی ئەگەر وانەکەی کوڕە گچکەکەشت ئەکوژم. قولی هەستا کوڕە گچکەکەشی کوشت و لەبن خۆڕێی ناو هەستان باریان کردەوە ڕۆژ بەسەرداهات هیچ قسەی نەکرد ژنەکەی جارەکی دی شەویان بەسەردا هاتەوە دیسان قولێ گۆتی: کاری خراپم دەگەر بکە. ژنەکەش ڕازی نەبوو. دوای ژنەکەش گۆتی: ئەچم دەست نوێژی ئەشۆم ئەوجا پاش هەنگێ کاری خراپم لەگەر بکە. قولیش کندرەکی هینا لەدەستی ژنەکەی کرد ئەجا ئەو ژنە ڕۆیی چووە دەرێ ڕۆیی هەتا کندر خەلاس بوو هەنگێ ئەو ژنە دانیشت کندری لە دەستی خۆی کردەوە و لە مەسینەی هێخست بەردەکەشی لەسەر مەسینەکەی دانا ئەو ژنە هەرات بەو شەوە قولی لە هێکەوە کندری هەرتەکاند و بووە

تەقەتـەقی مەسـینەی ئـەو لەشـکرە هـەموو لـە خـەویٚ هەسـتا لەگـەر تەقەتـەقی مەسـینەی زۆر بەتونـدی ڕاکێشـا لەشـکر گۆتیـان: ئـۆ قـولیٚ چ بـووە؟ قـولیٚ گـۆتی: ئـەو ژنـە بـەخۆ و منـدارەوە بزربـووە. دوایـی قـولیٚ و لەشـکر گەڕانـەوە لای حەسـەن ئاغـا ژنەکـەش ڕۆیـی و هـەرات بـو دەشـتێ لـەویٚ گەیشـتە شـوانەکی و شـوانیٚ ئـاگری هـەرکرد بـوو. ژنەکـەش سـەلامی کـرد و ئـەویش سـەلامی جـواب داوە و ژنەکـە گـۆتی: ئـەریٚ کـاکی شـوان لـۆ نایـەی جلکـان بگۆڕینـۆ شـوانەکەش گـۆتی: ئاغـاژن فـەقیر و دەوڕەمەنـد هـەر هـەبووە گـەمانم پـیٚ مەکـە ژنەکـەش گـۆتی: ولاهـی گـەمانت پـیٚ ناکـەم ئـەتوو جلکـیٚ خـۆ بـدە مـن ئـەمنیش ئەدەمـە تـوو، شـوانەکەش گـۆتی: ئـەجا کـو جلکـان بگۆڕینـۆ ژنـە گـۆتی: ئـەتوو هـەڕوە ئـەو کەنـدەی جلکـان بگـۆڕە و لـەویٚ دایـنیٚ خـۆ بـەخۆت بـڕۆ لایـەکی شـوان جلکـیٚ خـۆی لـەویٚ دانـا و شـوان وە دوور کـەت ژنەکـەش لـەویٚ هەسـتا جلکـیٚ شـوانیٚ لەبـەر کـرد و بـەخۆ هاتـەوە بـەر ئـاگری شـوانەکەش جلکـیٚ ژنەکـەی دەبـەکرد و شـوانەکەش هـاتۆ بـەر ئـاگری، ژنەکـە گـۆتی: شـوان لـۆ پـیرە مـەڕێکی کێهـە خراپـە لـۆم بکـوژەوە هەرچـی زێـڕ و خشـری خۆشـم هـەمووت ئـەدەمیٚ شـوانیٚ پـیرە مەڕەکـەی هێنـا لـۆی کوشـتەوە و ژنەکـە گـۆتی: گۆشـتەکەت هـەموو لۆخـۆ بـەس هەنـدەك هـورگی مەڕەکـەی لـۆ سـەریٚ خـۆ پرچـی خـۆی دەناونـاو دوای هـورگی مەڕەکـەی هێنـا و شوشـتیەوە کردیـە کـراو لەگـەر جەمـەدانی شـوانی لەسـەری نـاو وەکـی کەچـەرانی لـیٚ هـات. دوایـی ژنەکـە ڕۆیشـت و چـووە لای مـاریٚ بـابی خـۆ، لـەویٚ نزیـك بـووەوە گـۆتی: لـە ئیشـەك ئەگـەڕێم بکـەم بـە نـان و زگ بـەس نـانم بـدەنیٚ مـاریٚ بابیشـی قازەوانیـان ڕۆیـی بـوو گـۆتی: کـوڕم قازەوانیـت پـیٚ ئـەکریٚ گـۆتی: ئـەریٚ وەلا. چـۆ کـن قـازان. هەنـدی خزمـەت ئـەکردن هـەر قـازەك هەنـدەی دوو قـازانی لـیٚ هـات هەنـدەی جـوان خزمـەت ئـەکردن. دوایـی حەسـەن ئاغـا گـۆتی: عالـەمیٚ گیسـکەك لـیٚ بـزر ئـەبیٚ ئـەمن دوو کـوڕم بـزر بووینـە بـەدوودا ئەچـم حەسـەن ئاغـا بـەخۆ و سـەد سـواری هـاتن لـە دامـەنیٚ ماریٚ پاشا ڕەشماریـان هـەردا قـازەوان وەکـی چـاوی بـە حەسـەن ئاغـا کـەوت ناسـیەوە پاشـای گۆتیـە حەسـەن ئاغـای دەبـی ئـەوڕۆ دەعـوەتی مـن بـن بـەخۆو بـە لەشـکری پاشـا گـۆتی: وە برێنـە قـازەوانی دوو قـازان بینیتـۆ قـازەوانی دوو قـازی بردنـۆ کێهـە قـاز گـەورە بـوو هەریبـژارد. ئێـوارە داهـات نانیـان خـوارد و مـەلا لـەکن پاشـای بـوو قـولیش لـەکن حەسـەن ئاغـای بـوو شـەو داهـات و گۆتیـان کـیٚ مەسـەلەکی ئـەزانی بیگێڕیتـەوە؟ قـازەوان گـۆتی: ئـەمن ئـەزانم. بـەرام دەرکـەی گـارادەم هەرچـی ئیشـی هەیـە بـا ئێسـتا بچـی بکـا دوایـی

دەرکەی گارا دەکەم لێناگەڕێم کەس بچیتە دەرێ. گۆتیان: قازەوان برێ قازەوان دەرکەی گاردا و کلیلی هاوێشتە باغەری خۆ دەستی پێ کرد و بەسەرهاتەکەی خۆی و مەلای گێڕایۆ دوایی مەلا گۆتی: خەوما دێ ئەوە چیە ئەو کەچەرە دەستی پێ کردیە ئەمن ئەڕۆم لێیان نەگەڕا بڕوا دوای قازەوان بەسەرهاتی خۆی لەگەر قولی دەست پێ کرد و هەمووی گێڕاوە قازەوان دوایی گۆتی: ئەو کیژەی هیچ عەیبی هەبووە. هەموو گۆتیان: هیچ عەیبی نەبووە. قازەوان گۆتی: دەنا ئەمن ئەو کیژەمە و کیژێ ئەو پاشایەمە و ژنێ حەسەن ئاغای مە چ عەیبم نەبووە. پاشاش گۆتیە حەسەن ئاغای مادام ئەتوو ئەو پیاوەتییەت لەگەرە من کردیە کیژێ خۆت لێ ناسینۆ بەرام دەبی قولی و مەلای بکوژن پاش ئەوە قولی و مەلایان کوشت و ژنەکە دەگەر حەسەن ئاغا دابوو دوایی حەفت شەو حەفت ڕۆژان شاییان لۆ کردن لەمارێ پاشای، دوایی پاشا سەد سواری خۆی وەگەر ناو ژنەکەو حەسەن ئاغا چوونەوە مارێ حەسەن ئاغا مارێ خۆیان.

ئەمنیش لەوسەری هاتمەوە کارەکم دڕا و چشم پێ نەبڕا.

**= ئەم حیکایەتەش بە چەند شێوەیەکی تر گێڕدراوەتەوە و چاپ کراوە، ئەوەی لەم حەکایەتە دێتە دەست ئەوەیە کە، بە کچێتی و بە ژنێتی کەسایەتی خۆی دەپارێزی و لە بەرامبەر (مەلا) کە خیانەت لە ئەمانەت دەکات و ڕێزی مەلایەتییەکەی خۆی ناگرێ و (قول)یش خیانەت لە ماڵە گەورەی دەکات و لەوەش زیاتر منداڵە بێ گوناحەکان دەکوژێ! کەچی ژنە هێشتا هەر خۆ دەگرێ و خۆ ناداتە دەست، بەلام، حەکایەت لێناگەڕێ تاوانباران بۆی دەربچن! بە سزای خۆیان دەگەن و ژنەش کەسایەتی ڕاستەقینەی خۆی بە دەر دەخات و سەر بەرز لە بەرامبەر باوك و برا مێردی ڕوو سووری خۆی دەسەلمێنێ.**

# پاشــا و شــوان

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: فازل نەجم**

**لەدایك بووی: ١٩٣٧**

**دانیشتوی: دارەتوو**

دەگێڕنــەوە دەڵــێن ســاڵێك قــات و قــڕی و گرانــی ڕووی کــردە ولاتێــك پاشــا هەرچــەنێك ســەری دەهێنــا و دەبــرد عیلاجــی بــۆ نەدەدۆزرایــەوە، دەڵــێ ڕۆژێــك دەچــێتە دەشت بــۆ پیاســە کــردن دەبــینی شــوانێك مێگەلــە مەڕەکــەی خەوانــدوە و ســەگێکی لــە قــەنارە داوە بــە دارێکــەوە، پاشــا لێــی دەچــێتە پێشــەوەو ســەلامی لێــدەکات و دادەنیشــێ، شــوانەکە هەنــدێ شــیری لەســەر ئــاگر بــۆ دەکــوڵێنێ و دەیــداتێ، پاشــا شــیرەکەی خــواردەوە و پرســی ئــەم ســەگەت لــە قــەنارە داوە بــەم دارەوە؟ شــوانەکەش دەڵێــت هــەتا مــرازم حاســڵ نــەبێت مــن پێــت نــاڵێم! پاشــا دەڵێــت مــن پاشــام دوایــی ئیعــدامت دەکــەم هــا، شــوانەکەش دەڵێــت ئیعــدامم بکــەی و نەکــەیت هــەتا مــرازم حاســڵ نــەبێت پێــت نــاڵێم،"پاشــا دەڕواتــەوە بــۆ کۆشــکی خــۆی و چ وەزیــر و گزیرێــك هەیــە هــەموویان خــڕ دەکاتــەوە، بــانگی عەلــەی شــوان دەکــا و دەڵێــت: دەبێــت ئــەو سرڕەی خــۆت بڵێــی عەلــەی شــوانیش دەڵێــت: قــەد پێــت نــاڵێم، پاشــا دەڵێــت بەڕاســتی ئــەمجارەیان ئیعــدامت دەکــەم، وەزیرێــك لــە وەزیرەکــان ئاقــڵ دەبێــت و دەڵێــت: ئێمــە ئــەم کابرایــەمان ئیعــدام کــرد بــەلام پاشــا ئــەو مەراقــەت لــە دڵا هــەر ئــەمێنێ، بۆیــە لێــی گــەڕان شــوانەکە ڕۆیشــت و گەیشــتەوە مــاڵ وەخــتێ وەزیرەکــان دەڵــێن پاشــا کچــەکەی خــۆتی لــێ مــارە بکــە بــەس یەکــەم شــەو خــۆی تەســلیم نــەکات هــەتا سرڕەکەی پــێ دەڵێــت پاشــا کچــەکەی خــۆی لــێ مــارە دەکــا و یەکــەم شــەو کچــەکە دەڵێــت: هــەتا پــێم نــەڵێی ئــەو ســەگەت بــۆ لــە قــەنارە داوە مــن خــۆم تەســلیم ناکــەم، عەلۆکــەی شــوان دەڵێــت کەواتــە بــڕەوە مــاڵی پاشــای باوکــت، چــونکە مــن قــەت پێــت نــاڵێم، کچــەکە دەڕواتــەوە مــاڵ پاشــا مەســەلەکەیان بــۆ دەگێڕێتــەوە، پاشــا ســەر دێــنێ و ســەر دەبــا نــازانێ چــی بکــات دیســان دەنێرێتــە دوای عەلــەی شــوان بــە عەلــەی شــوان دەڵێــت: بــزانم چــیت دەوێ من دەیــدەم و بــۆت دەکــەم بــەس ئــەو سرڕەی خــۆتم پــێ بڵــێ، عەلــەی شــوان دەڵێــت:

هیچم ناوێت بەس یەك حەفتە پاشایەتی خۆتم بدەیە بە شەرتێ دەبی ئەو حەفتەیە دەسەلاتم بدەیتێ چی دەکەم و چی ناکەم، پاشا سەر دێنێ و دەبا وەلحاسڵ ڕازی دەبێت. عەلەی شوان بۆ ماوەی ئەو حەفتەیە چ وەزیر و دەست و پێوەندی پاشا هەیە هەمووی ئیعدام دەکات، وەختێ پاشا ئاگادار دەکەنەوە کە عەلۆکە وای کردووە و وا دەکات، پاشا دەڕواتە لای عەلەی شوان دەڵێت ئەوە بۆ وا دەکەی؟ عەلە دەڵێت سەگەکەی من گورگەمێش ببوو مەڕی دەبرد بۆ گورگ بۆیە منیش لە قەنارەم دابوو چونکە خائین بوو، وەزیرەکانی تۆش هەموویان دز بوون، ئەگەر تۆ بمردیتایە دەهاتنە شوێنت ئێستا چۆن قات و قڕی و گرانییە ئەوکاتە خراپتر دەبوو ها پاشا ها ئەوە کۆشك و کورسی و جل و بەرگەکەت.

- لێرەدایە گرنگی حەکایەتی فۆلکلۆر، ئەم حەکایەتە هەر دەڵێی بۆ ڕۆژی ئەمڕۆی ولاتی ئێمە نوسراوە و ڕێکخراوە. کە بەلایەك ڕوو لە ولات دەکات دەبێ دڵسۆزانی ئەم ولاتە بەدوای چارەسەری ڕاستەقینەدا بگەڕێن. بەلام، تۆ بڵێی کەسانێ هەبن سود لە پەند و حەکایەت وەربگرن.

## لەیل و مەجنون

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: عوسمان عەلی خدر**

**لەدایك بووی: ١٩٥٥**

**دانیشتووی: دارەتوو**

لـەیل و مـەجنون دوو ئـامۆزا بـوون، مـاڵی بـابی لـەیل مـەڕدار بـوون، دەچـن بـۆ کوێسـتان مـەجنونیش لـەپێناو دیـتنی خۆشەویسـتەکەی دەڕوا لەسـەر ڕێـی خێڵـی لـەیل دادەنیشـێ و پاشـان خـەوی لـێ دەکـەوێت، تـا ئەوکاتـەی خێڵەکـە بەوێـدا تێپـەڕ دەبێـت، بـەڵام مـەجنون هـەر لەخـەودا بـەئاگا نایەتـەوە، کاتێـك بـەئاگا دێتـەوە دەزانـێ کـە مـاڵی لـەیل ڕۆیشـتوون و ئـەویش لـە خـەودا بـووە، بۆیـە زۆری پـێ نـاخۆش دەبێـت، چـونکە لـەیل و مـەجنون دوو خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینەی یـەکتری بـوون، هـیچ کـارێکی نـا پەسـەند و نـا شـەرعیان لەگـەڵ یـەکتر نـەکرد بـوو، زۆر بـە پـاکی یـەکتریان خۆشدەویسـت، بۆیـە مـەجنون داوا لـە بـاوکی دەکـات کـە بچـنە دخـوازی لـەیل بـۆی، بـە حـوکمی ئـەوەش کـە تاقانـەی بـاوکی بـوو زۆر زۆریشـی خۆشویسـتووە دڵـی نەشـکاند، بۆیـە بـە کاروانێـك کـە بـەرەو کوێسـتان بـەڕێ دەکـەوت جـواب بـۆ براکـەی خـۆی واتـە بـاوکی لـەیل دەنێـرێ، کـە کچـەکەی بداتـە کوڕەکـەی، بـەڵام بـاوکی لـەیل ڕازی نابێـت و لـەیل بـە مـەجنون نـادات، ئەمـەش ئـەو نامەیـە کـە بـاوکی مـەجنون بـۆ بـاوکی لـەیل دەنێـرێ کـە لەسـەر زاری قاسـیدەکەوە گێڕدراوەتـەوە کاتێـك بـەوەی زانیـوە کـە مـەجنون داوای لـەیل دەکات بەڵام باوکی لەیل ڕازی نییە بیداتێ.

**ئەمەش نامەکەیە**

ئەو لەیل و مەجنونەی بابیان برایە

زێدە لە برایان گەلێك تەبایە

باوکی مەجنون جوابان دەنێرێ

ئەو سۆرە گوڵەی بۆ کوڕم بنێرێ

**باوکی لەیل**

ئەوە ئەمن دام ئەلاّ نەینووسی

چەند مەڕم دەویَ کەڕەی کەوی سار

چەند گورگم دەویَ ڕووتەی کلك خوار

پێکەوە بکەن شەوێن و شەو خوار

ئەوە ئەمن دام ئەلاّ نەینووسی

چەند حوشترم دەویَ حوشتری چەموشی

لەسەر منارە چۆپی بکێشی

بەریش بێتەوە هیچ جێی نەیەشی

ئەوە ئەمن دام ئەلاّ نەینووسی

چەند کچم دوێت کچی چواردە سالّ

چەند کورم دەویَ کوڕی خەنجەر دار

شەو تا بەیانی پێەوە بنون

مەلا شایەت بێت نەینێن زەرەردار

ئەوە ئەمن دام ئەلاّ نەینوسی

تێبـــینی/ زۆر سوپاســـی (دەشـــتی عوسمـــان) دەکـــەم کـــە یارمـــەتی دام بـــۆ کۆکردنەوەی ئەم بابەتە.

**= لـەم دەقـە فۆلکلۆریـە کـە باسـی لـەیل و مـەجنون دەکـات، دەقـە وای پیشـان دەدات کـە لـەیل و مـەجنون لـە کوردسـتان ژیـاون و کوێسـتان و گـەرمێنیان کـردووە، ئەمـەش یەکێکـە لـە تایبەتمەندییـەکانی فۆلکلـۆر کـە شـوێن و کـات و شوناسی ڕووداو دەگۆڕیَ.**

# مەلای مەشهور و پاشا

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: حاتەم عەبدولڕەحمان**

**لەدایك بووی: ١٩٥١**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

ڕۆژەك پاشا لە گەنجانی مەملەكەتی خۆی كۆ دەكاتەوە و داوایان لێ دەكات دەڕێت من سێ پرسیارتان لێ دەكەم ئەگەر نەیزانن لە ملتان دەدەم، ڕۆژەك گەنجەك لە گەنجەكەتان لە ئاقار دەبیت و بیر دەكاتەوە و دەڕێت: ئەوە ئەمە نەمانزانی خۆ پاشا لە ملمان دەدات، لەو كاتەدا مەلای مەشهور لەسەر كەرێ دەبیت و دێت لۆ ئەو گوندە لە ڕێگا لادەدات لۆ كن گەنجەكە پێی دەڕێتن: لۆوا خەمباری؟ گەنجەكەش دەڕێت: چت لێ بشارمەوە مامە پاشایێ مە سێ پرسیاری هەنە ئەوەی نەیزانی لە ملی دەدات، مەلای مەشهور دەرێ: وەرە با هۆردووكمان بچینە كنی. دەچنە كن پاشا و پاشاش بەخێرهاتنی هۆردووكان دەكات و مەلای مەشهور و كوڕەكە دادەنیشن و مەلای مەشهور دەڕێت: ئەتو سێ پرسیارت هەیە ئەوەی نەیزانی لە ملی دەدەیت؟ گۆتی بەرێ، گۆتی ئەمن ئامادەم لە منی بكەیت، پاشا دەڕێت نەیزانی لە ملت دەدەم، مەلای مەشهور دەڕێت: قەیدی ناكات، پاشا دەڕێت: باشە ناوەندی عەردی لە كێیە؟ دەڕێت: شوێن پێی من، لە كێ،دەرە ئێرە، پاشا دەڕێت كو دەزانی؟ دەڕێت: دەتوانی بیپیوی، دەڕێت باشە ئەوە یەكیانت زانی، دەڕێت چەند ئەستێرە هەنە لە عاسمان؟ دەڕێت چەند موو بە كلكێ كەرەكەمەوەیە ئەوەندە، دەڕێت كو دەزانی؟ دەڕێت دەتوانی بیژمێری، دەڕێت: باشە ئەوەشت زانی، دەڕێت باشە پرسیاری سێیەم ئاخیر خوای تەعالا كە ئادەم و حەوای دروست كرد لە قوڕ كای تێكرد؟ گۆتی نا، پاشا گۆتی كو دەزانی ئەویش گۆتی ئەگەر كای تێكردبایە ناوگەل تو قلیش نەدەبوو، دەركەوت كە پاشا ژنە. پاشا زێڕ و گەوهەرێكی زۆری دا بە مەلای مەشهور و مەلای مەشهور كردیە نیوە لەگەڵ كوڕەكە، چوونە دەرێ كوڕەكە گۆتی نامەوێ مەلای مەشهور گۆتی ئەگەر ئەتو نەبای ئەوەم بە نسیب نەدەبوو.

= مەلای مەشهور یەکێکە لەو کەسایەتیانەی کە زۆر چیرۆك و بەسەرهاتی دەدرێتە پاڵ، لە ڕاستیدا بووە بە هێمایەك کە خەڵك خواستەکانی خۆی لە پەنای ئەو کەسایەتیە دەردەبڕێ. مەلای مەشهور ئێستا بووە بە کەسایەتیەکی جیهانی و هەموو میللەتان بەهی خۆیان دەزانن و لە هەموو ولآت و لە هەموو زەمەنێك پەنای بۆ دەبەن.

# ئەفسانەی حەسەنە ڕاوکەر و مارەکە

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی:عوسمان عەلی خدر**

**تەمەن:١٩٥٥**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

لــە ســەردەمێکی زووەوە کابرایــەك هــەبوو نــاوی (حەســەن ڕاوکــەر) بــوو کــار و پیشــەی ئــەو کابرایــە تــەنها ڕاوکــردن بــوو، ڕۆژێــك کــە بــۆ ڕاو چــوو شــەوی بەســەردا هــات، شــەو لــە چــیا مــاوە، وە بەیانیەکــەی چــووە ســەر کانییــە ئاوەکــانی کــە نیچــیرێکی دەســت بکــەوێت و ڕاوی بکــات، کاتێــك چــووە ســەر کانییەکــە تەماشــای کــرد مــارێکی بــۆری چــڵکنی پــیس لــە گــەردنی مــارێکی ســپی و خــاوێن ئــاڵا بــوو، حەســەن ڕاوکــەر زۆری پــێ نــاخۆش بــوو کــە دیــتی ئــەو مــارە پــیس و چــڵکنە لــەو مــارە ســپییە جوانــە ئــاڵاوە، کەوانەکــەی بەدەســتەوە گــرت و تیرێکــی لــە پشــتی دەرهێنــا و خســتیە ســەر کەوانەکــەی و ویســتی مــارە بــۆرە چــڵکنەکە بهاوێــت و بــە مــارە ســپییەکە کــەوت و کوشــتی، حەســەن ڕاوکــەر زۆری پــێ نــاخۆش بــوو، بــەس کــار لــەکار تــرازا بــوو، مــارە ســپییەکە کچــی شــای مــاران بــوو، خەبــەر درایــە شــای مــاران کــە حەســەن ڕاوکــەر کچــەکەتی کوشــتووە، کاتێــك شــای مــاران ئەمــەی بیســت بڕیــاری داو گــوتی: حەســەن ڕاوکــەر لــەبن گڵــیش بێــت بیهێــنن بــۆ ئێــرە، پــاش گــەڕانێکی زۆری مارەکــان بــەدوای حەســەن ڕاوکــەردا لــە کۆتاییــدا حەســەن ڕاوکــەریان دۆزییــەوە و بردیانــە بــەردەم پاشــای مــاران، شــای مــاران پرســیاری کــرد بۆچــی ئــەو تــیرەت لــە کچــەکەم داو کوشــتت؟ حەســەن ڕاوکــەریش بــە شــای مــارانی گــوت: بــەیانی بــوو چــووم بــۆ ســەر کــانی و بینــیم کــە مــارێکی پــیس و چــڵکن لــە مــارێکی ســپی و جــوان و خــاوێن ئــاڵاوە مــنش زۆرم پــێ نــاخۆش بــوو دەســتم کــردە تــیر و کەوانەکــەم و ویســتم کــە مــارە پــیس و چــڵکنەکە بکــوژم بــەڵام بــەو مــارە سپییە کەوت و نەمزانی کە کچی تۆ.

شــای مــاران بــە حەســەن ڕاوکــەری گــوت: ئەگــەر ئێســتا ئــەو مــارە بــدینی دەیناســیەوە؟ حەســەن ڕاوکــەریش وتــی بــەڵێ دەیناســمــەوە، شــای مــاران بڕیــاری دا کــە هــەموو مارەکــان کــۆ ببنــەوە و لێــرە حــازر بــن، پاشــان چــەند ماوەیــەکی

کـورت مارەکـان لـە هـەموو شـوێنێك هـاتن و کـۆ بوونـەوە هـەموو کەڵەکـە ببـوون لەسـەر یـەك شـای مـاران بـە حەسـەن ڕاوکـەری گـۆت: بگـەڕێ تەماشـاکە بزانـە کـام مار بوو کـە لـە کچـەکەی مـن ئـالآ بـوو؟ حەسـەن ڕاوکـەر گوتی: ئـەی شـای مـاران مـن نـاوێرم نزیـك ئـەو مارانـە بکەومـەوە، پاشـای مـاران بـە حەسـەن ڕاوکـەری گـوت: بگـەڕێ و مەترسـە بـەبێ ئیزنـی مـن نـاتوانن هـیچ کارێـك بکـەن و پێـوەت بـدەن، کاتێـك حەسـەن ڕاوکـەر دڵنیـا بـوو دەسـتی کـرد بەگـەڕان لـەناو مارەکـان بـۆ دۆزینـەوەی مـارە چـڵکنەکە، پـاش گـەڕانێکی زۆر بـە شـای مـارانی گـون: ئـەی شـای ماران ئەو مـارە لێرە نییـە هـیچ کامێك لـە مانـە هـەو نییـە شـای مارەکـان ئـەمری بـە مارەکـان کـرد کـە بـڕۆن ئـەو مـارە لـە هـەر شـوێنێکە بیهێـنن، کاتێـك لـەناو زەلکاوێـك لـەبن بـەردێك خـۆی حەشـار دابـوو، مارەکـان چـوون گرتیـان و هێنایـان بـۆ لای شـای مـاران، شـای مـاران بـە حەسـەن ڕاوکـەری گـوت: ئـەم مـارە هـەوە؟ گـوتی بـەڵێ، ئـەی شـای مـاران ئـەوە ئـەو مـارە بـوو کـە لـە گـەردنی کچـەکەت ئـالآ بـوو، شـای مـاران بڕیـاری دا کـە لەبـەر چـاوی مـن و حەسـەن ڕاوکـەر ئـەو مـارە چـڵکن و پیسـە کـەرت و پارچـە کـەن، کاتێـك کـە مارەکـەیان کوشـت، شـای مـاران بـە حەسـەن ڕاوکـەری گـوت: هەرچـی تـۆ لـە دنیـا دەتـەوێ بخـوازە تـا بـۆتی جـێ بـەجێ بکـەم؟ حەسـەن ڕاوکـەر بـە شـای مـارانی گـوت: هیچـم لـە دونیـا نـاوێ تـەنها ئـەوە نـەبێ کـە بتـوانم لــە زمــانی هــەموو حــەیواناتێك بگــەم؟ شــای مــاران گــوتی: بــڕۆ مــن تێگەیشتنی هەموو زمانی هەموو گیاندارێکم پێ بەخشی.

حەسـەن ڕاوکـەر ڕۆیشـت، دوای چـەند مانگێـك هـەروەکو پیشـەی خـۆی بـۆ ڕاوکـردن بـەرەو کێـو لـە عەسـرانێکی درەنـگ کەوتـە ڕێ شـەوی بەسـەردا هـات و شـەو لـە چیا مایـەوە، لەگـەڵ شـوانێك کـە لـە دیـار مەڕەکانییـەوە شـەو بـە کێـوی گرتبـوو شـەو بـوو بـە بـەفر و بـاران مـەڕی شـوانەکە شـەو ڕای داو ڕۆیـی بـەلآم هـیچ پـێ نـەزانی، چـونکە حەسـەن ڕاوکـەر و شـوانەکە لـە خـەودا بـوون، شـوانەکە خەبـەری بـۆوە تـەنها ئـەو مـەڕە مـابوو کـە بـە دەسـتی خۆیـەوە بەسـتبوویەوە، شـوانەکە حەسـەن ڕاوکـەری بەخەبـەر هێنـا و حەسـەن ڕاوکـەر پرسـی هـا چییە و چـت لـێ قـەوماوە ئـەی شـوان؟ شـوانەکەش گـوتی: دەبـینی کـەوا ئەمشـەو بـەفرە و مەڕەکانیشـم هیچـی دیـار نـەماون تـەنها ئـەوە نـەبێ لـە دەسـتم بەسـتبۆوە، حەسـەن ڕاوکـەر بـە شـوانەکەی گـوت: ئەگـەر مـن مـەڕەکانت بـۆ بدۆزمـەوە ئـەم مـەڕەی دەسـت خـۆتم

دەدەیێ بۆ خۆم؟ شوانەکەش بەڵێنی بە حەسەن ڕاوکەر داو گوتی شەرتی پیاوان بێ، ئەگەر ئەتو مەڕەکانم بۆ بدۆزیەوە ئەم مەڕەت بدەمێ، شوانە و حەسەن ڕاوکەر کەوتنە گەڕان بۆ دۆزینەوەی مەڕەکان لەگەڵ مەڕەکەی کە مابۆوە لەگەڵیان، حەسەن ڕاوکەر کەوتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی مەڕەکان لەگەڵ مەڕەکەی کە مابۆوە، حەسەن ڕاوکەر بەدوای مەڕەکە دا کەوت و بۆ هەر شوێنێك بچوبایە حەسەن ڕاوکەر بەدوای ئەو مەڕە دەکەوت، تاوەکو مەڕەکە گەیشتە نزیك ئەشکەوتێ، کە حەسەن ڕاوکەر و کاکەی شوان نزیك ئەشکەوتەکە بوونەوە بینیان سەگەکەی شوانەکە لەگەڵ مەڕەکان ڕۆیشتوون و لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا ڕێی بەسێ گورگ گرتووە و دەوەڕێ، شوانەکە بەم دیمەنە زۆر سەری سوڕما! لە حەسەنی ڕاوکەری پرسی ئەوە چییە ئەم سەگە بۆ وا دەکات؟ حەسەن ڕاوکەر گۆتی ئەو گورگانە بە سەگەکە دەڵێن ڕێگامان بدە با بڕۆین بۆ ناو ئەشکەوتەکە و مەڕەکان بخۆین تۆش لەگەڵمان شەریك بەو تێر گۆشت بخۆ، سەگەکەش دەڵێ من ڕێگاتان پێ نادەم ئاگام لە مەڕەکان دەبێت دەیان پارێزم، چونکە خاوەنی ئەم مەڕانە زۆر بەوەفا بوو لەگەڵم نانی باشی پێداوم منیش لە پاداشتی ئەوە ڕێگەتان پێ نادەم، حەسەن ڕاوکەر و کاکە شوان گورگەکانیان ڕاونا و مەڕەکانیان هێنایەوە کاکە شوانیش ئەو بەڵێنەی بە حەسەن ڕاوکەری دابوو هێنایە جێ و مەڕەکەی دایە، بەڵام حەسەن ڕاوکەر گوتی: من ئێستا تەنیام مەڕێك ئێستا بۆ کوێ بەرم؟ لێبگەڕێ با لەلات بێ تاکو بە یەك دوو ساڵی تر لەگەڵ ئەوانەی خۆت بەخێوی بکە، شوانەکەش ڕازی بوو پاشان حەسەن ڕاوکەر شوانەکەی بەجێ هێشت و شوانەش سوپاسی حەسەن ڕاوکەری کرد. ڕۆژ هات و ڕۆیی تاکو دوو ساڵ تەواو بوو مەڕەکەی حەسەن ڕاوکەر زاووزێی کرد بووە نزیکی زیاتر لە (١٥) سەر مەڕ دەبوو، حەسەن ڕاوکەر چوو بۆ لای شوانەکە پاش سڵاو و چۆنی و چاکی گەرم، حەسەن ڕاوکەر بە شوانەی گوت: هاتووم مەڕەکانم ببەمەوە، شوانەکەش زۆر بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێ کردو فەرمووی ئەوەتانێ تەنیا سێ مەڕیان هی تووە، حەسەن ڕاوکەر گوتی خیانەتم لێ مەکە چۆن کە ساڵانێکی دوور من مەڕەکم جێهێشتووە تەنیا سێ سەر مەڕ هی منە؟ شوانەکەش هەر سوور بوو لەسەر قسەکەی خۆی، تاکو بووە مشت و مڕیان، پاشان حەسەن ڕاوکەر بەهۆی زیرەکی و لێهاتوویی خۆی بە شوانەی گوت وەرە با شتێکی تر بکەین، شوانەکە گوتی شتی تو

چییە؟ حەسەن ڕاوکەر گوتی: من تورەگە خوێیەك لە ملی خۆم دەکەم و تۆش هەروەها پاشان بە لایەدا دەڕوین تۆ بەلای دەستە ڕاست و منیش بەلای دەستە چەپدا لەسەر بەردێك کەمێك خوێ ڕوو بکە منیش لەسەر بەردێك کەمێك خوێ ڕوو دەکەم، ئەو مەڕەی هاتەی لای تو خوێی خوارد ئەوە مەڕی تووە و ئەوانەی هاتنە لای من خوێیان خوارد ئەوا مەڕی منن، شوانەکەش لەسەر ئەم ڕاو و تەکبیرەی حەسەن ڕاوکەر ڕازی بوو، دەستیان کرد بە جێ بەجێ کردنی ڕاو و تەکبیرەکەیان، هەندێك مەڕ بەلای شوانەکەدا دەڕۆیشتن و هەندێك مەڕ بەلای حەسەن ڕاوکەر دەڕۆیشتن، تا وای لێهات (١٥) سەر مەڕێك چوونە لای حەسەن و ئەوانی تریش چوون بەلای شوانەکە، بەلاّم تەنها مەڕێکیان لەو ناوەندە مایەوە، مەڕەکە دەیباعاند و جارێك دەڕۆیشت بۆ لای حەسەن، شوانەکە لە حەسەنی ڕاوکەری دەپرسی ئەم مەڕە بۆ وا دەکات، حەسەن ڕاوکەریش گوتی: ئەو مەڕە دەڵێ من دایکم لە مەڕی حەسەن ڕاوکەرە و شیری مەڕی شوانەکەم خواردووە، نازانم هی کامتانم؟ شوانەکەش گوتی ئەی چی لێ بکەین؟ حەسەن ڕاوکەریش بە شوانەکەی گوت: با ئەمەش بۆخۆت بێ ئینجا مەڕەکە چوو بۆ لای مەڕەکانی شوانەکە و کلاّشم دڕاو هیچم پێ نەبرایەوە.

تێبینی/ زۆر سوپاسی بەڕێز (دەشتی عوسمان) دەکەم کە یارمەتی دام بۆ کۆکردنەوەی ئەم بابەتە.

- ئەو دەقە لەو دەقە دەچێ کە وەختی خۆی (قەناتی کوردۆ) لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو لەسەر زاری کوردەکانی ئەوکاتی سۆڤیەت کۆی کردۆتەوە، بەشێوەی کرمانجی سەرو، بەلاّم، کۆتایی ئەم ئەفسانەیە جیایە لەگەڵ کۆتاییەکەی قەناتی کوردۆ ئەوەی لەم ئەفسانەیە دێتە دەست ئەوەیە، ئەگەر چاکە لەگەڵ ئاژەڵ و زیندەوەریش بکەیت ئەویش ڕۆژێ دێ چاکەت دەداتەوە. هەروەها دەیسەلمێنێ کە گیانلەبەرانیش زمان و هەستیان هەیە و لە نێوان خۆیان پێی دەدوێن هەڵبەت بەشێوەی خۆیان و لە زۆر ڕووداو و بەسەرهات وەفا و ئەمانەتی گیانلەبەران بەرامبەر بە مرۆڤ دەرکەوتووە.

## گواره

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: محەمەد ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ۱۹۵۰**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

ئێوارانێــك کابرایــەك لــە ئــیش دەگەڕێتــەوە مــاڵ، ژنەکــەی لــەجیاتی ئــەوەی بــەخێرهاتنی بکــات و ئــاوی بــۆ گــەرم بکــات و هــەتا دەســت و دەم و چــاوی بشــوات دەڵــێ: مــن گــوارەم دەوێ و گــوارەم دەوێ، پیاوەکــەش دەڵــێ ژنەکــە ســەبر بگــرە ئارامت هــەبێت هــەتا بــەیانی خــۆ بــەم شــەوە و بــەم هــیلاك و ماندیــە بەچــی بــڕۆم بــۆ شــار، ژنەکــەی دەڵــێ وەڵا ئەگــەر بــەیانی بــۆمی نــەکڕی دەڕۆمــەوە مــاڵی بــاوکم و ئــەم مــاڵ و منداڵــەت بــۆ بــەجێ دێڵم، بــەیانی پیاوەکــە ملــی ڕێ دەگــرێ و خــۆی لــە ئــیش و کــار دەکــات و دەچــێتە شــار، وەخــتێ دەکاتــە لای زێڕینگــر دەڵێــت: گوارەیــەکم بــۆ دانــێ بــە ســعرێکی مناســب، هــەموو ســەربردەی شــەوی بــۆ دەگێڕێتــەوە، زێڕینگرەکــە دەڵێت: مــن کچێکی قــەیرەم هەیــە بــۆ نایــەی لــێتی مــارە بکــەم، لــەو ژنــە ڕزگــارت بێــت، پیاوەکــە دەڵێــت: ئــەی چــی بــەو ژنــە غەزەبــەم بڵــێم، زێڕینگرەکــە وتــی ئاســانە ڕۆیشــتیەوە مــاڵ بڵــێ ڕۆژی پێــنج شــەم حــازر دەبێــت، پیاوەکــە لــە خۆشــیان نــەیزانی چــی بڵێــت هــەر ئــەو ڕۆژە کچــی زێڕینگــری مــارە کــرد و شــیرنی و شــت خورایــەوە و ئێــوارە گەڕایــەوە مــاڵ، ژنەکــەی گــوتی: کــوا گــوارە؟ گــوتی: ئــەو گوارەیــەی تــۆ دەگمەنــە بۆیــە هــەتا پێــنج شــەم حــازر نابێــت، پێــنج شــەم بــۆتی دێــنن بــۆ ماڵــەوە، ڕۆژی پێــنج شــەم بەرەبــەرە نزیــك دەبــۆوە، پیاوەکــە گــوتی ئــافرەت مــن قــەرارم داوە خێــر بکــەم ئــەمڕۆ ڕۆژی پێــنج شــەمە مــەڕێك ســەر دەبــڕین و خــەڵك دەعــوەت دەکــەم و دەیکــەین بــە مــەولود، ژنەکــە دەڵێــت: ئــێ وەڵا باشــە هــەر ئــەمڕۆش گوارەکــەی مــن دێتــەوە، پیاوەکــە دەڵێــت: ئــەی چــۆن هــەر ئەوهایــە، کــابرا مــەڕێکی دابەســتی و قەڵــەوی لــە عــەرزداو ســەریان بــڕی و کــەوڵیان کــرد و لێیــان نــاو خــەڵکیان دەعــوەت کــرد، وەخــتێ بەرەبــەری نیــوەڕۆ ەبێــت، ژنەکــە تەماشــا دەکــات لەشــکرێك لــە دوورەوە دیــارە، بــانگ پیاوەکــەی دەکــا و دەڵــێ ئــەها ئــەو لەشــکرەت بینیــوە لەســە ئەســپ وادێــن؟ پیاوەکــە دەڵێــت ئــێ ئــەوە لەشــکری

بووکـــه هــــی ئاوایـیـــهکانی دهوروبـــهری ئاوایـیـهکهمانـــه، وهخـــتیَ لهشـــکر هـــهر نزیـــك دهبێتـــهوه لـــه مـــاڵی کـــابرا هـــهتا دهگاتـــه بـــهردهم مـــاڵی کـــابرا، ژنهکـــه دهڵێـــت ئـــهوه چـــییه؟ پیاوهکـــه دهڵێـــت: تۆهـــهر دهعـــوای گـــوارهت دهکـــرد ئـــهوه گـــواره و بیکـــه گوێت. ئـیتر ژنهکه بـیر دهکاتـهوه و دهڵێت بزانـه مـن چیم بـهخۆم کـرد گواره چۆن سهرمی بهقوڕدا کرد.

= لـهم حیکایهتـه ژنهکـه لـه وهختێکـی ناوهخـت و بهشـێوهیهکی ناڕێکداوای گـواره دهکـات، کـابرای مێردیشــی بهشــێوهیهکی نــاڕێکتر وهڵامــی دهداتــهوه و ژنــی بهسهر دێنیَ. ئهمهش نموونهیهکی ڕووداو و بهسهرهاتی خهڵکه.

# کوڕەکە و شێخەکە

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: مەحمود ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٥**

**شوێنی دانیشتن: کەرکوك**

ڕۆژێـك کـوڕێکی گـەنج دەچـێت بـۆ لای شـێخێك بـەناوبانگ دەبێـت، خـەڵکی زۆر بـە باشـە باسـی ئـەو شـێخەیان دەکـرد، کوڕەکـە دەچـێتە لای شـێخەکە و دەڵێـت: مامـە شـێخ مـن حـەز دەکـەم یـەك حەفتـە خودایـەتی بکـەم، بزانـە چـۆن مـن ئـەم خـەڵك و گیانلەبەرانـە دەبـەم بـەڕێوە؟ شـێخەکە دەڵێـت: کـوڕی شـیرینم خودایـەتی تـەنیا لـە خـودا خـۆی دەوەشـێتەوە بـەتۆ ناکرێـت، کـوڕە مسـڕ دەبێـت لەسـەر قسـەی خـۆی، شێخەکە دەڵێـت: باشـە بـڕۆ جامێـك ئـاوم بـۆ بێنـە، کوڕەکـە دەچـێت جامێـك ئـاو دێـنێ و پێـی دەڵێـت: ئێسـتا تـۆ خـودای دە تەماشـای نـاو ئـەو جامـە ئـاوە بکـە دونیـات دێتـە بەردەسـت، کوڕەکـەش تەماشـای نـاو جامـە ئاوەکـە دەکـا و دەبـینی وا شـوانێك لای ڕانەکـەی بلـوێر لێـدەدات لـەو وەختـەدا کچـێك دێـت بـۆ بێرکـردن، شـوانەکە تەماشـای کچـەکە دەکـات دڵـی دەچـێتە سـەر کچـەکە پـەلاماری کچـەکە دەدات، کوڕەکـەش لـەو کاتـەدا یەکسـەر دارێـك هەڵـدەگرێت لـە شـوانەکە بـدات لـەناو جامەکـە، شـێخەکە جامـە ئاوەکـە لەبـەر دەمـی لادەدا دەڵێـت: کـوڕی خـۆم تـۆ بـۆ یـەك سـعات خودایـەتیت پـێ نـەکرا چ جـای حەفتەیـەك، خـودا بـەو گەورەیـەی خۆیـەوە کـە خـودای هـەموو عالەمـە بەسـەدان کـاری لـەوە خـراپتر دەبـینێ، بـەس ئـەو زۆر بەڕەحمـە تۆڵـەی لـێ ناکاتـەوە تـاکو مـردن، بـەلام تـۆ کوڕەکـەم یـەك شـتت بـینی هەڵچـوی ئینجـا ئەگـەر ئـەو هـەموو کـارە خراپـە ببـینی، کوڕەکـە دەڵێت: مامـە شـێخ مـن غـەڵت بـوم خودایـەتی تـەنیا بـۆ (رب العالمین)ە بۆ کەسی تر نییە تەنیا خۆی دەتوانێ عالەم بەڕێوە ببات.

**= حەکایەتـە فۆلکلۆرییـەکان تـەنیا باسـی شـتی سـادە و کـاری ڕۆژانـە ناکـەن، بەڵکـە زۆر حەکایـەت دەچـێتە نـاو بابـەتی گـرنگ و پـەنا بـۆ وەڵامدانـەوەی پرسـیارە ئەزەلییـەکان دەبـات. (خـودا) لەوەتـەی مـرۆڤ چـاو و مێشـکی کراوەتـەوە. مرۆڤـی بەخۆیـەوە خـەریك کـردووە، ئـەم حەکایەتـەش دەربـڕی قۆنـاغێکی گەڕانی مرۆڤە بەدوای (خودا)دا.**

# ژنێکی ژیر

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: مام عمر دارەتویی**

**لەدایك بووی: ١٩٤٩**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

ڕێبوارێــك ئێوارانێــك درەنگـــی بەســـەردا دێــت بچــیتەوە گونـــدی خۆیــان، ڕێـــی دەکەوێتە گونـدێکی لەبـەر دەعبـا و دڕەنـدە نـەوەك شـەو توشـیان بێـت، کـە دەچـێتە ئـەو گونـدە کـەس پێـی نـاڵێ مـارت لـە کێیـە؟ هـەر دەڕوا هـەر دەڕوا دەبـینی ژنـەکی زۆر جـوان و جاحێـلێ دەبـی وا لەبـەر دەرکـەی دانیشـتیە، ئـەویش سـڵاوەکی لـێ دەکـات و دەڵێــت: دەتـــانم ئـــەو شـــەو لـــە مـــارت بمینێمـــەوە ڕێـــم دوورە ناتـــانم بگەڕێمـەوە گونـدی خـۆم؟ ژنەکـەش دەڵێـت: چ قەیدیـە، بەخێرهاتنـەکی گـەرمی دەکـا و دەڵێـت میـوان خۆشەویسـتە، لـۆ ئێـوارێ شـلە سـاوارەکی لـۆ لێـدەنێ و نـان و مـانی دەخـۆن و کـابرای ڕێبـوار لـە دری خۆیـدا دەڵێـت: باشـە ئـەوە لـۆ مێـردی دیـار نییـە؟ خـۆ وا شـەوە، ئەگـەر لـە ئیشـێ بیـت هـەتا ئـەلعان هـەر دێتـەوە، وا مندارەکانیشـی خەوانـد، دەبـا لێـی بپرسـم چـی تێدایـە، دەڵێ کـابرا ڕووی کـردە ژنەکـە و گـۆتی ئـەڵێ خوشـکی خـۆم ئـەوە نوێـژی عیشـایەش تێپـەڕی ئـەدی مێـردت لـۆ دیـار نییـە؟ ژنەکـەش دەڵێـت مێردەکـەم مـاوەی سـارەك دەبـی ئـەمری خـوای بـەجێ هێنایـە و ئـەو سـێ منـدارەی لـەپاش بـەجێ مایـە، کـابرای ڕێبـوار ڕاسـت نیـازی خـراپ دەبێـت و زەوقـی دەچـێتە سـەر ژنەکـە و دەڵێـت دەزانـی زسـتانە و سـەرمایە پیـاو بەتـەنێ نـاتوانێ بنـوێ؟ ژنەکـە زۆر ئـاقر دەبێـت تێـدەگا، دەڵێـت وەڵا ڕاسـت دەکـەی، بـەرام جـارێ ئـەتو بـڕۆ کـورەی بکـە، وا دەچـم ئـاوت لـۆ گـەرم دەکـەم و لـە حـەمامێ کـابرا لـە خۆشـیان وەخـت بـوو بـار بگـری، ژنەکـە دەچـێتە دەرێ و برنـۆی مێـردی ڕحمـەتی دەیـنی و حـازری دەکـا، دوایـێ دێتـە ژوورێ دەڵێ ئاوەکـە وا لەسـەر ئـاگرە لـە حـەمامێ وەرە بـڕۆ حـەمامێ، بـەرام دەبیـت لـە پێشـدان هـەموو جـل و بـەرگت لێـرە دانێـی و بـە ڕووتـی بـڕۆ حـەمام. کـابراش خـۆی ڕووت دەکاتـەوە و دەچـێتە دەرێ هـەتا بچـێتە حـەمامێ، وەختـەك دەبـینی حـەمام سـارد و سـڕە، دێتـە دەرێ دەبـینی ژنەکـە برنـۆی لـێ ڕاسـت کردتـەوە دەڵێتـە پیاوەکـەی:

یالاّ بەم شەوە برۆ دەریّ دەی، دەبی بەڕووتی بڕۆی، بەرکی حەیات دەچی، خەرکی ئەگەر بتبینی، پیاوەکە ناچار ملی ڕیّ دەگری و بەو سەرمایە دەڕوا ناتانی هیچ بکات، ڕووت و قوتە ناتانی لەدەرکەی هیچ مارەکی بدات، شەقەی ددانی ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیی، دەڕوات دەڕوات بە ئاقاردا دیتی وا ڕووناکییەك لە دوورەوە دیارە، ڕۆیی ڕۆیی هەتا گەیشتە ڕووناکییەکە، دیتی گوندەکی بچوکە، ڕاست مل دەنێتە ناو مارەکی دەچێتە ناو حەیوانان خۆی دەخاتە ناو کۆڵی حەیوانان، وەختەك سبەینیّ ساحب مار دێتن کا و جۆی دەداتە حەیوانان، دەبینی تشتەکی ڕووت وا لەناو کۆلیدایە، لێی ڕاکشاوە دەرێت ئەریّ کابرا هەستە ئەتو ئینسانی جنۆکەی ئەتو چی؟ لەسەرمان چی پیّ ناگۆتریّ، کابراش گاسی ژنیّ خۆی دەکا و دەریّ: برۆ جێیەکی لۆ حازرکە سۆبەی داری پێکە، ژنەکەش دەچیت چی مێردەکەی پێی دەریّ وادەکا، کابرای دەبەنە ناو جیّ و تا ڕۆژ هەردیّ، کابرا بە تەواوی گەرم دەبتەوە، کابرای ساحب مار دەچیت یەك قرمەی دەینی و دەرێت دەبیّ بەسەرهاتی خۆت بگێڕیەوە دەنا دوایی دەتکوژم ها، کابراش چی بەسەر هات بوو هەمووی لۆ دەگێڕێتەوە، ساحێب مار دەریّ وەلاّهی ئەو خوشکیّ منە هەر ئێستا دەچمە کنی ئەگەر یەك ئیشی خراپت کردبی شەرت بی بتکوژم، کابرای لەگەرە خۆی دەبا بۆ ماڵی خوشکی، پێی دەریّ خوشکی خۆم وەرە بزانم ئەم کابرایە چ ئیشی خراپی لەگەر کردی؟ ئەگەر کردیتی با بقوربانی یەك قرمەی کەم، ژنەکەش دەرێت وەلاّهی هیچی نەکردیە بەس ئەوەندە نەبێت کە وەیگۆت ئەمنیش ئەوهام بەسەر هینا، کابرایەکە دەرێت زەلام ژنت هینایە. دەرێت ناوەلاّ دەرێت دە مادامەکی وەیە خوشکم ئەتو ڕازی مێرد بەم کابرایەی بکەی؟ ژنەکەش دەرێت بەریّ ئەمن ڕازی مە. بەکابر دەرێت: ئەتو ڕازی خوشکی من لەخۆ مارە بکەی؟ کابراش دەرێتك بەریّ بەو سبەینە زووە مەلا دەینن و ژن و پیاوەکەی لە یەکدی مارە دەکەن کابرا بیّ کەس و غەریب گوند بە گوند دەسوڕاوە ڕەبەن بوو لە پڕ بووە ساحێبی ژن و سیّ مندار و مار و حار.

= لە ڕووداوە سەیر و نەوازەکانی ژیان زۆر ڕووداوی سەیر ڕوو دەدەن کە لەم ڕووداوانە پیاو ژنی مەرد و لێهاتوو بەدەر دەکەون و پیاوی فرسەت خواردوو

نـان بـه حـەرامیش دەردەکـەوێ، ئـەم بەسـەرهاتە دەق و گێڕانـەوەی تریشـی هەیـە، ئـەوەی لێـرە نوێیـە، ئەوەیـە کـە دواجـار ئـەو پیـاوە ئازایـە خوشـکە ئازایەکـەی خـۆی لـەم - پیـاوە = نمـەك بـە حەرامـە مـارە دەکـات و ژنـەش رازی دەبـێ، بـەلام، ئـەم کـارە هۆیـەکی کۆمەلایـەتی و دەروونـی هەیـە، هۆیـە کۆمەلایەتییەکـە ئەوەیـە کـە کـابرا دەزانـێ خوشـکەکەی گـەنج و شـوەکەی مـردووە و واباشـە شـو بکاتـەوە، ژنـەش شـو کردنـەوە بـە ڕاسـت دەزانـێ. هۆیـە دەروونییەکـەش ئەوەیـە ژنـەش غـەریزە و ئـارەزووی هـەبووە و بـەلام وای لا چاك بـووە کـە لـە ڕێگایـەکی دروسـت، ئـەم ئـارەزوو و غەریزەیـە بەدەسـت بـێنی، کابرای بێ کەس غەریبیش لەمەی چاکتر دەست ناکەوێ.

## عەلەکە

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: محەمەد ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

ماڵی بەکر تانیا ماڵ بوون لە دێکەمان هەبوون بوون، زەمانی قات و قڕی و گرانی ڕۆمەکان، چوون هێستر و مەڕ و ماڵاتیان هەبوو، بەریەری نیوەڕۆ بوو، بەکر مەڕەکانی بەرەو قوڵایی دەشت دەبرد، دیتی زەلامێك لەسەر پشت لێی ڕاکشاوە، بەکر وایزانی مردووە، نەختێ چووە پێش لێی دیتی کە عەلەکەی خەڵکی ئاواییی خۆیانە، وتی: عەلەکە خێرە لێرە لێی کەوتووی؟ گوتی: ئەوەندەم برسییە نان نەبوو لە ماڵ بیخۆم لەبەر برسییەتی قسەشی بۆ نەدەکرا، بەکریش چوو یەك دوو مەڕی بۆ دۆشی، گوتی عەلەکە نانم پێیە بەس ئێستا بتدەمێ شەوێلگەت نابڕێ، هەتا ئەو شیرە بخۆوە، وەختێ عەلەکە شیرەکەی خواردەوە و هاتەوە هۆش خۆی و نانەکەم دایێ و خواردی دەستی بەسەر زگیا هێنا و گوتی: عەلەکە خۆ ئەمجارەش نەمردی مایی و شۆڕبۆوە ناو ئاوایی زەمانی قات و قڕی خەلاس بوو، کۆتایی پێهات، بەکر پەریوت بوو باوکی لەسەر جێگا کەوت فلسی نەبوو، بەکر باوکی پێ ببات بۆ شار چارەسەری بکات، عەلەکە ئەوکاتە خوا پێداو بوو دەوڵەمەندێکی ئاوایی بوو، بەس خزمەتکاری دیوەخانی سێ خزمەتکار بوو، بەکریش دەڵێ بابچم و بزانم ڕۆژەکەی لەبیر ماوە و هەندێك یارمەتیم بدات باوکمی پێ ببەم بۆ شار، بۆ شەو بەکر دەچێتە دیوەخانی عەلەکە و دیوەخانی عەلەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، دەڵێ: لە ڕووم نەهات پێی بڵێم، چاوڕێم کرد هەتا دیوەخان چۆڵ بوو، چووم بۆ لای عەلەکە و داوای دینارێکم لێ کرد کە بە قەرز بمداتێ بەشکم باوکمی پێ ئەبەم بۆ شار نەخۆشە و هاوین تۆیەکەم دوورییەوە دەت دەتدەمەوە، یان بایی دینارەکە گەنمی دەدەمێ، دەمی پچڕی و گۆتی لە کوێم بوو ها؟ کوڕو خۆ خەزێنەم نەدۆزیوەتەوە، وتم دەمدەیتێ یان نا؟ گوتی: بەخوا کوڕم شك نابەم، دەڵێ هەستام ڕۆیشتم و لە ڕێگا دەستم کردە گریان لە دڵی خۆم دەمگوت باوە خوا گەورەیە خوا شفا دەدات، خوا قاپییەك دەکاتەوە، چوومەوە ماڵ باوکم گوتی: ها کوڕم بەکر چیت کرد؟ بەکریش گوتی وەڵا باوەگیان هیچ دوعا بکە و شوکری

خوا بکه، باوکم دەستی بەگریان کرد و گوتی کوڕم عەلەکە خۆی بەبیر نایەت چۆن ئەژیا لەبرسا خەریك بوو بمرێ، شەو لێی خەوتین و بۆ بەیانی کەرەکەم کورتان کرد و چوم بۆ دار بۆ ناو تەندوور و سۆبە، هەتا نیوەڕۆ دارم بڕی و خڕم کردەوە، لەسەر پشت کەرەکەم ناو هاتمەوە مالّ لە ڕێ لەسەر کانییەکەی دێ لامدا و هەندێ دەست و دەم و چاوم شوشت و گەڕامەوە و ملی کەرم ڕاکێشا، دیتم وا دیناری با لێی ئەدات، منیش دینارەکەم هەلگرتەوە و گوتم باوە خوا ناردی چوومەوە مالّ و گوتم باوە لە ئێستەوە خۆت حازر کە بۆ بەیانی بچین بۆ شار، باوکم گوتی کوڕم بەکر چی بووە؟ گوتم باوە خوا ناردی خوا کەسی بێ کەسانە بەیانی چووینە شار و عیلاجی باوکم کرد و هەندێ ئەشیامان کڕی و هێشتا هەندێکی هەر مایەوە و هاتینەوە مالّ.

ئەم سەربردەیە سەربردەکی ڕاستەقینەیە بەلاّم بەشێوەی فۆلکلۆری باوکم گێڕایەوە و منیش بەشێوازی فۆلکلۆری نوسیمەوە و ئارەزووی بلاّو کردنەوەیم کرد. باوکم لە ژیاندا ماوە و ئەمەی بۆ گێڕامەوە.

تێبینی/ ئەم بەسەرهاتە ڕاستییە و زەمانی داگیرکاری عوسمانییەکان ڕوویداوە بۆیە باپیرم بۆ باوکمی گێڕاوەتەوە و باوکم بۆ منی گێڕایەوە.

**- هێزی گەڕ و کوڕی ژیان تەنیا مرۆڤەکان نین کە بە عەقلّ و بە مەبەست کارەکان دەکەن، بەلّکە قەدەر هێزێکی تری کاریگەری کارەکانی ژیانی خەلّکە، عەرەب دەلّێن: لەوانەیە ڕێکەوتێك لە هەزار گفت و ژوان چاکتر بێ.**

## قەسابەکە

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: محەمەد ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

دەگێڕنەوە دەڵێن زەمانی زوو کابرایەك دەچێتە بازاڕ بۆ گۆشت کڕین، وەختێ دەچێتە لای قەسابەکە دەبینی پیاوێکی ریش سپی و سەر سپی بە پیاوێکی ریش سەر و ریش سپی دەڵێت باوە، پیاوەکە سەری سوڕ دەمێنێ لەو تشتەی دەیبینێ، دەچێتە پێشەوە و دەڵێت: دەبێت بزانم ئەو سڕەی ئێوە چییە؟ بۆ بەو سەر و ریش سپییە دەڵێیت باوە، کابرای سەر و ریش سپی دەڵێت حیکایەتی من دوور و درێژە، کابرایەکەش دەڵێت دەبێت ئەو سڕەم هەر پێم بڵێیت، باشە وەرە پێشەوە با بۆتی بگێڕمەوە چی بووە چی نەبووە، گوتی رۆژێك لای مەڕ بووم بەهار بوو دەشت و دەر خۆش بوو پاڵم دایەوە لێی خەوتم، وەختێك بەخەبەر هاتم دیتم مەڕەکان رۆیشتوون چووم بەدوای مەڕەکانم گەڕام و سوڕام نەمدیتەوە، وەختێ لەناکاو کەوتمە ناو بیرێکەوە، هەتا ماوەیەك بەرچاوم تاریك بوو، ناو بیرەکە وەختێ تۆزێك بەرچاوم رۆشنبۆوە دیتم مارێك چەند قەف لەسەر یەك کەپکەی کردووە، منیش لە ناوەڕاستی مارەکەم لەدڵی خۆم دەمگوت ئێستا نا ئێستا دەمخوات، ئیتر ماوەیەکی پێچوو هیچ دەنگ نەبوو، وەختێ بووە ئێوارە خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، دیتم شتێ سپی وەك پەنیر وابوو هاتە خوارەوە، وەلا مارەکە کەوتە خواردنی، خواردی خواردی هەتا نیوەی خوارد نیوەکەی تری فرێدا بۆمن، منیش گوتم بیخۆم نەیخۆم ئەوە پیسە، لە برسا هیچم پێ نەکرا وەلا پەلامارمدایە و کەوتمە خواردنی، کە خواردم لە ژیانما شتی وا بەتامم نەخواردووە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو مارە بەو تشتە سپیە دەژیان بێ ئەوەی پیساییمان هەبێت یان تێنیمان بێت، بێ خەم بووم لە مارەکە ترسم لێی شکا، بڵێی کەی بەلای ئەو بیرەیا بێ یان بڕوات کەس نەبوو فریام بکەوێت دەرم کات، رۆژێك زنجیرێك هاتە خوارەوە مارەکە خۆی سەرخۆی لێ ئاڵاند و زنجیرەکە سەری خستە سەرەووە، منیش گوتم ئەی

هاوار هەیش ڕزقم لەسەر ئەو مارە بوو ئەویش ڕۆیشت، وەتیّ لای کلکی هەندێکی مابوو لەناو قەدمی ئاڵاند و منیشی سەرخست هەتا لەبیرەکە دەرچووم، منی فڕێدایە لایەکەوە، ئیتر نەمزانی مارەکە چی لێهات، من لەبەر ئەوەی ماوەیەك ڕووناکیم نەبینی بوو ماوەیەکی زۆر چاوم نەیدی، وەختێ هاتمەوە هۆش خۆم، هەستام ڕۆیشتم وەختی چوومەوە ماڵەوە منیان نەناسییەوە سەر و ڕیشم هەمووی سپی ببو، تەعزێکەشم هەمووی تەواو ببوو، منیش پرسیم کوڕێکتان بەو حاڵە بزر بوو لە دەشت گوتیان ئەرێ وەلا ئەوە عەیامێکی زۆرە تەعزێکەشی تەواو بووە نازانین گورگ خواردی یان دڕندە بردی نازانین چی بەسەر هات منیش بەسەرهاتەکەم هەموو بۆیان گێڕایەوە و کردیانە شایی بەو حاڵە سەر و ڕیشم سپی بوو.

تێبینی/ وەکو باوکم گوتی: ئەمە وابزانم فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ)، چونکێ مەلایەك بۆ منی گێڕاوەتەوە.

- لەم حەکایەتەدا کە زۆر دەقی تریشی هەیە، دەبێ بیخەینە گەڵ ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی کە دەچنە نێو نهێنییەکانی ژیان و گیانداران، ئەو نهێنییانەی کە هێشتا زانست پەی پیّ نەبردوون و هەر نهێنین.

# ڕێبوارەکە و پاشا

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: محەمەد ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو کەس لە عەبد ڕوو ڕەشتر نەبوو کابرایەکی ڕێبوار ڕێی دەکەوێتە شارێك بەناو شاردا دەگەڕێت لەناو قەڵەباڵغییەکی زۆر دەبینێ پیاوێك سێ کۆمەڵە خۆڵی داناوە یەکێ گەورە و یەکێ ناوەنجی و قلێکیان گچکە ڕێبوارەکە لێی دەڕواتە پێشەوە دەڵێ خاڵە ئەم کۆمەڵە خۆڵە چییە؟ دەڵێت هەریەکەیان بە نرخێکە کۆمەڵە گەورەکە بە سێ لیرە کۆمەڵە ناوەنجییەکە بە دوو لیرەیە کۆمەڵە گچکەکە بە یەك لیرە کابرای ڕێبوار دەڵێت باشە کۆمەڵە گچکەکەم دەوێت ها ئەوە لیرەیەك کابراکەش دەڵێت کوڕی خۆم هەتا پرسیاریان لێ نەکردی جواب مەدەوە گوتی باشە ناوەنجییەکە دەڵێت ئەگەر چویە دیوەخان شوێنی خۆت بناسە دەڕێت ئی سێیەم دەڕێت چوویە هەر جێیەك دۆستەکی لۆخۆت پەیدا بکە دەڵێت مامە ئەوە پارەکانی خۆڵەکە گوتم دەبێت چی بێت کابرای ڕێبوار شەوی بەسەردا دێ و لادەداتە ماڵی پاشا لەوێ نان دەخوات کاتێ دەچنە دیوەخان دەڕواتە سەرەوەی دیوەخان لێی دادەنیشێ کاتێك کاڵەك دێنن بۆ پاشا وا دەکات چەقۆی لێ نییە یەکسەر کابرای ڕێبوار دەڵێت ها فەرموو پاشای گەورە وەختێ پاشا تەماشای چەقۆ دەکات چەقۆ چەقۆی خۆیەتی دەڵێ ئەم چەقۆیەت لە کوێ بوو دەڵێت پاشا هی خۆمە حەز دەکەی با ببێتە هەدیە بۆ تۆی خاوەن شکۆ پاشا دەڵێت ئەم چەقۆیە هی منە لە کوێ دۆزیوتە وەلحاسڵ پاشا دەڵێت هەتا بەیانی هەتا ڕاستیەکەی نەڵێت دەتکوژم وەختێ مامە پیرە لەوێ دەبێت پاشا بە مامە پیرەکە دەڵێت دوو پاسەوانت لەگەڵ دەنێرم و ئەم پیاوە ببەوە لەگەڵ خۆت بەس هەر نابێت قسەی لەگەڵا بکەیت کابرا لەگەڵ مامە پیرە زاناکە دەڕواتەوە ماڵ لەگەڵ دوو پاسەوانەکە دەبێتە نیوە شەو دەڵێت ئەم کابرایە بەیانی دەیکوژن نەتدییە بە گوێمی نەکرد مامە پیرەکە لەسەر جێ هەڵدەستێتەوە و کڵاوەکەی سەری دادەکەنێ و دەڵێت کڵاو هۆ کڵاو خەوتووی

یـان بەخەبـەری ئاگـات لێمـە یـان نـا بـەیانی دەچـیتە لای پاشـا دەڵێیـت مـن ئـەم چـەقۆیەم لەسـەر جـەنازەی بـاوکم هەڵگرتۆتـەوە پـێش حـەوت سـاڵ کـڵاو بەخەبـەری یـان نـا کـابرای ڕێبـوار دەزانـێ لەگـەڵ ئەویـەتی بـۆ بـەیانی لەگـەڵ مامـە پـیرە دەچـنە دیـوانی پاشـا و دەڵێـت پاشـا مـن ئـەم چـەقۆیەم حـەوت سـاڵ پـێش ئێسـتا لەسـەر جـەنازەی بـاوکم هەڵگرتۆتـەوە ئـەوە حـەوت سـاڵە دەگـەڕێم بـزانم ئـەم چـەقۆیە هـی کێیـە بکـوژی بـاوکم بدۆزمـەوە پاشـا جـەنابتان دەڵێـت ئـەم چـەقۆیە هـی منـە پاشـا دەڵێـت مامـە پـیرە ئەمشـەو قسـەت لەگـەڵ کـردووە مامـە پـیرەش دەڵێـت بـە پاسـەوانەکان بڵـێ بزانـە مـن قسـەم لەگـەڵ ئـەم کابرایـە کـردووە پاسـەوانەکان دەڵـێن نـەخێر پاشـا. پاشـا دەڵێـت باشـە خـوێنی بـاوکی بـدەن کـابرا زێـڕ و گەوهـەرێکی زۆر وەردەگرێـت و لەگـەڵ مامـە پـیرە دەڕۆن لـە دەرەوە مامـە پـیرە دەڵێـت بزانـە کـوڕی مـن بەقسـەی منـت نـەکرد نـەمگوت ئەگـەر چـویە دیوەخـان شـوێنی خـۆت بناسـە ئەگـەر کـەس پرسـیاری لـێ نـەکردی وەڵام نەدەیتـەوە ئەگـەر مـن لێـرە لـەم وڵاتـە غەریبیـە دۆسـتت نەبومایـە پاشـا لـە ملـتی دەدا ڕێبوارەکـە دەڵێـت مامـە گیـان بـا بەشـی بکـەین مامـە پـیرەش دەڵێـت نـا پیرۆزی خۆت بێت بەس ئامۆژگاریەکانی من ببێتە دەرس بۆ جاری ترت.

**نێـو خـەڵك بۆخـۆی قوتابخانەیـەکی گرنگـە بـۆ دەرز دادانـی تاکـەکانی کۆمـەڵ ئـەم کومەتـە خۆڵانـە لـە هەنـدێ حەکایـەت هـەیاس دەیـان کـڕێ و پاشـاش گاڵتـەی بـە عەقڵی هەیاس دێت!**

# مەلا و چل دز

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: خاتون ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٢**

**شوێنی دانیشتن: بنەسلاوە**

هەبوو نەبوو کەس لەخوای عالم تر و گەورەتر نەبوو ژن و پیاوێك لە مەملەکەتی خۆیان بوون هیچ منداڵیان نەبوو پیاوە هیچ سەنعاتێکی نەدەزانی سەری هێنا و برد هیچی پێ نەکرا ژنەکەی ناوی گوڵێ بوو شەوێك لەگەڵ گوڵێ دانیشتن قسە ئەکەن گوڵێش دەڵێ پیاوە بۆ لێرە نەڕۆین تۆ خۆت بکە مەلاو دەچینە مەملەکەتێکی تر و بەیانی کابرا جبە و عەمامەیەك لەبەر دەکا و لەگەڵ گوڵێ دەڕۆن بۆ مەملەکەتێکی تر لەوێ خۆی دەناسێنێ بە خەڵکەکە و دەڵێت من مەلام خەڵکەکەش زۆریان پێ خۆش دەبێت و دەیکەنە مەلای خۆیان کاتێك ڕۆژی جومعە دەست دەکاتە خوتبە دەبینێ مزگەوتەکە ئەوندە کۆنە وا لە ڕمانایە یەکسەر هاوار دەکا و دەڵێت موسڵمانینە بڕۆنە دەرەوە ڕاکەن مزگەوت دەڕوخێ خەڵکەکەش هەموویان بە ڕاکردن خۆیان ڕزگار دەکەن کاتێك کەمێکی پێ دەچێ مزگەوتەکە ڕما خەڵکەکە دەڵێن بەخوا مەلایەکی باشە و ئەم مەلایە غەیبی پێیە لەو ڕۆژە خەڵکەکە زۆر مەلایان خزمەت دەکرد بەرەبەرە مەلا دەوڵەمەند بوو ڕۆژێکیان کابرایەك دەچێت کوللەیەك دەگرێت دەیکاتە ناو پەڕۆیەك و دێت بۆ لای مەلا بە مەلا دەڵێت ئەگەر ئەتو بزانی ئەمە چی تیایە من ئیعترافت پێ ئەکەم کە تۆ مەلایەکی باشی و غەیبت لایە مەلا هەرچەنێك دەکات نازانێ چی بکات لە داخا لەجیاتی بڵێ ئاخ گوڵێ چیت بەمن کرد لێی غەڵت دەبێ و دەڵێت ئاخ کولە یەکسەر کابرا دەڵێت بەڵێ ڕاستت کرد مەلا کولەی تیایە بەم کارەی مەلا ناوبانگ پەیدا دەکات ڕۆژی ماڵی دەوڵەمەند دزییەکی زۆریان لێ دەکرێ چی پارە و پول و لیرە و زێڕ هەیە دەیدزن هانا دێنن بۆ مەلا دەڵێن مەلا فریامان کەوە دزییەکی زۆرمان لێ کراوە و بۆمانی بدۆزەوە بەس دزییەکە زۆرە بۆیە هەتا چل ڕۆژی تر بزانە بۆمانی نادۆزیتەوە مەلاش بۆ شەو هەڵدەستێ چل بەرد دەکاتە ناو کوپەیەك بۆ ئەوی شەوەکانی پێ حیساب بکات پێش ئەوەی بگاتە چل ڕۆژەکە ڕابکات لەو مەملەکەتە نەمێنێ مەلا بە گوڵێ دەڵی بزانە چیت پێ کردم ئێستا چی بکەم ها؟

گـولێش دەڵـێ خـوا گەورەیـە قاپییـەك دەكاتـەوە دزەكـان دەزانـن خـاوەن ماڵەكـە مـەلای ئاگـادار كردۆتـەوە ئـیتر شـەو یـەكیان دێـت بـۆ لای مـاڵی مـەلا مـەلاش لەوكاتـەیا بـەردێكی نـاو كوپەكـە دەردەكـا و دەڵێـت ئـەوە لـە چـلان یـەك دزەكـەش وادەزانـێ ئـەوی بینیـوە ڕا ئەكاتـە لای سـەرۆكەكەیان دەڵێـت مـەلا دەزانـێ ئێمـە دزیومانـە چـونكە گـوتی ئـەوە لـە چـلان یـەك سـەرۆكی دزەكـان دەڵێـت درۆ دەكـەی بـۆ بـەیانی شـەو دێـت سـەرۆكی دزەكـان یـەكێكی تـر دەنێـرێ مـەلاش دێتـە دەرەوە بـەردێك فـڕێ دەدات و دەڵێـت ئـەو لـە چـلان دوو دزەكـە ڕادەكـا و دەڵێـت بـەخوا مـەلا دەزانـێ ئێمـە چـل كەسـین چـونكە مـنی بـینی گـوتی ئـەوە لـە چـلان دوو بـۆ شـەوی سـێیەم سـەرۆكی دزەكـان دیسـان یـەكێكی تـر دەنێـرێ دیسـان مـەلا بـەردێك فـڕێ ئـەدات و دەڵێـت ئـەوە لـە چـلان سـێ دزەكـەش ڕادەكـا و دەڕوا و دەڵێـت بـەخوا مـەلا زانیـوتی چـلین چـونكە گـوتی ئـەوە لـە چـلان سـێ بـۆ شـەوی چـوارەم سـەرۆكی دزەكـان دێـت دیسـان مـەلا بـەردێك فـڕێ ئـەدات دەڵـێ بـەخوا ئەمـەیان لـە هـەموویان گـەورەترە ئـەوە لـە چـلان چـوار مـەڵێ مەغسـەدی بەردەكـە بـوو كـە لـە هـەموو بـەردەكان گـەورەتر بـوو سـەرۆكی دزەكـان دەڵێـت بـا بـڕۆین بـۆ لای شـوێنی پـارە و زێڕەكـانی پـێ دەڵـێین بـەو شـەوە لـە قـاپی مـاڵی مـەلا ئـەدەن مـەلا قـاپی ئەكاتـەوە و سـەرۆكی دزەكـان دەڵێـت مـەلا ئێمـە دزەكـانین هـەتا ئێسـتا چـوارمانت كەشـف كـردووە بۆیـە بەكـەس مـەڵێ ئێمـە دزیومانـە بڕۆ پـارە و زێڕەكـان وا لـە فلانـە شـوێنە ئێمـە دەڕۆیـن هـەر لـەم مەملەكەتـە نـامێنین بـۆ بـەیانی مـەلا بـانگ خـاوەن ماڵەكـە دەكـا و دەڵێـت بـا بـڕۆین وا لـە فلانـە شـوێن شـاردویانەتەوە دەڕۆن شـوێنەكە هەڵەقـەنن زێـڕ و لـیرە و پارەكـان هـەمووی لـەوێ شـاردراونەتەوە خـاوەن ماڵەكـە بـە مـەلا ئـەڵێت مـادام بـۆ منـت دۆزیـەوە هـا چـارەگی ماڵەكـە بـۆ تـۆ بێـت مـەلاش وەری دەگـرێ و دەڕواتـەوە بـە گـوڵێ دەڵێـت بـا بـڕۆین بـۆ مەملەكـەتی خۆمـان هـەر ئەمشـەو بەسـە بـا كەشـف نـەبین بـۆ خۆمـان بوینـە خـاوەن پـارە و سـامان بـۆ شـەو لەگـەڵ گـوڵێ ئـەو مەملەكەتـە بـەجێ دێڵـن و دەڕۆنـەوە مەملەكـەتی خۆیـان بـۆ بـەیانی خـەڵكی دێـن تەماشـا دەكـەن مـەلا ڕۆیشـتووە و نـەماوە ئیتر منیش كلاشم دڕا و هیچم پێ نەبڕا.

**- مـەلا كەسـایەتییەكی خۆشەویسـتە و ژیـانی لەسـەر خەڵكـە، زۆر كـەس حـەزیان كـردووە ببنـە مـەلا و زۆر ژنـیش خۆزگـەیان بـە مـەلاژن خواسـتووە، ئـەم بەسـەرهاتەش زۆرجـار گێڕدراوەتـەوە. ئەمـەش دەچـێتە نێـو سـوخریەتەكانی قەدەر.**

# نەوە دەوڵ ژەن

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی.**

**گێڕانەوەی: کاکل ئاغا محەمەد.**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو.**

وەختی خۆی زوو لە گوند بووین، پشیلەیەکم ماڵی کرد بوو ناوم لێنا (نەوە دەوڵ ژەن). پشیلەکە دەهاتە سەر جێگام، یاری بە تەسبیحەکەم دەکرد، زیاتر بۆ مشك ڕاو کردن بەخێوم دەکرد. بەس وەکو من دیقەتم دەدا شەوانە دەچووە دەرەوە ئیتر نازانم چی بەسەرە هات، هیچ گوێم پێ نەئەدا، بەش ڕۆژێ بیرم کردەوە گوتم وەختێ دەیانگوت پشیلە هەندێکیان جنۆکەن، بۆیە ئەو ڕۆژە گوتم دەبێت ئاگادری بم بزانم ئەمە بۆ کوێ دەڕوات و چیەکاو چی ناکا. وەڵا هەروەکو هەموو ڕۆژان هات هەندێ یاری لەگەڵ تەسبیحەکەم کرد. وەڵا ئێوارە دوای نان خواردن دیقەتم دا وا خەریکە بڕوات، منیش بە ئاسپایی کەوتمە دوای، ڕۆیشتم، ڕۆیشتم بەس نەمهێشت ئاگای لە من بێت، بەس جار جار ئاوڕ دواوەی ئەدایەوە، ڕۆیشت هەتا گەییە ئەودیو ئاواییەکە کە شوێنێ چۆڵ بوو، ئەها هەندێ دار و بار هەبوو، دیتم کاکی پشیلە چووە ناو قەرەباڵغییەوە هەر یەکسەر بوو بە شەڕ، خش لەپەنای دارێك خۆم شاردەوە، تەماشای ئەوانمەکرد، وەڵا کاتێ یەکێکیان گوتی دەی (نەوە دەوڵ ژەن) دەست پێکە، ئەویش دەوڵێکی هێنا و کەوتە کوتینی، جار جارەش دەیانگوت (نەوزاد) چاکی لێدە، (نەوە دەوڵ ژەن) چاکی لێدە، منیش بە ئاسپایی گەڕامەوە ماڵ، چوومە سەر جێگام و لێی پاڵ کەوتم، وەڵا بەیانی هەستام دەست نوێژم هەڵگرت و نوێژم کرد و، کاتێ لە نوێژەکەم بوومەوە دیتم وا بەسەر دیوارا ئاودیوە بێت دێتە حەوشەوە، وەڵا منیش تەسبیحەکەم گرتە دەست و تەسبیحاتم ئەکرد، ئەویش هات بۆ سەر بەرماڵەکەم، هەندێك یاری لەگەڵ تەسبیەکەم کرد، منیش گوتم ها (نەوە دەوڵ ژەن) بەخێر بێیەوە، کە گوتم (نەوە دوڵ ژەن)، ڕای کرد ڕۆیشت، چۆن ڕۆیشت هەتا ئێستا چاوم بە چارەی نەکەوتەوە.

تێبینی/ ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە و ڕوویداوە، کاکل ئاغا محمەد لە ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی کۆماری سەر بە ناحیەی شوان لەدایك بووە، ئێستا تەمەنی (٨١) ساڵە و لە قەزای ڕانیە دادەنیشێ. لە دواییدا گوتی لەوکاتەوە زۆر لە پشیلە دەترسم.

= گومان کردن لە پشیلە و پشیلە بە جنۆکە زانین، باوەڕێکی ناو خەڵکە، جنۆکەش مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و هەموو ئاینەکانیش پشتگیری لە هەبوونی دەکەن. مەسافەیەك هەیە بۆ زانین، کە ئەو مەسافەیە پێی دەگوترێ (عالەمی غەیب) زۆر زانیاری و پرسیاری مرۆڤ و وەڵامەکانی لەنێو ئەم مەسافەیەدا گیری خواردووە، لە هەندێ ئەفسانەی کوردی باس لە (هەیە و نییە؟) دەکات، بەڕاستی جنۆکەش هەیە و نییە؟ ئەگەر نییە؟ بۆچی هێندە باسی دەکرێ و چیرۆکی لە بارە دەگێڕدرێتەوە؟ کەواتە هەیە! باشە! ئەگەر هەیە کوانێ؟! لە کوێیە؟ گرفتەکە لەوەدایە ئێمەی مرۆڤ بۆ سەلماندنی هەموو شتێك تەنیا پەنا بۆ چاو و دەست دەبەین، تا بەچاو ببینین و بە دەست بیگرین. بەلام: ژیان پێمان دەڵێ: بۆ زانینی هەموو نهێنییەکان پێویستیمان بەزۆر هەستی تر هەیە، کە لە سەرووی ئەو پێنج هەستەن کە تا ئێستا ناسراون.

## نەگبەتی

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: محەمەد ئەحمەد محەمەد**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

کابرایەك زۆر دەوڵەمەند دەبێت، لە شار جێی نابێتەوە بارگەی خۆی تێك دەنێ و دەڕواتە دەرەوەی شار، لە چۆڵایی شار خێمەیەك هەڵەداو مەڕ و ماڵاتی و ماڵی دەباتە ئەوێ، ڕۆژێ لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە بەفر دایدەکات، شەوێ پاڵ دەدەنەوە و دەخەون، بەیانی کابرا هەڵدەستێت تەماشا دەکات شوێن پا بەدەوری خێمەکە دیارە سوڕاوەتەوە و ڕۆیشتووە، ئەویش دەبێت شتێك هەبێت، هەڵدەستێت بەشوێن پایەکە دەڕوات، دەڕوات، تا دەگاتە بەردەمی ئەشکەوتێ، دەبینێ وا زەلامێکی گەورە وا لەناو ئەشکەوتەکە دانیشتووە. پرسیاری کرد و گوتی: وەڵا کابرا ئەوی ڕاستی بێ ئەمشەو شوێن پات لە دەوری خێمەکەی منا دیار بوو، ئەوە شوێنی پایەکە هاتۆتە پێش ئەشکەوتەکە ئایا چەنابتی؟ دەڵێ بەڵێ خۆمم، من هاتم بەدەوری خێمەکەتا. باشە پێم بڵێ سەبەبی چییە؟ بۆ هاتی؟ گوتی: کاکە من نەگبەتم، ڕوو لەهەر شوێنێ بکەم وێرانی دەکەم، کابرای خاوەن ماڵ گوتی: کاکە وەرە چیت دەوێ وەرە چەند سەر مەڕت دەوێ دەتدەمێ، دەڵێ کاکە هیچم ناوێ بەس بڕۆ ڕاوێژ بە ماڵ و منداڵت بکە بزانە ئەوان چیەڵێن؟ ئینجا وەرە تەکبیرێکی بۆ ئەکەین، کابرا دەڕواتەوە ماڵ و ماڵ و منداڵەکەی خڕەکاتەوە و نۆ کوڕی دەبێ، ڕاوێژیان پێ ئەکا، کوڕێکی دەڵێ ماڵمان ناوێ با مەڕ و ماڵات بەرێ، کوڕێك دەڵێ بە فێڵ دەچین دەیکوژین، لە ئاخیرا بوکی بچوکی کابرا دەڵێت: هیچی ناوێ، با ئێمە تەبا بین و تفاق بین کەس و نەگبەت ناتوانێ زەفەرمان پێ بیات، کابرا دەڕواتەوە ئەشکەوت و لەگەڵ نەگبەت قسەئەکات، نەگبەت دەڵێ: ها چیت کرد؟ دەڵێ کاکە چی ویست ببیە، بەس ئێمە تەبا بین ناتوانیت زەفەرمان پێ ببەیت، نەگبەت دەڵێ: عافەرین بۆ ئەو کەسەی کە تەکبیری بۆ کردی، دەڵێ وەڵا بوکە گچکەکەم تەکبیری بۆ کردم، دەڵێت بزانە مهم ئەوە نییە، بچوك بێت یان گەورە، ئافرەت بێت یان پیاو، مهم ئەوەیە عەقڵی هەبێت و تەکبیری خەڵکی پێ بکات. دە بڕۆ بڕۆ سەرکەوتی بەسەرما.

**- ئەم حەکایەتە گرنگی بە تەبایی دەدات، تەبایی نێو ماڵ نێو وڵات.**

# حەسەن مەمەندی

**کۆکردنەوەی: پشتیوان محەمەد شوانی**

**گێڕانەوەی: بەهائەدین عەزیز**

**لەدایك بووی: ١٩٤٥**

**شوێنی دانیشتن: دارەتوو**

دەگێڕنــەوە دەڵــێن دوو دەروێــش هــاتن لــە زەمــانی قــەدیم، چــون بــۆ لای حەســەن مەمەنــدی، حەســەن مەمەنــدی ئەوەنــدە دەوڵەمەنــد بــوو لــە دونیــا دەنگــی دابــۆوە، دەڵــێ دوو دەروێشــەکە ســەیریان کــرد دوو گێــژ [1] گــەنم گــەنم وا لەوێیــە، دەڵێــت ئــەوەتا حەســەن مەمەنــدی، لای دوو گێــژە گەنمەکەیــە، دوو دەروێشــەکە لــە فــەقیری گریــان دەخــوارد، دەڵــێ دیتیــان حەســەن مەمەنــدی قلــە گــەنم لــە هــۆوێ کوتبــوو هــەڵی ئەگرتــەوە و ئــەیکردەوە ســەر گێــژە گەنمەکــە، دەڵــێن باشــە ئەمــە ئەوەنــدە ڕزیــل بێــت چــۆن خێــر بــە ئێمــە ئــەکات؟! وەنییــە، دەڵــێن ســەلام و عەلــەیکوم، حەســەن مەمەنــدیش دەڵێــت عەلــەیکوم ســەلام، دەڵــێن ئێمــە ناوبــانگی تۆمــان بیســتووە، بــەس دەبیــنین قلــیٚ گــەنم لــە هــۆوە کــەوتووە تــۆ هــەڵی ئەگریتــەوە دەیکەیــە ســەر گێــژە گەنمەکــە، نایــەڵی کێشــکەش بیخــوات، کێشــکەش خێــر لــە تــۆ نــابینیٚ، چــۆن ئێمــە خێــر لــە تــۆ دەبیــنین؟ دەڵێــت ئــەزانی چییە؟ خــۆ لەبــەر قلــە گەنمەکــەم نییــە، دەڵــێن ئــەی لەبــەر چییە؟ گــوتی: بۆیــە هــەڵی ئەگرمــەوە بەشــکو بەرەکەتەکــە لــەو قلــە گەنمــەیا بێــت، خــوا نــەبیٚ کــەس نــازانیٚ مــن لەبــەر بەرەکەتەکەمــە، حەســەن مەمەنــدی گــوتی مــن ســەخیم، نــاوم لــە دونیــا دەنگــی داوەتــەوە، کــەس نییــە لــەمن ســەخی تــر دەروێشــەکان گوتیــان: بــەرەوەلاٚ یــەکێکی تــر هەیــە لــە تــۆ ســەخی تــرە گــوتی کێیــە؟ گوتیــان ئــەوە ئەمیرولموئمینینــە، لــە فلاٚنــە شــارە لــە تــۆ ســەخی تــرە، ئــیٚ گــوتی: باشــە ئەگــەر وانــەبوو ئــەوا هــەردووکتان ئیعــدام دەکــەم، بــەس ئەگــەر وابــوو ئــەوا چــی بەخشــیە دەتــان دەمــیٚ، گوتیــان بەســەر چــاو، دەڵــیٚ حەســەن مەمەنــدی چــوو بــۆ لای ئــەمیرولموئمینین، ســەیری کــرد خــانیٚ خــراپ، خــراپ وەك کــەپر وایــە دوو داریــان چــەقاندووە، گوتیــان ئــەوە مــاڵی ئەمیرولموئمینینــە، گــوتی باشــە ئەمــە ئــەمیری ئــەم شــارەیە، باشــە چــۆن بــیٚ حــەرەس و پاســەوانە، بــەس بــاب نیــزام [2] لەوێیــە، چــووە لای بــاب و نیــزام بــاجێکی

---

[1] گێژ – خەرمانی گەنم و جۆ.

[2] باب نیزام – دەرگەوان.

لـه یەقـەی دا چـووە هـەر مەتعـەم و چـاپخانەیەك کـەس پـارەی لـیٚ وەرنـەگرت، لەبـەر ئـەو باجـەی قـەدی، گـوتی کـاکی مەتعەمچـی بـۆ پـارەم لـیٚ وەرناگریـت؟ گـوتی: کاکـە گیـان ئـەوەی میـوان بێـت غـەریب بێـت عایـدی ئەمیرولموئمینینـە، پـارەی خـواردنی خـەوی ئـوتێلی، پـارەدان نییـە، ئەمـە ئەوهایـە ئیشـی، هـەتا حـەوت حـەوت رۆژە، لێـی ئەپرسـن: ئـیش و کـار چییە؟ ئیشـی نـەبێت دەڵێـت بـڕۆ کـاك بـۆ خـۆت دەڵێـت چـووە لای ئـەمیرولموئمینین، گـوتی تـۆ پاشـای ئـەم شـارە گەورەیـەی چـۆنە نـە حەرەسـت نـە پاسـەوانت نییـە؟ گـوتی: ئەوەنـدەم چـاکەم لەگـەڵ عالـەم کـردووە بچـم لـەو مەیدانـە بخـەوم کـەس هـەقی نییـە بەسـەرمەوە، لەبـەر ئـەوەی پاشـایەکی ئەوەنـدە چـاکم کەسـی تـری وەکـو منیـان دەسـت ناکـەوێت، گـوتی بـەخێربێی حەسـەن مەمەنـدی، هـەر ئیشـێکت هەیـە بڵـیٚ، مـادام دەزانـی نـاوم حەسـەن مەمەندییـە دەشـزانی بۆچـی هـاتووم، دەڵێـت بـەڵیٚ دەزانم، بـەس گـران لەسـەرت دەوەسـتیٚ؟ گـوتی: بـەڵیٚ گـرانیش بـوو بڵـیٚ، وایزانـی بـە پارەیـە، گـوتی بـۆ داخـوازی مـن هاتوویتـە، داخـوازی منـیش بـە پـارە نییـە، بـە عەقڵـە، یـەکیٚ عەقڵـدار بـیٚ تەجرەبـەی یەکـەم بـیٚ پـارەش شـوی پـیٚ دەکـەم، گـوتی: مـن سـیٚ شـەرتم هەیـە، یـەك لەبەغدایـە، یـەك لـە بەسـرایە، یـەك لـە کرکوکـە، ئەگـەر عـەقڵ داری ئـەو شـتانەم بـۆ بکـە مـن شـوت پـیٚ ئەکـەم، بـەس ئەوەنـدەی گـوت، حەسـەن مەمەنـدی گـوتی ئـای چـیم بەسـەر خۆمـدا هێنـا، قسـەکەم بریـا نەکردایـە. بـە حەسـەن مەمەنـدی گـوت: ئـەو دوو دەروێشـە بـڕوات هـەتا مـن دێـم، ئەگـەر دە سـاڵی پێچـوو خزمـەتیان بکـەی چـیان ویسـت بۆیـان بکـەی. حەسـەن مەمەنـدی ڕۆیشـت. یەکـەم جـار چـوو بـۆ بەسـرا، کابرایـەکی ناشـارەزا، بـەس یـەك جـاغ (٣) لـیرەی پـیٚ بـوو، لـەو شـارە گـەڕا سـوڕا گـوتی: ئیلاهـی چـی بکـەم باشـە، چـۆن بـزانم ئـەم ئیشـەی ئـەم ئـەمیرە چـییە؟ حەفتەیـەك مایـەوە، سـەیری کـرد لـەناو مزگـەوتیٚ کابرایـەك حـافزە (٤) تەشـتیٚ ئـاوی لایـە، هەرکەسـیٚ ئـاوی لـیٚ بخواتـەوە لیرەیـەکی ئـەداتیٚ، ئـەو کەسـەی ئاوەکـە دەخـواردەوە زلەیـەکی لـە کـابرای حـافز دەدا، گـوتی: مـن شـتی وام قـەت قـەت نـەدیوە، غەریبـە. گـوتی ئەمـە بـیٚ سـڕ نییـە؟ گـوتی دەبێـت ئەمـە بـزانم، ماڵەکـەی دیتـەوە و بـۆ ئێـوارە لـە دواوەیـەوە ڕۆیشـت چـووە ماڵیـان گـوتی: مـن میـوانی تـوم، کـابرای حـافز گـوتی: بـەخێربێی سـەر هـەردوو چـاوم، نـان و مانیـان دروسـت کـرد و دەسـتیان بـە نـان خـواردن کـرد لەگـەڵ مـاڵ و منـداڵ و ژنەکـەی حـافز، حەسـەن مەمەنـدی گـوتی: مـن نـان نـاخۆم، گوتیـان پیـاوی چـاك بـە بـۆ نـان نـاخۆی؟ گـوتی:

---

[3] جاغ – تورەگە، بوخچە.

[4] حافز – کوێر.

شەرتێکم هەیە هەتا ئەتو ئەو سڕەی خۆت بۆم نەگێڕیتەوە نان ناخۆم، ئەوەی لەناو مزگەوت دەتکرد، کابرای حافز گوتی: ئۆو تۆ حەسەن مەمەندی، ئەوە چەندی چەند ساڵە چاوەڕوانی توومە، ئەوە من ئەو دەلیل و ئەسبابەت بۆ دەگێڕمەوە، وە خەونم دیوە بۆت دەگێڕمەوە، بەیانی دەمرم مادام گەیشتم بە تو، بەیانی دەمرم، ڕۆژێک دەچووم بۆ ناو چۆم دار و شتم دەهێنا هیچم نەبوو ئیدارەم پێ دەکرد، دیتم لە ژێر دارێک مەلوتکەیەك تازە لە دایك بوو بوو کەوتبوو، منیش وەجاغ کوێر بووم گوتم بۆ من باشە بەخێوی دەکەم بەخێوم کرد تا گەورە بوو، کە دەوڵەمەند بووم جێ نەما پارەی تێکەم ڕۆژێك وا بە خەیلما هات کە ئەو منداڵە گەورە بوو منیش ئیختیار بووم بمرم دەبێتە میرتگری سەروەت و سامانەکەم، ڕۆژێك بردمە چۆم[5] لە ژێر دارێک چەقۆیەکم لێداو منداڵەکە پێش ئەوەی بمرێت گوتی: بابە گەردەنت ئازا نەبێت، خۆشی لە خۆت نەبینی هەردوو چاوت کوێر بن.

منیش پاش ماوەیەکی کەم هەردوو چاوەکانم کوێر بوون، ئەو سەروەت و سامانە هەمووی بۆ خۆم مایەوە، بۆ ئەوەی لەو گوناحە ڕزگارم بێت ئاو دەدەمە خەڵکی و لیرەیەکی دەدەمێ وەکو خێر، حەسەن مەمەند گوتی: وایە نوسی و ڕۆیشت. ڕۆیشت بۆ کەرکوك، دیتی وا کابرایەك زینی ماین دروست دەکا و ئێواران دەیداتە بەر شمێر، گوتی: عەجایەب ئەم زینە جوانە بۆ وا لێدەکات؟ بووە میوانی نان هات و گوتی: نان ناخۆم کوڕە پیاوی چاك نانەکەت بخۆ، دەڵێت ئەو سڕەتم بۆ نەگێڕیەوە نان ناخۆم دەڵێت باشە، دەڵێت منداڵ بووم دایك و باوکم نەما بوو، خوێندنم تەواو کردبوو ڕۆژێك هاتمەوە ماڵ دیتم ماڵ گسك دراوە و ئاش لێنراوە و جێش ڕاخراوە، دەڵێت: باشە کلیل لای خۆمە باشە کێ کردوتیەوە؟ دیاە جیرانەکانن بۆ ڕۆژی دواتر هاتمەوە عەینەن تاس عەینەن حەمام، گوتم بەخوا شتێك هەیە، ئەو ڕۆژە نەچوومە دەرەوە و خۆم مات کرد، دیتم ئاوا دەورویەر چێشتەنگاو کۆترێك هاتەوە ماڵەوە، کۆتر دەتگوت بەیداخە[6] دەسوتێ، ئەمەندە جوان بوو ئاشی کرد و ناومالی گسك داو هات بڕوات، بەس بەرگی کۆترەکەی داکەندبوو یەکسەر بالیم گرت گوتم بەخوا ناڕۆی کوڕە دانیشە پیاوی چاك بە با بڕۆم ئەوەی تیا نیە نابێ بڕۆی، گوتب پەری کەلك بەشەری نییە پیاوی چا بە، ئەوەی تیا نییە، دەڵێت باشە بەشەرتێ من چیم کرد نابێ تووڕە بی، دوایی تووڕە

[5] چۆم – چەم.

[6] بەیداخ – جوان و شۆخ و شەنگ، شەوقی زێڕ، زیاتر بۆ ئاگربەکار دەهێنرێ.

بێت خراپ دەقەومێ، گوتی دوو کوڕمان بوو هەردووکیان گورگ خواردی، گوتی: سەر سێیەم ویستم توڕە بم پەریەکە گوتی قەولت داوە نابێت توڕە بیت سەر سێی گورگەکە هات خواردی، گوتم بە خوایە دەکەومە دوای لەماڵ دەرچووم کۆترە سپی بەرگەکەی لەبەر کرد و دای لە باڵ و ڕۆیشت. تاقی بەیانیان دەیکەم تاقی نیوڕۆیان دێمەوە دێتە بیرم ئێوارەش ئەوهای لێ دەکەم لەو زینە، گوتی: بەڵێ هی تۆش زۆر تەواوە گوتی بەڵێ، بەشکم ڕۆژێک بگەڕێتەوە لام. حەسەن مەمەندی ئەمەشی بەجێ گەیاند و چوو بۆ بەغدا (بەس من لەبەر زۆری پیر بوومە تاقەتم نەماوە بیگێڕمەوە)هاتمەوە لای ئەمیرولموئمینین گوتی: لە بەسرا ئەوەیە و لە کەرکوکیش ئەوەیە و لە بەغداش ئەوەیە، ئەمیرولموئمینین بەڵێ من سرِی ئەوانەم نەئەزانی بۆ ئەوەم بوو بیزانم، گوتی بڕۆ مەلا بێنە مارەم بکە، دوو کچیشی لەگەڵدا بوو، گوتی ئەمانە لە دوو دەروێشەکە مارە بکە، ئەمە ئیشی دەروێشەکانە ئیشی تو نییە، خۆی لە حەسەن مەمەندی مارە کرد و دوو کچەکەشی لە دوو دەروێشەکە مارە کرد، لێیان داو بوونە پاشای ئەو شارە. منیش هاتمەوە و لوقمێکیان نەدامێ.

تێبینی/ کاک بەهائەدین لەبەر نەساغی گیانی و لە هەمان کاتدا پاسەوانی پارکی (دارەتو) بوو، نەیتوانی بە تەواوی بیگێڕێتەوە، لەوانەیە لەناو هەقایەتەکە ڕووداوەکان یەکتری نەگرنەوە، چونکە جار جار بەجێی دەهێشت و منداڵی پاس دەکرد لە پارکەکە، تا دەهاتەوە بیری زۆر زەحمەتیم لەگەڵ کێشا لەگەڵ هاوڕێی بەڕێزم (دەشتی کۆیی).

پشتیوان محەمەد شوانی

- حەسەن مەمەندی لە هەندێ حیکایەت وەك باوکی هەیاس دێتە ناسین، لەم حیکایەتە ڕۆڵێکی تری دراوەتێ.

لە گێڕانەوەدا پچڕانێك هەیە کە وەك برای کۆکەرەوە (پشتیوان محەمەد شوانی) نوسیویەتی مام بەهائەدین عەزیز پیرۆ نەساغ بووە، بۆیە نەیتوانیوە حەکایەتەکە بەچاکی بگێڕێتەوە: ئەمەش زەنگێکە بۆ زوو کۆکردنەوەی فۆلکلۆر و پەلە کردن، چونکە ئەوەی فۆلکلۆرزان ئەوا پیر دەبێ و لەبیری دەچێتەوە.

# گەنج سالح

**کۆکردنەوەی: گوڵستان حیدر محمد**

**ئارمیش رەشید حسن**

ل سەردەمەکی ل ولاتەکی کابرایەکێ فەقیر هەبوو، دگەل خێزانا خودا ژیانەکا ئاسایی و هەژاری دبردە سەر، ئەو کابارییە رۆژانە شولاوی ئەو بوو داچیتە دارستانێ و دارا کۆکەتەوە و بژێوا خۆ ب وێ رێکی پەیدا دکر. رۆژەکی ل رۆژان چوو بۆ دار کۆکردنەوەێ خەریکێ برین بنە دارەکا ئەستور بوو کۆل ناکاو ل ناو وێ بنە دارێ دا خەزێنەکا گەلەک زۆر دیتەوە نەزانی چ لێ بکەت. هەستا بارەك ل وێ خەزێنێ هەلگرت و هاتەوە بۆ مالێ. کابرایێ هەژار کەوتە بیرکدنەوێ ل وێ گەنجێ دگەل خۆ دگوت ئەز نزانم ب تنێ چ ل وێ گەنجێ بکەم ب هەر شێوەیەکی بیت دێ ل من ئاشکرا بیت یا باش ئەوە ئەز بچم خۆ دگەل وەزیری بکەمە شریك و بۆ من و وی بنیوە بیت. شەوێ کابرایێ هەژار چوو دیوانا وەزیری هەتا درەنگ شەو هەر هەڵنەستا. دیوان ب یەکجاری چۆل نەبووی هەڵنەستا وەزیری پرسیار لێ کر. ئەورێ تو ناچیەوە وەختێ نوستێیە؟ کابرای گۆتێ وەزیرێ خۆش بن من شولەکا هەی ئەزێ هاتی بێژمە تە من گەنجەکا دیتیتەوە و من دوێت بۆ من و تە ب نیوە بیت وەزیریش دگەل وی ب رێك کەوتن و بریاردا سپێدێ پێکوە بچن وێ گەنجێ بۆ خۆ بیننەوە وەکی بووە سپێدە و وەزیر و کابرایێ فەقیر پێکوە رێك کەوتن و چون بۆ ئینانە وا گەنجێ ئەو گەنجە نزیکێ حەفت بار و نیوا بوو وەزیر زۆرێ تەماع بوو گوتە کابرایێ هەژار با پێنج بار بۆ من بی چونکە من زۆر مێوان بێ تەیو دیوانا من زۆریا قەڵەباڵغە بەلێ بۆتە ئەو هەندەی مایی لێرا ئەوی چرکێت تەژی هەنە ماتو دێ چ لێ کەی کابرایێ هەژار رازی بوو هەندەك بەرێ کەوتن جارەکا دی وەزیری تەماع گوتێ: ئەی فەقیر ماتو دێ چ ل وان هندە زێرا دکەی بلا بارەك و نیو بۆ تەبی و ئەوێ دی بۆ من بی چونکە من زۆر پێویستیا پێ هەی بەلێ ماتو دێ چ لێ کەی تێراتە هەنە هەتا تویێ مایێ دیسا کابرایێ هەژار رازی بووە و هندەکی دی چونە پێش دیسا وەزیرگۆتی با بارەك تنێ بۆتە بیت و تێراتە هەیە هەتا هەتا دیسا کابرایێ هەژار رازی بووە. ئیدی وەزیر چووە ب ٦ بارو نیوێت خزێنی وەو کابراش ب نیوە بارێ گەنجێوە چووە مال کو کابرا گەیشتە مال

ژناوی لێ پرسی کا خزێنا تە تو بوچی دەست بەتال هاتیەوە کابراش ل سەری وە هەتا خارێ بۆ گێراوە گۆتێ: وزیری ئەوا دی هەمیا بری، ژنا کابرای زۆر تورە بۆوە گوتێ: هەرتازە دێ چی و بەشێ خۆ هەمی دێ ئینیەوە هەتا نەئینیەوە ناهێیەوە مال. کابراش هەستا جارەکا دی چووە دیوانا وەزیری و هەتا دیوان چول نەبووی نەهەستا وەزیرێ لێ پرسییەوە ئەرێ کابرا لۆ ناچیەوە وەختێ نوستنێیە، کابراش گۆتێ: وەزیرێ خۆش بیت ئەز چوومە مال ژنا من زۆر تورە بوو گوتە من دەبیا بچی بەشێ خۆ هەمێ بینینەوە ئینجا ئەزیێ هاتی و دا بەشێ من بدەیەوە. وەزیر زۆر تویرە بوو شیرێ خۆ دەرئینا سەرێ کابرایی هەژار بری و سەرێ وێ بردە ژیر زەمینێ ل بن تەختێ خۆدا جێ کر و دانا ناودا تەختێ خۆ داناو سەر....

رۆژ بورین ژنا کابرایێ هەژار یا ب حەمل بۆ وەختێ کاتێ وێ تەواو بووی خودێ کورەك دایە ناوێ وی دانا گەنج سالح ئەو کورە وەك هەر بچوکەکێ ئاسایی نەبوو زۆریێ ب هێز و خودان شان و تێگەشتی بوو. کۆ تەمەنێ کورێ گەیشتە حەفت هەشت سالا هەستا هەمی بچوکێ ئاوایی ل خۆ خرکرنەوە رۆژانەدا تەمرینا پێ کەت و دبەرامبەردا هەر یەکی برە پارەکی یان زێرەکی یا هەر تشتەکێ بێت دا دەنێ هەتا وەلێ هات هەمی بچوك بونە هۆگرێن وی هەتا کورێ وەزیر و پاشا ژی بونە لایەنگرێت وی رۆژ هات و رۆژ چون ئەول سەر وە کاری بەردەوام بوون ئەو سەردەم سەردەمی ئەسپ سواری و شەمشێر بازی و راو و نێچیر و هێز و توانایێ بوو، وکی وەزیر ما بەرێ خۆ دایێ ئەو بچوکانە هەمی ببونە هۆگرێت وی کوری پیت گۆ وە باوێ وی کوشتی بیرکرەوەو گۆت هێشتا نەبویە درەنگدا ئەز شولوکێ بکەم نەوەك ئەو کورە پاشێ بزانێت کو من بابی وی کوشتی و پاشێ تۆلا خۆ ل من بکەتەوە. هەستا چوە لای پاشایێ و گوتێ، با پاشایێ عەزیز نزاتە بەرێ خودایێ یانە گەنج سالحی هەمی بچوکێن مەیێ ل مەکری و هیچ ل وان پێ گۆهێ نادەنەوە هەل سپێدێ وە دێ چن و ئێوارێ درەنگ دێ هێنەوە. یەك ل مال نیە بەردانەکی ئاوێژی بۆ مە بینن یان خزمەتەکی بکەت یاباش ئەوە نەهێلین کۆ چێ دی ل مال بچنە دەرێ. پاشا گوتێ تو راست دبێژی پاشای بریاردا گوتە خولاما هەرن بێژنە دایك و بابێت هەمی بچوکا نەهێلن ل سبەی را یەك بچوکێ وان بچیت و بگەهێتە گەنج سالحی ئەوێ بچیت دێ سەرێ وی برین هەتا کورێ منیش بیت. بۆ سپیدەیا رۆژ پاشتر پاشا هەستاوە بەرێ خۆ دایێ کۆ کورێ وی یێ خۆ ئاکادە دکەت دا بچیتەوە

لایێ گەنج سالحی و تەمرینێت خۆ بکەنەوە، پاشای گوتێ کورێ من چ دکەی وەرە زێرەکی بدەتە ئەز دێ رۆژانە سەد زێر دەمەتە هەرچییەکی تە بوێت ئەز دێ دەمەتە ما ئەو مالێ من هەمی بۆتە نەبیت مادێ بۆ کێ بیت بەس تو نەچە و ل مال بە. کورێ پاشای گۆتێ یا بابێ خۆشەویست ئەو بریارەکە و من یادا ئەز دێ چم و من دوێت ئەز ب ئارەقا ناوچاوێت خۆ بژیم و ل سەر دەست و پێت خۆ بی ببمە کەسەکێ خودان شان. هندی پاشا هاتێ کورێ وی رازی نەبوو هەر چو. ئیدی پاشا چ ل دەستی نەهات وەکی بچوکێت وی دیت کورێ پاشای چو گەیشتە گەنج سالحی ئەو ژی هەمی هاتن و چونەوە سەر تەمرینێت خۆ هەمیان ل ژێر فەرمانێت گەنج سالحی دابوون هەر چیەکی گەنج سالحی کۆتبێ نەدگۆتن نە، ئەو بچوکانە ل سەر تەمرینێت خۆ بەردەوام بوون هەتا گەیشتنە تەمەنی گەنجیێ و هەریەك ل وان وەك پەهلەوانەکی لێ هاتبوو هەمی ژی ل ژێر فەرمانێن گەنج سالحی دابوون رۆژەکێ ل رۆژان پاشا خەونەك دیبوو هەمی خەلك ب وەزیر و خولام و خەلکێ ئاوایی مەزن و ریش سپییەوە خربوونەوە و گۆتی ئەی خەلکینە من خەونەکا دیتی و من دوێت بۆ من بێژن من چ خەونەکە دیتی و تەعبیرا وێ ژێ چییە؟ هندی خەلك هاتن و چون کەسێ نزانی پاشای چ خەونە دیتی. یەکێ ل وان کەسێت ئێرێ گۆتی یا پاشایێ خۆش بیت گەنج سالح ئەزانێت ئەواکە کەسەکێ دی نزانیت کاتە چ خەونە دیتی پاشای ئەمر کردە دوو خولامان گۆتی هەرن زووی بۆ من گەنج سالحی بینە ئێرە ئەو دوو خولام چوون ل سەر رێکێ گەیشتنە دوو حەرەسێت گەنج سالحی گوتنێ ئەرێ گەنج سالح لێرەیە بلا زووی بێت دا بچین پاشای شولا پێ، ئەو دوو حەرەسی چونە لایێ گەنج سالحی و گوتنێ کۆ پاشای شولا ب تەهەی گەنج سالحی گۆتێ هەرن تێرا ل وان خولامان بدەن ب هێرنەوە لای پاشای هەمی ئەو کەسێت ژێر فەرمانێ وی داچوون تێر ل دان دوو خولاما دان و گێرانەوە بۆ لای پاشای پاشای گۆتێ ئەوە چییە بۆ گەنج سالح هەنگو نەئینا ئەو کەسێ لوێرێ گوتێ یا پاشایێ خۆش بیت خۆ گەنج سالح کەسەکێ نییە تۆ وە تۆ بهێنریە دواوئەویش پێت دەبیا ب رێز و حورمەتەکا زۆر وە بهێنریە دوودا دا بێتن پاشای ژی دوو خولامێت دی هنارتنە بدوودا ب شێوازەکی زۆر بریزەوە کۆ گەنج سالح هاتە دوان پاشای پاشای ریزەکا زۆر لێ گۆت و هەمی هەرەسێت ژی دەورە لە دیوانێ دابوو داوەکو هیچ کەسەك زیانێ نەگەهینیتە گەنج سالحی پاشای گۆتێ من بێ هنار تیە دوو تەدا دا بێژیە من کامن شوێ دی چ خەونەکە دیتی و تەعبیرا وێ ژی بۆ من بێژی گەنج سالح ماو بەرێ خۆدا پاشای

گۆتی پاشایێ خۆش بیت شویێ دی تە ل خەوێدا دیتی حەوزەکا ئاویێ کو ماسیەکێ تێدا سەرێ خۆیی ئێینانە دەرێ یا بۆ خۆ ب تەکەش پاشای گۆتێ تە راست گۆت من ئەو خەونا دیتی بەلێ تەعبیر وێ چییە؟ گۆتێ تەعبیرا وێ ئەوەیە کو ژنا تە ل تەیا خائینە و رۆژا کوتە دگەل ئینا وێ دوو کافرێن دگەل خۆ ئینای و هەمی رۆژێ چینەك وان دوو کافر خیانەتێ ل تە دکەت ئەگەر باوەرناکەی هەستە دا بچین نیشانتە بدەم. پاشا دگەل گەنج سالحی چوو ل ناو قەسرێ دا ژێر زەمینەك هەبوو ئەو دوو کافر ل وێ ژێر زەمینێدا بوون کو پاشای ئەو دوو کافرە دیتن بریاردا سەرێ هەردوو کافر و ژنا خۆژی ببریت. گەنج سالح گۆتێ پاشایێ خۆش بیت، نە بەئەز دێ بۆتە ژنەکا زۆر باشدێ بینمەوە. بەس تو چەك و شەمشێر و ئەسپ بدە من و لەشکرێ من ئەز دێ چم بۆتە ژنەکا باش ببینمەوە. پاشای ژی هەرچیەکی وی خاستی دایت گەنج سالح ب لەشکرێ خوە رێك کەوتن چوون ماوەکی زۆر ل سەرچوون خۆ بەردەوام بوو هەتا ل دوورەوە هەندەك خیوەت کا دیتن وەکی لێ پرسین بۆ وان دەرکەوت کو لەشکرێ (قەرالێ کوفری)یە.

گەنج سالح جواب بۆ وان هەنارد ئەگەر هەتا سبەی نەبنە موسلمان ئەوا دێ هێرشێ دکەتە سەروان و لەشکرێ وان. قەرالی کوفری جابی وی داوە گۆتێ ئەم ب هیچ شێوەیەکی نابینە مسولمان سپێدێ زووی گەنج سالح ب لەشکرێ خۆوە هێرش کردە سەر لەشکرێ قەرالێ کوفری و هەمی ل ناو برن قەرالی کوفری ژنەکا زۆر جوان و کچەکا زۆر جوان هەبوون ئەو ژن و کچ مسولمان بوون و گەنج سالحی ل گەل خودا ئینانەوە بۆ ولاتێ خۆ. گۆتە پاشایێ پاشایێ خۆش بیت ئەوە ژنەکا زۆر باش بۆتە ئینا ئەز بێژم ل وێ دونیایەدا کەس ل وێ باشتر نییە. پاشای گوتێ هەتا گەنج سالح ژنێ نەئینینت ئەز ژنێ نائینم گەنج سالح گۆتێ یا پاشا تو وەنەبێژە من هێشتا زۆر شول یێت مای کو ئەز بکەم پاشا دێ بێژی تە چ شول هەنە بۆ من بێژە ئەو دێ بێژی تێ یا پاشا من دوێت بێژم بەلێ ئەز حەز دکەم بئامادەبونا هەمی ئەوانە ئەز بێژم و هەتا باسێ من تەواویش نەبیت کەس ل دیوانێ نەچیتە دەر ئینجا ئەگەر یەکی شولەك هەیە با نوکە بچیت شولا خۆ بکەت هەر کەسی شولەك هەی چو شولا خۆ کرو هەتا هەمی ب یەکجاری ئامادەبوون ددیوانێ داو پاشای دەر گرتن و گوت نابێت کەس لێرە بچیتە دەرێ گەنج سالحی دەستی پێ کر ب گێرانەوە و گوت چەند سال پێش نوکە کابرایەکێ فەقیر هەبوو شولا وی دار کوکردنەوە فروتنا دارا بووە کو وەزیری زانی دێ بەحسێ بابێ خۆ دکەت وەزیر تەنگاو بوو دەست کردە کوخە کوخێ و گۆتە پاشای ئیجازەم هەیە بچمە دەرێ

پاشای گوتیێ نەخێر بۆچی هەتازە تە نەدگوت هەتا گەنج سالح هەمی ئاخوینیت خۆ تەواو نەکەت کەس لێرە ناچیتە دەرێ. گۆتە گەنج سالحی بەردەوام بە گەنج سالحیش سەرتاپای ب سەرهاتا بابێ خۆ گێراوەو گۆتی کو وەزیرێبابێ منێ کوشتی ئەگەر باوەریش ناکەن هەر یەك بەرێ خو بدەن بن تەختێ وەزیرێ ئێسکێت بابی من پێت لێرێ وەزیری گوت یاپاشا تۆ بۆ چ گوهێ خۆ دەدەیە وی کورەی هیچ وەتو نییە ئەو درودکەت و پێویست ناکەت بەرێ خۆ بدەنە بن تەختێ من من ئاگە لە خۆ نیە چ دبێژیت، پاشای گۆتیێ تۆ بۆچی خۆ تەنگاو دکەیما دێ بچین بەرێ خۆ دەینێ ئەگەر ئێسك ل وێرێ بون ئەوە گەنج سالح راست دبێژیت ئەگەریش لوێرێ نەبوون ئەوە راست نابێژیت.

پاشا و ئەو هەمی چوون بەرێ خۆ ب دەنە بن تەختێ وەزیر کو ئێسکێت بابی گەنج سالجی ل وێرێ دیتن پاشای زانی کو راست دبێژیت و سەرێ وەزیریش بری و تولا بابێ گەنج سالحی لێ کرەوە ئیدی دەس کرە ئاهەنگ و دەواتێ هەتا حەفت شەو حەفت رۆژا پاشای گوت پشتی مرنا منیش دەبیا گەنج سالح ببێتە جێگرێ من.

- لەم حیکایەتەدا زۆر مەبەست هەیە و هەریەکەی بۆخۆی گرنگە، چاوبرسیەتی وەزیر و سادەیی دارکەر و عاقڵی و پاڵەوانیەتی گەنج ساڵح و ڕاهێنانی کوڕە پاشا و کوڕە وەزیر. لەوەش گرنگتر کوڕە پاشا دەڵێ: من دەمەوێ بە نانی دەستی خۆم بژیم و لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم، دواجار گەنج ساڵح وەك کیژە پاشای لە دیوەخانی دەرگای دادەخا و چیرۆکی تاڵی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە و لێرەش تاوانبار دەگاتە سزای خۆی. کە ئەم بە سزا گەیشتنەی خراپەکاران لە حیکایەتان. بەردەوام دڵگەشی بەرچاو ڕوونی هیوایەك دەداتە گوێگر و خوێنەر، کە لە ڕاستیشدا ئەمەش ئەرکی (ئەدەبە) دیارە فۆلکلۆر بەگشتی و حەکایەت و ئەفسانەش هەر ئەدەبە، ئەدەبی خەڵك.

# مەلای مەشهور

**کۆکردنەوەی: خەرمان مەغدید یوسف**

**گێڕانەوەی: بەهیە خالد ئیسماعیل**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠ نەخوێندەوارە**

هــەبوو نــەبوو کــەس لــە خــوای گــەورەتر نــەبوو. بەرەبەیانــە و مــەلای مەشــوری گوتــە ژنــیٚ خــۆ، حــورمیٚ ئــەوڕۆ ئەچــمە داران بــارە دارەکیەکــەم. هەســتا بــەخۆ بەکــەریٚ چووە داران. کەرەکــەی لــە چیای لــە کــن خــۆ بەســتەوە و بــە خــۆش چــۆوە ســەداریٚ. دارەکــی گــەورە لەســــەر ئــەویٚ داریٚ بــوو ئەشــی بــڕی بــەخۆش لەســــەر داری بــوو. ڕێبــوارەك بەوێــدا تێپــەڕی چــاوی وە کــابرای دار بــڕ کــەت و ســەری لــیٚ ســوڕما بــوو (مــەلای مەشــوری) گــۆتی: ئــەریٚ کاکــە ئــەتو ئــەو دارەی بــبڕی بەرنابیــەوە؟ مــەلای مەشور: لۆ بەرەبمەوە؟!

کــابرای ڕێبــوار وازی لــیٚ هینــا و ڕۆیشــت. مــەلای مەشــور بــبڕی کــردەوە هــەر داریشــی ئــەبڕی گــۆتی: مــادام کــابرا ئــەزانی ئــەمن بەرەبمــەوە ئەگــەر ئــەو دارەی بــبڕم دیــارە ئــەزانی عــومری مــن چــەندی مایــە! هاتــە خــواریٚ و بــەغار کەتــە دو کــابرای ڕێبــوار، هــۆ کــابرا هــۆ کاکــە بــە هــاوار هــاوار گەیشــتە کــابرای ڕێبــوار دوور و نیزیــك بــە بانگــە بــانگ... هتد.

کــابرای ڕێبــوار: ئــەریٚ ئــەو شــێتە چــاریٚ بــریٚ ئــەمن چــیش بەســەردابو نــا عــیلاج ڕاوەســتا، مــەلای مەشــور دیٚ و دەریٚ: مــادەم ئــەتو ئــەزانی ئــەمن ئــەو دارەی ببڕمــەوە بەرەبمــەوە دیــارە ئــەزانی عــومریٚ منــیش چــەند مایــە، کــابرای ڕێبــوار ئــەمن چســوانم عــومری تــو چــەند مایــە (دوور لــە ڕووی هــەموان) عــومری تــو دوو تــڕ و نیــوی کــەریٚ مایــە. لــە کــۆرە خــۆی کــردەوە. مــەلای مەشهور ئــەو قســەی کــەت مێشــکی و لــە کــابرای گــەڕا. کــابرا بــە ڕێــی خــۆدا گــەڕاوە مــەلای مەشــوریش بــە هەناســە ســاردی ئــای هــەی: عومری من هەر ئۆندە مایە لەسەر دنیایی.

مــەلا مەشــور گــەڕاوە دوو کــەریٚ لــە دار کردنــیٚ گــەڕا ســواری کــەریٚ بــی پــاش ماوەیــەکی گــۆتی بــەخوای ئــەوا عــومری منــیش ڕۆیــی ئــای هــەی. نــاوە نــاوە ئــەو قســەی دووبــارە کــردەوە. هــەتا بەینــەکی وەلاٚ مــەلا مەشــور لەســــەر کــەریٚ هاتــە خــواریٚ و لەســــەر ڕێــی خــۆی لەگــەزداو لــەویٚ درێــژ بــوو لەســەر ڕیٚ. نــە زنــدی و نــە مــردی خــۆی بــە عــاردی دادا

بوو ئێواره داهات مەلا خۆی نەبزافت (نەجولاند) شەو داهات و تاریك بوو دنیا لەو چیایەی بەتاقی تەنێ کەریش لە دیار ڕاوەستایە گورگ هاتن دە کەرێ بەربوون خواردیان. لەپێش چاوی مەلای مەشورێ. مەلاش ناوە ناوە ئەی گۆت: ئەگەر چاوێ مەلای لەسەر دنیایێ مابانە کەر نا خوارد قەیدیناکە. مەلاژنیش لە ماڕێ مشاوەش هەر ئەهاتە دەرێ و ئەچۆوە ژۆرێ نیوڕان داهات مەلا هەر نەهاتەوە. هێوارە داهات مەلا هەر نەهاتەوە هەر چاوەڕێ بوو. ناعیلاج و ناچارە. چوو ماڕێ جیرانان و لێی پرسین ئەرێ مەلاو نەدیتیە لەوەتی سبەینێ چوویتە داران نەگەڕاپتەوە؟ قەومی گوندی سەریان سوڕما بوو ئەرێ مەلاژن لۆ زوت وەناگۆ ئەلعان ئەمە کێندەری لە دوو مەلا بگەڕێین بەو تاریك و سەلاتەی هەی مارت بەقوڕێ نەگیرێ دە بە ڕووناکیت وەگۆتبا تازە وارێی!

وەڵا ناعیلاج وەجبە پیاوەك خڕ بوونەوە خۆیان قایش پێچ کرد و بە هەسپێ خۆیان حازر کرد وەجبە پیاوەکی گورج و تونەد وە چیای کەتن لۆ دوو مەلای مەشوری پێشی بگەنە چیای ئەشتەکا لەسەر ڕێی کەتیە ڕەشاییەکە هەتا نێزیك ئەبنەوە وەکی لێنۆڕن مەلا لەوێ کەتیە گۆڕێ و کەریش گورگانا خواردیە کەلاکی لەوێ کەتیە. وەڵا مەلایان هیناوە مارێبە عاجزی گەڕانەوە ئۆوەیش مەلا مردیە مەلاژن ئەتوش گەردەنی ئازادکە مەلایان لەناو بەتانییەکی وەرپێچا کفن و دفنی لۆ مەلای حازر کەن قەومی گوندی یارمەتی ماڕێ مەلایان دا ژن هەرکەسە و لە ماڕێ خۆ قاپە شیوی لەگەر خۆ دینن دەمەکێ دانیشتن هەتا هەموو خڕینەوە مەلا مەشوری کچەکی گچکەی هەبوو تێی وەڕامایە. مەلاش نەمردیە لەبرسانیشا مری نە نانی نیوەڕۆیی نە نانی هێوارێی نەخواردیە. قاپی شیویش لەوێ بوون. مەلاش بەتانی لەسەرخۆ لادەبا و پڕداتە ئاپراغەکی ئەچیتەوە بن بەتانیێ کچیشی چاوی لێیە دوایێ دیسان یەکی دی ئەبا و لەبن بەتانێ ئەخوا سێباراکاتەوە کچەکەشی وارێتە داکێ خۆ ئۆدە! ئۆدە: باوی من ئۆ سێ ئاپراغان بخوا!! وارێ وس بە کچێ باوتا مردیە قەومیش وارێن ئۆوەش چ نزانی چە غەریبە ڕۆرە تازە باوتا مردیە. لەو قسانەدا بون لۆ مەلا سەری هینا دەرێ گۆتی: هەی لەبرسان بمرن لە سێ ئاپراغان زێترم نەخواردیە هەر ئەو دەمایێ مەلا خۆ ئەمرینتەوە وەکی جاران نە هەست و نە خوست نە زندی نە مردی!!. ئەو شەوی هەتا بەیان بەرە بەری بەیانی لە دیار مەلای بوون هەتا دنیا ڕووناك داهات گۆتیانە مەلاژنێ ئەرێ مەلاژن ئەمە چ بکەین وەیشێرین نەیشارینەوە ئەتو چارێی ئەمە ڕاوەستاینە. مەلاژن: وەڵا چ برێم ئەنگۆ بە خێرا خۆ وەی شێرن و کولاوکەکێ (دەلاقە) بەقەدەر سەری مەلای دەقەبری

بێرنــەوە. مــەلاش نەمردیــە ە بــەرای لــێ نییــە بەحســابی خــۆی عــومری تــەواو بــووە و مردیــە بەقســـەی کــابرای ڕێبــوار. قەومەکــەش بــە ناچــاری و نــاعیلاجی چــوون شاردیانەوە بەقسێ مەلاژنێ کولاوەیان دەقەبری دا هێشتەوە و گەڕانەوە ماریێ.

شــەو داهــات مــەلاش ســەری لــە کــولاوەکێ هینــابۆوە دەریێ بــەس ســەری داتــەدەریێ و قالبیشــی لــەناو قەبریــدا مــابوو. کــاروانێ (قــەهار و نــەهار) تێپــەڕن بەوێــدا قــەهار و نــەهاریێ کۆییــان ئەڕەونــەوە و مــەلای دەردێــنن لــە قــەبری و هەنــدیێ پێــدادەن هــەتا ئەپســێن مــەلاش هــەرەدەن و دەرێــن: ئــەتو دزی و ڕێگــری بــە تــەمای چ بــووی ئەمەتــە ترساند هەندی کەرەکیان مەلا دابەریێ و بەجێیان هێشت.

مــەلاش بــە حــاری ســەی ئەگەڕێتــەوە مــاریێ و هــەموو قالبیــان شــکاندییە بــە ســەد دەردە ســەری هــەتا ئەگاتــەوە مــاریێ و دەرکــیێ ئەداتــە بــەریێ. مــەلاژن! مــەلاژن! دەرکــێم لــیێ وەکــە. مــەلاژن بــە تــرس و لــەرزەوە ئــەتو کێــی؟ ئــەدی نــەمردی مــەلا مەشــور کچــیێ حــورمیێ دەرکێملــیێ وەکــە! مــەلاژن بــە ناچــاری دەرکــەی کاتــەوە مــەلا مەشــورا لــە پشــت دەرکــیێ کــەتی چــرینگ چــرینگ ئالــەرزی و جێیــەکی ســاغی نەمایــە بــەخۆ و بــە جلکــی ســپی هــەموو قــالبی یــادەخوێنیێ وەرچــووە هــەموو قــالبی تــۆز و خــۆر و خوینــە. مــەلاژن دەســـت پرســـیارانەکاو دەریێ: ئـــەریێ مـــەلا ئـــەتو نـــەمردبووی کـــو هاتیـــەوە؟! مـــەلا مەشــور دەریێ: هــەر لــێم گــەڕیێ حــورمیێ (قــەهار و نــەهاریێ) کۆییــان ئــەمنیان هینایــە دەریێ و تێریــان لێــدام مــەلاژنیش هەنــدەك کەونــە جلکــان ئەبینیتــەوە لــە مــاریێ مــەلا جلکــیێ ســپی فــرادا (کفــن) ڕۆژ دادیێ قســە بــراو ئەبێتــەوە لــە گونــدی مــەلا لــە بــنی دنیــاییێ هاتیتــەوە بــا ســەردانی مــەلا بکــەین چــی لــە بــن دنیــاییێ دیتیــەوە چــی دیتیــە و چ چــاکە و چ خراپــە ئــەزانی. بــا بچــینە ســەردانی مــەلای هەنــدەك پیــاویێ ڕدێــن ســپی خڕەبنــەوە ئەچــنە مــاریێ مــەلای پــاش بــەخێرهێنانی مــەلای. دەرێــن مــەلا: لــە بــنی دنیــاییێ چ باســە چت دیتیە و چی چاکە و چی خراپە با ئەمەش بزانین؟!

مــەلا مەشــور دەریێ: ئــەمن چــم لــە بــنی دنیــاییێ نەدیتیــە بــەران ئــەوەی کولاوکــەی لــە قــەبری لــۆ بێرنــەوە قــەهار و نــەهاریێ کۆییــان دەری دیــنن و هەنــدەی لێــدەدن ئەگــەر ســەری هینایــە دەریێ و ڕەواندنیــەوە ئەگەڕێنــەوە هــەتا ئەپســێن ئەیدەنــە بــەریێ. دەنــا چ لــە بــنی دنیــاییێ نییــە. ئیــدی مــەلا مەشــور دوو ســیێ ڕۆژان لــە مــاریێ ئەکــەوی هــەر هـــاوار و نـــارەی دیێ هەنـــدیان پێدادایـــە (قـــەهار و نـــەهاران) هـــەتا بەچـــاکی دێتـــەوە ســەرەخۆ قیتەبیتــەوە لــەبن جێــی چــاتر دەبــی و دەرێتــە مــەلاژنێ: مــەلاژن ئــەمن ئــەوڕۆ ئاچــمە چــیاییێ تــۆریێ لــە گورگــان ئەســتینمەوە کــەریان لــیێ خــواردم مــەلاژنیش: کــوڕە

مەلا عەیبە تۆرەی لە گورگان ئەستینیەوە چ لە گورگانەکەی پێیان ناوێری، لۆ خۆ شێتەکەی لە گورگان گەڕێ. قەومت دێتە کنێ و سەردانیتەکەن ئەتوا لەبنی دنیایێ هاتیەوە! مەلامەشور: ئەتو چسوانی مەلاژن ئەمنا چم بەقسێ مەلاژنێ ناکا. مەلا ئەچیتە ئەو جێیەی گورگان کەر لێ خواردبوو خۆ لەبن تەراشەکی ئەشاریتەوە چاوەڕوانی گورگیا ئەکا! وەڵڵا هەندەك قەل و دارەش دێن دەکەلاکی کەرێ وەردێن مەلاش ناکاتە نامەردی و ڕووە بیتە (پڕ دەداتە) قەلەکی و لە باغەرێ خۆ ئەنێ وارێ: ئەو هەولێ کەم خۆ تۆرەم لە گورگان ستاندەوە خۆ بەشای نادا ئەگەڕێتەوە مارێ. وارێ مەلاژن خۆ تۆرەم لە گورگان ستاندەوە. هەروەتگۆ مەچوو مەچوو. مەلاژن چت کردی؟ مەلا کۆ تۆرە لە گورگانە ستیندرێتەوە مەلا مەشور قەلێ لە باغەرێ دێنیتە دەرێ ئۆتە تۆرەما لێستاندینە لۆ بڕوا ناکەی مەلاژنز مەلاژن: کوڕە مەلا ئەوە قەلە بەریدە گوناحە قەلت لۆ چییە. مەلا مەشور: ئەتو سوانی مەلاژن ئەمنە زانم چاکەم. ئەوێ شەوێ لە خۆشیان مەلا خەوی نەچۆوە چاوان ڕۆژدادێ مەلا مەشور دەرێ: مەلاژن ئەمنا چمە شاری (بازار) ئەورۆ نایێمەوە ئەچم ئەوەی بە کەرەکییەدەم مەلاژن: کوڕە مەلا ئەو قەلەی بەهەر دەخەرەکی قەل لۆچییە مەلا مەشور: ئەتو سوانی مەلاژن. هەرچی گۆتە من وەرەوە مارێ من میوانی من بە ناچمەوە مارێ و هەرچی خۆی تێنەگەیاندم ئەچمە مارێ ئەو کەسی.

مەلای مەشهور چۆوە شاری و قەلیشیا لەناو باغەریدایە هەرچی نەیناسی وەیگۆتە مەلای مەشوری وەرە هێوارێ میوانی من بە با بچینەوە مارێ مەلای مەشور: بەزاید بیز پیاوەکەیش بن دیوار و بن دیوار ئەڕۆیی و خۆی لە مەلای نەگەیاند. ئیدی مەلای مەشور وەدو ئەو کابرایەکەت و کابراش ئاوری لە مەلای نەداوە لە دەرکەی مارێ خۆیدا و مەلا لە دوو کابرای چۆوە ژۆرێ و سەلام و عەلەیك کابراش لە شەرمان جوابی مەلای داوە و چوونە ژۆرێ ژنێ مەلاش خۆی تێ نەگەیاندن. کابرا ها حورمێ: چت لێنایە بابیخۆین ژنیش: ئەو کابرایەت لۆ چ دایتە دوو خۆ؟ کابرا: ئەمن هایم لێ نەبووە لە بازاڕی ڕا وەدو من کەتیە.

ئەوەی خوا داینابی لۆ مەلای مەشوری میوان دینی. مەلای مەشور کە خواردنەکەی تەواو کرد بەخۆ کابرا تێر نەبوون. دەستی لۆ باغەرێ برد قەلی ڕاکوشی قەلیش لە تاوان ئەقیرژینی. کابرا: مامۆستا ئەوە چییە و چارێ؟! مەلا مەشور: کاکە ئەوە دەرێ قاپە برنجەکا لێراهێ لەبن تەشتێ دایە. ژنیش گۆتی: ئۆوەی ئەوە ئی دونێ

نیوڕانێ بوو لەبیرم چو گەرم کەمەوە. لۆی گەرم کردنەوە و خواردیان. ئەوجارەش هەتا تاقەتی هەبوو قەلی ڕاکوشی، کابرا: مەلا ئەوە چارێ؟ مەلا مەشور دەرێ: قاپە کولیچەکا لێراهێ هەیە لەکن ئەو دەلاقە. ژنەش گۆتی لەبیرم چوو و گەرم کەمەوە ئەوە ئی پێرێ هێوارێ بوو کابراش ئەو خواردنانەی تام نەکردیە ئی دونێ و ئی پێرێ. تێریان خوارد و نوستن هەتا سبەینێ. لۆ نانی سبەینێش مەلا مەشور دووبارە قەلی ڕاکوشی قاپە ماستەك لێرا هێیە. کابراش بەخێرا مەلا تێری خوارد و مەلا مەشوریش وەختی ڕۆیشتنێ بوو کابرا دەرێ: ئەرێ مامەستا ئەو قیژە قیژەی بە چەندیە فرۆشی؟ مەلا مەشور: ئەوەی بە کەرەك دەدەم. ژنی کابرای دەست بە هەراو هۆریا کرد ئەمە ئەوەمان لۆ چییە کابرای گوێی نەدایە ژنێ. کەرەکی هەبوو لۆ مەلا مەشوری هینا و مەلا مەشوریش قەلی دایە کابرای و پێك هاتن. مەلای کەر برد و ڕۆیی لە ماری کابرای بۆوە شەڕیان پیرەژنەکیش ماستیە فرۆشی و ئەچی لێکیان کاتەوە سەیەکیش هەر کەلانگوچکی پیرەژنێ ئەلێستەوە بە ئاوی ماستی بووە، پیاو و ژن دێن و لێکیان کەنەوە کەس بەکەس نییە کەس لێك نابیتەوە. کابر هەر قەلی ڕاکوشی ئەقیژێنی و هیچ تێناگا ناچارەدو مەلای مەشوری ئەکەوی. مەلای مەشوریش ئەچی هەندەك گوێ و کلکی کەرێ ئەبڕی و با کابرا پشیمان نەبیتەوە. کابار هەر وەدوی مەلا مەشوری ئەکەوی و هۆ مامۆستا هۆ مامەستا مەلا مەشور چیشت بە منە کەرێم لێ ستێنیەوە پشیمان بوویەوە کابرا دەرێ کەرێت لێ ناستێنمەوە بەران لە مارێ مە بوویتە شەڕ کویان لێك وەکەم. مەلا مەشور دەرێ دارەکی هەرگرە و یەکی دارەکی هەمان دەلمێکەینەوە و ئەڕۆن و ژنیشت ئەمینیتەوە و لەگەرت چاکەبی. کابرا قسەی مەلای بەجێ دینی و هەموو ئەڕۆن ژنیش ئاقرەبی و لەگەری باشەبی. مەلادێتەوە مارێ وارێتە ژنێ حورمێ ئۆتە بە کەرەکم دا مەلاژنیش: ئەدی لۆ کلك و گوێی بڕاینە مەلا مەشور ئەوە ئیشی منە ئەتو توسوانی. مەلا مەشور هەتا حەفتیەکی کاو جۆی ئەداتە کەرێ کەرە چاك ئەبیتەوە لەجاران باشترەبی. خەرجەستێن داتنە ئەو گوندەی و ئەوێندەریان تاران ئەکرد بە گەنم و بە جۆ بە حەیوان هەموو شتیان بە زوڵم لە قەومی ئەو گوندەیە ستاند سارێ دوو جار سێ جار ئەهاتن پارەبا توتن با گەنم...هتد. قەوم مشاوەش بوو ئەی ئەو خەرجەستێنە هاتەوە مەلاش گۆتی ئەنگۆ هەڕوونەوە مارێ دەرکان گاردەن هاق و نەبی تەنەکە کایەك و جۆی لۆ کەرێ بینن چیش و بەسەردا نەبی هەڕوونەوە ژوورێ قەومیش بەقسەی مەلای چوونەوە ژوورێ. مەلاش کەر بەڕلا کرد و تێی بەردان و هەمووی ڕاونان ئێکی بەساغی نەهێشت هەمووی لە سواران

هێخست کەتبۆ دویان. خەرجەستێن ناچار گەڕانەوە کن پاشای بە شەلە شەل پاشا وەکی چاوی وێکەتن هەندەی دی تورە بوو ئەنگۆ ترسنۆکن چو پێناکرێ. سبەینێ وەجبەکی کانێرم. سبەینە داهات پاشای ناردن. قەومێ گوندی هەمووە لەرزین ها مەلا ئەو هەت پێخۆش بی ئەوجارە ئەمەشە کوژن مەلا گۆتی ئەنگۆ هەروونەوە ژۆرێ هاق و نەبی. مەلا دووبارە کەری تێبەردانەوە ئەوجارە لە جاران خەراتر کەر بە چ باران لە کۆریان نابۆوە هەمووی تێهەردان هەمووی کوتان ئەوانیش بە چ جارە جارە گەیشتنەوە کن پاشای پاشام خۆش بی ئەوانە درۆیان نەکرد بوو وازی لێنانیناین لە دون نابۆوە. پاشا هەندەی دی سۆر بۆوە و تورە بوو وەیگۆ ئەمن سبەینێ بەخۆ چم ترسنۆکینە. سبەینێ پاشا بەخۆ و بە لەشکرەکی دی چۆوە سەر ئەو گوندەی قەومیش هەموو وەخت بوو بپسێن لە ترسی پاشایێ ئەی مەلا مارێ ئەمەت کو کۆرکردەوە مارێ خۆشت کۆرکردەوە پاشا ئەوجارە بەخۆ هاتیە خۆ هەمانن ئەکوژن مەلا مەشور تێری گەنم و جۆ دابۆوە کەرێ دیسان وەیگۆ هەروونەوە ژۆرێ و هاق و نەبی. کەرێ لە وێ بەڕلاّ کرد کەریش پێش وەخت بە پاشای وەنووسا بە چ باران لە پاشای نەبۆوە هەندەی بە شەرە پێنان تێهەردا و ئەو جارە هەمووی کوتان هەتا ئەو گوندەی پاشای وەدوی کەتن. پاشا نەخۆش بوو هەتا ماوەکی باش کەتە بن جێی جارەکی دیش نەوێرا باسی ئەو گوندەی بکا و خەرجی بستێنی لەسەر ئەو گوندەی هەر گرت قەومێ گوندی بە کا و جۆ و باراشە گەنم و هەموو ئەشیای مارێ لۆ مارێ مەلا مەشوری برد و مەلا مەشور بۆوە مەلای ئاوایی و دەورەمەند بوون و ناویان لە کەرێ نا نەڕنە شێر کەر بووە نەڕ شێر.

٭

= حەکایەتی کەمم لەبارەی مەلای مەشهور نەخوێندوەتەوە، بەلاّم، ئەمە یەکمجارە کە ئەم جۆرە حەکایەتە دەخوێنمەوە و (مەلای مەشهور)یش پاڵەوانیەتی. ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەم حەکایەتە تێکهەڵکێشراوی چەند حەکایەتێکە، کە یەکەمیان حەکایەتی مەلا خۆیەتی. بەلاّم، ئەوانی تر حەکایەتی ترن و لێکدراون، ئەمەش لە فۆلکلۆردا ئاساییە، کە هەر حەکایەتێك زۆر دەق و گێڕانەوەی هەیە و زۆرجاریش پاڵەوان دەگۆڕێن و کەسانی ناسراو دەبن بە پاڵەوان، بەلاّم، دەبێ کە ناسراوەکە لەگەڵ جۆری حەکایەتەکە بگونجێ، ئەوەی مەلای مەشهور پێی ناسراوە، حیکمەت و پەندە بەشێوەی گاڵتە و جەفەنگ، واتا بەشێوەی کۆمیدی.

# ئەتۆ نا مزگەفت

**کۆکردنەوەی: فریـــاد زیـــاد**

**دارا خلیل حامد**

بەسـەرهاتێکی کۆنـە ئـەو بەسـەرهاتە لـە زەمـانی خۆیـدا هـەبووە دەگێڕنـەوە فەقێیـەك لـە شـار بـەرەو گونـدێك دەکەوێتـە ڕێ بـۆ خوێنـدن لـە مزگـەفتی ئـەو گونـدە لـە ڕێگـادا دەگاتـە پیـاوێکی پـیری ئـەو گونـدە لەگـەڵ ئـەو پیـاوە پـیرە بـەڕێ دەکـەوێت بـۆ ئـەو گونـدە. لـەڕێگادا لـە شـار دوور دەکەونـەوە دەکەونـە ئاقـارێکی گـەورە لـەو ئاقـارەدا پارچە دەغلێکی باش دەبینین؟

پیاوە پیرەکە دەڵێ: ئەو دەغرە دەغلێکی باشە یارەبی بەقسمەتی ساحێبی بێ.

فەقێیەکەش دەڵێ : مامە گیان ئەگەر بەشینی نەخورا بێ.

پیـاوە پیرەکـەش دەڵـێ : نانـا بەشـینی نەخورایـە لـەوێ ڕەت دەبـن دەگەنـە ڕووبـارێکی گەورە !

پیاوە پیرەکەش گوتی: ئەوجا کو لەو ڕووبارە گەورەیە دەپەڕینەوە؟

فەقێیەکەش گوتی : مامە گیان وەرە با پردێك دروست بکەین.

پیاوە پیرەکەش گوتی: لەو دەمەی کو پرد دروست دەکرێت کوڕم ؟

فەقێیەکەش گوتی : مامە گیان ئەگەر پردێکی نەکەین نیوەی پردێك بکەین.

وەڵڵا لەوێش ڕەت دەبن دەگەنە چیایەکی گەورە و بەرز.

پیاوە پیرەکە گوتی : ئەوە کو بەسەر ئەو چیایە ڕکەی کەوین کوڕم؟

فەقێیەکەش گوتی : مامەگیان بەسەر دەکەوین بەیارمەتی خودای گەورە.

پیاوە پیرەکەش گوتی : بالێرە دانیشین ئیسراحەتێك دەکەین ئینجا دەڕۆین.

فەقێیەکـەش گـوتی : ئێمـە دوو کەسـین هـەتا نەبینـە چـوار کـەس نـاڕۆین لـە چـیایەکەی دێنـە خـوارەوە، لـە خـوار چـیایەکە گونـدێکی بچـکۆلانە هـەبوو ئـەوجا پـێش بگەنـە ئـەو گوندەی دەبینن مەیتێك دەشارنەوە خەڵکی ئەو گوندە.

پیاوە پیرەکەش گوتی: کوڕم ئەوا ئەو مەیتەی دەشارنەوە، کە مردیە؟

فەقێیەکەش گوتی: ئینشائەڵڵا نەمردیە.

لەمەیتەکە ڕەت دەبن و دەگەنە گوندەکەی خۆیان.

پیاوە پیرەکە گوتی: کوڕم ئەتو میوانی کێی؟
فەقێیەکەش گوتی : وەڵڵا ئەتو نا مزگەفت؟
پیـاوە پیرەکـە دەچـێتەوە مـاڵی خۆیـان و فەقییەکـەش دەچـێتە مزگـەفتی ئـەو گونـدە بۆ خوێندن.
پیاوە پیرەکە کچێکی جاحێل و جوان و ئاقڵی هەبوو.
کچەکە بە باوکی دەڵێت بابە ئەو کوڕە جاحیڵە کێ بوو لەگەڵتدا بوو؟
بـاوکی کیژەکـەش گـوتی: کیـژم کـوڕێکی زۆر لەسـەرخۆ نـەبوو کـوڕێکی بـێ ئـەقڵ بـوو هاتووە بۆ لای مەلا لە حوجرە بخوێنێت.
کیژەکـە بـەباوکی دەڵێـت بابـە ئـەمن ئێسـتا نـانی بـۆ دەنێـرم هـەڕوو پێـی بڵـێ نـانی نەخوات.
کیژەکە چوو (سی) نان و (دووازدە) هێلکەی بۆ دادەنیت.
براکـەی بـانگ دەکـات پێـی دەڵـێ ئـەو نانـەی بـۆ ئـەو کـوڕە ببـە. بـەڵام کیژەکـە دەڵێتـە براکەی چ نەخۆی لەرێگادا باشە؟
براکەشی گوتی : باشە خوشکم.
بەڵام براکەی لە رێگادا نانێك و هێلکەیەك دەخوات لە رێگادا.
نانەکەی دەبات بو لای فەقێیەکە.
فەقێیەکـەش گـوتی: ئـەوە هـەبی و نـەبی سـرێکی تێدایـە؟ فەقێیەکـە بـیر دەکاتـەوە وەڵڵا بانگی برای دەکات گوتی ئەوە کێ ئەو نانەی بۆمن ڕەوانە کردووە؟
کوڕکەش دەڵێت: ئەوە خوشکم بۆ تۆی ڕەوانە کردیە.
فەقییەکـە بـانگی بـرای کیژەکـەی دەکـات و دەڵـی: هـەڕوو بـە خوشـکت بڵـی دیـارە لەکنەنگۆ مانگ ٢٩ ڕۆژە و ساڵیش ١١ مانگە.
کیژەکەش دەچێتە لای باوکی گوتی بابە ئەو فەقییە لە رێگادا هیچ قسەی نەکرد؟
باوکی گوتی: کیژم قسەکانی هەموو بێ مانا بووە نازانم باسی چی دەکرد.
کیژەکەش گوتی: بابە چبوو قسەکان؟
بـاوکی گـوتی: کیـژم لـەرێگادا گەیشـتینە دەغرێکـی زۆربـاش گـوتم ئـەو دەغـرە بـە قسـمەتی سـاحێبی بێـت دەغرێکـی زۆرباشـە فەقێیەکـە گـوتی ئەگـەر بەشـینی نـەخورا بـێ، ئـەو جـارە گەیشـتینە ڕووبـارێکی گـەورە گـوتم کـوو بپەڕینـەوە لـەو ڕووبـارەی

گوتی با پردێکی دروست کەین ئەو جارە گەیشتینە چیایەکی ڕك و بەرز گوتم ئەدی کو لەو چیایە بەرزە سەرکەوین گوتی دووکەسین هەتا نەبین بە چوارکەس ناڕۆین.
ئەو جارە گەیشتینە گوندێك لەو گوندەدا مەیتێکیان دەشاردەوە ئەمن گوتم ئەو مردیە و ئینشائەڵلا خودا لێ خۆش دەبێت گوتی ئەوە نەمردیە ئەوجا هاتین گەیشتینە گوندەکەی خۆمان لێم پرسی ئەتوو میوانی کێی گوتی ئەتو نا مزگەفت.
کیژەکەش بەباوکی گۆت: بابە دەزانی ئەمانە مانایان چیە؟
گوتی: نا کیژم.
کیژەکە گوتی: بابە ئەو کوڕە زۆر بەزیرەکانە پرسیارەکانی تۆی وەلاّم داوەتەوە.
کە دەڵی ئەگەر بەشینی نەخورابی مەبەستی ئەوەیە ئەگەر ئەو کابرایە قەرزدار نەبی ڕووبارەکەش مەبەستی ئەوەیە بابە فەقێیەکە تۆی لە پشتێ کرد؟
بەڵی کیژم بابە ئەوە نیوەی پردێکی بۆ دروست کردی. بابە مانای چیایەکە ئەوەیە کاتی ڕۆژئاوا بوو سێ بەری هەردوکتان درێژ دەبێت دەبن بە چوار بابە مانای مەیتەکەش ئەوەیە دەڵی نانە مردووە مەبەستی ئەوەیە کە ئەو کابرایە کوڕی چاکی لە دووای خۆی بەجێ هیشت بێت و خێر و سەدەقەی بۆ بکات. بابە کەتو پێت گوت تۆ میوانی کێی گوتی تو نا مزگەفت مەبەستی ئەوەیە میوانی تۆ دەبیت یانیش میوانی مزگەفت دەبیت.
ئەو جارە کیژەکە دەڵی بابە ئەو کوڕە کوڕێکی ئاقل و زیرەك و لێهاتووە من شووی پێ دەکەم ئەگەر تۆ ڕازی بی.
بابی دەڵێ کیژم بۆ نا، بانگی کوڕەکەی دەکات کیژەکەی لێ مارە دەکات. ژیانێکی خوش دەبەنەسەر.

- ئەم حەکایەتەش شێوەی گێڕانەوەی زۆرە و هەندێ جار دەدرێتە پاڵ (هەیاسی دوڕناس) و هەرچۆنێ بێ، لێرە زیرەکی کوڕە و کچە دەیانکا بە ژن و مێرد. لە کوردەواری دەڵێن: (لە ئاسمانان بانگ دەکەن هاوکووف.. هاوکووف).

# حیکایەتی ئەحمد وەی خڕ

کوکردنەوەی: ئاواز عبدالله محمد

پیرێـژنێك هـەبوو ئـەو پیرێژنـە لەشـوێنێك دەژیـا وەكـو گونـدێك وابـوو ئـەو پیرێژنـە یـەك كـوڕی هـەبوو كوڕەكـەی نـاوی ئەحمـەد بـوو، ئەحمـەد لەگـەڵ دایكـی دەژیـان ئەحمـــەد ماینێــك و دوو تــاژی هـــەبوو. هـــەموو ســبەینان زوو لـــە مـــاڵ دەچـــووە دەرەوە دەچـوو بـۆ ڕاو هەرچـی ڕاوی بكردایـە دەی هێنایـەوە مـاڵ لەگـەڵ دایكـی بـەمجۆرە خواردنـە دەژیـان هـەركاتێك كـە ئەحمـەد دەچـوو بـۆ دەرەوە بـە تـەنیا لـە مـاڵ دەمایـەوە دێوێـك لـەم شـوێنە بـوو كەئـەوانی تێـدا دەژیـان ئـەم دێـوە بـە دایكی ئەحمـەد فێـر ببـوو هـەموو ڕۆژێـك دەهاتـە لای دایكـی ئەحمـەد واتـە پیرێژنەكـە ئـەم دێـوە وازی لـەو پیرێژنـە نـەدەهێنا تـاوای لێهـات كـە دایكـی ئەحمـەد منـداڵێكی لـەو دێـوەی بـوو منداڵەكـە كـور بـوو و سـپی و خـڕین و جـوان بـوو، دایكـی ئەحمـەد گـوتی دێـوە چ لـەو منداڵـەی بكـەم ئەحمـەد بێتـەوە سـەرم دەبـڕی زۆری پـێ نـاخۆش دەبـێ دێـوە كـەمێك دامـا لـە دوایـی بـیری لـەوە كـردەوە كـە ئـەو منداڵـە ببەنـە سـەر ڕێگـایی ئەحمـەد ئەحمـەد لـەكاتی گەڕانـەوەی تووشـی دەبـێ و هـەڵی دەگرێتـەوە چـونكە ئەحمـەد منـداڵی زۆر خـۆش دەوێ كـە ئەحمـەد دەگەڕێتـەوە دوو تاژییەكـەی پـێش ئەحمـەدی دەگەنـە لای منداڵەكـە دەكەنـە دوكـە دوك ئەحمـەد لـە دوای ئـەوان غـاردەدا وەكـی دەگاتـە ئـەوەی كـوڕەكی جـوان لـەوێ فـڕێ دراوە جەمادانیەكـەی لەسـەر دەكاتـەوە تێـی لـوول دەدا لەپێشـی خـۆی دادەنـێ لەسـەر ماینەكـە كـە دەگەڕێتـەوە بۆمـاڵ لـە دوورەوە هـاوار دەكـا بـە دایكـی دەڵـێ وەرە كـورەكم هێنایـە دەبـێ بـۆم بـەخێو بكـەی دایكـی دەڵـی كـوڕم ئـەمن هیچـم بەبـەر نـەماوە مـەمكم شـیری تێـدا نـەماوە چـۆن بـەخێوی بكـەم بـەڵام ئەحمـەد زۆری لـە دایكـی دەكـات كـە ئـەو منداڵـەی بـۆ بـەخێو بكـات دایكـی دەڵـی بـڕۆ سـەربانی بڵـی خوایـە دایكـم شـیری بێتـە گـوانی ئەحمـەدش دەچـێت ئـەم كـارە دەكـات دایكـی هـاوار دەكـات دەڵـی وەرە خـوارێ مـەمكم پـڕ شـیر بـوو كورەكـەی گـەورە بـوو نـاوی لێنـا ( وەی خـر ) وەی خـر بـە ئەحمـەدی دەگـوت خاڵـە (وەی خـر ) دێوەكـەی بینـی بـوو كـە هـەموو ڕۆژی دەهاتـە لای دایكـی ڕۆژێـك بـە ئەحمـەدی گـوت: هـەموو ڕۆژێ دێوێـك دێتـە لای دایكـم ئەحمـەدش بـە وەی خـری

راسپارد کە دێوە لە کوێ دانیشت چاڵەك لە وێ لێ بدات و رایەخەکەی لەسەر دابنێ منیش ئاگرت بۆ ئامادە دەکەم هەر کەوتە ناو چاڵەکەی لەگەڵ دایکم ئەتۆش دارەکەی ببە و ئاگریان تێبەردە ئەو دارەی کە ئاگری پێوەی دەمرن ئینجا ماوەیەك ئەحمەد و وەی خر بە تەنیا لەوەێ دەمیننێنەوە ژیان بۆیان زوور سەخت دەبی بە هەردووکیان دەست دەگرن و دەڕۆن ئاوارە و دەربەدەر دەبن دەچنە گوندێك کە ئەو گوندە کەسێکی لێ دەبێ بە ناوی سۆرەی چاو شین ئەحمەد دەچی بۆ لای تا ئیشی بۆ بکات ئەحمەد و سورەی چاوشین رێك دەکەون لەسەر جوتی بۆ سۆرەی چاو شین بکات بە زوێرە چەرم لەگەڵ ئەحمەدی رێك دەکەوێ بە ئەحمەدی دەڵی گوجیلەکم هەیە ئەو گوجیلەیە لە کوێ وەرکەی تۆ دەبێ لەوێ جوتم بۆ بکەی ئەحمەد لەگەڵ گوجیلەی دەچن بۆ ئیش گوجیلە هەر دەڕوا تا دەگاتە ناو چیاو چوڵ و هەڵدێرەکی لەوێ وەدەردەکەوێ کاتێك ئەحمەد دەست دەکات بە جوتەکەی خوێ ئەوا هەموو شتەکانی ئامێرەکەی دەشکێ و ناتوانێ لە کارەکەی خوێدا سەرکەوتن بە دەست بێنی لەبەر ئەوەی کە ئێوارەی دادێ بە بێزاری و بە دڵ ناخۆشی دەگەڕێتەوە. سۆرەی چاوشین بە چوقۆ زوێرە چەرمی دەکات واتە لە پشتی ملی تا خوارەوەی پشتی بەچەقو هەڵدەڕی ئەحمەد بەو نەخۆشییەوە دەناڵێنێ تا لە ماوەیەکی کەمدا دەمرێ لەدوای ئەحمەدی وەی خر دەبێتە جوت کەری سۆرەی چاوشین ئەو مامەڵەی لەگەڵ دەکات کە لەو پێش لەگەڵ ئەحمەدی کردبووی، بەڵام وەی خر زۆر زیرەك دەبێ وەك ئەحمەدی خاڵی نابێ کاتێك دەچێت بۆ ئیش بەردێکی گەورە هەڵدەگرێتەوە لە گوجیلەکەی دەدا دەی توێپێنێ لە کارەکەی خوێ سەر کەوتوو دەبێ کاتێ کە ئێوارە دەگەڕێتەوە ماڵ بە دڵێکی زوور خۆش دەگەڕێتەوە، چونکە لە ئێشەکەی سەر کەوتوو بوو هیچ ترسێکی لەدڵدا نەماوە ڕۆژێك سۆرەی چاوشین بەوەی خری دەڵێ ئێمە دەچین بۆ میوانداری حەوت چێلمان هەیە دەبی هەر حەوتیان ئالیك بدەی ئەوێش دەڵێ باشە کە ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ تەماشا دەکەن وەی خر هەر حەوت چێڵەکەی کوشتووە ماوەیەکی پێ دەچێ سۆرەی چاوشین لەگەڵ ژنەکەی خوێ دەچن بۆ میوانداری حەوت منداڵیان هەیە بەوەی خر دەڵێن کە تا دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ هەر حەوت منداڵ بە جوانی پەروەردە بکات. ئەویش پێیان دەڵی چوێنی دەڵێن وا دەکەم تا ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ وەی

خەر هەر حەوت منداڵەکە دەکوژێ و لە نوێنیان دادەنێ ژنەکەی سوورەی چاوشین دەڵی بە خوا وەی خەر تۆڵەی خاڵەی لێ کردینەوە بە سوورەی چاوشین دەڵی وا چاکە لێرە بڕوێن خۆمان لە دەست وەی خەر ڕزگار بکەین ئەگەر نا ئێمەش لەناو دەبات وە دەمانکوژی سوورەی چاوشین بیردەکاتەوە زۆر زەحمەتە کە شوێنی خۆی بەجێ بێڵێ، بەڵام ناچار دەبن کە لەبەر ڕۆحی خۆیان ڕزگار بکەن ئەو جا بە ژنەکەی خۆی دەڵێ کەهەر شتێکمان پێوست بوو ئامادەی بکات و بیکاتە تێرکەی کەرێکیان هەبوو تێرکەکە بخە سەر پشتێ کەرەکەی ژنەکەی هەموو شتێك ئامادە دەکات لەگەڵ سوورەی چاوشین بەڕێ دەکەون و زۆر شوێن دەکەن بەڵام لە دواییدا ڕوو لە شوێنێك دەکەن لەم شوێنە سەگێکی لێ دەبێ ئەم سەگە واز لە سوورەی چاوشین و ژنەکەی ناهێنێ لەبەر ئەوە ژنەکەی دەڵی ئێستا وەی خەر لێرە بوایە لەم سەگە قوتاری دەکردین لە وکاتە وەی خەر لە ناو تێرەکەکە خۆی فڕێ دەداتە دەرێ سەگەکەی هەڵەتە دەکات و وازیان لێ دێنێ ئینجا ژنەکەی سوورەی چاوشین دەڵی وەی خەر چارەمان چییە ڕوو لەکوێ بکەین ئەوێش دەڵێ وا چاکە بچنە سەر قەبری علی لەسەر گردەکی بڵندە ئەو گردە بنی زێیە کەس ناتوانێ بێتە ئەوێ کاتێك دەچنە سەرگردەکە سوورەی چاوشین بە ژنەکەی دەڵی شەو وەی خەر لە نێوان خوامان دەنوێنین ئەمن دەڵیم هم ئەتۆش بڵی هم بە هەردووکمان تێی هەڵدەینە ناو زێیەکە و دەمری، بەڵام وەی خەر گوێی لەو قسانە دەبێ شەو سوورەی چاوشین دەهێنێتە شوێنکەی خۆی و تێی هەڵدەدەنە ناو زێیەکە کەسبەینی ژنەکە هەڵدەستێ دەبێنی کە مێردەکەی مردووە ئینجا وەی خەر ژنەکەی سوورەی چاوشین لەخۆی مارە دەکات پێکەوە دەژین و ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەن.

- لەم جۆرە حەکایەتانە، کە دێو و ژن دەست تێکەڵ دەکەن، منداڵەکان زۆر تێکەڵی واتا لە دێو و لە مرۆڤ دەچن. بەڵام لێرە منداڵەکە (سپی و خرپن و جوان بوو) لێرە دەتوانین، ئەوە بە ڕاست بزانین کە ئەفسانە زۆرجار کەسێك دەکات بە دێو کە کردەوەی خراپ و ناشیرن دەکات، لێرەش کابرا کە دەست لەگەڵ ژنە تێکەڵ دەکات. بە دێو دەچوێنرێ، دەنا ئەگەر لە منداڵە (سپی و خرپن و جوان)ەکەوە سەیری بکەین دەبێ، کابرا کەسێکی ئاسایی بووبێ و (دێو) نەبێ، چونکە کردەوەی خراپ خاوەنی ناشیرین دەکات.

# شاماریَ پەریا

**کۆکردنەوەی: گیابەند ئیبراهیم حاجی**

**شێوەزار: رواندز**

**گێرانەوەی: عائشە عەباس قادر**

**تەمەن: ٧٥ ساڵە و نەخوێندەوارە**

لە گوندی ئاکۆیان لەدایك بووە ئێستاش دانیشتووی شاری رواندزە لە گەڕەکی شۆڕش بە گوتەی خۆی ئەم چیرۆکەی لە باوکی بەڕێزیانەوە گویَ لێبووە بۆی ماوەتەوە.

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو. (حەسەن – حسین – ئەحمەد) برا بوون، چونە کن باوکی خۆیان باویان پاشا بوو، برایەکان وەیان گۆتە یەك بالۆ ولآتەکی دی بڕۆین هەر یەك لەمە مەملەکەتەکیو دەبینە پاشا بە باویان گۆ ئەمارۆین حسین و حەسەن و ئەحمەد مارلێنا ڕۆیشتن شەویان بەسەر داهات لەشکەوتەکی چوونە ژۆریَ مافوورەك راخسترا بوو سەماوەر هەرکرا بوو پرا و برنج لێندرا بوو هەندە گۆشتەی لەسەر بوو مندارا وەگۆتە باوینە خۆ ئەو ئەشکەوتەی سەحێب لیَ نییە چەندی با بکەین کەس جواب ناداتۆ باوی وەگۆ هەبیَ لە غەیبیَ ئەو شتە لۆمە حازر کرایە چەند جمعە بوو هیچ ساحێب دیار نەبوو باوی وەگۆ خوای ئەو نیعمەتە دایە لۆمە ئیشی ئەو برایانە هیچ نەبوو، ڕۆژیَ هەتا ئێواریَ ئەچوونە ڕاویَ هیواراش دەهاتنۆ لۆ ئەشکەوتیَ لە کن مندارایـنە خۆ ئەبوون ژنیَ ئەحمەدی و حەسەن و حسینی خوشك بوون دیار بوو وەکی ئەحمەد چاو لە ژنیَ خۆ کرد هە ڕەنگی زەردە بوو ئیدی ئینەویش هەوەکی خۆ بوون و قەرەوە بوون ئەحمەد وەگۆتە ژنیَ خۆ ئەتو لۆ هەرەنگت زەردبی ژنیَ ئەحمەدی هیچ قسەنەکردن گۆتی ئەمن هیچ قسـاناکەم لە ترسیَ خودای گەورە هەوڕێ وەکی چوونە راویَ لە نیوەی ڕێی ئەتو زگی خۆ بێشینە بگەڕێۆ خۆت لە تیلەکەی شکەوتیَ بگرە ئەمن هیچ قساناکەم وەلآ ئەحمەدیش بەقسیَ ژنیَ خۆی کرد لە ڕیَ گەڕاوۆ لە تیلەکەی شکەوتیَ ڕاوەستا وەکی چاوی لێکرد هیچ زەینی نەما دیتی پیاوەك دەگە ژنیَ براینە وی دابوو وەیگۆ ئەگە من هەردووکا بکوژم ژنیَ خۆ نەکوژم پێم باوەڕ ناکەن برایەکانی وارێن کو ژنی تو

وەنەکردیە ئیمە وەکردیە بەلاّم خوا قبول ناکا ئەمن خێزانی خۆ بکوژم لەسەر هیچ و خۆرایی، وەلاّ ئەحمەد ڕۆیشت خۆی دەکەس نەگەیاند هەمووی بەجێ هێشتن ڕۆیشت چووە کن پاشایەك سارەك بوو لەوێ بوو ئەو پیاوەی کە بە ژنێ حەسەن و حوسێنی فێر بوو زانی کە ئەحمەد لەوێیە خۆی کردە دەروێش ڕۆیشت چووە کن پاشای دەی گۆ پاشام خۆش بی ئەتو کوا ئەحمەدی لە دیوەخانی دانایە نابێ ئەوە پیوی هەندێ نییە وەلاّ پاشاش بە گوێی دەروێشی کردە عایدی وەراغا کلیلی چل هۆدا وەراغا وێدا ئێ یەك هۆدەی نەبی وەلاّ ئەحمەد رازی بوو وەیگۆ باشە خۆ پاشای ئاگای لێ نیە با هۆدەی بکەمۆ وەلاّ پلەکی وەبن هەردا کردیۆ وەکی کردیۆ هەسپەکی ڕەشی تێدا بوو مەنجەرەکی هێسکای لە پێش بوو وەلاّ هەموو ڕۆژێ ئالیکی دەهێنە لۆ وەراغا لە هەمای مستەك دەگێراوۆ لۆ هەسپێ ڕەشی دادەنا وەلاّ بە قەدەرای مانگەکی هەسپەکە قەرەو بوو لە قەرەویان پشتێ ڕۆن بوو دیسان کابایەکە خۆی کردە دەروێش هات و سەلامی کرد وەی گۆ پاشام خۆش بی زۆر حەیف و مەخا بن ئە قەراتەتان بن دانایە سەرەوەشت کردبا پاشا گۆتی دەروێشم خۆش بی ئەو قەراتە بەکێ ڕێکەکەوی وەی گۆ بە ئەحمەدی خورامی تو پاشا بانگی ئەحمەدی کرد وەی گۆتێ ئەتو ئەبیە وەستا ۆ ئەو قەراتەی ئەحمەدیش ڕازی بوو لۆ مانگەکی قەراتی تەواو کرد لە دونیایێ خەڵك دەهاتە دیار قەراتی زۆر برند بوو ئینجا پاشا لە خۆشیا کیژ و کوڕەکانی خڕ کردۆ شایەکی ڕێکخست ئی کیژ و کاران بە جودا ئی کوڕ و کاران بەجودا هەنگی دیسا دەروێش هات و سەلامی کرد وەی گۆ پاشام خۆش بی ئەو قەراتەت پیرۆز بی ئێستا ئەو قەراتە داری خۆش ئاوازی پێویێ ئەو قەراتە ئیوهە نابی پاشای وەگۆ بەکێ پەیابی گۆتی بە ئەحمەدی خورامی تو (ئەحمەد) هاتۆ گۆتی ئەحمەد لەتوم ئەوێ ئەو قەراتەت دروست کرد ئێستاش داری خۆش ئاوازم دەوێ ئینجا ئەحمەد وەگۆ داری خۆش ئاواز لەکێ پەیا بی وەلاّهی ناونیشانم نەزانینە پاشای ئەحمەد سەرت نێشینم دەروێشی وەگو چار دەوری قەراتێ داری خۆش ئاوازی پێویێ تێی بگیرێ ئەحمەد چووە کن هەسپێ ڕەش ئاوی دایێ ئالیکی لەبەر دانا هەسپەکە بە ئەمری خوای وەجواب هات گۆتی ئەحمەد چاوی من چت بەسەر هاتیە ئیوهە غەمباری ئەحمەد وەگۆ چت لێ بشارمۆ ئیشەکەی پێ گۆ هەسپ وەی گۆ خەمت نەبی چاکایەتی وەت دەگە من کردیە هەرچی برێی جێ بەجێ

ئەکەم ئینجا دروست هینایانە دەریێ ئاوت لە کەفەدا کردبا دەهاتە دەریێ ئینجا ڕایکێشا دەریێ زینی لیێ کرد لغاوینە زێڕی بەسە دەوی وەکردن ئینجا ڕۆیشتن لە ڕێی هەسپەکە وەی گۆتە ئەحمەد چاویێ من باغەك دیارە چاوت لەخۆ بی ئەمن ئەگەمە ناو ئەو باغەی لێتە بێتەتاریك و تارستانەك بەردەکی پانی لێیە کوڕە وەکی دەستم لە تاتی دا بۆ ڕەنگە ژن داری خۆش ئاوازت دێتە دەستی شوارکەکی لە من دە ئینجا گەرانۆکن پاشا وەلاّ بەسەری تو کە مەداری خۆش ئاوازیان هینا هاتینۆ ئینجا وەستا و کاریان هێنایە سەر دەقەراتێیان گرتن بەرا بەکەس وەدەنگ نەهاتن سەر لەنو دەروێش هاتۆ کن پاشای گۆتی پاشام خۆش بی پیرۆزت بی بەرانو لۆ دەنگیان نیە پاشا گۆتی نزانم دەروێشی وەگۆ دەبی ئامارەتینە وەستا خدری هەبن دەگە داری نە خۆش ئاواز دە دیواری قەراتیێ بگیرێن ئامارەتیش لە کن پیرەژنیێ چنگ ئاسن پەیابن پاشای وەی گۆ ئینجا ئامارەتینە وەستا خدری یەکیێ دێن دەروێشی وەی گۆ بە ئەحمەد خورامی تو پاشای بانگی ئەحمەدی کرد وەیگۆ دەبیێ ئامارەتینە وەستا خدرم لۆ پەیدا بکەی ئەحمەدی دیسا بە حێدزی چووە کن هەسپیێ ڕەش هەسپیێ وەگۆ ئەحمەد چاوی من دیسا لۆ بە خەمی ئەحمەدیش لۆ باس کرد هەسپیێ وەگۆ خەمت نەبی هەرچی برێی لۆت دینم وەلاّ هەنگی ئەحمەدی هەسپ حازر کرد ڕۆیشتن چوون ئامارەتینە وەستا خدری بینن هەسپیێ وەگۆ ئەحمەد چاوی من ئاگات لەخۆ بی ئامارەت لەکن پیرەژنیێ چنگ ئاسنن لە بێراییێ دەنا و جانتای دانە بە هاوا وەکراینە دەبی ئەتو لە دوور بابکەی وەبرێی هۆ پیرە داك بەخۆت جوابی ئەداتۆ وەبریێ ئەمن توجاری ئێرانی مە ئەگەر جێت هەبی ئەمن لە کنە تو میوانم شەوم بەسەردا هاتیە ڕۆیشت لۆ کنە پیرەژنیێ چنگ ئاسن هەسپیێ ڕەش چی گۆ هەمووی جیێ بەجیێ کرد هەسپیێ ڕەش لەناو باغی بەستۆ سیێ جای باکردە پیرەژنیێ چنگ ئاسن پیرەژنیێ وەگۆ دی کا قافرت گۆتی لەپشت قەراتێم بەجیێ هێشتینە گۆتی ئەحمەد کوڕی من وەرە دانیشە گۆتی درەنگیتم توخوا جێت هەیە هەر هۆدەی پێشان دا ئاوری نەداوە ئەحمەد سەر بردنکرد ئامارەتینەی وەستا خدری بە هەواوە بون ئەحمەدی ئامارەتینەی وەستا خدری هینان سواری هەسپیێ ڕەش بوو ڕۆیشت پیرەژنیش وەکی ئاوڕی داوە کەسی لە دوو نەبوو هەند غەمبار بوو وەکی چاوی لێکرد جانتا نەمایە لەپەکی لەخۆدا تیرە گۆشتی لەخۆ هینانە خواریێ هەنگی ئەحمەد گەیشتۆ جیێ

وەستاو کاریان هێنانە سەر ئامارەتینە وەستا خدریان تێگرتن دەگەداری خۆش ئاواز ئەوێ جادی دەنگیان لێوە هات مەملەکەتی ئەو پاشایە چەند شەو و ڕۆژا لەخۆشیا نەنوستن هەر گوێیان لەو ئاوازانە دەگرت بەسەری تو گەمە دیسان دەروێشی لە داکا خۆدا مەیتی بەوێندەردا شۆڕ کردۆ خواریێ ئەو هەندەت بەمن گۆ ئەحمەدیش نەفەوتا دەروێشی دەگۆ داکا خۆ بەپیتێ بە بەسەنەمی بە داکا حەسناغەی دەبێ ئەو جارەی ئەحمەد بفەوتێ داکا وەگۆ ئەی نێرمە جێنەوە بەروح نێتو سەلەند خۆی کردۆ دەروێش هاتۆ کن پاشای گۆتی پاشام خۆش بی ئەو قەراتەت ئی هەدنێیە شارمارێ پەریا تێدا بی خێزانی تو بی پاشا وەی گۆ بەرای تو شاماری پەریا بەکێ دێ دەروێشی وەی گۆ حەفت سارە شاماری پەریام حەپس کردیە بەمن نایێ دەروێشی وە گۆ بە ئەحمەدی خورامی تو دێ وەلا ئەحمەدیان راسپارد ئەحمەد چووە کن هەسپێ ڕەش حێدز بوو هەسپی وەگۆ ئەحمەد چاوەکەم چ بووە بۆ وا حێدزی ئەحمەدی وەگۆ پاشای وەگۆ شاماری پەریام لۆ بینە هەسپی وەگۆ ئەحمەد خەمت نەبی رۆیشتن ئەحمەدی ناوی خواو پێغەمبەرا هینا لێی سوار بوو هەسپی وەگۆ ئەحمەد وەکی گەیشتینە ئەوێ ئەمن حەفت سارە بزر بویمە مزگێنی ئەدەنە شاماری پەریا کە هەسپ هاتیتۆ ئینجا ئەتو قۆرکەکی لێدا کەرەنگرێ بێنە سەرەخۆ ئەمیش لەباغی شاماری بەردە ئەوان ئەمن ئەناسن سبەینێ خورامی شاماری پێشی هەما هەستا وەکی دیتی هەسپ هاتیتۆ بانگی شامارێی کرد وەیگۆ هەسپ هاتیتۆ ئەویش وەیگۆ بڕۆن بیگرن ئێستا دێم هەسپی لوشک هاوێشت هەمووی فرەدان هەتا سامار بێتە خوار هەسپی وەگۆ ئەحمەدی خۆ لەوی دابنوسینە هەتا شامار دێ شامار هات وەیگۆ چاوت کۆرەبن حەفت سارە خۆت بزر کردیە پشتت لە جاران پانتر بووە لەو دەمەدا ئەحمەدی شامار برد سواری هەسپی کرد رۆیشتن شەویان لێ داهات چوونە ماڕێ شێخی عەرەبا لەوێ میوانەبن شێخی نەزانی چاوی لەکیهەی بکا هەموو لەیەك جوانتر بوون ئەحمەدی وەگۆ ئەوە ژنێ منە شێخی وەگۆ بڕۆن ئالیکی بدەنە هەسپی ئەحمەدی وەگۆ ئەمن بەخۆچم هەسپی من بەدەستی من ئەخوا هەسپی ئالیك خوارد و وەیگۆ ئەحمەد هەوشۆ شێخت سەر ترنجانێ دەگاکا گۆتی شێخی عارەبا خۆکاتە مشك ئەچیتە ناو فەردەی خوریا گۆتی ئەتوش وەرە ناو ددانێ من کلۆرە شەوی درەەنگ داهات گەورە و وەزیر خڕبونۆ لە خەنی و خۆشیا ئەحمەد و شاماری پەریا

شەوێ لەبە شەوقی شاماری دانیشتن شێخی وەگۆ ئەرێ برا ئەمن حێدز بویمە با سەرترنجانەکی بکەین دەگە ئەحمەدی لەسەر شاماری پەریا ئەحمەدیش وەگۆ لەسەر سفرۆکەی تەعام و شەعامە گەمە دانرا شێخی خۆ کردە مشك چووە ناو خوریێ ئەحمەدی هەموو جێ رۆنین پاشان وەیگۆ وەرن فەردەینە خوریا بینە خواری شێخی دیتۆ ئەو جارەی ئەحمەد چووە ناو درانی هەسپێ خۆ شاردۆ شێخی زۆر با کردی وەیگۆ ئەحمەد وەرە گرۆت بردۆ تا سێ جار بات ئەکەمێ وەرە دەر هەسپێ وەگۆتە ئەحمەدی ئەگەر شێخی وەگۆ لەکێ بوی مەیرێ لەبەمرێ هێز بووم دەیگۆ درانم بەحرە هێزپیشم دیارە ئەحمە هاتە دەر شێخی وەگۆ لەکێ بوی جێ نەما نەرۆنم گۆتی لەبەحری هێز بوم ئەحمەدی خۆ حازر کرد سفرۆکەی تەعام و شەعامای هەرگرت بەتەما بو بروا شێخی باکردی وەیگۆ ئەچیۆ کن پاشای وەیگۆ بەرێ گۆتی کورە خۆ تو کەسەك هەیە یان شکەوتەك هەیە ئەچیۆ کن پاشای چەکەی ئەحمەد رۆیشت ناوی خواو پێغەمبەرانی هینا رۆیشت لۆ کن براو ئەوینە خۆی وەلا رۆیشت لە تیلەکی شکەوتێ دیتی ئەو پیاوەی دەگەر ژنێ براینە وی دایە ژنێ منیش لە جارا لاوازترە بووە رەنگی زەرد بوو وەلا سفەرەیان دانا نان خورا هەموو بە سفەری وەنوسان ئەحمەد مەسەلەکە لۆ براینە خۆ گێراوۆ وەیگۆ حار و مەسەلەکی ئیوهە هەیە ئەویش وەیانگۆ ئەدی لۆ ژنێ خۆ نارێی ئەویش وەگۆ ژنێ من وەناکا وەیانگۆ کو باوەڕ بکەین ئەونیە وەیگۆ ئێستا وارێمە ئەو سفرەی هەرچی حەقا با پێوە بێ هەرچی ناحەقا بالێی وەبێتۆ وەلا شاماری پەریا و ژنێ ئەحمەدی لێ بونۆ ئینە دیش پێوە نوسان وەلا ئەحمەدی مار تێك نا رۆیشت لۆ کن باوی خۆ.

- ئەم ئەفسانەیەش دەق و شێوە گێڕانەوەی تری هەیە. هەرچەندە ئەمجۆرە حەکایەت و ئەفسانانە دواجار یەك مەبەست و یەك حیکمەتیان هەیە، بەلام، زۆرجار ئامراز و قۆناغ و کەسایەتیەکان دەگۆڕێن.

# دنکە هەنـــارە

**کۆکردنەوەی: بەیان عەلی عەبدولکەریم**
**گێڕانەوەی: عەلی فەرەج عەبدوڵڵا**
**تەمەن: ٧٠ ساڵ**
**دانیشتووی: سەید سادق**

هـــەبوو نـــەبوو لـــە ڕۆژگـــارێکی ڕابـــردوودا، ماڵێـــك هـــەبووە کـــە ژنەکـــەی بەســـەر کچـــەکەیەوە گیـــان لەدەســـت ئـــەدا. مابوونـــەوە بـــاوك و کـــچ، بـــاوکی بـــۆ ئاســـوودە کردنـــی ژیـــانی کچـــەکەی و خـــۆی ژنێـــك دێنێـــت، لـــە ژنەکـــەی کچێکی تـــری دەبێـــت کـــە دوو ســـاڵ لـــە کچـــی یەکـــەمی بچـــوکتر دەبێـــت کچـــی یەکـــەم (دنکـــە هـــەنارە)ی نـــاو دەبێـــت و کچـــی دووەم (مینـــا)ی نـــاو دەبێـــت، جیاوازیـــەکی زۆر لـــەنێوان ئـــەم دوو کچـــەدا هەیـــە و پەیـــدا دەبێـــت کـــە زۆر شـــت دەگۆڕێـــت، دنکـــە هـــەنارە زۆر جـــوان و ئاقـــڵ و لەســـەرەخۆ و قســـە خـــۆش دەبێـــت، بـــەڵام مینـــا زۆر ناشـــرین و بایـــەخ پێـــدراو نازهـــەڵگیراو دەبێـــت بـــەهۆی بـــوونی دایکـــی لـــە ماڵـــدا، دنکـــە هـــەنارە دەکرێـــت بەشـــوانی مـــەڕ و مـــاڵات و هەمیشـــە لـــە دەشـــت و دەر ژیـــان بەســـەر دەبـــاتو کـــە گەیشـــتە ماڵـــەوەش دەبێـــت خزمـــەتی بـــاوەژن و زڕ خوشـــکەکەی بکـــات ســـەرەڕای ئـــەو هـــەموو ئـــیش و کـــارەی لـــە ماڵـــدا ئـــەکات دەبێـــت نـــازی خوشـــکەکەی هـــەڵگرێت، پاشـــان کـــە دەچـــێت بـــۆ دەشـــت مـــەڕ و مـــاڵات دەبێـــت خـــەریکی ڕســـتن و چـــنین و دەســـت ڕەنگـــین دەبێـــت، ڕۆژێـــك دنکـــە هـــەنارە دەچـــێت بـــۆ دەشـــت هەنـــدێك خـــوری لەگـــەڵ خۆیـــدا دەبـــات تـــاکو لـــەو دەشـــتە دەســـت بـــەتاڵ دانەدەنیشـــت، و کارێـــك بکـــات، لـــە ناکـــاو بایـــەکی تونـــد دێـــت و هـــەموو خوریەکـــەی لەدەســـت دەفڕێنێـــت و دەیبـــات بـــۆ لای پیرێـــژن[1] و پیرێـــژن کـــە دەیبینێـــت زۆری پێـــی دەڵێـــت وەرە ژوورەوە بـــەڵام دنکـــە هـــەنارە ڕەتـــی دەکاتـــەوە دەڵێـــت: مـــەرەکانم بـــە تـــەنهان و گـــورگ دەیـــان خـــوات بـــەڵام پیرێـــژن زۆری لێـــدەکات و دەیباتـــە ژووری، دوای دانیشـــتن پیرێـــژن دەڵێـــت لێـــرەوە ئاوێـــك دێـــت ڕەنگـــەکانی تێدایـــە، کـــە ئـــاوی زەرد هـــات و خـــەوم لـــێ کـــەوتبوو خەبـــەرم بکـــەرەوە بـــا ئاگـــادارم، پاشـــان ئـــاوێکی ڕەش دێـــت و دەڕوات ئـــاوێکی ســـەوز دێـــت و دەڕوات..... هـــەتا نـــۆرەی ئـــاوی زەرد دێـــت

---

[1] دێوێك کە ناویان لێناوە پیرەژن. ئەفسانەیەکە زۆر جار بەکار دەهێنرێت لە داستاندا.

هـەر کـە ئاوەکـە هـات بەپەلـە پیرێـژن خەبـەر ئەکاتـەوە کـە خەبـەری کـردەوە دەسـی دنکـە هـەنارە دەگرێـت و لـە ئاوەکـەی ئـەخات و دەری ئەهێنێتـەوە هـەموو گیـانی دنکـە هـەنارە دەبێـت بـە مـانگ ئەونـدە جـوان و درەوشـاوە ئـەبێت، پاشـان خورییەکـەی ئەداتـەوە و ئەگەڕێتـەوە هـەموو مـەڕ و ماڵاتەکـەی وەك خـۆی مـاون دەچـێتە ماڵـەوە دایکـی (باوەژنەکـەی) زۆری لـێ تـوڕە بـوو دەڵێـت شـتێکت کـردووە وا ئەوەنـدە جـوان بـویی و خورییەکەشـت هـەمووی ڕێسـتراوە و مـەڕو مـاڵات هـەمووی بەسـەلامەتی گەڕاونەتـەوە پـاش چـەند جـار بـەم شـێوەیە ئـیتر دایکـی کچ هـار دەبێـت دەڵێـت ئـەم جـارە کچەکەی خـۆم دەنێـرم بـا ئـەویش بێـت، تۆزێـك خـوری ئـەداتێ و مـەڕ و ماڵاتەکـەی لەگـەڵ دەبـات تـا جێگـەی لـەوەڕ، پاشـان بـەو پـەڕی نـازەوە بـەجێ دێڵێـت، کاتێـك بـەجێ دێڵێـت بایـەکی زۆر تونـد هەڵـدەکات و خورییەکـەی هـەموو دەبـات، پاشـان (مینـا) بـەدوای دەکـەوێت بـە قسـەکردن بـە باکـە و زۆر جنێـو دەدات کاتێـك دەگاتـە لای پـیرەژن زۆر قسـەی پـێ دەکـات و دەڵـێ خوریەکـەم بـدەوە، پاشـان پیرێـژن بـانگی دەکاتـە ژوورێ هـەر چـۆن بێـت دادەنیشـێت، هـەر لـەو کاتـەدا مـەڕەکانی هـەمووی گـورگ دەیخـوات، لای پیرێـژنیش خوریەکـەی بـزر دەبێـت، پاشـان پیرێـژن دەڵێـت: ئێسـتا چـەند ڕەنـگ ئـاو لـەم جێگایـە دێـت هـەر ڕەنگێـك تایبەتمەندیـەکی هەیـە بـەڵام تـۆ دەبێـت کـاتێ مـن نوسـتم هەرچـەند ئـاو هـات هـەڵم مەسـتێنە تـەنها لـە ڕەنگـی ڕەش خەبـەرم بکـەرەوە، ئـەویش کـە ئـاوی ڕەنگـی ڕەش هـات بەخەبـەری دێنێـت پاشـان پیرێـژن ئەیخاتـە نـاو ئاوەکـەوە دەری دەهێنێتـەوە هـەموو دەم و چـاوی دەبێـت بەچـەند (گونکێـك)[1] کـە ڕووخسـاری زۆر ناشـرین دەکـات پاشـان هـەموو لەشـی بەشـێوەیەك ناشـرین دەبێـت کـە زۆر کـەس نایناسـێتەوە، پاشـان بەدەسـتی بـەتاڵ بـۆ لای دایکـی دەگەڕێتـەوە ئێوارەیـەکی زۆر درەنـگ کـە دایکـی دەیبینێـت. زۆر نارەحـەت دەبێـت بۆیـە ئەوەنـدەی تـر لـە دنکـە هـەنارە تـوڕە دەبێـت ئیشـەکانی زیـاتر قورسـتر دەکـات. ڕۆژێـك کـوڕی پاشـا دنکـە هـەنارە دەبینێـت شـەیدای دەبێـت بۆیـە دێتـە خـوازبێنی دایکـی (باوەژنەکـەی) ئەچـێت دنکـە هـەنارە دەشـارێتەوە و کچـەکەی خـۆی کـە (مینـا)بـە ئێسـتا (گونکـە توێڵـە)ی پێـدەڵێن لـە کـوڕی پاشـای مـارە دەکـەن، بۆیـە دنکـە هـەنارە داوا لـە خـوا دەکـات کـە بیکـات بـە ماینێـك و دوای

---

[1] جـۆرە بالوکەیەکـە کـە زۆر گەورەیـە و روخسـاری زۆر ناشـرین کـردوو ... ـساریییەوە بووە.

لەشکری زەماوەندی کوڕی پاشا بکەوێت، خوای گەورە داواکەی قبوڵ ئەکات دەبێت بە (نۆما)[1] ماینێکی زۆر جوان و دوای سواری کوڕی پاشا دەکەوێت گونکە توێڵە کە نۆما دەبینێت دەڵێ دەبێ سواری ئەو ماینە بن کە سواری ماینەکەی ئەکەن ماینەکە هیچ ناوەستێ چەندین جار گونکە توێڵە ئەدا بەزەویدا بەڵام کە کوڕی پاشا سواری ئەبێت هێدی هێدی دەڕوات کە دەگەنە ماڵی پاشا گونکە توێڵە ئەڵێ ئەبێ ئەو نۆمایە سەربڕن ئەگینا ئەڕۆمەوە بۆ ماڵی باوکم، کوڕی پاشاش بەقسەی ئەکات و نۆماکە سەر ئەبڕێ هەرچەندە زۆری پێ ناخۆش دەبێت کە نۆماکە سەر ببڕێت بەڵام داواکەی مینا جێ بەجێ ئەکات و نۆماکە دوای سەربڕینی ئەخەنە چاڵێکەوە تەنها دوو دڵۆپ خوێنی لەم بەرو ئەوبەری چاڵەکە ئەکەوێت ئەو دوو دڵۆپە خوێنە ئەبێت بە دوو داری زۆر بۆن خۆش و سێبەرێکی خۆش دروس ئەکات پاشان ماڵی پاشا کەڵەشێرێکیان ئەبێت هەموو بەیانییەك کە دەخوێنێت دەڵێت: قوو، قوو، قوو گونکە توێڵەیان دابەشو دنگە هەنارەیان نایە پێچ کەنو، پاشان کە مینا ئەم دەنگی کەڵەشێرە ئەبیستێت دەڵێت هەر دەبێت ئەو کەڵەشێر سەر ببڕن پاشان کوڕی پاشا چاری نییە داواکەی جێ بەجێ دەکات و سەری دەبڕێت و گۆشتەکەی دەخۆن بەڵام گۆشتەکەی بۆگونکە توێڵە تاڵ دەبێت بۆیە گونکە توێڵە گۆشتەکەی ناخوات و نانیش ناخوات هەمووی کوڕی پاشا ئەیخوات پاش ماوەیەك مینا حەمل دەبێت و منداڵێکی دەبێت دەڵێت دەبێ لۆ بێشکە تەنها ئەو دوو دترە ببڕنەوە و ئەگینا نایخەمە بێشکە، ئەوانیش ناچار دەبن دارەکان ببڕنەوە و بێشکەی لێ دروست ئەکەن، پاشان کوڕە ئەخەنە ناو لانکەوە و کاتێك کوڕە پاشا دەست بنێت بە لانکەوە بۆ ڕاژاندن و ژێر کردنی منداڵەکە منداڵ بە خۆشی و ئارامی ئەخەوێت و ئیسراحەت دەکات بەڵام کە گونکە توێڵە دەست دەدات بە لانکەکەوە منداڵەکە ئەگری و ئەقیژێنێت بۆ ساتێك ئارام ناگرێ. بۆیە ناچار ئەو لانکەیەش ئەشکێنن و لەناوی ئەبەن، مینا خۆی ئەیشکێنێت و ئەیسوتێنێت تەنها یەك لەت لە دارەکە بە وشکی و سوتاوی دەمێنێتەوە. پاشان ئەبرێ

---

[1] ماینێك کە زۆر جوان و لە هەرەتی لاویدا لەجوانیدا پێی دەڵێن نۆما.

لەسەروی کۆلانـدا لـە شـوێنی فرێدانی خـۆڵ و خاشـاکی پـیس ئەکـەوێت. پیرێـژنێك کـە هـیچ کەسـی نابێـت ئیشـی بـۆ بکـات هـەر خـۆی بەتـەنها ئـەڕژی بـۆ دار ئەگـەڕێ بـۆ سـوتاندن بـەکاری بێنێـت لـە کـاتی گەڕانـدا چـاوی بـە لەتـە دارەکـە ئەکـەوێت هـەڵی دەگرێـت و دەی باتـەوە بـۆ ماڵـەوە بـۆ سـوتاندن لـە ئاگردانەکـەدا کـە شـوێنی کردنـەوەی ئـاگر یـان لێنـانی چێشـت و خواردەمـەنی دا فرێـی دەدات و دەڕوات بـۆ دەرەوە بـۆ کـڕینی شـت، بـەڵام کـە دەڕواتـەوە لقـە دارەکـە دەبێتـەوە بـە دنکـە هەنارەکـەی جـاران، وە زۆر جـوانتر لـە جـاران بـە کۆڵێـك زێـڕ و پرچـێکی زێـڕین و چـاوێکی شـین و روخسـارێکی سـور و سـپی درەوشـاوە، خـۆی لـە پیرێـژن دەشـارێتەوە بـۆ ئـەوەی هەسـتی پـێ نـەکات دەچـێتە ئاگردانەکـەوە و دەم و چـاوی ڕەش دەکـات و جلێکـی شـڕ لەبـەر دەکـات بـۆ مـاوەی چـەند ڕۆژێـك لـەو شـوێنەدا دەمێنێتـەوە بـەبێ ئـەوەی پیرێـژن ئاگـای لـە بـونی هـەبێت لـە ماڵـدا، بـەڵام هـەموو ڕۆژێـك ئیشـەکانی نـاو مـاڵی پیرێـژن دەکـات و گسـکی بـۆ دەدات و جلـەکانی بـۆ دەشـوات و چێشـتی بـۆ لـێ دەنێـت، کـە پیرێـژن گەڕایـەوە بەپەلـە خـۆی دەشـارێتەوە و دەچـێتەوە جێگەکـەی خـۆی، پیرێـژن هەسـت دەکـات کـە کەسـێك لـە ماڵەگـەدا هەیـە بـەڵام نـازانێ چـییە و کێیـە بۆیـە ڕۆژێـك خـۆی دەکـات بـە نـەخۆش بـۆ ئـەوەی لـە نهـێنی ئـەو شـتە بزانێـت، دەچـێتە ژێـر جێگـە وەك نـەخۆش زۆر داوای ئـاو دەکـات دەڵێـت: تخـوا ئـاو یـەکێك تۆزێـك ئـاوم بـداتێ زۆر نەخۆشـم نـاتوانم هەسـتم بۆیـە دنکـە هـەنارە چـی دی خـۆی پـێ ڕاناگیرێـت و دڵـی زۆر نـەرم و میهرەبانـە و ئێسـتاش کەسـێك داوای یارمـەتی لـێ دەکـات چـۆن دەبێـت یارمـەتی نـەدات دێتـە دەرێ و پـەرداخێك ئـاوی بـۆ دێـنێ بـە ئاسـپای دای دەنێـت پیرێـژن هەسـت دەکـات کـە ئـەو کەسـە هاتۆتـە دەرێ ڕوودەکاتـەوە لـە دواوە جلـەکانی و دنکـە هـەنارە دەگرێـت پێـی دەڵـێ: تـۆ کێیـت؟ بۆچـی هاتوویتـە مـاڵی مـن؟ دنکـە هـەنارە ڕێگـە چـارەی نابێـت بـۆ دەربـاز بـوون لەدەسـتی پیرێـژن بۆیـە دادەنیشـێت و هـەموو ڕاسـتییەکانی پـێ دەڵێـت وە بـەو مەرجـەی نهـێنی لای کـەس نـەدرکێنێت. وە پیرێـژن بـەڵێنی پـێ دەدات کـە بـە کـەس ناڵێـت. بـۆ مـاوەی سـاڵێك زیـاتر لـە مـاڵی پیرێـژن بەخۆشـی و بـە پـەنهانی بەسـەر دەبـات ڕۆژێـك لەسـەربان خـانووی پیرێـژن چـەند کـوڕ یـاری دەکـەن بـە تـۆپ، یـەکێك لەوانـە کـوڕی پاشـا دەبێـت، لـەکاتی یـاری کردنـدا تۆپەکـەیان دەکەوێتـە مـاڵی پیرێـژن وە پیرێـژن لـەماڵ نابێـت، بۆیـە دەنکـە هـەنارە ناچـار دەبێـت خـۆی تۆپەکـەی بداتـەوە بـە کوڕەکـان بـە دوو پەنجـە تۆپەکـەیان بـۆ فـڕێ دەداتـە دەرێ،

کـوڕی پاشـا کـە سـەیری خـوارەوە دەکـات چـاوی بـە یـەکێك دەکـەوێت کـە زۆر جـوان دەبێـت و غـەریب نییـە لەبـەر چـاوی، دووەم جـار بەدەسـتی خـۆی تۆپەکـە فـڕێ دەداتـە خـوارێ و ئـەوەی بزانـێ ئـەوە کێیـە لـە مـاڵی پیرێـژن دا، خـۆ پیرێـژن کەسـی نییـە ئێسـتا کەسـێك لەوێیـە گومـان دەبـات خـۆ پیرێـژن دەڵـێ کەسـم نییـە، دووەم جـار کـە تۆپەکـە هەڵدەداتـەوە بـە تـەواوی کـوڕی پاشـا لەسـەرەوە دەیبینێـت و دڵنیـا دەبێـت کـە کسـێکی نـامۆ لەوێیـە کـە تـا ئێسـتا کـەس نـەیبینیوە لـە شـاردا، بۆیـە هـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە ڕۆژێـك دیـاری دەکـات و ڕسـتن و چـنین کـە بڕیـار وایـە هـەموو کچـانی شـار بچـن بـۆ ئـەو گەلـە[1] هـەموو کەسـێك بەشـدارە بـەبێ بەرامبـەر، وە ئـەمجارە مـەرقی دەبێـت لەگـەڵ جارەکـای تـر و سـاڵانی تـر ئـەمجارە کـوڕی بـەس بـۆ بینـینی کچـی پیرێـژن خۆشـی ئامـادەی ئـەم ڕسـتن و چـنینە دەبێـت ڕۆژی دیـاریکراو نزیـك دەبێتـەوە هـەموو کچـانی شـار کـۆ دەبنـەوە بـە جلـی جـوان و ڕازاوە ڕوو لـە مـاڵی پاشـا دەکـەن، کـوڕی پاشـا سـەیر دەکـات ئـەو کەسـەی کـە ئـەو ڕۆژە بینیویـەتی لـە مـاڵی پیرێـژن نـەهاتووە، بۆیـە بەپەلـە بڕیـار دەدات کـە پیرێـژن بهێـنن بـۆ لای کـە پیرێـژن دەگـات دەڵـێ بۆچـی کچەکەت نـەناردووە بـۆ ڕسـتن و چـنین؟ پیرێـژن دەڵێـت کـوا مـن کچـم هەیـە گـەورەم، مـن بەتـەنها ژیـان دەکـەم تـا ئێسـتا کەسـم نـەبووە ئـیتر کچـی پاشـا چـی هـەر لـە خۆتـەوە کچـێکت بـۆم دۆزیوەتـەوە، کـوڕی پاشـا زۆری لـێ دەپاڕێتـەوە بـەڵام پیرێـژن هـەر ڕەتـی دەکاتـەوە کـە کچـی هـەبێت. پاشـان پیرێـژن مـەرجی ئـەبێت بـۆ ئـەوەی کچەکەی بهێنێـت مەرجەکـەش ئەوەیـە کـە دەبێـت سـەرەتا بچێتەوە بـۆ مـاڵ و مۆڵـەت لـە کچەکە وەربگرێـت پاشـان خۆشـی مـەرجی ئەوەیـە کـە دەبێـت زێـڕ و زیـوێکی زۆرم پـێ بـدرێت، کـوڕی پاشـا ڕازی دەبێـت بەهـەر مـەرجێکی بـەڵام کچەکەی بهێنێـت وە پاشـان پیرێژنـە دەچێتەوە بـۆ مـاڵ و بـە دنکـە هـەنارە دەڵێـت دەنکـە هـەنارە ڕازی دەبێـت و دەچـێت بـۆ مـاڵی پاشـا، کـە دەنکـە هـەنارە دەچێتە ژووری هـەموو لـە جـوانی و شـۆخ و شـەنگی سەرسـام دەبـن و بـە سەرسـامییەوە سـەیری دەکـەن، کـوڕی پاشـا زۆر بـە گـەرمی بـەخێرهاتنی دەکـات و پیرێـژن لـە باشـترین شـوێن دادەنـێن و دنکـە هـەنارە دەبەنـە لای کـوڕی پاشـا، بـەڵام دەنکـە هـەنارە ڕەتـی دەکاتـەوە دەڵێـت منـیش وەك کچـانی تـر دەچـم بـۆ چـنین کـوڕی پاشـا داواکـەی

---

[1] کۆمـەڵێك کۆدەبنـەوە و دەسـتەیەك پێـك دێـنن یـەکێك پێشـڕوییان دەکـات کـە کـار پێکـەوە دەکەن.

جـــێ بـــەجێ دەكـــات، وە دەڵێـــت هەرچـــی ویســـتی بیـــدەنێ خۆشـــی لـــەلای دادەنیشـێت، یەكـەم شـتە دنكـە هـەنارە داوا دەكـات دەڵێت قـاپێكی گـەورەم بـۆ بهێـنن لەگـەڵ هەنـدێك گـەنم دەبێـت خۆشـم بیكـوڵێنم گونكـە توێڵـە (مینـا) كـە داواكـەی دەبیسـتێت پاشـان كـە سـەیر دەكـات كـوڕی پاشـا لـەلای دانیشـتووە داوا دەكـات لـە كـوڕی پاشـا دەبێـت دەری بكـات و گـوێ بـۆ داواكارییـەكانی نـەگرێت وە لەیەكـەم بینینـەوە گونكـە توێڵـە (مینـا) دنكـە هـەنارەی خوشـكی ناسـیوەتەوە و دەزانێـت هـەمان خوشـكەكەی خۆیـەتی. بۆیـە زۆر نیگـەران دەبێـت پاشـان كـوڕی پاشـا داوای ڕەت دەكاتـەوە و دەڵێـت نابێـت دەركرێـت و لای دادەنیشـێت و گـوێ بـۆ قسـەكانی دەگرێـت هـەر دەنگـە هـەنارە ئـاگر دادەگیرسـێنێت لەگـەڵ خـۆش كردنـی هـەر جـارێكی ئاگرەكـە و كـولانی گەنمەكـەدا سەرگوزشـتەی خـۆی لـە سـەرەتاوە دەگێڕێتـەوە، هـەر لەسـەرەتای كـە دایكـی دەمرێـت تـا مـاڵی پیرێـژن و هـاتنی بـۆ مـاڵی پاشـا و نهـێنی هـەموو داواكارییـەكانی هـەمووی لەگـەڵ كـولانی گەنمەكـەدا تـەواو دەبێـت لەسـەر گوزشـتەكە. كـوڕی پاشـا هـەموو شـتێكی بـۆ ئاشـكرا دەبێـت، وە فـەرمان دەدات كـد دەبێـت (مینـا) بـە سـزای خـۆی بگـات و دوور بخرێتـەوە لـە مـاڵی پاشـا و چـەند ئەسـپ سـوار دەهێـنن (مینـا) دەبەسـتن بـەدوای ئەسـپەكانەوە و ئەسـپەكان دەبێـت غـار بـدەن تـا مینـا دەمرێـت، وە پاشان دەبێت لاشەكەی لە سەحرایەك بەجێ بهێڵن با دڕندە بیخوات.

كـوڕی پاشـاش دنكـە هـەنارە مـارە دەكـات و پیرێـژن وەك دایكـی دنكـە هـەنارە و كەسـێكی بـەڕێزی بنەكاڵـەی پاشـا لـە قـەڵم دەدرێـت و لـە مـاڵی پاشـا خزمـەت دەكرێـت وە ئاهـەنگێكی زۆر خـۆش بـۆ دنكـە هـەنارە ڕێـك دەخـەن. منـیش و ئێـوەش لـەو ئاهەنگـە بەشـداریمان كـرد و ئەوەنـدە هەڵپـەڕین تـا كەوشـەكانم هەمووی دڕا و دەممان شیرین كرد و ەخێر هاتینەوە.

= ئـەم ئەفسـانەیەش بـەوۆر شـێوەی تـر گێڕدراوەتـەوە، بـەڵام لـە هـەمووان زڕدایـك و خراپـی زڕدایـك لەگـەڵ كچـە بـێ دایـك و جوانەكـە: ئەمـەش پـاش كێشـەیەكی زۆر كچـە دەگاتـە ئامـانجی خـۆی و جـوانی و پاكییەكـەی دوا ڕۆژەكـەی دیـار دەكـەوێ و دەگاتـە ئـەو خۆشـیەی كـە لـە ئەفسـانان پاڵەوانـە ڕاسـت و پـاك و ئازاكان هیوای دەخوازن.

# زڕ داکێکی زاڵم

**کۆکردنەوەی: هەنار عبدالکریم**

**گێڕانەوەی: پورە فەهیمە**

**لەدایك بووی: ١٩٥٠خەڵکی: کەرکوك**

**پلەی خوێندەواری: نییە**

کچێك هەبوو ناوی (سەیران) بوو لە گوندی لەگەڵ دایك و باوکی دەژیا، ئەم کچە زۆر گوناح بوو ئەم کچەیە لە ماڵێکی زۆر دڵخۆش و کراوە بوون ژیانی ئەو ماڵە زۆر بە جوانی بەڕێوە دەچوو، سبەینان ئەم کیژۆڵە لەگەڵ باوکی دەچوو ۆ دەشت و دۆڵی ئەم گوندە، چونکە باوکی شوان بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان دایکی سەیران زۆر نەخۆش بوو کە ئێوارەکەی گەڕانەوە ماڵەوە دەبینێت دایکی زۆر نەخۆش و هیلاکە کە کچەکە چووە ژوورەوە گۆتی دایە گیان ئەوە چییە بۆ وات لێهاتیە ! ؟ لەو کاتە کچەکە تەمەنی (٧)ساڵ بوو ئەو کاتەش دکتۆر زۆر کەم بوو، دوو ڕۆژی پێچوو یەکسەر دایکی گیانی لەدەستداو مرد، کە مردیش کەس نەیزانی کە ئەم ژنە چ نەخۆشییەکی لێبوو یان بە ئیرادەی خوای گەورە مرد یان یاخود بە چ ئەم ژنە ۆ ماوەی دوو ڕۆژ نەخۆش کەوت و مردیش، بەڵام لەوکاتە سەیران زۆر گریا و دەیزانی کە ئەندامانی ماڵەکە یەکێکی لێ کەم بووەوە، وە دەیزانی کە دایکی وەفاتی کردیە بۆ ماوەی چوار مانگ باوکی و سەیران ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد وەکو هەموو ڕۆژێك بەڵام دایکی سەیران لەگەڵیان بەشدار نەبوو ئەمجارە، دوایی عالەم بەباوکی سەیرانیان گۆت بۆ بۆخۆت ژنێك ناهێنی تاکو سەیرانیش بەجوانی پەروەردە بکات، بەڵام باوکی سەیران یەکەمجار گۆتی نا، نەوەك لەگەڵ سەیرانی خراپ بێت، بەڵام دوایی ژنی هێنا لەبەر قسەی عالەمێ، ئەم ژنەی کە هێنای کە دڵ ڕەقە و زۆر خراپ بوو لەگەڵ ئەم کچە ناسکۆڵەدا، وە سەیران کچێکی زۆر جوان بوو ناسك و ئێسك سووك بوو، بەڵام ئەم زڕدایکە زۆر خراپ بووکە ئەم کچە تەمەنی زۆر بچوك بوو هەموو ئیشێکی پێ دەکرد و سەرەڕای ئەوەش کە کاری زۆری پێ دەکرد زۆریش لێی دەدا، کە ئێوارەکەی باوکی دەگەڕاوە دەیگۆت ئەگەر بە باوکت بڵێی سبەینێ نانی ناخۆیت، ئەم کچە بەستەزمانە نەیدەزانی چ بکات نەیدەتوانی هیچ قسەیەك بکات کە ئەم کچە هەرچەندی گەورەتر دەبوو جوانتر و ناسکتر دەبوو پاشان زڕداکەکەی کچێکی زۆر ناشرینی بوو کە زۆر ڕقی لە سەیران دەبووەوە لە دوایی (١٥) ساڵ تەمەنی سەیران بووە (٢٢) ساڵ بووە

گـەنجێکی زۆر جـوان و ناسـك، بـەڵام زڕ خوشـکەکەی زۆر ناشـرین بـوو کـەس کـەیفی پێ نەدەهات.

ئـەم دایکـە زۆر زاڵـم و کـافر و دڕندانـە دەجـوڵاوە لەگـەڵ ئـەم کچـە بەسـتەزمانە هـەموو ئیشـی نـاو مـاڵی پـێ دەکـرد گـۆتی دەبێـت بچـیتە بـەر چـێران و مـەڕ و مـاڵاتی ئـەو گونـدەش بـەڕێوە ببـات کچـە زۆر گریـا گۆتیـە بـاوکی باوکـە مـن نـاتوانم بەتـەنیا بـڕۆم تـۆش لەگـەڵم وەرە بـاوکی دەسـەڵاتی نـەبوو لەبـەر ژنەکـەی واتـە زڕدایکـی ناچـار بـوو ئـەم کچـە دەچـووە دەشـتێ تـاکو ئێـواران دەهاتـەوە ئیشـی نـاو مـاڵی هـەموو بـۆ جـێ بـەجێ دەکـرد، زڕ خوشکەکەشـی هیچـی نـەدەکرد، هـەر تـەنیا دەیخـوارد دەنوسـت و دەهـات و دەچـوو، وە هـیچ ئـیش و کـاری نـەدەکرد زۆر ناشـرین بـوو. ڕۆژێـك سـەیران چـوو بـۆ دەشـتێ لـەوێوە زڕ دایکـی بـە بـاوکی سـەیرانی گـۆت نـابێ ئـەم کچـە لـەم ماڵـە بمێنێـت دەبێـت لێـرە بـڕوات ئینجـا بـاوکی زۆر لێـی پـاڕاوە و پێـی گـۆت نـابێ ئـەم کچـە دەترسـێ و شـوێنی نییـە بـۆ کـوێ بچـێێت. بـەڵام زڕداکەکـەی گـۆتی مـن هـەق نییـە دەبـێ لێـرە نـەمێنێ ئـەم کچـە ئینجـا بـاوکی هەسـتا لەگـەڵ خـۆی بـردی بـۆ دەشـتێ گـۆتی بابـەگیان مـن کچـی تـۆم چـۆن دڵـت دێ وام لێکـەی دایکمـت بـەبیر دێ مـن زۆر گونـاه بـووم بـاوکی گـۆتی مـن نـاتوانم لەبـەر زڕدایکـت دەبـێ بـڕۆم بـاوکی ڕۆیشـت و ئـەم کچـە بەسـتەزمانە لـەم دەشـتە مـاوە هـەر بـەرەورێ ڕۆیشـت تـاکو گەیشـتە بـازێڕێکی گـەورە ئـەم کچـە زۆر تـێنی بـوو کـە ڕۆیشـت ڕووبـارێکی بچـوکی دیـت بـەرەو ئـەم ڕووبـارە ڕۆیشـت زۆری ئـاو خـواردەوە، ئینجـا لەسـەر ئـەم ڕووبـارە سـەری خـۆ شوشـت کـە تـەواو بـو ئـەم کچـە خـاوێن و زۆر جـوان بـوو کـوڕی پاشـاش ئـەم کچـە جوانـەی دی پێـی گـۆت بـۆ کـوێ دەڕۆیـت؟ کچـە زۆر ترسـا گـۆتی: ئـەڕۆم بـەرەو ئـەم ماڵـە گەورەیـە تـاکو وەکـو خزمـەتکار کـار بکـەم لەلایـەن ئەگـەر ڕێـم پێبـدەن ئـەویش کـە دیـتی زۆر کەوتـە دڵـی ئـەم کـوڕە وە پێـی گـۆت لەگـەڵم وەرە مـن ئیشـێکت بـۆ دەدۆزمـەوە. ئـەویش زۆر خـۆش حـاڵ بـوو گـۆتی: ئەگـەر وام بـۆ بکـەی تـاکو مـردن ئـەم چـاکەیەت لـەبیر ناکـەم بـەڵام ئـەم کـوڕە مـەرجێکی هـەبوو ئـەویش ئـەوە بـوو کـە پێـی بڵـێن کـە بۆچـی و لەبـەر چـی لـەوێ چـۆن هاتوتـە ئـەم جێگایـە کچـەش بـە گریانـەوە چـیرۆکی خـۆی هـەموو بـۆ کـوڕە بـاس کـرد کچـەکە نەیـدەزانی کـە ئـەم کـوڕە کـوڕی پاشـایە کـە چـیرۆکەکەی بـۆ گـوت پێکـەوە بـەرەو مـاڵی پاشـا ڕۆیشـتن بـەڵام کـوڕە بـە خزمـەتکارەکانی گـۆت پێـی مـەڵێن کـە ئـەو کـوڕی پاشـایە! ئـەوانیش لـە دواییـدا ڕازی بوون.

لـەم کاتـە کـە ئـەم کچـە کـاری زۆر جـوانی دەکـرد وای لێهـات کـە کـوڕی پاشـا تـەنها لـە دەسـتی وە یـاخوت ئـەو نـان بخـوات. تـاکو ڕۆژێـك دایـك و بـاوکی ئـەم کـوڕە واتـا پاشـا و ژنـی پاشـا گۆتیـان کـە کوڕیـان گـەورە بـوو بۆیـە دەبـێ ئەمـە بـەدوای ژنێکـدا بگـەڕێن بـە

مـەرجێك ژنەكـە لـە ماڵـەكی بـەناوبانگ بێـت لـە دوايـيـدا سـەيرانيش كوڕەكـەی خـۆش دەويست كـە پاشـا زانـی كـوڕی پاشـايە زۆر خـەمی خـوارد و گـۆتی دەبـی لـە بـيری كـەم ئينجـا كـوڕە ڕازی بـوو گـۆتی دەبـێ كچـانی بازێڕمـان و گونـدەكانی دەوروبـەرمان هـەموو بهێـنن تـاكو منـيش كچـێك هەڵبـژێرم و لەگـەڵ هـەموو خزمـەتكارەكانی هـەموو جێگايـەك ئـەوانيش لـە يەكەمـەوە ڕازی نـەبوون، بـەڵام كـوڕە پاشـا خـۆی نـەخۆش كـرد لەدوايـيـدا ڕازی بـوون كـە ئـەم هەواڵـە بـە زڕدايكـی سـەيران گەيشـت گـۆتی دەبـی ئـەمن بڕۆم ۆ ئـەوەی تـاكو كچی مـن ببێتـە خێزانـی كـوڕی پاشـا تـاكو ئـەم سـەروەت و ماڵـە بـۆ كچـی مـن بمێنێتـەوە تـاكو ئێمـەش دەوڵەمەنـد بـين هەڵسـا چـوو بـۆ بـازاڕ گـرانترين كـراس و جـوانترين كراسـی ۆ كچـە ناشـيرينەكەی كـڕی ئـەم لـەم كاتـەدا سـەيران گـۆتی مـن نـاتوانم بـڕۆم چـونكە مـن هـيچ كراسـەكی ديكـەم نييـە لەبـەری كـەم، بـەڵام سـەرۆكی خزمـەتكارەكانی مـاڵی پاشـا گـۆتی مـن كراسـەكم هەيـە هـی كـاتی كچـێنيمە ئەگـەر بتـوانی بۆخـۆت دەسـتی تێـوەردەی چـاكی كـەی مـن دەتـدەمێ ئـەويش زۆر خۆشـحاڵ بـوو گـۆتی بـەڵێ بـەڵێ مـن دەتـوانم چـاكی بكەمـەوە، ئينجـا هەڵسـا سـەيران كراسـەكەی جـوان كـرد و لەبـەری كـرد جـوانتری لێـدەهات لـە كـاتی هاتنـە دەرەوەی ئـەو هـەموو خەڵكـە تەماشـای سـەيرانيان دەكـرد و تەماشـای جـوانی ئـەم شـۆخە جوانـەيان دەكـرد ئـەويش زۆر شـەرمی دەكـرد كـە گەيشـتە بـەر دەرگـای پاشـا پـێش بـڕۆن بـۆ ژووریێ هـەر لـە هـەمان كاتـدا كـوڕی پاشـا بەتـەمای سـەيران وەسـتا بـوو، ئينجـا لـەو كاتـەدا زڕدايكـی لـە پـێش دەرگـا سـەيرانی دی و پێـی گـۆت تـۆ كێـی ئـەويش ديـتی زانـی كـە ئەمـە زڕدايكـيتی گـۆتی تـۆ زڕدايكـی هـات هـەڵێت ئـەويش هـات لەبـەردەمی سـەيران گريـا و گـۆتی مـن زۆر پەشـيمانم مـن نـاتوانم لـەخۆم خـۆش بم ئينجـا چـۆن تـۆ لـە مـن خـۆش دەبـی ئـەويش بـە هـەموو سـادەيی و سـاكاری خـۆی گـۆتی هـەر چـۆنێك بـێ تـۆ دايكـی مـنی و كچـت خوشـكمە و پياوەكـەت باوكمـە ئينجـا مـن لـە هـەمووتان خـۆش دەبم ئـەويش بـەفێرەوە گـۆتی دەتـوانی ئێسـتا بـڕۆين بـۆ ماڵـەوە تـاكو كراسـە جوانەكـەی لەبەركـەی ئـەويش گـۆتی نـا سـوپاس كراسـەكەم هـيچ عـەيبی نيـە. ئـەويش گـۆتی نـا چـۆن دەبـی لەگـەڵ كراسـی خوشـكتم كـڕی گـۆتم دەبـی بـۆ سـەيرانيش بكـڕم ئەگـەر چـی لێـرە بيـت يـاخوت لێـرە نـەبيت ئـەم كچـە بەسـتەزمانە زۆر خـۆش بـاوەڕ بـوو هەڵسـا بـەزم و ڕەزمـی مـاڵی پاشـای بـەجێ هێشـت و بـەدو زڕداكەكـەی كـەوت و تـاكو گەيشـتەوە ماڵـەوە كـە گەيشـتە پـێش دەرگـای ماڵـەوە زڕداكەكـە ڕقـی خـۆی لـێ دەرهێنـاوە پێـی گـۆت بـڕۆ ژووریێ تـاكو كچـم بـدەم بەشـوو بـۆ كـوڕی پاشـا تـاكو ئێمـە پارەمـان هـەبی وە بـا پێـت بڵـێم باوكيشـت مـردووە لـەو كاتـەوەی كـە ئـەتوی لەدەشـتێ بـەجێ هـێشـت، ئينجـا ئـەم كچـە بەسـتەزمانە تەحـەمولی ئـەو هـەموو شـتەی نـەكرد يەكسـەر دڵـی لـەخۆ بـۆوە، لـەخۆ چـوو لـەو كاتـەدا كـوڕی پاشـا بەتـەمای سـەيرانە ئـەو

هـەموو بـەزم و هەرایـەی کـرد لەبـەر خـاتری چـاوی سـەیران ئینجـا کـە کچـەکانی بـاژێڕ و گونـدەکان کۆبوونـەوە زڕداکەکەشـی کچـە ناشـیرینەکەی بـرد لەگـەڵ کراسـی سـەیران، وە کـە ڕۆیشـتن بـەرەو مـاڵی پاشـا کـوڕە پاشـا هـەروا چـاوی خـۆی دەگێـڕێ بـەدوای سـەیران کەچـی دیـار نـەبوو بـەلام خـۆی پـێ نـەگیرا و بـەرە و ژووری خزمـەتکارەکان ڕۆیشـت و بـە سـەرۆکی خزمـەتکارەکانی گـۆت کـوا سـەیران؟ مـن بەتـەمای ئـەو وەسـتایمە ئـەویش پێـی گـۆت لـە مێـژە سـەیران هاتۆتـە دەرەوە بـەرەو ئاهەنگەکـە کـوڕەش زۆر سـەری سـوڕما وە گـۆتی مـن دەڕۆم بـەدوای دەگـەڕێم کـە ڕۆیشـت بـۆ نـاو ئاهەنگەکـە وەکـو شـێت لـەم کچـەیە دەگـەڕا وە نـازانی کـە خۆشەویسـتەکەی وا دەسـتگیر کرایـە لەلایـەن زڕداکەکـەی کـە ڕۆیشـت بـۆ ئاهەنگەکـە کـە ئـەم ئاهەنگـە دەسـتی پـێ کـرد کـوڕی پاشـا زۆر دڵـی تـەنگ و نـاخۆش بـوو وە گوتیـە دایـك و بـاوکی ئـەوەی ئـەمن دەمـەوێ نـەهاتووە مـن کـەس هەڵنابـژێرم تـاکو خۆشەویسـتەکەم نـەبێ، ئـەوە ئـەوی هەڵنەبـژێرم ئینجـا دایـك و بـاوکی ڕازی نـەبوون وە گۆتیـان دەبـی هـەر کچێك بۆخـۆت هەڵبـژێری چـونکە نابێـت بنەماڵەکـەمان پلـەیان نزم بێتەوە بەرە و پاشایەکانی باژێڕەکانی تر.

ئـەویش گـۆتی مـن کـەس هەڵنابـژێرم تـاکو سـەیران نـەبێت لـەم کاتـەدا دەبینێـت کچـە ڕەشـەکەی خوشـکی سـەیران و زڕدایکـی هاتوونـە لای پاشـا بەچـاوی پـڕ لـە فرمێسـکی بـە درۆوە گـوتی کـوڕە پاشـا مـن هاتوومـە بـۆ لای سـەیران مردیـە وە گـۆتی ئەگـەر بەڕاسـتی ئـەمنی خـۆش دەوێ دەبـی خوشـکی مـن بهێنێـت لـە جیـاتی مـن تـاکو ژیـانی خوشـکم وەکـو منیلـێ نـەبێت کـوڕی پاشـا پێـی بـاوەڕ نـەکرد چـونکە ئـەو هـەموو ڕاسـتییەکانی دەزانـی گـۆتی مـن پێـت بـاوەڕ ناکـەم بەڵـەت چییە بەرامبـەر ئـەم قسـەیەی کـە دەیکـەی؟ گـۆتی ئـەم کراسـەیە گـۆتی مـن وا دەمـرم بـەلام بـەم کراسـەیە بـاوەڕت پـێ دەکـات کـە سـەرۆکی خزمـەکارەکان کراسـەکەی دیـت گـۆتی بەڵێ ڕاسـتە ئـەم کراسـەیە هـی منـە کـە دابـووم بـە سـەیران بـەلام پێم بڵـێ چـۆن مـرد؟ گـۆتی کـە ئـەمنی دی لەگـەڵ خوشـکەکەی یەکسـەر دڵـی لـەخۆ چـوو دوایـی ئـەم قسـانەی کـرد و مـرد، بـەلام کـوڕە پاشـا هـەر بـاوەڕی پـێ نـەکرد. یـەلام ئـەو وایزانـی لـە ترسـان خۆشەویسـتەکەی مردیـە هەڵسـا زڕداکەکـەی لەگـەڵ کچـەکەی دەرکـرد وە یەکسـەر کـوڕی پاشـا دڵـی لـەخۆ چـوو ئـەم کـوڕە بـۆ مـاوەی یـەك مـانگ هـەر نـەخۆش بـوو، بـەلا زۆر بـیری لـە سـەیرانی دەکـرد وە کـە چـۆن بـینی و چـۆن خۆشیویسـت چـۆن لێـك جیـا بوونـەوە بـەلام ئـەو هـەر لـەو بـاوەڕەی دابـوو کـە مردنـی هـۆی ترسـانەکەی بـووە لـە زڕداکەکـەی ئینجـا زڕداکەکـەی وە پێشـانی سـەیرانی بەسـتەزمان هـەموو ئیشـی نـاو مـاڵی بـۆ دەکـرد. وە هـەموو ڕۆژێـك تێـری لـەم کچـە بەسـتەزمانەی دەدا، وە ڕۆیشـت بـۆ جێگایـەکی زۆر دوور تـاکو کـوڕی پاشـا پێـی

نـەزانێت زۆرجـار سـەیران دەویسـت هـەڵێ بـەڵام نـەیتوانی گـۆتی ڕۆژێـك سـەیران بـە زڕداکەکەی گـۆت مـن ئـەڕۆم بـۆ ئـەم بـازێڕە شـت دەکـرم لـەجیاتی تـو ئـەویش سـەیری کـرد و گـۆتی بـاش بـەڵام ئەگـەر هـەڵاتی ئـەوجارەی بەڕاسـتی دەتکـوژم ئـەویش گـۆتی مـن بـۆ هەڵـدێم ئـەو کەسـەی خۆشمدەویسـت لەدەسـتم چـوو ئێسـتا بـۆ خـۆی ژنێکـی تـری هێنـاوە و هیـوادارم دڵـی خـۆش بـێ وە ژیـانی سـەرکەوتوو بـێ. بـەڵێنت پـێ دەدەم هەڵنایـەم چـونکە نـە دایکـم و نـە بـاوکم مـاوە لـەتۆ زیـاتر بـۆ کـوێ بچـم؟ پاشـان زڕداکەکـەی پێـی گـۆت باشـە زۆری مـەڵێ بـڕۆ بـۆ بـازاڕ. بـەڵام پـێش نیـوەڕۆ لـە مـاڵ بیـت. ئـەویش گـۆتی باشـە کـە ڕۆیشـت بـۆ بـازاڕ دەبـینی زۆر قەڵەباڵغـە خـەڵك زۆر هاتووچـوو دەکـەن ئـەویش پرسـی ئەمـە چـییە؟ گۆتیـان ئـەوە کـوڕی پاشـای فـلان بـازێر هاتیـە بـە میوانـداری وە دەڵـێن زۆر کـوڕێکی قـۆز و جوانـە ئـەویش بـیری لـە خۆشەویسـتەکەی کـرد کـە لـەم کچـەی تێپـەڕی کـوڕە شـتێکی وەبـەر چـاوی کـەوت گۆتیـە خزمـەتکارەکانی ئەسپەکە ڕاگـرن هەنـدێ ئیشـم هەیـە لێـرە کـە هاتـە خـوارەوە یەکسـەر سـەیرانی دیـت یەسـەر کچـەکە لەخۆشـیان دڵـی لـەخۆ بـۆوە لـەخۆی چـوو کـوڕە پاشـاش دیـار بـوو هـیچ کەسـی هەڵنەبـژاردبوو بیکاتـە هاوسـەری خـۆی یەکسـەر سـەیرانی لەگـەڵ خـۆی بـردەوە بـۆ مـاڵی ئـەو پاشـایەی کـە سـەیران لـەو بازێڕەیـە بردیانـە ژوورەوە پاشـا گۆتیـە خۆشەویسـتی سـەیران ئـەم کچـە پـیس و پەڵۆخـە کێیـە پێتـە؟ ئـەویش بـە تـوورەیی پێـی گـۆت تـۆ دەزانـی کچێکی چـۆنە بـۆ ئـەوەهای پـێ دەڵێـی لـەناخی ویـدا دەژی تـاکو بزانـی ئـەم کچـە باشـە یـان نـا بـاش بزانـە ئـەم کچـەیە لـە مـن و تـۆش خـاوێنترە! ئینجـا کچـە هێـدی هێـدی هاتـەوە سـەرەخۆی کـە هەسـتاوە کـوڕی پاشـای لەکنـە گـۆتی تـۆی لێـرە وامزانـی خەونـە پێـی گـۆت نـا ئازیزەکـــەم خـــەون نییـــە ڕاسـتییە وە هـــەر پێکـــەوە دەژیـــن یەکســـەر چـــوون زڕداکەکـەیان هێنـا لەگـەڵ خوشـکەکەی بـە سـەیرانیان گـۆت چییان لـێ کـەین؟ گـۆتی هـیچ مـن لـەناخی دڵمـەوە لێیـان دەبـوورم زڕداکەکـەی ئـەمجارە بەڕاسـتی بەسـەیرانی گـۆت کچـە لـە دایـك و خوشـکی بـەرەو گونـدی خۆیـان ڕۆیشـتن سـەیران و کـوڕی پاشـاش بـەرەو بـازێڕی خۆیـان ڕۆیشـتن وە گەیشـتن بەشـتێك و ژیانـەکی خـۆش بەسەریان برد لەگەڵ یەکتر.

– لـە حەکایـەتی کوردەواری، زۆر چیرۆکی گرنگ و ئەفسـانەیی بـۆ کچـە جـوان و بـێ دایکەکـە و کچـە ناشـرین و زڕدایکەکـە داڕێـژراوە. لـەم جـۆرە حەکایـەت و ئەفسـانانە پـاش بگـرە و بەردەیـەکی زۆر کچـە بـێ دایـك و جـوان و عەقڵەکـە بـەمرازی خـۆی دەگـات، ئـەوەی ئـەم حەکایەتـە لـە زۆر حەکایـەتی تـری ئاوهـا جیـا دەکاتـەوە دڵسـاف و لێبـوردەیی (سـەیران)ە، سـەیرانیش نـاوێکی تازەیـە و لـە کچە جوانەکە نراوە.

# کیــژێ پاشــای

**کۆکردنەوەی: ئاشنا جەمال سلێمان**

**شلێر عبداللە مەغدید**

**گێڕانەوەی: نسار تۆفیق غەریب**

هــەبوو نــەبوو داکــەك و کــوڕەکی فــەقیر هــەبوون لــە گونـدەکی، ئــەو کــوڕە ڕۆژێ بــە سـی درهــەمان چــوویتە ئیشــێ ڕۆژەکــی دەچــیتە ئیشــێ لەســەر ڕێــی دەبــینی ســێ کــەس دانیشــتینە خــەریکی گەمــە کــردنن لەســەر کودییــەکی. بــەکنیان دادەچــی و ســەلامیان لــێ دەکــا و لێیــان دەپرســی دەرێ ئــەنگۆ چ دەکــەن؟ ئــەوانیش دەرێــن ئەمــە گەمــەکی دەکــەین لەســەر ئــەو کودییــەی هەرکــەس بیباتــەوە دەبێتــە هــی خــۆی. ئــەویش ئەگــەر ئــەمنیش بــێم بکــەم و بردمــەوە دەدەنــە منــیش. ئــەوانیش دەرێــن ئــا. ئــەویش دەگــەوان دادەنیشــی هــەتا مــەلا بــانگ دەدا کــە مــەلا بــانگ دەدا هەردەســتی دەســت نوێــژێ دەشــوا و نوێــژێ دەکــات و دێتــەوە ســەر گەمەکــەی هــەتا دەیباتــەوە هەرناســتی دوایــی دەیباتــەوە کودییەکــەی دەدەنــێ.دەچــیتەوە مــاڕێ داکــی دەرێ کورشــە پــارەم بــدێ بــە شــەکر و دەرمــان بــدەم نــەن مایــە. ئــەویش دەرێ ئەوڕۆکــە نەچــویمە ئیشــێ ئیشــم پــێ نەکرایــە نــەخۆش بویمــە. لــۆ سبەینێ دەچــیتە ئیشــێ لەســەر ڕێــی ئیشــێ بــەکن مــاڕێ پاشــای دادەچــی کیــژی پاشــای لەســەر بــانی دەبینی، دێتــەوە دەرێتــە داکــی دەبــی بچیە داخــوازیێ کیــژێ پاشــای، داکیشــی ســێ ڕۆژان لەســەر یــەك دەچــیتە مــاڕێ پاشــای و دێتــەوە نــاوێری لەبــەر مــاری پاشــای وەبــێ کوڕەکــە دەرێتــە داکــی نەچــووی؟ داکــی دەرێ چــوویمە بــەس نەوێرایمــە وەبــرێم. جــارەکی دی دەچــیتەوە ئــەوجارە ژنــێ پاشــای دەرێ داپــیرە لــۆ چ هــاتی چ ئیشــت هەیــە؟ ئــەویش دەرێ یــەك تاقــە کــوڕم هەیــە دیــارە عەجــەلی بەدەســتی پاشــای هاتیــە داوای کیژەکــە و دەکــاتن. ئــەویش دەرێ چ قەیدیــە ئەگــەر قســمەت بــێ هــەردەبی دوایــێ ژنــێ پاشــای دەچــی وارێتــە پاشــای دەرێ ئــەو مــارە فــەقیرە هاتینــە بــۆ کیــژێ مــە داوای کیــژێ مــەیان کردیــە. پاشــاش تــوڕە دەبــی دەرێ کــو دەبــی ئــەو فــەقیرە داوای کیــژێ مــن بکــاتن دوو خورامــان دەنێــری لــەدو کــوڕە فەقیرەکــە ئــەوانیش دەچــن لــۆی دەیــنن و پاشــاش دەرێ: ئــەتوو چــی داوای کیــژێ مــن دەکــەی پاشــا زۆر پێــی ســەیرە کــە ئــەو فــەقیرە داوای

کیـژێ وی بکـا. کوڕەکـەش دەرێ: پاشـام خـۆش بـی ئـەتو هێـزی خـۆت هـەمووی بینـە ئـەمنیش هـەموو هێـزی خـۆم دینم ئەگـەر ئـەمن لـە تـوم بـردەوە ئـەوە دەبـی کیژەکـەتم بـدەیێ. پاشـاش دەرێ باشـە ڕازی دەبـی. پاشـاش دەچـی چـەند خـزم و کـەس و خـورام و هـەموان خـڕ دەکاتـەوە هـەتا لـە کـوڕە فوقیرەکـە بـدەن و بەسەریدا سـەربکەون کیژەکـەی نـەدەنێ. کـە وەخـتی خـۆی دادێ کوڕەکـە دەچـی خـۆی ئامـادە دەکـا و کەچـە سـاقۆیەکی لەبـەر دەکـا و کودیەکـەی دەباغـەرێ خـۆی دەنـێ و بـە تـاقی تـەنێ دەچـی. کـە دەگـاتێ دەرێ پاشـام خـۆش بـی هـەر ئەوەنـدە هێـزەت هینایـە؟ پاشـا دەرێ ئـا. کوڕەکـە دەرێ ئەوەنـدە کەمـە هەنـدەکی دیـش بینـە. پاشـاش دەچـی هەنـدەکی دیـش دیـنی هـەموان خـڕ دەکاتـەوە هـەتا لـە کـوڕە فەقیرەکـە بـدەن و هـەردوولا خۆیـان ئامـادە دەکـدن و دەیانـەوێ بچـن لـە کوڕەکـەی بـدەن کوڕەکـەش دەچـی کودییەکـەی لـە باغـەرێ دردیـنی سـەری دەکاتـەوە زەنگـەزۆرەی تێدایـە بـەڕەلآیان دەکـاتن بـە خەرکەکەیـەوە دەنوسـێ زۆری بـە خەرکەکـە و پاشـای وەدەدەن و تـا خەرکەکـە زۆر داوای لێدەکـەن کـە ئـەو زەنگەزۆرانـەیان لـەکۆر کاتـەوە ئـەویش لـە دیاریـان ڕاوەسـتایە و تەماشـایان دەکـاتن کودیەکـە لەسـەر دەسـتییە زۆر رەجـای لێدەکـەن ئـەویش دەرێ کودیلـە زوو، ئەکسـەر زەنگـەزۆرەکان دەچـنەوە نـاو کودییەکـە و سـەرەکەی قـەپات دەکاتـەوە چـۆوە مـارێ خـۆ خەرکەکـەی هـەموو کـەڕ و کـۆر کـرد. ماوەیـەکی پـێ دەچـێ هـەتا خەرکەکـە و پاشـا چـا دەبنـەوە ئـەوجا پاشـا لـە دوای دەنێـرێ دەرێ بـابێ. کوڕەکـەش دەچـی پاشـا دەرێ بـا کیژەکـەم بۆتـوو بـی کـوڕە فەقیرەکـەش دەرێتـە پاشـای خـۆ ئـەوها ئـەمن کیـژی تـوم نـاوێ دەبـی مـار و زێـڕ و خانیشـن لـۆ بکـەی ئـەوجا دەم هـەوێ. ئـەتوو چ بخـۆی ئـەمنیش ئـەوی دەخـۆم دەبـی داکیشـم ئـەوی بخـوا ئـەوجا پاشـا کیژەکـەی دەداتـێ مەسـرەفی لـۆ دەکـا و ئاهەنگەکـەش لەسەر پاشای دەبی ئەمنیش هاتمەوە هیچم پێ نەبرا.

= **ئەگـەر لـە واقیعـدا پاشـاکان خـوێن و فرمێسـکی هـەژاران دەڕێـژن و بەرهـەمی مانـدوو بـوون و ئارەقـەیان دەخـۆن، ئـەوا لـە حەکایـەت و ئەفسـانان، کـوڕە هـەژار زۆرجـار بـەزۆر شـێوە کچـی پاشـا دەخـوازێ و هەنـدێ جـار دەشـبێتە پاشا.**

# سەر کودیلە

**گێڕانەوەی: شکریە مستەفا قادر**

هەبوو نەبوو لە گوندەکی منداڕەك هبوو پێیان دەگوت سەر کودیلە، ڕۆژەکی سەر کودیلە منداڕێ گوندی هەمووی خڕ دەکاتەوە ودەرێ وەرن بابچینە داران، دەچنە داران و داران دەکەن و دەخافرێن. هەتا شەویان بەسەردا دێ دەنگی سەیان دێ لەو لاش تەماشا دەکەن چرایەك پێکرایە، سەر کودیلە دەرێتە منداڕەکان لە دوو دەنگێ سەی ناچین سە دەن خۆن با بەدوو ئاگریدا بچین بزانین ئاوەدانی لێیە. دێوەکە لە ژوورێیە کە دەبینی کۆمەرە منداڕەك دەچنە ژۆرێ زۆر پێی خۆش دەبی فەرمووی لە منداڕەکان دەکات و دەیانباتە ژوورێ دێوەکە دەرێتە منداڕەکان بنوون، دەرێ ئەوشۆکە منداڕەکان هەموان دەخۆم. دێوەکە دەسەریان دەسوڕێ دەرێ: کێ خەفیە؟ کێ نەخەفیە؟ یەکێك لە منداڕەکان دەرێ مامە سەر کودیلە نەخەفیە. دێوەکە دەرێ: سەر کودیل لۆ ناخەفی؟ سەرکودیلە دەرێ: داکم هەموو هێواران گەنمی لۆ دەکردینە برێشکە هەتا نەن خواردبانە نەدەنوستین ئەویش دەرێ: سەر کودیلە چەندی گەنم ببرژێنم؟ سەر کودیلە دەرێ: بێرژێنگەك. دێوەکە گەنمی برژاند منداڕەکان خواردیان و چوونەوە بنجێ. دێوەکە ئەوجارە دیسان گۆتی: کێ خەفیە؟ کێ نەخەفیە؟ یەکێك لە منداڕەکان دەرێ مامە سەر کودیلە نەخەفیە. دێوەکە دەرێ: سەر کودیل لۆ ناخەفی؟ سەرکودیلە دەرێ: کە هێوارە دادەهات داکێ مە دەچوو لە کانیێ ئاوی لۆمە بەسەرەدێ دەینا. دێوەکە دەچی ئاوێ بینی سێ جاران دێتەوە دەرێ سەر کودیلە داکت کو ئاوی بەسەرەدێ دێنی؟ ئەویش دەرێ: داکێ مە دەچووە سەفینی بنیشتە تاری دەینا بە بنیشتە تارەکەی کونە سەرەدەکانی پێ قەپات دەکرد. ئەوجارە دەچی بە بنیشتە تاری کونەکان قەپات دەکاتن دەچتەوە کانیێ ئاوی بینی. کە دێوەکە دەڕوا سەر کودیلە دەرێتە منداڕەکان با هەربێین ئەوە دێوە ئەوشۆ لێرە بمینێینەوە هەموان دەخوا هەتا سبەینێ ئەوجا سە رکودیلە منداڕەکان خڕ دەکاتەوە دەرێ دوو دەستی یەك بگرن. ڕێی بزر دەکەن ناچنەوە گوندی خۆ لە شەوێ هەتا سبەینێ بەڕێیەوە دەبن خەرکەکە لە خەوێ هەردەستن دەچن نوێژی

بکەن دەبینن کۆمەرە مندارەك لەسەر گوندەکی دانیشتینە خەرکی گوندەکە ی مندارەکان دەبەنەوە ماریّ نانیان دەدەنیّ دوو سواریان دەکەن بە وراغان دەیانبەنەوە گوندەکانی خۆیان مندارەکان دەبەنەوە کن دایك و بابیّ خۆیان و داك و بابەکانیش زۆر کەیف خۆش دەبن و مەمنونی خەرکیّ گوندەکەی دەبن و ئەمنیش هاتمەوە هیچم پیّ نەبرا.

- دێو لەگەڵ ئەوەی هێزێکی زۆری هەیە و زۆر هۆش هەن کە سودیان لیّ دەبینیّ، بەلام، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەفسانە و حەکایەت گێلی و ساویلکەیی دێو دەکاتە خاڵی لاواز و بەم خەڵە لاوازە لە بەرامبەر عەقڵی مرۆڤ – هەندێك لە مرۆڤەکان. نەك هەموویان – دەدۆڕێنیّ!!

# پیر عەولکە

دەرێن لە نێزیک گوندەکی پیر عەولەك هەبووە پیر عەولکە و دێو مرۆڤیان خواردیە. مەغریبەکی پیر عەولکەك لە دەرکێ مارەکی دەدا دەرێ ئەمن فەقیرم ئەوشۆکە ڕام بگرن ڕێم دوورە. مارەکەش تازە بوکیان هینا بوو. بوکەکە دەرێتە خەسووی کچێ مامۆژن ئەوە پیر عەولکەیە بەشەر نییە ئەوشۆ هەموان دەخوا. پیرەژنەکەش دەرێتە بوکێ خۆی ئەتوو دونێ هاتیە مارێ من بەتەمای خێری لەمارێ من ببەیە دەرێ ئەمن ئەو خێرەی نەکەم فەقیرە ئەوشۆکە لێرە دەبی سبەینێ دەڕوا، ئەو شەوەی لەوێ دەمینێتەوە مارەکە خێزانێکی زۆر بووینە کە وەختی نوستنێ دادێ هەموو دەنوون بووکەکە دەچی خۆ دەشاریتەوە دەزانی پیر عەولکەیە خۆی لەناو کای دەشارێتەوە لەناو کای دەبی. پیر عەولکەش دەزانی هەموو نوستینە دەچی دەرمانی دینی و بەسەریان دادەکا هەتا پێ لەخر بچن گوریسیشی بیبەکەرە وماتیان پێ دادەکا بە گوریسی دەیان بەستیتەوە لە دووخۆیان ڕادەکێشی دەیان باتە سەر گوفەکێ پیر عەولکەش بە هەموو تاقەتێ خۆ هاوار دەکا و دەرێ هەرێمەتێ هەرێمەتێ نێچیر گرتیە و وێم ڕامەتێ بانگی پیر عەولکەکانی دی دەکا دەرێ وەرن نێچیرم گرتیەو ئارێم کەن، خەرکێ گوندەکەش دەرێن دەبی ئەوشۆ پیر عەولکە مارێ کێی کۆرکردبیتەوە هەموویان دەچن و تەقەی لێ دەکەن و پیر عەولکەکە هەردێ دەچیتەوە جێی خۆ. خەرکەکە دەچن کەلەشەکان دەبەنەوە مارێ دەیان بەنە ژۆرێ بووکەکەش لەناو کادینەکەی دێتە دەرێ بووکەکە دەرێ ئەمن دەزانم چایان بکەمەوە دەچی چارۆکی خۆی دەسوتێنی تۆزێ چارکە سوتایەکەیان لە کونی کەپوویان دەکا چایان دەکاتەوە. بووکەکە دەرێ نابی خەسوی بینەوە چاکی ناکەمەوە بەقسەی منی نەکرد هەتا ئەوهان بەسەر هات. خەرکەکەش ڕەجای لێ دەکەن کە ئەویش چاك بکاتەوە ئەویش لەبەر خاتری خەرکەکەی چاکی دەکاتەوە خەسووەکەشی وەعدی بە بووکەکەی دەدا کە ئەوجارە لەقسەی دەرنەچی. پیر عەولکەش زۆر غەمبار دەبی و دەرێ جامبازەکە وەی لە من کرد بووکەکە وەی لەمن کرد.

- لەم ئەفسانەیە کە باسی دێو و پیر عەولکە دەکات، وا دێـە بەر چاو کە پیر عەولکە لە دێو پتر لە مرۆڤ نزیك بێ و واپێدەچێ مرۆڤە دێو بێ، بەپێی دەقەکە.

# برادەر

**گێڕانەوەی: شکریە مستەفا قادر**

دوو برادەر دەبن دوو برادەرەکە دەڕێن با لۆ ئیشی بچینە ئێرانی یەکێ گۆشە نانەکی دەباتن هەتا دەگەنە حاجی ئۆمەران نانی یەکێکیان تەواو دەبێت بەڵێنی بەیەکتر دەدەن کە خیانەت لە یەکتری نەکەن کە نانی برادەرەکەی تەواو دەبێت برادەرەکەی تر دەڕێتە برادەرەکەی خۆی تەواو نانی من با ئی تو بخۆین، برادەرەکەی دەرێ وەڵا ئەمن نانی خۆت نادەمێ گۆشە نانەکەی لەپشتی خۆی هەردەدا و دەڕوا دەچێتە ئێرانێ برادەرەکەشی شەوی بەسەردا دێ شەوێ دەچێتە ئەشکەفتەکی لەناو ئەشکەفتەکەی دوو کونی تێدا بوو لە هی دەعبا و شتی دەچوو خۆی شاردەوە دوایێ گورگ و شێرێك هاتنە ژووری گورگەکە دەڕێتە شێرەکەی مام شێر ئەوڕۆك هیچت پەیا نەکردیە؟ دەرێ ناوەڵڵا ئەو زگمە دێشی لەبرسان ئەوجا وەرە نانت لێ بڕابێت پێت نەکرێ خێری لێ ببینی شێرەکە دەڕێتە گورگەکەی ئەدی ئەتو مام گورگ ئەویش دەرێ ئەمنیش هەروەکی تو ئەوجە وەرە نەتوانی خێر لە خەزێنەی ببینی کە سبەینە دادێ پیاوەکە دەچی جێی شێرەکەی هەردەداتەوە یەك توورەگە زێڕی دەبینتەوە کە کیژێ پاشای نەخۆشییەکی گرتیە پیاوەکەش لە خەونێدا عیلاجی کیژێ پاشی دەبینی کە بەخینی سەی چاك دەبیتەوە دەگاتە شوانەکی شوانەکە سەیەکی پێیە دەرێ ئەرێ کاکە ئەو سەیەی نافرۆشی ئەویش دەرێ کاکە ئەو سەیەت لۆ چییە ئەویش دەرێ بفرۆشی دە لیرەت دەدەمێ ئەویش دەیداتێ دەرێ هانی ئەوە (٥) لیرەیتریشت بدەمێ لۆم بکوژەوە ئەویش دەرێ باشە دەرێ هانی ئەوە (٥) لیرەی دیش خوێنەکەم لۆ دەناو شتەکی بکە ئەویش دەرێ باشە، ئەوجا دەچتە کن پاشای دەرێ ئەمن دەزانم کیژێ تو چاك بکەمەوە پیاوەکی غەریب بوو پاشا فشەی پێ دێ دەرێ ئەمن ئەو هەموو عیلاجەم لێکرد چا نەبۆوە ئەتو کو دوتانی چاکی بکەیەوە دوایێ ڕازی دەبی دەرێ باشە بەس چاکی بکەیەوە هەرچی برێی دەت دەمێ بەس ئەتو لێ بگەڕێ ئەمن بەخۆ بچمە ژۆرێ دەرێ باشە پیاوەکە دەچی بەخوێنی سەی کیژەکەی چەور دەکا پاشی چەند ڕۆژان کیژەکە چاك دەبیتەوە پاشاش

دەڕێتە پیاوەکەی هەڕو مەلای بینە و مارەی کە کیژەکەی دەداتێ و دوکانەکی گەورە دادەنێ ماری دەداتێ، ڕۆژەکی برادەرەکەی دێتەوە پێش دوکانی برادەرەکەی دەرێ ئەرێ ئەتو فران کەس نی؟ ئەویش دەرێ بەرێ وەڵلا برادەرەکەی لێی دەپرسی دەرێ باشە ئەدی ئەتو نەچوبوویە ئێرانێ لێرە چ دەکەی دەرێ بەرێ وەڵلا بەس هیچم ئیشم وەدەست نەکەوتیە، ئەدی ئەتو بە چ ئەو مارەت پەیا کردیە ئەویش دەرێ کە لەتو جودا بوومەوە شەوێ لە ئەشکەفتێ مامەوە گورگەك و شێرەکی لێبوو خەزێنەی بن پێی شێرەکەم هێنا ئی بن پێی گورگەکش مایە ئەویش سبەینێ زوو دەچێتەوە ئەو جێیەی کە برادەرەکەی باسی کرد کە دەگاتە ئەو کونە ئەشکەفتەی کە شێرەکە و گورگەکەی لێ بوو شەوێ لەوێ دەمینێتەوە شەوێ شێرەکە دەرێتە گورگەکەی ئەرێ بۆنەك ناکەی گورگەکەش دەرێ بۆنی بە بۆنی بەشەران دەچێ کابرایەکی لێیە دەیبینەوە پارچە پارچەی دەکەن و دەیخۆن ئەوەش تەماح.

**= پێشتر زۆرجار گوتوومانە، حەکایەت و ئەفسانە ڕاهێنانی مرۆڤە بەهۆی حیکمەت و ڕەوشتەوە، لە ئەفسانان، هەمیشە عەقڵ و پاکی و ڕەوشت جوانی پاداشتی چاکەی خۆی وەردەگرێتەوە.**

# گۆڕستان

**گێڕانەوەی: فاتیمە عەلی. ئەویش لە دەمی باوکییەوە وەری گرتووە**
**تەمەن: ٦٧ ساڵ خەڵکی: کەلار**

کوڕێک کچێکی خزمی خۆی زۆر خۆشویستووە چونکە کچەکە تا بڵێی جوان و بالاَ بەرز و دڵڕفێن بووە و هەم لە بنەماڵەیەکی ناوداریش بووە. بەلاَم هەرچەندی چووەتە داخوازی ئەو کچە کە بیدەنێ کەچی باوکی کچە ڕازی نەبووە. بۆیە کچەی خێر لەخۆ نەدیو لە داخی دڵڕەقی باوکی بەمەبەستی خۆکوشتن خۆی فڕێ دەداتە نێو گۆمە ئاوێکی قوڵەوە دەخنکێ و پاش مردنەکەشی لە گۆڕستانی ئاوایی دەینێژن، لەم لاشەوە کوڕەی خۆشەویستی کچە لە حەژمەتا شێت و هار دەبێ. بۆیە بڕیار دەدات کە لە نیوە شەوێکی درەنگدا بەخۆی و بێڵ و قازمەیەکەوە بچێتە سەر گۆڕی کچەکە و لە گۆڕەکەی دەری بهێنێ و بۆ دواجار سیمای جوانی خۆشەویستەکەی ببینێ بۆیە ئەوکارە دەکات و کچەکە لە گۆڕەکە دەردێنێ. ئا لەوکاتەدا کە دەیەوێ بۆ دواجار ماچێکی کچەکە بکات بە ئەمری خودا کچەکە بەزمان دێت و دەڵێ برۆ هەی نەفرەتت لێ بێت. من شەیتان وازی لێ هێناوم بۆچی تۆ وازم لێ ناهێنی. دەی خێرا زوو بمخەرەوە جێگای خۆم بۆوە کوڕەکەش خێرا بەدەستی خۆی ئەمجارە خۆشەویستەکەی لەگۆڕ دەنێتەوە و خۆڵەکەی بەسەردا دەکات. ئیتر پاش ئەم ڕووداوە کوڕەکە شێت و هار دەبێ و دەمرێت.

**- لەم حەکایەتە باس لە خۆشەویستی دەکات، بەلاَم، کوڕە پاش مردنی کچەکە گۆڕەکەی هەڵدەداتەوە، شێت دەبێ، لە ئەفسانە کچە زیندوو دەکاتەوە و قسە بە کوڕە دەڵێ: بەلاَم، لە واقیعدا کوڕە هەر ئێسک و لاشەی مردووی کچەی دیوە و ئەمەش وەک سەدمەیەک بووە بۆی و خۆی لەبەر نەگرتووە و شێت بووە، کەچی حەکایەت کچە زیندوو دەکاتەوە و بەقسەی دێنێ.**

## مەڕ و شوان

### گفتوگۆی نێوان شوان و مەڕێك بەم شێوەیە دەبێت

**ئامادەکردنی: کاروان صالح عوسمان**

**رەفیق شوکر مەحمود**

- شــوان لــە مەڕەکــەی خــۆی دەپرســیت بۆچــی وا نــەخۆش و لاوازی هــیچ شــیرت تێدا نەمایە؟
- مەڕەکــە وەڵامــی شــوانەکە دەداتــەوە و پێــی دەڵــێ: هــەمووی خــەتای تۆیــە نــازانی مــەڕەکانت بــاش بلــەوەڕێنی. لــە زســتانان دەمانبەیــە نــزاری و بــە هاوینــان دەمانبەیــە بــەر ڕۆژێ. کــە مــەڕەکان لــەم وەرزە جیــاوازە کــەیفیان بــەم دوو شوێنە نایەت.
- شوانەکە بە مەڕەکان دەڵێت: ئەی چیتان پێ خۆشە تا بۆتانی بکەم؟
- مــەڕەکان بــە شــوانەکە دەڵێن: بــە هاوینــان بمانبــە ســە رکــەوی بەزســتانان بمانبــە جێ مامز لێ کەوی.

واتــا مەبەســتی مــەڕەکان ئەوەیــە کــە هــاوین داهــات پێیــان خۆشــە شــوانەکە گــەرمێن و کوێســتان بکــات لــە هــاوین کــە وەرزی گــەرما و وشــك بــوونی گیــای پاوانەکانــە، شــوان مــەڕەکانی لــە گــەرمێن بباتــە کوێســتانەکان بــۆ ئــەوەی لــە کوێســـتانەکان هـــەر گـــژوگیای ســـەوزی ئـــەوێ بخـــۆن و لـــە ئـــاوی بـــەفراوی کوێســـتانەکان بخۆنـــەو. بـــەڵام لـــە وەرزی زســـتان شـــوان مـــەڕەکانی بباتـــە ئـــەو شــوێنەی کــە ڕۆژی لــێ دەدات بــۆ ئــەوەی گــەرم ببنــەوە. واتــا دەبێــت بــە کــەیفی مەڕەکان بێت نەك بە کەیفی شوانەکە.

**- لــەم گفتوگۆیــە بۆمــان ڕوون دەبێتــەوە کــە شــوان چــۆن شــوانی بکــات و چــۆن مەڕ بەخێو بکات.**

### چیرۆکی گورگ و پیرە ڕێوی

ڕۆژێــك لــە ڕۆژان پــیرە ڕێوییــەك زۆری برســی دەبێــت زۆر هــەوڵ دەدات کــە نێچــیرێك ڕاو بکــات بــەڵام هــەموو هەوڵــەکانی بــێ هــودە دەبــن. بــە ڕێگــادا دەڕوات

لەناکاو چاوی بە گورگێك دەکەوێت کە لەو شوێنە دەبێت. ڕێویەکە بیر لە فێڵێك دەکاتەوە بۆیە لە گورگەکە نزیك دەبێتەوە لێی دەپرسێت؟

- ڕێوی بە گورگەکە دەڵێت ئەزانی زۆر لە غەمی تۆدامە؟
- گورگەکە وەڵام دەداتەوە بۆ چی قەوماوە؟
- ڕێویەکە دەڵێت ئەوە زستان داهات ئەتۆش ئەمساڵ زۆرت سەرما دەبێت.
- گورگ بە ڕێویەکە دەڵێت باشە چی بکەین؟
- ڕێویەکە دەڵێت تۆ پێویستیت بە عەبایەکی گەرم هەیە بەسەر شانی خۆتی دادەی لەسەرما دەتپارێزێت.
- گورگەکە دەڵێت ئەو عەبایە چۆن دەست دەکەوێت؟
- ڕێویەکە وەڵام دەداتەوە ئەوە هەر زۆر ئاسانە. ئەو عەبایە لە پێستی مەڕ دروست دەبێت بۆیە دەبێت بچی مەڕێك بێنی بۆ ئەوەی ئەو عەبایەت بۆ دروست بکەم.
- گورگە چوو مەڕێکی ئەستەویری بۆ ڕێوی هێناو بە ڕێویەکەی گوت ئەوەش مەڕ.
- ڕێویەکە گوتی پاش دوو ڕۆژی تر وەرەوە.

ڕێویەکە گۆشتەکەی خوارد و پێستەکەی فڕێدا پاش تێپەڕ بوونی کاتەکەی گورگەکە چووە لای ڕێویەکە بۆ ئەوەی عەبایەکەی لێ وەربگرێ. بەڵام ڕێویەکە بە گورگەکەی گوت لە پێستی مەڕێك عەبا دروست نابێت دەبێ بچیت یەکێکی تر بێنی. گورگەکە هەمان کاری دووبارە کردەوە. بەڵام ئەوجارە زۆری نەمابوو بەدەستی شوان بکوژرێت. گورگەکە لە فێڵی ڕێوی تێگەیشت کە ڕێوی نیازی دروست کردنی عەبای نییە. بۆیە گورگەکە بڕیاریدا تۆڵەی خۆی لە ڕێوی بکاتەوە کاتێك گەڕایەوە لای ڕێوی دەبینی وا ڕێوی تێری گۆشت مەڕ خواردیە و لێی کەوتۆتە خەوێ. گورگەکە کە دەمێك بیری کردەوە کە چۆن تۆڵەی خۆی بکاتەوە چوو تەنەکەی هێناو بە پەتێکەوە لە کونی ماڵی ڕێوی هەڵیواسی هەر بای لێ دەدا و دەنکی دەدایەوە ڕێویەکە بەم کارەی گورگەکە زۆر ترسا بەم شێوەیە مایەوە تاکو مرد.

**= لەم چیرۆکە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەی بیەوەێ بە فێڵ بژی، دواجار بە هەژاری و بێ کەسی دەمرێت.**

## چیرۆكی ئەستێرەی كاروان كوژ

لەسەردەمی كۆن كۆمەڵگەی كوردی بە كاری جۆراوجۆر توانیویانە بژێوی ژیانی خۆیان و خێزانیان دابین بكەن و بەردەوامی بە ژیانی ئاسایی خۆیان بدەن.

كارەكانی ژیانی ئەوكات وەك كشتوكاڵ كردن و مەڕداری و ڕاوشكاری و بازرگانی بووە جا لەو كار و پیشانە هەندێك ڕووداو هەن كە دەشێ بە ڕاستی ڕوویان دابێ بەشێوەی جیاواز لەسەر زاری خەڵك گوترابنەوە. یەكێك لەو چیرۆكانە ئەستێرەی كاروان كوژە كە ڕووداوێكە بەسەر كۆمەڵێك كاروانچیدا دێت لە وەرزی زستان ڕوویداوە.

ڕۆژێك ئاسمان ساماڵە و هیچ پەڵە هەوری لەبەر نییە كاروانچییەكان وەكو پیشەی ڕۆژانەی خۆیان ئەو كەلوپەلانەی كە بازرگانی پێ دەكەن لە ولاغەكانیان باردەكەن و ڕێگای سەختی شاخاوی دەگرنە بەر دوای بڕینی ڕێگایەكی زۆر ئێواریٚ كە نزیك مەغریب دادێت دەگەنە گوندێك كە لەو شوێنەیە وا ڕێك دەكەون كە هەموویان ئەوشەوە لەو گوندە پشو بدەن و بحەسێنەوە كە بەیانی داهات كاروانەكەیان بگەیەننە جیٚ. شەویٚ بارەكانیان لە ولاغەكانیان دادەگرن و ولاغەكان بۆ شوێنی تایبەت دەبەن.

دوای نان خواردن و نوێژی شێوان هەموویان لێی دەخەون شەوی زستانان درێژە مرۆڤ ئەگەر زوو بخەوێت ئەوا نیوەی شەو تێر خەو دەبێت یەكێك لەو كەسانە نیوەی شەویٚ دێتە دەرەوە تەماشای لای ڕۆژهەلاٚت دەكات دەبینی وا ئەستێرەیەكی گەش دیارە و ئەویش وا دەزانێ ئەوا ئەستێرەی بەرەبەیانە دەچێتە ژوورەوە و هەموو هاوڕێكانی خۆی خەبەر دەكاتەوە دەڵێت وا بەیانیدا. ئەوكات وەكو ئێستا سەعات و ئامێری سەردەم نەبووە تاكو بزانن بەرەبەیانە یان هەر شەوە، كاروانچییەكان بەهۆی سروشتی كاركردنیانەوە ئاشنایەتییان لەگەڵ ئەستێرەكاندا هەیە بۆ نیشانەكردنی ڕێگا بەكاریان هێناوە بەلاٚم ئەمجارە هەڵە دەكەن ئەستێرەی نیوەشەو بە ئەستێرەی بەرەبەیان تێدەگەن بۆیە وادەزانن بەیانە بۆیە هەر بەپەلە بارەكانیان ڕێك دەخەن و هەر بەو نیوەشەوە بەڕێ دەكەون. بەردەوام دەبن لە ڕۆیشتن چونكە هێشتا كاتێكی زۆری ماوە بۆ بەیانی بەم تاریكە شەوە ڕێگایان لێ بزر دەبێ بەرەو شوێنێكی نادیار دەچن لەوكاتەش وردە وردە هەور بەری ئاسمان دەگریٚ و تاریكایی ئەو ناوە دەگرێتەوە تا دێت سەرما زیاتر دەبێت و لەناكاو بەفر بارین

دەست پێ دەکات و بەفرێکی زۆری لێ دێت کاروانچییەکان و ئەو وڵاغانەی کە پێیانە لەبەفر نقوم دەبن و بە لەناوچوونی هەموویان کۆتای بە چیرۆکەکە دێت دواکەس دەڵێت ئەستێرەی بەرەبەیان لێمان بوی بە ئەستێرەی کاروان کوژ.

**- راستە ناوی ئەستێرەکان بە ڕووداوەکانەوە بەندە.**

## چیرۆکی مێرەم و ئۆغەن

پاڵەوانی ئەم چیرۆکە پێك دێت لە ژن و مێردێك بە ناوی مێرەم کە ژنەکەیە و ئۆغەن کە پیاوەکەیە. دانیشتووی گوندێکن لە نزیك ڕووبارێك گوندەکە دەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی سەخت وەرزەکە زستانە و لە مانگی بەفرانباری دایە.

پیاوەکە بەیانی لە ماڵ دەردەچێت بۆ جێ بەجێ کردنی کاری خۆی. داسەکەی دەست دەداتێ و خۆی و گوێ درێژەکەی بەرە وشاخ بەرێوەن بۆ ئەوەی بارە دارێك ئامادە بکەن و کە ئێوارە دادێت دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ. کاتێك پیاوەکە دەگاتە ماڵ دەبینی کە ژنەکەی لە ماڵ نییە ژنەکەی بۆ شوشتنی کەرەستەکانی ماڵ ڕوو دەکاتە ڕووبارەکە. ژنەکە هەر خەریکی جێ بەجێ کردنی کارەکانی خۆی دەبێ و کەش و هەوا ڕوو لە ساردی دەکات وردە وردە بەفر دەبارێ تا دێت بەفرەکە زیاد دەکات تاوای لێ دێت بەفرێکی زۆری لێ دێت. ژنەکە دەیەوێت بگەڕێتەوە ماڵ بەڵام لە ڕێگا زۆر ماندوو دەبێت لە ڕێگا دەکەوێت سەرکا و ماندوو بوون هێزی لێ دەبڕن لەناو بەفر ڕەق دەبێتەوە. دوای وەستانی بەفر بارینەکە پیاوەکە ماڵ بەجێ دێڵێ بەدوای دەگەڕێ دوای ماندوو بوونێکی زۆر دەیدۆزنەوە بەڵام گیانی دەرچووە. بۆیە لە کوردەواری دەڵێن: مێرەم دەبینی ئۆغەن دەشکێنی.

واتە مێرەم کە ژنەکەیە دەبینێ کە بەفر دەبارێ و ئۆغەن بەفرەکە دەشکێنێ واتە بەدوای دەگەڕێ.

**- ئەم ڕووداوە نوونەی ڕاستەقینەی ناو لێنانی وەرزەکانە.**

## بەسەرهاتی شوانێك

مانگی ئادارێیە و شوان مەڕەکانی دەباتە بوارە وارێ بۆ ئەوەی لەوێ مەڕەکانی بلەوەرێنێ. دەبینی وا چۆلەکە هێلانەی دروست کردیە و چەند فەرخەیەکی تێدایە کە شوان چاوی بەم دیمەنە دەکەوێت و دەڵێت ئەوا بوار

داهاتیـە دەچـێتەوە زسـتانە واریَ دەڵێـت دەبـی بـەیانی بچـینە بـوارە واریَ گونـد و کـۆز و کۆتـانی زسـتانێی بـەجیَ هێشـت چـیخ و رەشمـاری تێـك وە پێچـا و لەگـەڵ مـەڕ و بەرخـەکانی چـووە چـیای لـە گونـدی دوور کەوتـەوە ئاسمـان سـامالّە و کـات وەخـتی ئێوارەیـە شـوان رەشمـاری هـەڵ دەدات و مـەڕ و بەرخـەکانی لـە دەوری رەشمارەکـە مـۆر دەبـن، بـەلاّم شـوانەکە نازانێـت هێشـتا زسـتان مایـە و کـاتی بـەفر بـارین هێشـتا ئەگـەری بـارینی بـەفر مـاوە، شـەو دادێـت و بـەفر دەسـت بـە بـارین دەکـات بـەفرێکی زۆری لێـدێت تـا بـەیانی دادێـت شـوانەکە دەڵێـت دەبـیَ زوو ئێـرە بـەجیَ بـێڵم بـەلاّم کاتێـك تەماشـا دەکـات هـەموو مـەڕ و بەرخـەکانی لەسـەرمان ڕەق بوونەتـەوە هیچـیان نـەماون بۆیـە شـوانەکە زۆر غـەمبار دەبێـت بـەم دیمەنـە لەبـەر خۆیـەوە دەڵێـت بـا بچـم سـەردانی ئـەو چۆلەکەیە بکـەم بـزانم چـی بەسـەردا هـاتووە کاتێـك تەماشـا دەکـات وا چـۆلەکەکە لەسـەر فەرخـەکانی ڕەق بۆتـەوە و هـەموو فەرخـەکانی مـردوون بۆیـە شـوانەکە بـە چـۆلەکەکە دەڵێـت: (چـۆلەکەی کوێسـتانیَ ماڵـت کـۆر بیتـەوە لەگـەڵ مـاڵی شـوانیَ کـو سـەرت لـە مـن و خـۆت شـێواند بـەویَ زستانیَ) شوانەکە خۆی و گۆپاڵەکەی گەڕایەوە گوندی بە غەمباری.

**= لـە ئـەنجامی ئـەم ڕووداوانـە کـوردەواری توانیویـەتی ئـاو و هـەوا بناسـیَ: گوتویانە: هەر عەقڵەو لە خەسارەتێك.**

**چیرۆکی ئەفسانەیی**

ڕۆژێـك کۆمـەڵێك ژن چـوونە چـیای بـۆ ئـەوەی هەنـدێك قەسـوان بکـەن، زۆر لـە گونـدی بـەدوور دەکەونـەوە. ئێـوارە دادێتـو نـاتوانن بگەڕێنـەوە مـاڵیَ، کاتێـك شـەویان بەسـەردا دێـت دەبیـنن وا ئاگرێـك لـە شـوێنێکی دوور دیـارە و ڕووناکـایی دیـارە، لـە شـوێنێکی تـریش دەنگـی حەپەحـەپی سـەگ دێـت، لـە شـوێنێکی تـریش دەنگـی کەڵەشـێر دێـت. ئـەم کۆمەڵـە ژنـە نـازانن بـۆ کـام لا بچـن کـە هەرسـێکیان نیشـانەی ئاوەدانییـە لـەو شـوێنە هـەموویان وا بڕیـار دەدەن کـە بچـن بـۆلای ئاگرەکـە. بۆ ئـەوەی ئـەو شـەوە لـەویَ بمێننـەوە تـاکو سبەینە دادێـت ئـەویَ بـەجیَ بـێڵن کـاتیَ: لـە ئاگرەکـە نزیـك دەبنـەوە دەبیـنن وا دێوێـك لـەکن ئاگرەکـە لێـی دانیشـتیەو خـەریکی خواردنـە کاتێـك دێوەکـە چـاوی بـەم هـەموو ژنـە دەکـەوێت و زۆر دڵـی خـۆش دەبێـت و لـە دڵـی خـۆی دەڵێـت یـەکێك لـەو ژنانـە دەکەمـە ژنـی خـۆم. دێوەکـە زۆر بـەخێرهاتنیان دەکـات و خۆیـان بـەقوربان دەکـات بـەلاّم

ژنەکان زۆر دەترسێن و هەوڵی خۆ رزگار کردن دەدەن بەڵام ناتوانن. ژنەکان بۆ ئەوەی خۆیان رزگار بکەن دەبێ فێڵێك بدۆزنەوە. یەکێك لە ژنەکان دەڵێت من فێڵێك لەو دێوە دەکەم و رزگارتان دەکەم ژنەکە بە دێوەکە دەڵێت ئێمە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هاتووین زۆرمان تینییە دەبێت ئاومان بدەیەی دێوەکە دەڵێت ئێوە بە چ ئاو دەخۆنەوە تاکو بۆتان بێنم؟ ژنەکە دەڵێت: ئێمە بە بێژنگ ئاو دەخۆینەوە دێوکە دەڵێت: بێژنگ ئاوی تێدا راناوەستێت، چۆن ئاو بە بێژنگ دەخورێتەوە؟ ژنەکە دەڵێت هەموو جارێ دایکی ئێمە دەچوو تارە بنیشتی لە دارەبەن دەردەهێنا و کونی ئەو بێژنگەی پێ دەگرت و دەیکردە قاپی بۆ ئاو خواردنەوە، دێوەکەش بەم قسانە باوەڕ دەکات و دەچێت ئەو کارە ئەنجام بدات بۆ ئەوەی ئاویان بداتێ دێوکە لە شوێنەکە دوور دەکەوێتەوە و هیچ لە ژنەکان لەگەڵ خۆیدا نابات کاتێك ژنەکان دەرفەتیان بۆ پەیدا دەبێت هەموویان را دەکەن و ئەو شوێنە بەجێ دێڵن. کاتێك دێوەکە دەگەڕێتەوە دەبینێ ژنەکان ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە بۆیە دێوەکە بەدوایان دەکەوێت بۆ ئەوەی ژنێك بۆ خۆی بگرێتەوە بەڵام ژنەکان بوناو زەوییەکی پڕ لە درك را دەکەن کاتێك دێوەکە بەناو زەوییەکە دەکەوێت و ئەو درکانەی لەپێی دێوەکە رادەچن و دێوەکە هەر خەریکی دەرهێنانی درکەکانە لەپێی خۆی ژنەکان بەردەوام دەبن لە رۆیشتن تاکو دەگەنەوە گوندەکەی خۆیان لەدەست دێوەکە رزگاریان دەبێت.

**= لێرەش دێوە چەند لە گێلە پیاو دەچێ. کە غەریزەی مرۆڤانەی هەیە، حەز دەکات ژنی هەبێ، بەڵام، عەقڵی مرۆڤێکی تەواوی نییە!**

**گورنام**

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، کەس لە بەندەی درۆزن و رووڕەشتر نەبوو. پاشایەك هەبوو ئەم پاشایە کوڕێك و کچێکی هەبوو، کوڕەکەی ناوی ئەحمەد بوو، کچەکەی ناوی گورنام بوو، ئەم پاشایە دەیەوێت بەخۆی و خێزان و کوڕەکەی بچێتە حەج کردن. بیری لەوە کردەوە کە گورنام بباتە لای مەلای گوندەکە تا لە حەج دەگەڕێتەوە فێری خوێندنی قورئانی بکات. دوای ئەویە پاشا و خێزانەکەی و کوڕەکەی بەرەو سەفەری حەج بەرێ کەوتن کچەکەی بردە لای مەلا تا فێری قورئان خوێندنی بکات. رۆژی دواتر

گورنـام چـووه لای مەلاکـه تـا بخوێنێت بـەڵام مـەلا نیـەتێکی خراپـی هـەبوو، ئـەویش ئـەوه بـوو کـه داوای لـه کچەکه کـرد کـه خـۆی تـەدوو بـدات، بـەڵام کچـەکه لەدەسـتی مـەلا ڕای کـرد و چـووه ژوورەوه دەرکـەکانی قـەپات کـرد و هـەموو ئەشـیاکانی دایـه پشـت دەرکەکـه تـا مـەلا نـەتوانێت دەرکەکـەی بکاتـەوه، کـه مـەلا هاتـه پشـت دەرکەکـەی داوای لـه گورنـام کـرد کـه دەرکەکـه بکاتـەوه بـەڵام هەرچـی کـردی و کـردی فایـدەی نـەبوو مـەلا بـیری لـەوه کـردەوه کـه بـۆ ئـەوەی چاوشـۆڕ نـەبێ بۆیـه یـا بڵـێین بـەر لـەوەی کـه حاجییـەکان بگەنـه شـاری هـەولێرێ چـووه زیارەتیـان. کاتێـك کـه گەیشـتنه هـەولێرێ چـووه لای پاشـایەکه دوای پیرۆزبـایی کـرن لـه پاشـاو خانەوادەکـەی بـه بۆنـەی گەڕانـەوەیان لـه سـەفەری حـەج. پاشـان پاشـا لـه مـەلای پرسـی ئـەدی کـا گورنـام ئـەوه بـۆ لەگـەره خـۆت نـەتهێناوه؟ مـەلا جـوابی پاشـای داوه و وتـی لـەوەتێ ئـەنگۆ چـووینه حـەجێ گورنـامم نـەبینیوه مـا ئـەنگۆ نـەوزانیوه پاشـینگۆ گورنـام هـەموو ڕۆژێ هـەر خـەریکی کـاری بـێ ئـەخلاقی بـووه. لەگـەڵ خـەڵکی ئـەم گونـدە. بۆیـه پاشـا تـوڕه دەبـی و بـه ئەحمـەدی کـوڕی دەڵـێ بـڕۆ ئـەم کچـه تیمـەم بـۆ بکـوژه و جـل و بـەرگی بـەخوین بکـه و بینـه ئێـره دەنـا ئـەمن ناهێمـەوه ئـەو مـارەی. ئەحمـەد بـەڕێ کـەوت و هـاتۆ مـارێ گورنـام ئـەوکات هـەر دەرکەکـەی نـەکردبۆوه کـه ئەحمـەد لـه دەرکەیـدا گورنـام دەرکـەی نـەکردەوه بـەڵام ئەحمـەد بـه گورنـامی گـۆت مـن ئەحمـەدی بـراتم ئـەوجا دەرکەکـەی کـردەوه دوای بەخێرهاتنـەوه ئەحمـەد بـه گورنـامێی گـۆت ئـەوه بـاوکی مـنی ڕەوانـه کـردووه کـه گوایـه تـۆ کـاری بـێ ئـەخلاقیت کردیـه کاتێـك ئێمـه لەسـەفەری حـەج بـووین. گورنـام گـوتی ئـەزانم ئـەوه مـەلا بـەنگۆی گۆتیـه بـەڵام بـه قورئـان، براکـەم مـن ئـەم ئیشـەم نەکردیـه ئەحمـەد بـڕوای بەخوشـکی کـرد بۆیـه توولـه تاژیـەکیان هـەبوو کـه بـەڕێ کـەوتن چـوونه نـاو دارسـتانەکی ئەحمـەد گۆتیـه گورنـامێ ئـەتو هـەڕوه نـاو ئـەو جەنگەڵـه جلـەکانی خـۆت لەبەرکـه تـا لـه خـوێنی ئـەو تاژیـەی وەربـدەم، بـۆ ئـەوەی بـاوکم بـڕوام پـێ بکـا. ئەحمـەد تاژییەکـەی کوشـتەوه جلـەکانی گورنـامی لـه خوێنەکـه وەردا دوایـی ڕۆیشـت چـووه لای بـاوکی ئینجـا پاشـا و خێزانـی و ئەحمـەد و مـەلا گەڕانـەوه گوندەکـەی خۆیـان. گورنـام لـەناو دارسـتانەکی قـەرەبالغ خـۆی شـاردبۆوه پاشـایەك لـه ڕاو دەگـەڕا ئـەم پاشـایه سـەگی لەگەڵـدا بـوو، سـەگەکه بـۆنی کـرد کـه شـتێ لـه نـاو ئـەم دارسـتانه هەیـه، بۆیـه پاشـا ڕاوکەرەکـه لـەدوای سـەگەکه ڕۆیشـت تاگەیشـته هەنـداو گورنـامێ پاشـا بـه گورنـامێی گـۆت ئـەوه لێـره چـی دەکـەی؟ گورنـام وتـی نێیـه پـێش ئـەمن قـەلبی گوناهکـارم دیـاره بۆیـه پاشـا

جل و بەرگەکانی سەرەوەی خۆی دایە گورنامیّ، کە گورنام لەبەری بکات، کە جلوبەرگەکانی بۆ هاویّشت لەبەری کرد و هاتە دەر لەناو بێشەرانەکە پاشا گورنامی بردە ماری خۆی. ڕۆژ هاتو ڕۆیی، سالّ هات و تێپەڕی هیچ کەس خۆی بەخاوەنی گورنام نەزانی، دوای سێ سالّ پاشا بە گورنامێی گوّت وابزانم کەس و کاری تۆ نەماون بۆیە داوات لیّ دەکەم کە من و تۆ ببین بە ژن و مێردی یەکتر، گورنام ڕازی بوو بەو کارەی کە پاشا داوای لیّ کرد دوای سێ سالّ سێ کوڕیان پەیدا بوو. ڕۆژێك پاشا لە ڕاو هاتەوە دەبینی گورنام دەگرییّ دوو ڕۆژی دواتریش بەهەمان شێوە کە پاشا لە ڕاو دەگەڕایەوە دەیبینی کە گورنام دەگرییّ. پاشا بە گورنامێی گوّت ئەوە لۆ چی دەگرییّی؟ گورنام گوّتی بۆ کەس و کاری خۆم دەگرییّم. پاشا بە گورنامێی گوّت ئەگەر کەس و کارت بمابایە تا ئێستا لێیان دەپرسییەوە. گورنام تووڕە بوو گوتی لۆ خۆ من لە کونی دیواری دەرنەچویمە تا کەس و کارم نەبی، پاشا گوتی خۆ من نارێم کەس و کارت نییە بەلّکو من دەلّێم کەس و کارت نەماینە. پاشا گوتی ئەوها ناچیتە سەر ناچار بوو بە گورنام بلّیّ دەی ئەوا من خورامەکی خۆم لەگەلّ تۆ ڕەوان دەکەم بۆ ئەوەی خزم و کەس و کاری خۆت ببینیەوە. پاشا یەکێك لە خورامەکانی خۆی بانگ کرد کە ناوی عبد بوو، تا لەگەلّ گورنام بچی. گورنام بەخۆ و مندارەکانی لەگەلّ عەبد ڕۆیشتن تا شەو داهات. ئەوجا بێنێکیان دایێ، کە شەو ڕۆیی و ڕۆژ داهات دیسان بەڕیّ کەوتن و برۆ برۆ و برۆ تا شەو داهاتۆ. ئینجا عەبد بە گورنامێی گوّت یان دەبی خۆم دەدو بدەی یان مندالّێکت دەکوژم؟ گورنام گوتی بیکوژە بەس خۆت دەدو نادەم. شەوی داهاتوو بەهەمان شێوە داوای لێکرد کە یان خۆی دەدو بدا یان مندالّێکی بکوژی گورنام گوتی بیکوژە. شەوی سێیەم هەمان شت دووبارە بووەوە واتە مندالّی سێیەمیشی کوشت. شەوی چوارەم کە هیچ مندالّی نەمابوون بۆیە کە عەبد داوای لیّ کرد کە خۆی دەدو بدا ئەوجارە هیچ ڕێگای نەما بوو کە قورتار بیّ بۆیە بەر لەوەی خۆی بدا بەدەستەوە گوتی دەبا دەست نوێژ هەلّگرین ئینجا ئەوەی تۆ دەتەویّ دەیکەین. کە گورنام مەسینەی هەلّگرت کە بچی دەست نوێژ بشوا بیری لە ڕێگایەك کردەوە تا لە دەستی عەبد ڕابکات. ئەویش ئەوەبوو کە عەبد پەتێکی درێژی هێنا سەرێکی لە دەستی خۆی بوو سەرەکەی تریش لەدەستی گورنامی بەست بوو. گورنام سەری پەتەکەی لە دەستی خۆی کردەوە لە دارێك قەیمی کرد ئینجا هەلّات. کە بەیانی داهات گورنام بینی وا

شوانێك بەرەو ڕووی ئەو دێت. داوای لە شوان كرد كە جلوبەرگی خۆی بداتێ ئەویش جلوبەرگی خۆی بداتە شوان. بە گورنامێی گۆت بۆ گەمەم پێ دەكەی خۆ كفر نەبوو ئەتو دەوڵەمەند بووی و ئەمن فەقیر بووم. وەكو خۆت دەزانی كە هەموو زەمانەكی فەقیر و دەوڵەمەند هەر هەبووە. گورنام گوتی بەخوای گەمەت پێ ناكەم بەڕاستیمە دوای ئەوەی كە جلوبەرگی خۆی دا شوانەكەی و جلوبەرگی شوانەكەی لەبەر كرد، گورنام ڕۆیشت تا گەیشتە ماڵێ پاشا. كە چۆ ئەوێ داوای لێ كردن كە بیكەن بە قازەوان پاشاش ڕازی بوو كە بیكاتە قازەوان بەلام گورنام ناوی خۆی گۆڕی بوو كردبوویە كەچەڕۆك. شەوێك لە شەوەكانی زستان خەڵكێكی زۆر لە دیوەخانی پاشا كۆدەبنەوە كە مەلای گوندیش لەگەڵ عەبد و پاشایەكەی ڕاوكەر لەم كۆبونەوەیە بوون جەماعەت لەسەر ئەوە ڕێك كەوتن كە هەریەكەی چیرۆكێ بكا. كەچەڕۆكیش لەكن دەرگاكە دانیشت بوو. دوای ئەوەی هەریەكەو چیرۆكی خۆی گوت پاشا گوتی دەبا كەچەڕۆكیش چیرۆكێك بكات. كەچەڕۆك گوتی بەو شەرتە من چیرۆك دەكەم كە هەموو كلیلەكان بدەنە دەستی من، جەماعەت گۆتیان جا كەچەڕۆك ئەتو كلیلت لۆچییە؟ كەچەڕۆك گوتی ئەوا شەرتی منە ئەگەر ڕازین دەنا ئەمن چیرۆكی خۆم ناكەم. پاشا بە خورامەكانی گۆت هەموو كلیلەكان بینن تەسلیمی كەچەڕۆكی بكەن. كاتێك كە كلیلەكانیان دایە دەستی كەچەڕۆكی ئەوجا بڕیاریدا چیرۆكی خۆی بكات، كەچەڕۆك دەستی كرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەی خۆی مەلا و عەبد لەرزەیان گرت بوو ئارەقەیان چۆر چۆر بەلەشدا دەهاتە خوارەوە. داوایان لە پاشا كرد كە ڕێگایان بدات بچنە دەرەوە. واتە داوای ئەوەیان دەكرد كە دەركە بكەنەوە، بەلام كەچەڕۆك گوتی ئەگەر ئێوە بتانەوێ بچنە دەرەوە ئەوا من چیرۆكەكەی خۆم تەواو ناكەم. پاشا گوتی هیچ كەس ناچێتە دەرەوە هەتا كەچەڕۆك چیرۆكەكەی تەواو نەكات. دوای ئەوەی كە كەچەڕۆك چیرۆكەكەی گێڕایەوە لەناو مەدریسەكە هەڵسا و گوتی ئەوە من ناوم گورنامە و ئەوەش مەلا ئەوەش عەبد ئەمەش باوكمە ئەوەش برامە و ئەوەش مێردەكەمە. بۆیە لە دوای تەواو بوونی مەدریسەكە پاشا بڕیاریدا كە عەبد و مەلا لە سێدارە بدات. پاشا بە خورامەكانی گوت كە پەتكی قەنارە حازر بكەن تا مەلا و عەبد لە سێدارە بدەن، خورامەكان پەتكی قەنارەیان حازر كرد، پاشا بە خورامێكی گوت كە ئاگاداری هەموو خەڵكی ئەم گوندە و دەورووبەری ئەو گوندە بكەن كە بۆ بەیانی مەلا و عەبد لە سێدارە

دەدرێـن. لەبـەردەم خـەڵكی تـا بـبن بـە پەنـد و عیـبرەت بـۆ هـەموو خـەڵكی. كـە بـەیانی داهـات هـەموو خەڵكەكـە لـەو شـوێنە كۆبوونـەوە كـە مـەلا و عەبـدی تێـدا لـە سـێدارە دەدەن. ئینجـا پاشـا بڕیاریـدا كـە بـانگی عبـد و مـەلا بكـەن تـا لەسـێدارە بـدرێن، كـە هـەردووكیان هێنـان لەبـەردەم خـەڵك لـە سـێدارەیان دان بـەمجۆرە گورنـام بـە دایـك و بـاوك و برایەكـەی شـاد بـۆوە دوای دایـك و بـاوكی گورنـام داوایـان لـە گورنـام كـرد كـە بچـیتەوە مـاڵێ مێردكـەی خـۆی واتـە بچـیتەوە مـاڵی پاشـای ڕاوكـەر گورنـام چـووە مـاڵی خـۆیی لەگـەڵ مێردەكـەی بـە مـرازی خـۆی گەیشـت ئـەو مـرازەی كـە دەیویسـت، چـونكە گورنـام غـەدرێكی زۆری لـێ كرابـوو. لەگـەڵ مێردەكـەی ژیانیـان بەسـەر بـرد و لـە سـایەی خـوای گـەورە دوو منـداڵی تریـان بـوو كە كوڕێك و كچێك بوون. ئەمنیش هاتمەوە كراشم دڕاو چم پێ نبڕا.

**- ئـەم جیكایەتـەش شـێوە و دەقـی جۆراوجـۆری هەیـە، پێشـتر چـیرۆكی كچـە پاشایەك هەر ئەم ناوەڕۆكەیە و بە كەمێك گۆڕانەوە.**

**سـەرچاوەكان:**

١. چیرۆكی گفتوگۆی نێوان شوان و مەڕ.
٢. چیرۆكی ئەستێرەی كاروان كوژ.
٣. چیرۆكی مێرەم و ئۆغەن.
٤. بەسەرهاتی شوانێك.

ئەم چیرۆكانە لە زاری دایكی كاروان وەرگیراوە بە ناوی (مریم ابراهیم تەها).

ساڵی لەدایك بوون: ١٩٤٨. شوێنی دانیشتن: كۆمەڵگای پیرزین.

١. چیرۆكی گورگ و پیرە ڕێوی.
٢. چیرۆكی چوار ژن و دێوێك.
٣. چیرۆكی گورنام.

ئەم چیرۆكانە لە زاری داپیری ڕەفیق وەرگیراون بەناوی (حەلیمە رسول قادر).

ساڵی لەدایك بوون: ١٩٢٣. شوێنی دانیشتن: شارۆچكەی هەریر.

بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١- وریابن خەوتان لێ نەکەوێ! کورتە چیرۆك بۆ مێرد منداڵان- بەغدا- ١٩٨١.

٢- خۆت لە من بزر مەکە! شیعر - بەغدا - ١٩٨٥.

٣- قەدەغەشکێنی- لێکۆڵینەوەی ئەفسانەی کوردی- سلێمانی دەزگای سەردەم - ٢٠٠٠.

٤- گەڕان بە دوای نەمریدا، نامەی ماستەر- هەولێر- دەزگای ئاراس ٢٠٠٢.

٥- بەرەوژن ! کورتە ڕۆمان - سلێمانی- ٢٠٠٣.

٦- پیرلی کێوان- کورتە ڕۆمان - سلێمانی - ٢٠٠٤.

٧- هێلکە نامێ - ئەفسانەی کوردەواری - بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم - ئینستیوتی کەلەپوری کوردی ، هەولێر - ٢٠٠٦

٨- هێلکە نامێ - ئەفسانەی کوردەواری - بەرگی یەکەم ، بەشی دووەم ئینستیۆتی کەلەپووری کوردی - هەولێر - ٢٠٠٦

٩- پێکهاتەی ئەفسانەیی کوردی - نامەی دکتۆرا - دەزگای رەنج، سلێمانی - ٢٠٠٧.

١٠- تێرنەخۆرە، ئەفسانەی گوردەواری- بەرگی یەکەم بەشی سێ یەم - دەزگای بەدرخان - هەولێر ٢٠٠٨.

١١- زیاتر لە عەشقێك، بابەتی هەمەجۆر، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم- دەزگای بەدرخان - هەولێر - ٢٠٠٨.

## ناوەڕۆك